# مێژووی دەوڵەتی سەفەوی


- ناوی نووسەر : د. محەمەد سهێل تەققوش
- وەرگێڕانی : سالار محەمەد (شاخەوان)
- دیزاین و بەرگ: خەلیل هیدایەت مام شێخ ٤٩٢٤٢٦٣
- ژمارەی سپاردن ( ٤٦) ساڵی ٢٠٠٦
- نرخ: (٥٠٠٠) دینار
- نۆرەی چاپ : چاپی دووەم ٢٠١٢
- شوێنی چاپ : چاپخانەی رۆژهەلآت-هەولێر ٤٦٣٩٥٢١

بەڕێوەبەری هونەری دەزگا

**سەلام محەمەد رەسول**

**راوێژکاری دەزگا بۆ بەشی مێژوو**

**د. محمد عبدالله کاکەشوور**

## پێرست

## بەرایی

سوپاس و ستایش بۆ خودای هەموو جیهان و درووودیــش لەســەر گــەورەی پێغەمبــەران موحەممەد کوڕی عەبدوڵلا و سەرجەم یارو یاروەرانی و هەموو ئەوانەی بەدوعاکانی ئەو نزاو پاڕانەوە دەکەن تا ڕۆژی دوایی.

ئەم کتێبە باس لە مێژووی دەوڵەتی سەفەوییەکان دەکات لەئێران. لەڕاستیشدا بەرچاوخستن و وێنــاکردنی رابــردوو کــارێکی زۆر ســەختە ئــەویش نــەك لەبــەر وێکچــوونی زانیارییــە مێژووییەکان یاخود کەمی بابەتەکان، بەڵکو بەپلــەی یەکــەم گێڕانــەوەی مێــژوو کــارێکی سیاسییە، گۆتەگۆتیش دەربارەی نووســینی مێــژووی ســەفەوییەکان کــە ئــەویش لەســەر بنچینەیەکی سیاسی و تاك مەزەبی دامەزراوە وا لەلێکۆڵەر دەکات تووشی چەندین کــاری سەخت و دژوار ببێتەوە. سەرچاوە فارسیەکانی تایبەت بەم مێژووە بەهیچ شێوەیەك زانیاری تەواومان نادەنێ چونکە لەیەك روانگەوە تەماشا دەکا و بــاس دەکــەن ئــەویش ســتایش و پیاهەڵدانی کەسایەتییەکانیەتی، کەچی سەرچــاوەکانی دیکــە ســەرەڕای ئــەوەی زۆربــەیان رەخنەسازین، بەکەڵکی ئەوەش نایەن وەك بابەتێکی مێژوویی سوودیان لێببینرێ.

بەدرێــژایی مێــژووی خــۆرەلاتی ئیســلام دەوڵــەتی ســەفەویی وەك یــەکێك لەدەوڵەتــە سوڵتانیەکان هەژماردەکرێ و نموونەیەکی روون و ئاشکرای دەوڵــەتی مەزەبییــە لەچــەرخی ئێستاماندا، کەئەویش دەوڵەتی شیعەمەزەبی دوانزەییەو لەئێراندا دروست دەبێت و ئەوانــە لەوێوە سەرچاوە دەگرن و بلاودەبنەوەو هەڵدەکشێن بەرەو خۆراوا لەلایەك بەلای خۆراسان و ئەفغانســتان و ئازەربێجان و ئێراق و دیاربەکر؛ لەپاشانیش بەرەو کەرەج لەباکور.

لەڕاستییدا ئێرانییەکان لەجیهانی ئیسلامیدا، قەوارەیەکی مەزەبی ئایینی تایبەت بەخۆیان پێکهێنا جیای دەکردنەوە لە قــەوارە ئیســلامیەکانی دیکــە کەســەرجەمیان نوێنەرایــەتی موسوڵمانانیان دەکرد، بــەلام لــەدوای ماوەیــەکی زۆری دابڕانــی سیاســی و کۆمەلایــەتی

ئێرانییەکان شانازی بەدەوڵەتی سەفەوییەوە دەکەن، چونکە لەبنەڕەتدا ئەم دەوڵەتە یەکێتی سیاسیی بۆ ئێران سازکردەوە.

ئەو رۆژگارەی ئەم دەوڵەتەی تێدا دروستبوو بریتی بوو لەهەڵوەشانەوەی دەوڵەتی تەیموریی، کە ئەوکاتە ئێران بەدەست لێکترازان و بەش بەشبوونی پاشا لاوازەکانەوە ئاڵوودەبوو. لەسەرەتا سەدەی شانزەهەمی زایینیدا نەوەکانی سەفەویی توانیان دەسبەسەر تەختی پاشایەتیدا بگرن.

شایانی باسە سەرچاوەی بەرەبابی سەفەوییەکان لەئازەربێجانەوە سەریهەڵداوە و سەر بەشێخ سەفیەدین ئیسحاقی ئەردەبیلیین و ئەویش موسوڵمانێکی سوننی بوو، لەسەر مەزەبی ئیمامی شافعی و شێخی تەریقەتی سۆفیگەریی کەپاشان هاتۆتە باکوری ئێران و لەئەردەبیل نیشتەجێبووە. بۆیە لەناوی سەفیەدینەوە ناوی بەرەی نەوەکانی سەفەوییەکان وەرگیراوە، هەروەها مێژوونووسەکان رەچەڵەکەکەی دەگەڕێننەوە بۆ ئیمام موسا کازم.

یەکێك لەنەوەکانی شێخ سەفیەدین کەئەویش شێخ جونێد بوو هاتە ناو مەزەبی شیعی دوانزەئیمامیەکە، هەربۆیە بەهیچ شێوەیەك دانی بەدەسەڵاتی دەسەڵاتدارانی موسوڵمانە سوننیەکاندا نەدەنا و دەستی کرد بەبڵاوکردنەوەی مەزەبەکەی لەوڵاتانی دەوروبەرداو بەدەیان هەزار لەتورکمانە شیعەکانی ناوچەی ئەنادۆڵ لەدەوری کۆبوونەوەو پەیوەندیان پێوەکرد، هەر لەسەر دەستی ئەو لادانێکی گەورە لەبزووتنەوەی سەفەوییی بۆ بزووتنەوەی شیعەگەرایی روویداو، ئەمەیش لەدوای ئەوە سازبوو کە بارە سیاسییەکەی بۆ رەخسا و شاروخ مردو دەوڵەتی تەیموری لێکهەڵوەشایەوە.

پاشان شێخ حەیدەری کوڕی هەنگاوێکی دیکەی هەڵێنا بۆ گۆڕدان بەبزووتنەوەی سەفەوییی بەرەو مەزەبی شیعەی دوانزەیی، بەدروشمێکیش هەوادارانی لەخەڵکی دیکە جیا دەکردەوە کەبریتیی بوو لەفێسێکی پیاوانی ئایینی و دوانزە نقێمی سووری پێوەبوو و ئەم ژمارەیەش ئاماژەبوو بۆ دوانزە ئیمامەکەو ناویان نا (تاجی حەیدەر)، لەبەرامبەردا عوسمانییەکانیش ناویان لێنان (قزلباش) واتە سەرسوورەکان.

لەدوای ئەمەش ڕووداوەکان زۆر بەخێرایی ڕادەبوورین تا کـار گەیشـتە ئـەوەی خانـەوادەی ئیسماعیلی کـوڕی شـێخ حەیـدەر دەسـەڵاتیان گرتەدەسـت و تورکمانـەکانی ئـەنادۆڵیش بەخێرایی لەدەوری کۆبوونەوەو دەستیان کـرد بەبڵاوکردنـەوەی مـەزەب و بیروباوەڕەکـەیان لەناو تورکمانەکانی ئاق قوینڵووی سوننەمەزەب و پاشـان هەوڵیانـدا بیـان چەوسـێننەوە. ئینجا تورکمانەکانی ئەنادۆڵ کرۆکی سوپایەکیان پێکهێنا کەبەچاوی پیاوانی هەڵبژێردراوی خوداوەند تەماشای ئەوان و جێنشینەکانیان دەکردن و ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکردن.

ئیسماعیل لەئازەربێجانەوە بزووتنەوەکـەی دەسـتپێکرد و لەقـەبی پاشـای بۆخـۆی دانـاو دەستی بەسەر شەرواندا گرت و تـەورێزی لـەژێر دەسـتی ئـاق قوینڵـوو دەرهێنـاو کـردی بەپایتەختی دەوڵەتە تازە دروستبووەکەی و پاشان دەستی بەسەر ئەسفەهان و یەزد و کرمان و خواروی خۆراساندا گرت و دراویشی بەناوی خۆی لێداو لەسەکۆی مزگەوتەکانیشدا وتارە ئایینیەکان بەناوی ئەوەوە دەخوێندرانەوە.

سـەرکەوتنی ئیسماعیل شا بریتیی لەئایینپەروەری و بـوێری و بەئاشـکرا ڕایگەیانـد کـەوا مەزەبی شیعی دوانزەیی دەبێتە مەزەبی ڕەسمی و نیشتیمانی ئێران، پاشان گەلەکەی هانـدا بۆ دژایەتی کردنی سوننەکان و خۆلێدوورگرتنییان کەئەوانیش لەلای خۆرهەڵات: ئۆزبەکستان و لەلای خۆراوا: عوسمانییەکان بوون. تەنانەت بۆ دڵنەوایی کردنی شوێن کـەوتووەکانی وەك و بەرپرسێکی داکۆکیکار و بەرگریکار لەئایین و مەزەبەکەی ڕەفتاری دەکرد. بۆیە دەبوایـە شا خۆ ئامادەبکا بۆ جەنگ و ئەویش هەموو کاتێکی خۆی بـۆ ئـەم کـارە تـەرخان کـرد. لەڕاستیشدا بیانووی شەڕەکانی ئایینی و ماددی بوو:

- بڵاوکردنەوەی مەزەبی شیعی دوانزەیی لەنێو تورکە سوننەکان.
- فراوانکردنـی وڵات بەمەبەسـتی دەسـکەوتی پـتری مـاددی و ژێردەسـکردنی ئـەو دانیشتوانانەی کە بۆی هەیە باجیان بەسەردا بـەپێنێ.

ئەوەبوو لەئەنجامی زنجیرەیەك جەنگی یەك لەدوای یەکـدا، عوسمانییـەکان بـەرەو فـورات و قەوقاز و دەریای قەزوین هەنگاویان نـا بـەو ئومێـدەی دەسبەسـەر تـەورێزی پایتـەخت و بەغدادا بگرن، لەوێشەوە بەرەو خۆرهەڵات کەویلایەتە لێکترازاوەکانی ئێرانی لێبوو، پاشـان

بۆ دەریای قەزوین و قەوقاز لەلای بـاکوور و زەریـای هینـدی لـەلای باشـوور و کەنـداوی عەرەبی لەباشووری خۆرەلاّت، کتومت ئەمانە وەك ئـەوە وابـوون، چـاوەڕێی فریادڕەسـێك بکەن یەکیان بخاتەوە.

شا لەئۆزبەکستان شەڕی کردو خۆراسانی گێڕایەوە بۆ ژێر دەسـەلاّتی خۆی و بـەرەو بوخـارا پێشڕەویی کرد. سەرەتای جەنگەکەش لەکەرتی خۆرەلاّتەوە لەگـەڵ عوسمانییـەکان دەسـتی پێکرد. بەلاّم لەباشوردا، ئەلبورکی پورتوگالی تـوانی دەسبەسـەر دوورگەیـەکی بچـووکدا بگرێ بەناوی هورمز کەکەوتبووە سەرەتای کەنداوی عەرەبی و لەوێشـدا قەلاّیـەکی تونـدو تۆڵی بۆخۆی دروستکرد، بەمەش توانی زاڵبێ بەسـەر چالاکییە بازرگانیەکانی ئەوێ.

لێرەدا شا پشتگیریی لە بازرگانیی دەکرد بۆ ئەوەی بەسایەیەوە پارەوپوولی زۆری دەسکەوێ بۆ دەوڵەتەکەی، لەم پێناوەشدا بانگهێشتی بازرگانە ئەوروپییەکانی کرد بۆ ئەوەی سـەردانی ئێران بکەن و چالاکی بازرگانی تێدا ئەنجام بـدەن و بـەئازادییش دەتـوانن پێیـدا تێپـەڕن و کارناسانی زۆریی بۆ کردن. هەروەها دەیزانی بە چ شێوەیەك یاسـا و ڕێسـاکان بخاتـە ژێـر رکێفی خۆی، بێگومان ئەویش بۆ مەبەسـتی بـەهێزکردنی دەسـەلاّتی خـۆیی و پترکردنـی ژمارەی سەربازەکانی بوو.

سەفەوییەکان بەوە ناسرابوون کەبە بەربلاّوی خاوەنی هەموو شتێك بوون لەولاّتدا، چـونکە شا گەورەی ولاّت و خـاوەنی ژیـانی خـەڵك و سەروسـامانی سـەرجەم دەسـوپەیوەندبوو و سـەرجەم پیـاوانی دەوڵـەتی لەبەردەسـتدا بـوو و چـی بویسـتبا وای دەکـردو هـەموو فەرمانەکانیشی بەبێ هیچ چەندوچوونێك دەبوایە جێبەجێبکرێت و هیچ کەسیش بۆی نەبوو گفتوگۆی لەسەر بکات، تەنانەت ئەگـەر فەرمانەکـەی لـەکاتی مەستیشـدا راگەیانـدبێ، چـونکە ئـەو لەسـەرووی هـەموو یاسـاکاندابوو، دەبوایـە گـەلیش لەهـەموو شـتێکدا بەندەفەرمانی بن، تەنها ئەو فەرمانانەی نەبێ کـە دژی یاسـاکانی شـەریعەتی ئیسـلامن، لەوانەیە ئەو بالاّدەستیەش بۆ دوو هۆکار بگەڕێنینـەوە، لەلایـەك سـەفەوییەکان لـەبواری سەربازییدا لەئێران زۆرینە بوون بۆیە هەمیشە حکومەتەکەیان داپلۆسێنەرو چەوسێنەربوو، لەلایەکی دیکەشەوە گوایە شا جێگری پێغەمبەر (د.خ)ەو جێنشینییەتی.

لەدوای مردنی شا ئیسماعیلی یەکەم دەوڵەتی سەفەویی رووبەرووی کۆمەڵێك دواکەوتن هات لەبواری سیاسی و سەربازیدا، عوسمانییەکان دەستیان گرت بەسەر ویلایەتە فارسیەکانی عیراق و لورستان و خوزستان و خستیانەنە پاڵ خاکی خۆیان. لەهەمان کاتیشدا ئۆزبەکیەکان دەستیان گرت بەسەر هەرات و مەشهەد و نیساپور و دەوری ویلایەتەکانی خۆرەلاتیشیاندا، بۆیە خەلیفە تەهمەسابی یەکەم و ئیسماعیلی دووەم و محەمەد خودابەندە لەنێوی گێژاوی ململانێی ناوخۆیی لەسەر کورسی حوکمڕانی دەستیان کرد بەرووبەروو بوونەوە، بارەکەش تامردنی شا عەباسی یەکەم بەم شێوەیە مایەوە.

شا عەباسی یەکەم بەناو هۆزەکانی قزلباشدا گەڕاو، وەك ئازاو بوێرێك خۆی پێدەناساندن و لەهەمان کاتیشدا زۆر لێیان بەپارێزبوو، چونکە هەر ئەوان بوون بەهۆی کەمەنەتەوایەتیەکان خۆیان بەهێزکرد. بۆیە کورسی دەسەلاّت و خانەوادەکەی لە بالاّدەستی ئەوان رزگار کردو سوپایەکی بەناوی لایەنگرانی شا پێکهێناو ئەوانیش پێك هاتبوون لە چەند هەزار سەربازێك لەنێو هۆزەکان هەڵبژاردبوون، بەتایبەتی هۆزی کەرەجیە نەسرانیەکان کەخۆبەخشانە لەریزی سوپاکەیدا کاریان دەکردو خزمەتی تەواویان بە دەسەلاّتەکەی دەکردو راستەوخۆش فەرمانەکانیان لەو وەردەگرت، بەمەش پاڵپشتیەکی زۆر گەورەی وەدەست هێنا. لەبەرانبەریشدا ژمارەیانی لەریزەکانی سوپاکەیدا کەمدەکردەوە، دەستبەرداری ئەو کەسانە دەبوو کەتەنها بەفەرمانی سەرۆکەکانی خۆیان هەڵسوکەوتیان دەکرد و لەجێگەی ئەواندا بەکرێگیراو و جاشی دادەمەزراند کەخۆیان و کوڕەکانیان سەربازی پیادەبوون. هەروەها ئەفسەرەکانیشیانی دادەمەزراندو هەرکاتێك بیویستبایە ئەوا لای دەدان و دەری دەکردن، لەنێو ئەو پیاوانەی سوپاشدا زۆربەی حاکمی ویلایەتەکان و فەرمانبەرە پایەبەرزەکانی هەڵبژارد.

لەوانەیە شا یەکەم کەس بوویێ کەوا هەستی بەوە کردبێ بەهیچ شێوەیەك ناتوانێ لەچەند قۆڵەوە بجەنگێ، چونکە ئاشکرایە لەسەرەتای دەستپێکردنی ژیانی سیاسی ئاشتەواییەکی سەرشۆڕانەی لەگەڵ عوسمانییەکاندا ئەنجامدا ئەویش بەمەبەستی ئەوەی بواری ئەوەی هەبێ لەدژی ئۆزبەکیەکاندا بجەنگێ، کەچی دوای ئەوەی هەڕەشەکانی نەهێشتن دووبارە رووی لەعوسمانییەکان کردەوە بۆ ئەوەی لەدژیاندا بجەنگێ. لەم پێناوەشدا دەستی کرد بەهێرش

کردن و ئەوەبوو تەورێز و ئەیرەوان و شەروان و قارسـی لـەژێر دەسـت دەرهێنـان و پاشـان ئازەربێجان و خۆزستانی داگیرکرد و ئینجا چووە ناو بەغداو موسڵ و دیاربەکر. لەوێش ئەو سەرانەیەی کەدەبوایە ساڵانە بیدەنە سوڵتانی عوسمانی کەم کردەوە بۆ سەد باری حەریر.

پاشان شا دانی بەسەر خەسڵەتە ئایینیەکەیدا گرت کـە رێنیشـاندەرێکی بـێ کـەموکوڕیی ئایینیەو لەهەمان کاتیشدا پـارێزەری ئـاین و مـەزەبی شـیعەیە، ئـەوەبوو لـە خۆراسـان لەمەشهەد مزگەوتێکی گەورەی بینا کردو وەك شـوێن پێـی وشـترەکەی پێغەمبـەر (د.خ) پارێزگاری لێکرد. هەموو ساڵێکیش بۆ موبارەك بایی دەهاتـە ئـەم شـارە. ئێرانیـەکانیش لەسەردەمی ئەودا ساڵانە بەرەو ئەوێ دەچوون و لەجێگەی مەککە لـەوێ حـەجیان دەکـرد بەمەبەستی ئەوەی زێـڕی وڵاتـەکـەیان نەبەنـە دەرەوەو ناچـار نـەبن پـارەو سـەرانە بدەنـە عوسمانییە دوژمنەکانیان. لەهەمان کاتیشدا شا دەچووە نەجەف و مـەزاری ئیمـام عـەلی خاوێن دەکردەوەو خزمەتی میوانەکانیشی دەکرد.

پاشان شـا بەسـەرکەوتنەکانی لـەبواری سـەربازیدا پشـت ئەسـتووربوو بەهۆیـەوە تـوانی پەیوەندیەکی باش لەگەڵ ئەوروپیەکانـدا سـازبکا. کـاتێکیش پورتوگالیـەکان لەکەنـداوی عەرەبیدا رێگای هورمزیان بڕی کۆمپانیایەکی ئینگلیزی لەمۆسـکۆ تـوانی پەیوەندیـەکی بازرگانی لەگەڵ ئێراندا کەبە روسیاوە گوزەربکات پێکهێنا، ئەو کاتەش رووسیا بەتـەواوی لەدەوروبەری گۆماوی رووباری ڤۆلگا باڵادەستبوو. ئینگلیز لەرێگەی ئەستراخان و دەریـای قەزوین و باکۆ و شەرەوانەوە توانیان بێنە ناو ئێران؛ بەڵام لەدوای شـەش گەشتی لـەمجۆرە و بـەهۆی ئـاژاوەی نـاوخۆی ئێـران و ترسـی چـەتەکان ئیـدی ئـەم کۆمپانیـا ئینگلیزییـە پەیوەندییەکانی پچڕاند.

لەلایەکی دیکە شا لەگەڵ ئەو گیانبازە ئینگلیزانەی هاتبوونە ناو ئێران (ئەنتۆنی و رۆبێرت چێرلی) پەیوەنـدی سـازبکات کـە ئـەوانیش بیسـت و پێـنج یاوەریـان لەگەڵـدا بـوو و لەنێوانیشیاندا شارەزایەکی تۆپهاوێژیشی تێدابوو، هەر هەمووشیان لەخزمەتی شادا کاریان دەکـرد. ئـەوەبوو ئێرانییـەکانیان فێـری هونـەرە سـەربازیەکان دەکـرد و تیپێکـی تـۆپ هاوێژیشیان پێکهێنا و سوپاکەشیان پڕچەك کرد، جگە لەمەش رۆبێرت چێرلی خودی خۆی

بەشداری جەنگی دژ بەعوسمانییەکانی کرد. بەسـایەی ئـەو ڕاهێنانانـەو ئـەو پێداویسـتیە سـەربازیانەوە شا توانی بەسـەر عوسمانییەکاندا سەرکەوێ.

لەبەر ئارەزووی زۆری بۆ گەورەکردنی سـەرمایەکەی، شا دەستی بەسـەر بازرگـانی حـەریردا گرت و ئەم بابەتە گرانبەها و گرنگە بۆ ئەوەی دووربێ لەبەخشینی ئـەو باجـە گومرگییـە گەورەیەی کە عوسمانییەکان لەبەرانبەر تێپەڕبوونی کالاکانی ئێرانی بەنێو خاکیاندا لەسەری دانابوون، لەرێگەی کەنداوی عەرەبیەوە هەناردەی دەکردن. بۆیە ناچاربوو کەوا لەهیندستان و بەیارمەتی ئینگلیزەکان لەدژی پورتوگالیەکان بجەنگێ، ئاماڵجی کۆمپانیـای ئینگلیزیـی خۆرەلاتی هیندستانبوو تا کـالا خورییـەکانی لـەخاکی ئێـران سـاغبکاتەوە. بەمشـێوەیە پەیوەندییە بازرگانیەکانی نێوانیـان لەبەنـدەری جاسـك دروسـتبوو و، ئـەم پەیوەندییـەش رووخـانی بنکـەی هـورمزی لێکەوتـەوە بەدەسـتی ئێرانیـەکان. پاشـان زۆر بـەخێرایی هۆڵەندییەکانیش لەگەڵ ئێراندا جموجۆڵی بازرگانیان دەستپێکرد. شا لەلایـەن خۆیـەوە زۆر بەچاوتێری مامەڵەی لەگەڵ بازرگانە ئەوروپییەکاندا دەکرد. ئەوەبوو پەیڕەو کردنی فەرمانـە ئاینییەکانیانی بۆ مسۆگەر کردن و چەندین پرد و خانیشی بۆ سازکردن.

هەرچەندە شا خەریکی جەنگێکی زۆر بوو، بەلام ئەوەشی لەبیرنەچوو کە گرنگی تـەواو بـە گەشەپێدان و بەرەوپێشچوون بدا، بۆیە دەستی کرد بەدروسـت کردنـی چـەندین مـەیدان و باخی گشتی و باڵەخانەی بەرزو کۆشك و مزگەوت.

ئەگەر مردن نەبووایە هەرگیز شا عەباسـی یەکـەم لەبەرچـاوان ون نـەدەبوو، چـونکە ئـەو بەتەواوی جێگەی خۆی لەنێو دڵی خانەوادەی سـەفەوییدا کردبۆوە. لەبەر پارێزکـاری تونـدو بەردەوامی لەجیاتی ئەوەی رایان بێنێ لەسـەر هونەرەکانی جەنگ و بـەڕێوەبردن فەرمانیـدا کوڕەکانی بکوژن و چاویان بکوێڵن و لەگەڵ ئافرەتان و نێرەموکاندا بەندیان بکەن. ئـەوانیش هەر لەسـەرەتای تەمەنیانەوە هەموو کاتی خۆیـان لەمـەی خواردنـەوەو رابواردنـدا بەسـەر دەبرد.

بەمشێوەیە چەند پاشایەکی لاواز و بێ توانا بوون بەخاوەنی عەرشی سـەفەویی کە ئەوانیش سەفی شا و شا عەباسی دووەم و سلێمان شا و شا سوڵتان حوسێن، لەسەردەمی ئەوانیشـدا پلەوپایە کارگێڕییە بەرزەکان وەك کالاکـانی نێـو بـازاڕ سـەوداو مامەڵـەیان پـێ دەکـراو

بەمیراتگرییش کوڕ لەباوکییەوە بۆی دەمایەوە، لەلایەکی دیکەوە مووچەی ئەفسەرەکان بەهۆی نالەباری بودجە و دەسبەسەرداگرتنی ئەنجوومەنی دارایی بۆ (بیت المال) و حاکمەکان و بەڵێندەرەکانی باج و سەرانەکان هەمیشە خەریکی گەندەڵی بوون و زۆربەی ئەو پارەوپووڵانەی لەم بوارانەدا دەستیان دەکەوت دەچوونە گیرفانە تایبەتییەکان و تەنها سێ یەکی ئەو پارانە دەگەیشتنە گەنجینەی دەوڵەت.

بەهۆی ئەمانەشەوە یەکێتی ریزی سوپاکەیان کە ستووندەی دەوڵەت بوو شڵۆقی تێکەوت و، لەولاشەوە عوسمانییەکان بە سەرۆکایەتی سوڵتان موردای چوارەم هێرشیان هێنایە سەر بەغداو دەستیان بەسەرداگرت، هەروەها هۆزەکانی ئۆزبەکیش سەرلەنوێ دەستیان کردەوە بەپەلاماردان و خۆراسانیان داگیرکرد، بەو هۆیانەوە باری سیاسیی لەولاتی پشت رووبار رووی لەلێژی کرد و ئەنجام لێکهەڵوەشانەوەی لێکەوتەوە، هەروەها شازادە عومانیش توانی مەسقەت لەژێر دەسەڵاتی پورتوگالیەکان دەربهێنێت و بەردەوام هێرش و پەلاماری دەکردە سەر بەندر و کەناراوەکانی ئێرانیی لەکەنداوی عەرەبیدا.

ئێرانیش لەم کاتوساتانەدا خۆی ئامادە دەکرد بۆ رووبەڕووبوونەوەیەکی گرنگ کەمەترسی زۆری خستبووە سەریان، ئا لەو کاتەی شا سوڵتان حوسێن کەناوبانگی بەدڵسۆزیی دەرکردبوو ناوەندو پلەو پایە گرنگەکانی دەوڵەتی دەبەخشیە پیاوانی ئایینی و خەساوەکان، ئەوانەش بێگومان لەتایبەتمەندیەکانی جەنگاوەران بوون، پاشان دوو نێردراوی رووسی گەیشتنە ئەسفەهان و رووسەکان خۆیان ئامادەکرد بۆ هێرش و پەلامارداني ولات. ئەفغانیە سونیەکانیش لەلایەن خۆیانەوە شۆڕشیان لەدژی دەسەڵاتی سەفەویی لەقەندەهار راگەیاند و ئەم کاردش پشێوی و ئاڵۆزیەکی زۆری لەئێراندا لێ کەوتەوە.

ئاشکرایە کە مێژووی سەفەوییەکان پڕیەتی لە ململانێی توندو بێبەزەییانەی نێو ئەندامانی خانەوادەکەیان و کار گەیشتە ئەوەی کوڕ و براو ئەوەو خزمەکان بەئاسانی بکوژرێن و لەناوبرێن و ئەم کارەشیان لەزۆربەی سەردەم و قۆناغەکانیاندا هەر بەردەوامبووە، ئەم دیاردەیش مۆرکێکی بەرچاوی ئەو سەدەیەبوو و تەنانەت لەدەوڵەتی عوسمانی و مەگۆلیش لەهیندستاندا بوونی هەبوو. لەهەندێك سەرچاوەی تایبەت بەم مێژووە ئەوە بەرچاو دەکەوێ کەوا پاشا سەفەوییەکان کارو کردەوەی ئەوتۆیان ئەنجامداوە هەرگیز لەگەڵ بنەماکانی

ئایینی ئیسلام ناگونجێن، کاتێکیش باسیان لێوە کراوە هیچ لێدوانێکیان لەسەر نەداوە و وەکو خۆی بەجێیان هێشتووە.

ئەو لێکۆڵینەوانەی بەزمانی عەرەبی دەربارەی مێژووی سەفەوییەکان هەن ژمارەیان زۆر کەمە، بۆیە پەرتووکخانەی عەرەب پێویستی بە خوێندنەوەیەکی زانستیانەی بەرفراوان و گشتگیر هەیە تا بەهۆیەوە چارەسەری لایەنەکانی مێژووی ئەم خانەوادەیە بکات، چونکە رووداوەکانی نێو ئەم مێژووە پەیوەندی بە باری ئێستاو پێشکەوتنە سیاسیەکانی هەیە، هەروەها بۆ ئەوەی نەوەکانمان ئاگاداری تەواوی گرنگیی مێژووی ئیسلام بن و، چونکە ئێستاشی لەگەڵدا بێت بەشێوەیەکی گشتیی کاریگەری بەسەر رەوتی موسوڵمانانەوە هەیە.

لەم لێکۆڵینەوەیەمدا پشتم بە چەندین جۆر سەرچاوە بەستووە، کە خوێنەر دەتوانێ دەستیان بخا.

بەڵام بۆ لایەنی سازکردنی بابەتەکان، وام بەچاکزانی دابەشی سەر هەشت بەشیان بکەم:

- لەبەشی یەکەمدا باسی لایەنی سیاسی ئێرانم کردووە بەر لەدروستبوونی دەوڵەتی سەفەویی، کەلەسەر ئەو خاکەدا زۆرێك لەولاتانی ئەوکات بەدرێژایی مێژوو جەنگ و کێشەیان لەسەرکردووە، دواییەکانیشیان دەوڵەتەکانی تەیمووری و قەرە قوینلوو و ئالاق قوینلوو بوون، بەهۆی ئەمانەشەوە ولاتەکە بەشبەش کرا و دووچاری چەندین کاری وێرانکاری و خاپوورکردنەوەبوو، بۆیە هەمیشە ئێرانیەکان بەئومێدی ئەوەبوون کەسێك پەیدابێ لەم نەهامەتییەیان رزگاربکات و ولاتەکەیان یەکبخاتەوە.

- لەبەشی دووەمیشدا تیشکم خستۆتەسەر سەرهەڵدان و سەرفرازی خانەوادەی سەفەویی. ئەم خانەوادەیە لەئەردەبیلی ئازەربێجان سەریان هەڵداو ئەوان سەر بەخانەوادەی شێخ سەفیەدین ئیسحاقن کەیەکێك بوو لەسۆفیەکانی مەزەبی ئیمام شافعی و شێخەکانیشیان تایبەتمەندیان لە رێنیشاندان و وتارخوێنیی ئایینی وەرگرتبوو. بەڵام بەهۆی ئەو بارە سیاسی و ئایینیەی باڵی بەسەر ولاتدا کێشابوو ئەم خانەوادەیە لەسەر دەستی یەکێك لەشێخەکانیان کەئەویش شێخ جونێد بوو هەڵگەڕانەوەو هاتنە سەر مەزەبی شیعی دوازەمەزەبیی. ئەم خانەوادەیەش بەسەرشانی

هۆزە تورکمانــەکانی نێــو دۆڵــەکانی ئەنادۆڵــەوە گەشەیانـــەند و ســەریان هەڵــداو ناوبانگیان دەرکرد.

- هەروەها بەشــی ســێیەمم بــۆ لێکۆڵینــەوە لەدامەزرێنــەری دەوڵــەتی ســەفەوی شــا ئیســماعیلی یەکــەم تــەرخانکردو تیایــدا ئــەو هەوڵانــەم روونکــردەوە کــەدابووی بــۆ دامەزراندن و فراوانکردنی دەوڵەتەکەی، لەلایەکی دیکــەش باســی ئــەو پەیوەندیانــەم کردووە لەگەڵ دراوسێکانی وەك: ئۆزبەکەکان لەلای خۆرەڵات و عوسمانییــەکان لــەلای خۆراوا کەبەوە ناسرابوو بەهۆی مەزهەبایەتییەوە دوژمنایــەتی دەکــردن و هــەردەم شــا لەهەوڵی فراوانکردنی وڵاتەکەیدابوو. لەلایەکی دیکــەوە پەیوەندییــەکانی شــا لەگــەڵ ئەوروپییەکاندا تــەنها لەچوارچێوەی ئــەوەدابوو کەئەوروپییــەکان قایــل بکــات لــەدژی دوژمنەکانی یارمەتی بدەن.

- بەشــی چوارەمیشــی لیســتێکی لــەخۆگرتووە و پێکهــاتووە لــەرووداوەکانی مێــژووی ســەفەویی ئــەویش لەســەردەمی ســێ کەســایەتی کەیــەك لــەدوای یــەك حــوکمی دەوڵەتەکەیان بەدەستەوە گرتووە: تەهماسبی یەکەم و ئیســماعیلی دووەم و محەمــەدی خودابەندە. شــایانی باســە لەســەردەمی ئەوانــدا پشــێویەکی سیاســی زۆر بــەرفراوان لەمێــژووی ســەفەوییەکاندا دروســتبوو، ئــەویش بــەهۆی ئــەو ململانێیانــەی بــۆ گرتنەدەستی دەسەڵات هاتنــە ئــاراوەو، لەپێناویشــیدا هــەوڵی لــەناوبردنی ســەرجەم رکابەرەکانیان لەخانەوادەی دەسەڵاتدار دەدا. لەراســتیشدا ئەو پاشایانە شێوازی ئاسایی خۆیان، ئەوەی کەدامەزرێنەرەکەیان داینابوو دەگرتە بەر بۆ ســازدانی پەیوەندیــەکانیان لەگەڵ دراوسێ موسوڵمانە سونیەکان و ئەوروپییەکان.

- لەبەشی پێنجەمیشدا پەردەم لەسەر بــاری نــاوخۆی دەوڵــەتی ســەفەویی لەســەردەمی دەسەڵاتدارێتی شــا عەباســی یەکــەم لــەئارادابوو لاداوەو، ئــەویش تایبــەت بــوو بــە لەناوبردن و دامرکانەوەی ئەو بزووتنەوە شۆڕشگێڕیانەی لەدژی دەســەڵاتەکەیدا بــەرپا دەکران، بێگومان ئەو دەوڵەتەش گــەورەترین دەوڵــەتی ناوچــەکەبوو لــەرووی دەزگــای سەربازی و بواری بیناســازی مەدەنی. کەچی ئەو شایە بەوە ناوبــانگی دەرکردبــوو کــە لەرووی مەزهەبییەوە سەرســەخت و زۆردارەو جــاری واش هــەبووە لــەپێناو نەهێشتنی

دەسەلاتی دەوروبەرەکەی زۆربەی خەڵکی نزیکی خۆی لەخانەوادەی سەفەوییەکان کوشتووە یا چاوی دەرهێناون، تا کەس نەتوانێ رکابەریی بکات. بەمەش توانی خانەوادەکەی لەپیاوی بەتوانا دامالێ؛ ئەوانەی کەتوانای بەڕێوەبردنی دەسەلاتیان هەیەو بۆیان هەیە لەدوارۆژدا ببنە جێنشین.

- هەروەها لەبەشی شەشەمدا تیشکم خستۆتە سەر ئاستی پەیوەندیەکانی دەرەوە لەسەردەمی شا عەباسی یەکەم، ئەویش لەبواری پەیوەندیەکانی لەگەڵ جیهانی ئیسلامی و ئۆزبەکەکان و عوسمانییەکان و مەگۆلەکانی هیندستان کە بەکەللەرەقی و دوژمنکاری ئاشکرا ناوبانگیان دەرکردبوو. ئەوەبوو شا لەم ململانێیەی لەگەڵ جیهانی ئیسلامیدا بەسەرکەوتوویی هاتە دەرەوە، کەتوانی دەستبگرێ بەسەر خۆراسان و چەند بەشێکی خاکی ئەفغانستان و قەندەهار و ئازەربێجان و عێراق و دیاربەکر، هەروەها چەند بەشێکیش لەکەنداوی عەرەبی وەك دورگەی هورمز و بەحرەین. جگە لەمانەش ئارەزووی دوژمنکارانەی بەرامبەر عوسمانییەکان و دڵنەوایی کردنی دۆستەکانی لەئەوروپا پاڵی پێوەنا کاروکردەوەی ئەوتۆ ئەنجام بدات کەبەتەواوی دژی بەرنامەکانی ئایینی ئیسلام بوون، وەك بەشداری پێکردنی گاورەکان لەجەژنەکانی موسڵمانان و خواردنەوەی مەی تەنانەت لەمانگی رەمەزانیشدا، هەروەها دروستکردنی کڵێسا.

- لەبەشی حەوتەمیشدا باسی پەیوەندیەکانی دەرەوەی شا عەباسی یەکەمم کردووە لەگەڵ جیهانی ئەوروپی، لەوانەیە ئەو کرانەوەیەی بەرامبەر بە وڵاتانی ئەوروپاو ئیسپانیا و پورتوگال و ئینگلتەراو هۆڵەنداو کۆمپانیای ئینگلیزی خۆرهەلاتی هیندستان لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجە دوولایەنەکان سەرنجراکێشبێ. وەك هاوپەیمانیی سیاسی لەگەڵ ئەوروپیەکان لەدژی دەوڵەتی عوسمانی و ئاڵوگۆڕی بازرگانی. لەراستیشدا هاوپەیمانێتیە سیاسیەکە سەری نەگرت، چونکە ئەوروپیەکان تەنها چاویان لەوەبوو سوود لەبازرگانیەکانی حەریری ئێرانی وەربگرن، ئەویش لەبەرئەوەی پێویستی زۆریان پێی هەبوو، لەلایەکی دیکەش بۆ ساغکردنەوەی کاڵا خوریەکانیان لەبازارەکانی ئێراندا. بەکردەنیش شا زۆر بەپەرۆشەوەبوو بۆ هاوپەیمانێتیی بەهەرنرخێکبێ لەگەڵ ئەوروپیەکاندا سازیبدا، بەلام رێککەوتنە بازرگانیەکانی نێوانیان وادەهاتە بەرچاو

کەلەنێوان دوو دەوڵەتی وابن یەکێکیان بەهێز و ئەویدیکەشیان لاوازبێ. لەهەمان کاتیشدا ناوچەی کەنداوی عەرەبیشی خستەی نێو بازنەی ململانێی وڵاتە داگیرکەرەکانی جیهان، ئەوانەی هەمیشە لەپێناو داگیرکردنی جیهان و بەتاڵانبردنی سەروسامانەکەی لەکێشەدابوون، کەچی ئێران خودی خۆشی دووچاری ئەو تاڵان و بڕۆیەی داگیرکارەکان هات.

- لەبەشی هەشتەمیدا باسی لێکترازان و لەناوچوونی دەوڵەتی سەفەوییم کردووە کە هەموو بنەماکانی مان و بوونی خۆی و بەردەوامیی بەهۆی کەڵەکە بوونی هەڵەو زیادڕەویەکان و هەڵسوکەوتە نامەسئولانەکانیان لەدەستدابوو کەبەدرێژایی ماوەی حوکمڕانی خانەوادەکەیان بەدەستیان هێنابوو. ئەوەبوو ئەفغانەکان لەلای قەندەهارەوە بەرەو خۆراسان پێشڕەویان کردو داگیریان کردو چوونە ناو ئێرانەوە. لەئەفغانستانیشدا سێ کەسایەتی سەریان هەڵدا و بەدەستیی ئەوان سەفەوییەکان دەسەڵاتیان بەکۆتاهات: شازادە ئەویس و کوڕەکەی شازادە مەحمود و شازادە ئەشرەف و، پاشان نادرشا ئەفشاری کە دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەفشاریە لەدوای رووخانی دەوڵەتی سەفەویی دەوڵەتەکەی خۆی دامەزراند.

منیش دڵنیام لەوەی کەوا خوێنەر خۆشیی و سوودو قازانجێکی زۆر لەم لێکۆڵینەوەیە دەبینێ، هەروەها بەتەواویش هەست بەوە دەکات کەچۆن بابەتییانە باس لە رووداوەکان کراو.

**داواکارم لەخودای میهرەبان**

**کەخوێنەرانی بەڕێزی موسوڵمان سوود لەم هەوڵەم ببین**

**دانەر**

# بەشی یەکەم

# باری سیاسی ئێران [1] پێش سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەویی

## سەرەتایەک:

بەر لەوەی دەست بەلێکۆڵینەوەی مێژووی سەفەوییەکان بکەین، پێویستە کورتەیەک لەبارەی سروشت و سیاسەتی ئەو وڵاتە بزانین، تا بتوانین دەرك بەهەموو زانیاریەکان بەر لەدامەزراندنی دەوڵەتی سەفەویی بکەین. لەراستیدا ئەو رەگ و ریشاڵانەی هۆکاری سەرەکی بوون بۆ بزووتنەوەی پێشکەوتنی مێژوویی، بریتیی بوو لە رەخسانی بوار بۆ سەفەوییەکان تا دەوڵەتێك بۆخۆیان سازبکەن و لەسەر بەرژەوەندیی هاوسێکانیشیان سنوری دەسەڵاتی خۆیان دەوڵەمەندو فراوان بکات.

## باری سروشتی:

لەلای خۆرهەڵاتەوە ئێران و پاشان عیراق دێت، لەلای خۆرهەڵاتیشەوە کۆتاییەکەی بە هەرێمی خۆرهەڵاتی خواروی کۆن دێت، کەئەویش کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەمێژوو و شارستانیەتیەکەیدا، چونکە دەکەوێتە سەر رێگای نێوان خۆرهەڵاتی خواروو و هەرێمی دەریای سپی ناوەڕاست.

دەوڵەتی سەفەویی لەئێران پێکهاتبوو لە ئێران و ئەفغانستان و هەرێمی بلوجستان، لەرووی جوگرافیای سروشتیەوە، بەرزاییەکانی ئێران لە ئەرمینیا لەلای خۆراواو بامیر لەلای خۆرهەڵات دەست پێدەکات و بەرەو ئێران هەڵدەکشێ.

---

[1] -وشەی ئێران لەناوی نەتەوە ئاریەکانەوە سازبووە کەلەمێژووی کۆندا بەرەو ئەوێ کۆچیان کردووە و لە ئاڤێستاشدا بە وشەی ئایریانا ناوی هاتووە واتە نیشتمانی ئاریەکان؛ ئەم ناوەش لەسەردەمی ئیسلامدا بەکار نەهاتووە، بەڵکو ناوی فارس بۆ ئێرانی کۆن بەکارهاتووە.

ئەویش بەگشتی شێوەیەکی سێگۆشەیی دروستدەکات کەلەپێدەشتە نزمەکانی نێوان کەنداوی عەرەبی لەخواروو و دەریای قەزوین و دەشتی تورکمانەکان لەباکور پێکدێت و هەروەها چیاکانی ئەو ناوچانەش زاڵە بەسەریداو زنجیرەیەك چیای پێدا تێدەپەڕێت کەتێیدا چەندین ڕێڕەو هەن کەلێیانەوە دەچنە ناو ئێران و، لەناوەڕاستیشدا نزمدەبێتەوە:

- چیای زاگرۆس لەخۆراواوە بەشێوەیەکی هاوتەریبی لەباکوری خۆراواوە بەرەو خوارووی خۆرەلآت درێژ دەبێتەوەو، چەندین شیو و دۆڵی گەورە لێکیان جیادەکاتەوە.

- چیای ئەلبرز لەباکور، دەڕوانێتە سەر کەنارەکانی خوارووی دەریای قەزوین و بەلای خۆرەلآتیشەوە هەڵدەکشێ تادەگاتە بەرزاییەکانی ئالآداغ کەئەویش لەباکووردا بەچیای کوبیت دەگا، لەلای خۆرەلآتیشەوە بەردەوام هەڵدەکشێ تا دەگاتە بەرزاییەکانی خاکی ئەفغانستان و زنجیرە چیای هیندۆکش کەئەویش دەڕوانێتە سەر پێدەشتەکانی تورکستان، لەلای خۆراواشەوە بەرەو ئازەربێجان هەڵدەکشێ لەوێ کۆتایی پێدێ و لەناوەڕاستی ئەو ناوچەیەشدا دەریاچەی سوێراوی ئورمیە هەیە. لەوانەیە قەرەباڵغترین ناوچە بێ لەئێران چونکە لەلای باکوری خۆراواو باکورو باکوری خۆرەلآتەوە خەڵك بەئاسانی دەتوانن بیگەنێ و هیچ کارگەریەکی گەورەشی لەمێژووی ولآتدا نییە.

- چیاکانی خۆراسان لەخۆرەلآت، کە بەرزیەکەیان کەمە و تێپەڕبوون تیایاندا ئاسانە، بەدەروازەی دووەم دادەنرێ لەچوونە ناوەوەی ئێران.

- چیای مەکران لەخوارووە، دەڕوانێتە سەر دەشتەکانی عیراق و کەنداوی عەرەبی.

بەشی ناوەڕاستی خاکەکەشی پێکهاتووە لەبیابان، ئەویش دابەشی دوو دەکرێ:

- یەکەم: باکور، پێکهاتووە لەنشێوە قوڕاویە خوێاوکەکان و ژیانی تێدا نییە.

- دووەم: باشور، پێکهاتووە لەناوچەیەکی وشك، ئەویش ژیانی تێدا نییە.

ئاشکراشە هاتووچۆی ئێرانییەکان لەسەدە کۆنەکانەوە هەر لەدەوروبەری پێدەشت و ئەو دۆڵانەدا بووە کە کۆمەڵێك بەرزایی لەدەرەوە دەوری داون.

هەندێك پێدەشتی وەك ئەوانەی خوزستان لەخوارووی خۆراوا لەدەرەوە بەرزاییەكان دەوریان داون و لەپێدەشتەكانی عیراقەوە هەڵدەكشێن و لەكۆنیشدا ئەوێ بارەگای مەدەنیەتی كۆن بووەو لەپێدەشتەكانی باكوردا جێگیربوو تادەگاتە ئەو چیایانەی كە دەڕواننە سەر دەریای قەزوین.

پێدەشتەكانی ناوخۆی ئێرانیش تەنها كاریگەرییەكی لاوەكیان هەبووە لەدروستبوونی مێژووی ئێران، هەمیشە دانیشتوانەكە لەهەوڵی پەیداكردنی ئاوی سازگاربوون چونكە لەو ناوچەیەدا ئاو زۆر كەم بوو. لەلایەكی دیكەوە ویلایەتە كۆنەكانی ئێران و پایتەختەكانیان بەردەوام لەگەڵ بیابانەكان بەدرێژایی هەردوو ئەو ڕێگا سەرەكییەی كە دوو زنجیرە چیا دەوری داون ئەوانیش چیای ئەلبرز لەباكور و مەكران لەخواروو بوون. ئەمەش كاریگەریەكی زۆری هەبوو لەسەر دروستكردنی شاری دامغان و مەشهەد و ئیدیكەش، كە لەسەر شێوەی كەوانێك بوو بەدەوری بیابانە خوێاویەكە.

لەمەوە بۆمان روون دەبێتەوە كەوا بەرزاییەكانی ئێران لەرووی سروشتیەوە دابەش دەبێ بۆ چەند ناوچەیەكی نایەكسان كەبەهیچ شێوەیەك ناتوانرێ یەكبخرێنەوە، لەهەمان كاتیشدا بەرگری لێكردنی كارێكی ئاسانە، ئەوەبوو چەند نەتەوەیەك بەدرێژایی مێژووی خۆیان توانیان یەكرێزیەكی پتەو لەنێوانیاندا سازبكەن و جێپەنجەو شوێنەواری دیاریشیان تێدا جێهێشتووە، لەوانە سەفەوییەكانی بوون لەچەرخی نوێدا.

## باری سیاسی:

دەسپێك: ئێران لەدرێژایی مێژووی خۆیدا رووبەرووی چەندین كۆچڕەوی گەورە بۆتەوە، لەوانە كۆچی ئاریەكان-هیندۆئەوروپیەكان-، تێیدا نیشتەجێبوون و شارو لادێشیان تێدا دروستكرد، جگە لەمەش ئیمپراتۆریەتی بەناوبانگیشیان تێدا دامەزراند، وەك: میدیەكان، پارسیەكان، ساسانیەكان و،،، تد.

لەمێژووی ئێرانیشدا چەند ناوێك پرشنگداربوون وەك كۆرش كەدامەزرێنەری گەورەترین ئیمپراتۆریەت بوو لەخۆرهەڵات لە شەش سەد ساڵ پێش زاییندا، پاشان قەمبیز كەئیمپراتۆریەتەكەی تاكو وڵاتی میسر هەڵكشاند، ئینجا دارا هات و وڵاتی یۆنانی

داگیرکرد، لەدواییشدا زەردەشت ئایینی مەجوسی دامەزراند و ڕێساکانیشی بریتیی بوون لە بنچینەکانی ململانێی ئەزەلی نێوان چاکەو خراپە.

ئێرانیش هەروەکو ناوچەکانی دیکەی خۆرەڵاتی ناوین دووچاری داگیرکاری ئەسکەندەری مەکدۆنی هاتەوە، ئەویش لەدوای مردنی خۆی ئیمپراتۆریەتەکەی لەنێوان سەرکردەکاندا دابەشکرا و پاشان دەوڵەتی سەلجوقی لەساڵی ٣١٠ پێش زایین دەمەزرا، ئەم دەوڵەتەش لەدوای مردنی شا ئەنتیخۆسی سێیەم لەخۆراوای ئێران لەساڵی ١٨٧ی پێش زایین لەناوچوو، دەوڵەتی پارسی ئاگرپەرست (مەجوسی) دامەزرا، بەڵام دەوڵەتی ساسانی دوایین دەوڵەت بوو کەبەر لەهاتنی ئیسلام دامەزرابوو و موسوڵمانەکان لەناویان برد. ئایینی ئیسلام زۆر بەخێرایی لەئێراندا بڵاوبووەوە و لەسەردەمی عەباسیەکاندا شارستانیەتێکی بەرچاوی تێدا دامەزراند.

بەهۆی لاوازی خەلیفەکانی عەباسی کەلە سەدەی سێی کۆچییەوە بەروونی بەرچاوکەوت، دەوڵەتی عەباسی دووچاری لێکترازانی زۆر توند بووەوە، ئینجا دەوڵەتە جیاخوازەکانی وەك دەوڵەتی تاهیریی و سەفاریی و سامانیی و بویهیی و سەلجوقیەکان دامەزران، بێگومان ئەمانە بەر لەپەلامارەکانی مەگۆل بوو لەسەدەی حەوتەمی کۆچی (سیانزەهەمی زایینی) و، ئینجا کەوتە ژێر چەپۆکی بێبەزەییانە و دوژمنکارانەیان کە ئەوان بتپەرستبوون و دوژمنی سەرسەختی موسوڵمانان و ئیسلام بوون، پاشان ئەوانە بوون بەموسوڵمان، ئینجا وردە وردە ئێرانیەکان جێپێی خۆیان لەژێر حوکمی ئێلخانەکانی مەگۆلیدا بۆخۆیان کردەوە.

کاتێکیش ئێلخانیەکان لاوازبوون وڵات دووچاری پەلامارێکی توندی مەگۆلە تورکەکان بەسەرکردایەتی تەیمورلەنگ بووەوە و لەساڵی (١٣٦٩ز) دەستی بەسەرداگرت، ئەو دەوڵەتەی دروستی کرد پێکهاتبوو لەزۆرینەی ئەو تورکانەی سەر بە شارستانیەتی ئێران بوون، بەڵام زۆری نەخایاند لەدوای مردی تەیموورلەنگ ئەو دەوڵەتانە بەخێرایی لێکترازان و باری سیاسی ئێران بەرەو خراپتر چوو:

- ململانێی خانەوادەیی لەنێوان جێنشینەکان، دووبەرەکی و پشێوی باڵی بەسەر وڵاتدا کێشا.

- ململانێی نێوان هۆزە تورکمانەکان بەتایبەتی هەردوو هۆزی قەرە قوینلو و ئـالاق قوینلو.
- هێزی ئۆزبەکەکان لە ناوچـەکانی پشـت رووبـار[٢] چـڕدەبێتەوە، لەوێشـەوە بـەرەو خۆراوا هەڵکشان.

## هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەتی تەیمووریی:

ئیمپراتۆریەتەکەی تەیموورلەنگ زۆر فراوانبوو و لەدوای مردنی خۆی بـەجێی هێشـت، بەلاّم ئەم بەرفراوانییە گەورەیە هیچ کارگەرییەکی نەبوو لەسـەر بـەردەوامیی، چـونکە دووچاری چەندین ململانێی خانەوادەیی بـووەوە، بەمـەش هێـز و یـەکێتی ریزەکـانی لەدەستدا و تەنها ١٥٠ ساڵ مایەوە (١٤٠٥-١٥٠٧ک)، بەر لەمردنیش تەیموورلەنگ کوڕو نـەوەکانی کردبـووە بەرپرسـی ویلایەتـە جۆربـەجۆرەکان و هـەر یـەکێك لـەوان هەرێمێکی لەبەردەستدابوو هـەوڵی دەدا لەسـەر بەرژەوەنـدی ئـەوانی دیکـە موڵـك و سامانەکی زیاد بکات.

کاتێکیش تەیموورلـەنگ مـرد مـیران شـا حـاکمی ئازەربێجـان و عـیراق و دوورگـەی فوراتیەبوو، بەلاّم شاروخ حاکمی خۆراسان و هەرات و پیرمحەمەدی کوڕی جیهـانگیریش حاکمی غەزنە و باپیریشی کردی بەجێنشینی خـۆی، ئۆلـوغ بـەگی کـوری شـاروخیش حاکمی تورکستان و پشت رووبار و، ئیبراهیم سوڵتانی براشی حاکمی بەلخ و لورستان و فارس بوو. لەئەنجامی ئەو شەڕو ئاشووبانەی لەنێوانیاندا هەڵگیرسا میراتەکە هەمووی لەنێوان میران شاو شاروخ گیریخوارد، ئەوەبوو یەکەمیان لەگەڵ کوڕەکانی بەکرو عومەر شـێخ عـەلی و ئێرانـی خـۆراواو عـیراق و دوورگـەی فوراتییـەو ئـەرران و کـەرەج و ئـەرمینیای بەرکـەوت و شـاروخیش خۆراسـان و هـەرات و پشـت رووبـاری کەوتـە ژێردەست.

بـەگوێرەی وەسـیەتنامەکەی تەیموورلـەنگ پیرمحەمـەد حـاکمی شـەرعی بـوو، بـەلاّم میرەکانی شاری ئۆترار میرزا خەلیلی کوڕی میران شایان هەڵبژارد بۆ حوکمڕانی ولاّتـی

[٢] -مەبەسـت ئەو ولاّتەیە کەدەکەوێتە پشت رووباری جیحۆن لەخۆراسـان.

پشت رووبارەکان و تورکستان، لە (٦ئازار ١٤٠٥ز) لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، هەمووشیان وایان بەبیردا دەهات کە لەسەر حسابی چین ولاتەکەیان فراوان دەکات و دەوڵەمەندیان دەکات، کەئەمەش پرۆژەی تەیموورلەنگ بوو، بەلاّم ئەو هەرگیز شایانی ئەو لێپرسراوێتییە نەبوو کەخستبوویانە سەرشانی.

لەراستیشدا میرزا محەمەد تووشی چەندین کێشەو گرفت هات، چەندێك لەمیرەکان لەبەر نالەباری هەڵسوکەوتی لەژێر فەرمانی هاتنەدەر، لەلایەکی دیکەشەوە فشاری زۆری لەلایەن شاروخی مامیەوە بۆ هات بەمەبەستی لەدەست دەرهێنانی سامان و دەسکەوتەکانی ولاّتی پشت رووبارە، چونکە لەدوای مردنی تەیموورلەنگ ئەو دەستی بەسەرداگرتبوو، بەلاّم توانی مامی بەوە قایل بکات کەبەندە فەرمانیەتی و بەشێکی لە گەنجینەکانی تەیموورلەنگیشی دایە و پاشان کردی بەحاکمی ولاّتی پشت رووبار و گەڕایەوە بۆ خۆراسان، هەروەها لەلایەن پیرمحەمەدیشەوە فشاری بۆ هات کەئەویش چاوی تەماعی بڕیبووە تەختی پاشایەتی و هەرچەندێکیش هەوڵیدا بۆ لەناوبردنی بەلاّم بێسوود بوو و هەوڵەکانی سەریان نەگرت. کاتێکیش خەریکی دروسکردنی سوپا بوو بۆ رووبەرووبوونەوەی کەچی لە (١٤٠٦ز) بەدەستی یەکێك لەسەرکردەکانی خۆی تیرۆرکرا.

پاشان لەلایەن یەکێك لەشازادەکانەوە میرزا خەلیل لادراو خرایە زیندانەوە، لەولاشەوە حاکمی کەشغەر دەستی بەسەر ولاّتی پشت رووباردا گرت، بۆیە شاروخ ناچاربوو بچێتە ئەوێ و هەوڵبدا بارە شڵەژاوەکە ئارام بکاتەوە، ئەوەبوو میرزا خەلیلی ئازادکردو کردیە حاکی رەیی و فەرمانی پێکرد کەوا دەسبەسەر عیراقدا بگرێت، بەلاّم ئەو هەر لەرەیی بەدەستی یەکێك لەفەرمانبەرەکانی خۆی لە(٤تشرینی یەکەم١٤١١ز) کوژراو شاروخیش ئۆلۆغ بەگی کوڕی لەجێدانا.

بەشی لای خۆراوای ئیمپراتۆریەتی تەیموورلەنگ کەلەژێر فەرمانڕەوای میرانشا بوو دووچاری پشێوی و شڵەژان هات، چونکە میرانشا مێشکی نەخۆش کەوت و هێزی بەڕێوەبردنی کاروبارە گشتیەکانیشی تا دەهات لاوازتر دەبوو، بۆیە هەردوو کوڕەکەی ئەبابەکر و عومەر شێخ هاوکاریان دەکرد لەبەڕێوەبردنی ولاّت، لەبەرئەوەی هی دووەمیان لەرووی کاروبارە گشتیەکانەوە شارەزاتربوو، ئەم توانایە وای لێکرد چاو

بریتە دەسەڵات و براکەشی خستە زیندانی سولتانییەوە، بەڵام میرانشا هەڵات و چووە خۆراسان، کەچی لەشەڕێکدا لەگەڵ قەرەیوسفی سەرۆکی قەرە قوینلوو و لەململانێی بۆ دەسبەسەرداگرتنی ئازەربێجان لە(٢١نیسان١٤٠٨ز) کوژرا، دانیشتوانی تەوریزیش بانگهێشتی ئەبابەکریان کرد کە ئەوکاتە لەزیندان هەڵاتبوو و کردیانە حاکمی خۆیان. ئینجا عومەر شێخ عەلی مامیشی تووڕەبوو و شەڕی لەگەڵدا کردو بریندارینداری کرد و پاشان هەر بەهۆی ئەو برینەوە گیانی لە (ئایار١٤٠٧ز) لەدەستدا و لەهەمان کاتیشدا ئەبوبەکری برای لەگەڵ قەرەیوسفی تورکمانی لەکرمان رووبەروو بووەوەو لەوێش وەدەرنراو شکستی خوارد و لەهەمان ساڵدا ئەویش کوژرا. بەمشێوەیە کۆتایی بەژیانی میرانشا و هەردوو کوڕەکەی ئەبابەکر و عومەر شێخ پاشان وەك باسمان کرد میرزا خەلیل هات.

لەدواییدا شاروخ گیرۆخواردبوو بەدەست یاخیبوونی برازاکانی و دوژمنایەتی قەرەیوسف و کوڕەکانی تا ناچاربوو چۆکی پێدادان. ئینجا بارە سیاسیەکەی لەبەرژەوەندی ئەودابوو و یارمەتیدەری بوو بۆ فراوان کردنی وڵاتەکەی. لەساڵی (٨١٧ك-١٤١٤ز) دەستی گرت بەسەر جەرجان و مازەندەران و هەروەها لەدوای دووساڵ کرمانیشی داگیرکردو لەژێر دەسەڵاتی سولتان ئەویسی کوڕی میر ئەیدیکۆ برلاسی دەرهێنا، بەمشێوەیە بەردەوام لەفراوانکردن یا بەشەڕو کوشتار یاخو بەهاوپەیمانێتی تاکو لە(٨٢٣ك-١٤٢٠ز) توانی دەسبەسەر بەشی خۆرەڵاتی ئیمپراتۆریەتی تەیموورلەنگدا بگرێ کە جگەلە ناوەڕاستی عیراق و ئازەربێجان لەوڵاتی پشت رووبارو جەرجان و سیستان و باشووری ئێران پێکهاتبوو و، لەدواییشدا جێنشینی تەیموورلەنگیشی کوشت.

لەولاشەوە شاروخ لەدژی ویستەکانی قەرەیوسفی تورکمانی و کوڕەکانی وەستا، کە نیازی دروست کردنی ئیمارەتێکیان هەبوو لەئازەربێجان. لەراستیشدا قەرە قوینلووەکان ماوەی چەندین ساڵ هەڕەشەیەکی جدیان بۆ ئیمپراتۆریەتی تەیموورلەنگ سازکردبوو، بۆیە شاروخ هەوڵیدا کێشەکە لەگەڵ قەرەیوسف بەئاشتیانە یەکلابکاتەوە، بەڵام لەمەدا سەرنەکەوت، ئەوکاتە هیچی بەدەستەوە نەما تەنها چارەسەری سەربازی نەبێ. ئەوەبوو سێ هێرشی سەربازیی لە(٨٢٣ك-١٤٢٠ز)و (٨٣٢ك-١٤٢٩ز)و (٨٣٨ك-١٤٣٤ز)

بۆ کردو لەکۆتاییشدا تـوانی هـۆزی قـەرەقوینلۆو ملکـەچ بکـات، جیهانشـای کـوڕی قەرەیوسف هاتە ژێر فەرمانی و کردی بەحاکمی ئازەربێجان، بەڵام ئەسـکەندەری بـرای هەڵات و قەرەیوسفی باوکیشیان لەپەلاماری یەکەمیی شاروخدا کوژرا.

دوای لەناوبردنی قەرەقوینلۆو، شاروخ هیچ هێرشێکی گرنگی دیکەی بۆ هیچ شـوێنێك ئەنجامنـــەدا، رووی لـــەبنیاتنان و ئاوەدانکردنـــەوە کـــرد و هەوڵیـــدا پەیوەندییـــە دۆستایەتیەکانی لەگەڵ دراوسێکاندا بپارێزێت، بەتایبـەتی هینـدسـتان و چین و تبـت، لە(٢٥/زی الحجە ٨٥٠ك-١٣ئازاری١٤٤٧ز) لەدوای ژیانێکی پڕ لەخـەبات و تێکۆشـان لەپێناو گێڕانەوەی یەکێتی ریزەکانی مەملەکەتی بـاوکی و بـەدیهێنانی سـەقامگیریی تێیـداو رزگـارکردنی لـەلێکترازانی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی کەسـاڵانێك بـوو هـەر لەسەردەمی دوای مردنی تەیموورلەنگ پێوەی دەناڵاند، لە رەی کۆچی دوایی کرد. ئـەم پیـاوە بەیـەکێك لەحاکمـە هــەرە لێهاتووەکـانی ئێـران دادەنرێـت. ناوبانگیشـی بەئاینپەروەری و لەخواترسی و دادپەروەری و دەسکراوەیی دەرکردبوو، زانستیشـی زۆر خۆش دەویست، هەمیشە هانی قوتابیانی دەدا کەبخوێنن و فێربن، گرنگی بەهونـەریش دەدا، زۆرێـك لەشـوێنە رووخاوەکـانی سـەردەمی جەنگـەکان سـاز و ئـاوەدانکردەوە، قەڵایەکیشی لەسەر رووباری هەندەوان دروستکرد، داوای لەسەرجەم بریکارەکـانی کـرد لەهەرێمەکانیاندا بینا و باڵەخانە سازبکەن. ئێستاشی لەگەڵدابێ جێ پەنجەی هەرماوە، لەهەمووشیان گرنگتر: قوتابخانەی هەرات و قوتابخانەی مەشـهەدن کەتائێسـتاش نـاوی ئەوانی هەڵگرتووە. شاروخ شاعیرو خۆشنووس بوو، هـەرات لەسـەردەمی ئـەودا بـووە ناوەندێك بۆ کۆکردنەوەی شاعیران و زانایـان و ئـەدیبان و خۆشنووسـان و شـێوەکاران، پەرتوکخانەیـەکی گەورەشـی دامـەزرانـد، لەسـەردەمی ئەویشـدا باشـترین پـەرتووکی مێژوویی فارسی نووسران.

بەڵام دەوڵەتی تەیووری لەدوای مردنی شـاروخ دووچـاری چـەندین کێشـەو ململانێـی خانەوادەیی توندو درێژخایەن بووەوە کەزۆر بەخێرایی هەڵوەشایەوەو کۆتـایی پێهـات. لەراستیدا شاروخ کێشەی جێنشینی خۆی چارەسـەرنەکرد، بـەڵام ئاشـکرابوو ئەوکاتـە کەمحەمەد جوکی کوڕی کەحاکمی بەلەخ بوو لەلا لەهەمووان باشتر بـوو بـۆ خەلافـەت،

بـەڵام ئـەم کـوڕە سـێ سـاڵ بـەر لـەمردنی بـاوکی کۆچـی دوایـی کـرد. کەچـی جەوهەرەشادئاغای هاوسەری شاروخ بەنهێنییەوە پشتیوانی لە عەلائی کوڕی بایستقەری کوڕی شاروخ دەکرد. زانراویشە کەئەم خانمە هەمیشە خـەریکی سیاسـەتی دووفاقـەیی بوو کەچی شاروخ لەکۆتاییەکانی سالأنی حـوکمڕانی گرنگـی زۆری بـە عەبدوڵلـەتیفی کوڕی ئۆلۆغ بەگ دەدا، چونکە بەلایەوە ئـەو خـاوەنی کۆمـەڵێك سـیفاتی سـەرکردەی سەربازی بوو، بۆیە لەگەڵ هەردوو وەزیرەکەی خـۆی غـەیاسـەدین پیرئەحمـەدی خـوافی و خواجە شەمـسـەدینی سەمـنانی ناردییە هەرات و لـە(٨٤٥ك-١٤٤١ز) کردیـە حـاکمی ئەوێ.

ئـەم دوو وەزیـرە لـەپێناو وەدەسـتهێنانی تـەختی پاشـایەتی لـەدوای مردنـی شـاروخ پشتگیرییان لەعەبدوللەتیف کرد، بەڵام جەوهەرشادئاغا هانی هەندێك لەشـازادەکانیدا تا پشتیوانی لەعەلا بکەن کەئەو کاتە حاکمی هەرات بوو بۆ گرتنە دەسـتی دەسـەڵات لەدوای مردنی باپیری، عەبدوللەتیفیشی قایل کرد پلەی سەرۆکی سوپا وەرگرێ. پاشان عەبدوللەتیف نامەیەکی بۆ باوکی ناردو تیایدا باسی ئەو گۆڕانکاریانـەی بـۆ کـرد کـە لەدوای مردنی شـاروخەوە هاتبوونـە ئـاراوە، بەپەلـە خـۆی گەیانـدە خۆراسـان تـاکو کێشەکان بۆ بەرژەوەندی خۆی یەکلابکاتەوە. لەڕووباری جیحۆن پەڕیەوەو دەستی بەسـەر بەلخدا گرت و لەسەمەرقەند مایەوەو، هەوڵەکانی میر ئەبیبەکری کوڕی محەمەدی کوڕی جوکی بۆ دەسبەسەردا گرتنی تەختی پاشـایەتی پوکانـدەوەو، تـاوانی خیانەتکاریشـی دایەپاڵ و هەر لەسەمەرقەندیش کوشتی و لەناوی برد. کاتێکیش عـەلا بەمـەی زانـی عەبدوللەتیفی قۆڵبەست کرد و خـستیە زیندانەوە، بۆیە ئۆلوغ بەگ ناچـاربوو کێشـەکە بەگفتوگۆ چارەسەربکات و لەئەنجامدا بڕیاردرا عەلای هەر بەحاکمی هەرات بمێنێتـەوەو لەبەرانبەریشدا عەبدوللەتیف ئازاد بکرێ و، پاشان ئەویش گەڕایەوە سەمەرقەند.

جارێکی دیکە ململانێی نێـوان ئۆلـوغ بـەگ و عـەلای لـەپێناوی دەسـەڵات دەسـتی پێکردەوەو، سەرکەوتنەکەش بۆ بەرژەوەندی ئۆلـوغ بـەگ بـوو لـە(٨٥٢ك-١٤٤٨ك) و مەشهەدی خسـتە ژێـر دەسـەڵاتی خـۆی و لەهـەمان کاتیشـدا کوڕەکـەی چـووە نـاو هەراتەوەو ئەوێشی داگیرکرد، ئەم بەرفراوان بوونەی دەسـەڵاتیان ڕێگەخۆشـکەربوو بـۆ

هێرشکردنە سەر خۆراسان و عەلای لەلای خۆیەوە بەرەو شیراز هەڵات و پەنای بردە بەر ئەبی قاسمی بابری برایەوە.

ئۆلوغ بەگ لەکاتی حوکمڕانی خۆیدا دووچاری چەند گرفتێـك هاتـەوە کەنەیـدەتوانی خۆیانی لێدەرباز بکات، لەوانە:

- لەدوولایەنەوە دووچاری فشـاری دەرەکـی بـووەوە، لـەلای خۆئـاواوە هـۆزی قـەرە قوینلّوو جێپێی خۆیان لە باکوری خۆرەڵاتی ئێران و خۆرەڵاتی ئـەنادۆڵ قـایم کـرد ئەویش لەدوای ئەو سێ هێرشە سەرنەکەوتووەوە هات کەکاتی خۆی شاروخ لـەدژی ئەوان ئەنجامی دابوو و لەناوەڕاستیشیدا ئیمـارەتێکی بۆخـۆی دامـەزرانـد، پاشـان دەستی کرد بەپەلاماردانی زەویەکانی تەیموورلەنگ. لەلای خۆرەڵاتیشەوە سـەرۆکی ئۆزبەکەکان ئەبوخێر (٨٣١-٨٧٣ك/١٤٣٨-١٤٦٨ز) هێرشی هێنا بۆ سەر وڵاتـی پشت رووبار و گەیشتە دەوروبەری سەمەرقەند و هەمووی سووتاندو گەڕایـەوە بـۆ وڵاتی خۆی.
- لەناوخۆشدا عەبدوللەتیفی کوڕی بەیارمەتی ئەبی قـاسمی بـابر لەسـاڵی (٨٥٣ك-١٤٤٩ز) شۆڕشێکی لەدژی ئۆلوغ بەگ بـەرپاکردو، لەئەنجامـدا شـەڕێکی گـەورە روویدا و ئۆلوغ بەگ لەلایەن کوڕەکەیەوە بەدیل گیرا، ئینجا داوای لەکوڕەکەی کرد ئازادی بکات بۆ ئەوەی حەجی ماڵی خوا بکات، بەڵام لەرێگا لەنزیك سـەمەرقەند لە (١٨رەمەزان/٢٥تشرین)ی هـەمان سـاڵدا کـوژرا، پێشدەچـێ کـەوا کوڕەکـەی دەستی هەبووبێ لەئەنجامدانی ئەم کارە.

بەڵام عەبدوللەتف لەدوای مردنی باوکی تەنها ماوەی شەش مانگ لەحوکمدا مایـەوە، چونکە بە کەللەرقی و بەدرەوشـتی و ناوبـانگی دەرکردبـوو و لەکۆتاییشـدا لـەناوخۆی وڵاتەکـەی بـەهۆی ئـەم کردەوانـەی شۆڕشـێك بـەرپابوو و لـەدەرەوەی سـەمەرقەند لە(٢٦رەبیعی یەکەم ٨٥٤ك- ١٠ئایاری١٤٥٢ز) کوژرا.

لەدوای ئـەویش عەبـدوڵلای کـوڕی سـوڵتانی کـوڕی شـاروخی حـاکمی وڵاتـی فـارس دەسەڵاتی گرتە دەسـت، بـەڵام ئەبوسـەعیدی نـەوەی میرانشـای حـاکمی سـەمەرقەند

ململانێی لەگەڵدا کردو چاوی بڕیبووە خۆراسان و سـەرجەم خـاکی ئێـران، کەچـی لـەو جەنگەدا شکـستی خوارد و بۆ لای ئەبوخێر هـەلاَت و داوای یارمـەتی لێکـرد، ئینجـا لەسالّی ١٤٥١ز دا هێرشی هێنا بۆ سەمەرقەند و دەسـتی بەسـەرداگرت و عەبـدوڵلاَی کوشـت و بـوو بـەحاکمی ئـەوێ، بەمەشـەوە نەوەسـتا بـەلّکو بەیارمـەتی سـەرکردە تەیمووریەکانی هەرات و غەزنە و کابۆلّ وسیستان و خوارزم دەستی کرد بـەفراوانکردنی زەویەکانی و جەوهەر شادئاغای هاوسەری شاروخی لە(٣١تـەموزی١٤٥٧ز)دا کوشـت لەبەر ئەوەی کەوا ڕێگریی لێکرد و لەپاشاندا دەسەلاَتی بەسـەر تـەواوی ولاَتـی پشـت ڕووباردا سەپاند.

لەدوای مردنی جیهانشای حاکمی ئازەربێجان ئەبوسەعید بەرەو خۆراوا مەملەکەتەکەی هەلّکشاند بەمەبەستی ئەوەی دەستی بەسەردا بگرێ، بـەلاَم لەلایـەن ئـوزون حەسـەنی سەرۆکی ئالاق قوینلّووەوە دژایەتی کراو لەنێوانیاندا شەڕ دەستی پێکرد و ئەبو سەعید بەدیل گیرا، پاشان بەدەستی یادگاری کوڕی محەمەدی کـوڕی بایسـنقەر لـە(١٤٦٩ز)دا کوژرا، لەوانەشە کوژرانی جەوهەر شادئاغـای دایەگەورەی بووبێتە هاندانێك بـۆ ئـەوەی ئەم کارە بکات.

لەدوای کوژرانی ئەبی سەعید دەوڵەتی تەیموریەکان لـە پشـت ڕووبـار لەتلـەت بـوو و خاکەکەشـی بەسـەر کوڕەکانیـدا دابەشـکرا. کـوڕە گەورەکـەی کـەناوی ئەحمـەد بـوو سەمەرقەند و دەوروبەری بوخارای بەرکەوت، بەلاَم مـەحمودی کـوڕی دووەم ناوچـەکانی بەزخشان و ئەو زەویانەی دەکەونە نێـوان هینـدۆکوش و چـیاکانی حەسـار لـەخوارووی خۆراوای سەمەرقەند بەرکەوت. پشکی کوڕە بچووکەکەش شێخ عومەر بـریتی بـوو لـە بوخاراو دەورووبەری و لەناویشیاندا فەرغانەبوو و کوڕی چوارەمیش کەناوی ئۆلوغ بـوو کابۆلّ و غەزنەی بەرکەوت.

هـەموو کوڕەکـان ناویانگیـان بەتـەماعکاری دەرکردبـوو و هـەموویان هـەوڵیان دەدا کەلەسەر بەرژەوەندی دراوسێکانیان خاکی خۆیـان فـراوان بکـەن، بۆیـە کوڕەکانیشـیان لەدوای خۆیان هەمان ڕێچکەیان گرتەبـەرو، لـەم پێناوەشـدا بواریـان بـۆ ئۆزبەکـەکان ڕەخساند کەوا دەست لەکاروباری ولاَتەکەیان وەربدەن، ئەوەبوو شەیبانی خـانی ئۆزبـەك

لەساڵی ١٥٠١-١٥٠٢زدا هێرشی هێنایە بۆ سەمەرقەند کە ئەوکاتە لەژێر دەسەڵاتی بابری کوڕی عومەر شێخ بوو، داگیری کردو بەمەش توانی کۆتایی لەوڵاتی پشت رووبارەکان بەدەوڵەتی تەیموورییەکان بهێنێ.

دەوڵەتی تەیموورییەکانیش لەناوخۆدا دووچاری کێشەی زۆر هات و لەدەرەوەش مەترسی تورکمان و ئۆزبەکەکانیان هاتەسەر و لەئەنجامدا کۆتایی پێهێنان. چونکە لەدوای کوژرانی ئەبی سەعید حوسێن بایقەرە بەیارمەتی عەلی شێرنوائی وەزیر دەستی بەسەر تەختی حوکمڕانی تەیموورییەکاندا گرت، بەڵام لەلایەن ئوزون حەسەنی سەرۆکی ئالاق قوینڵو فشارێکی زۆری بۆهات، کەئەویش دەیویست لەسەر حسابی بەرژەوەندییەکانی ئەبی سەعید پەرە بەسەرکەوتنەکانی بدات، بۆیە عیراق و فارس و کرمانی داگیرکرد، ئینجا یادگار محەمەدی کردە میری موڵکی تەیموورییەکان و لەگەڵ سەربازەکانی ئەوانیشدا ناردی بۆ خۆراسان، و رووبەرووی حوسێن بایقەرە بووەوە لە١٥ئەیلولی١٤٦٩زدا دووچاری شکستێکی نادیار بوودوە لە شیناران و ئوزونیش ناچاربوو هێزی دیکەی بۆ بنێرێ. بەئاشکرا دیاربوو کە سەرۆکی تورکمانەکان بوونی میرە تەیموورییەکە بەهەل دەقۆزێتەوە تا بەهۆیەوە هێرش بکاتە سەر خۆراسان و داگیری بکات، پاشان هێرشی بردە سەر هەرات و حوسێن بایقەرەی ناچار کرد کەلێی دەرچێ، لە٨تەمووز١٤٧٠دا یادگار محەمەد هەراتی داگیرکرد و چووە ناویەوە، بەڵام تەنها لەدوای شەش حەوتوو حوسێن بایقەرە توانی هەرات بگێڕێتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆی.

لەدوای داگیرکردنی لەلایەن یادگار محەمەدیش سنووری دەسەڵاتی حوسێن بایقەرە تەسک بووەوەو لەنەمان نزیك کەوتەوە و تەنها خۆراسانی بەدەستەوە مایەوە، بەهیچ شێوەیەکیش لەزەوییەکانی خۆرەڵاتی ئێران هەوڵی فراوانکردنی نەدەداو دڵی تەنها بەهەرات خۆشبوو و هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە کەلەسەر حسابی بەرژەوەندی هاوسێکانی سنووری دەسەڵاتی خۆی فراوان بکات، کەچی لەلایەن ئۆزبەك لەخۆرەڵاتەوە دووچاری فشاری زۆر هات، ئەوانەیش لەدوای ئەوەی وڵاتی پشت رووباریان داگیرکرد بیریان لەوە کردەوە بەرەو خۆراسان هەڵکشێن.

حوسێن بایقەرە لەلایەن کورەکانیەوە لـەناوخۆدا رووبـەرووی بەرهەڵـستکاریی بـووەوە، ئەویش لەئەنجامی ململانێکانی نێوان سەرکردەکانی تەیموورییی لەپێناوی وەدەسـهێنانی دەسەلآت، لەوانیش: ئیبراهیم حوسێن لەبەلخ و بـەدیعی زەمـان حـاکمی ئەسـتەرئاباد، بەلاّم سەردرای ئەوەی ئەم شۆرشەی دامرکاندەوە کەچـی ئەنجامـەکانی هـەموو لـەدژی ویستەکانی ئەو و تەیموورییەکانـدابوون، ئینجـا ئەوکاتـەی بـەرەو هێـرش کردنـە سـەر ئۆزبەکەکان دەچوو لە٤ئایار١٥٠٦ز کۆچی دوایـی کـردو، سـەرباری هـەبوونی فشـاری بەردەوامی ئۆزبەکەکان کورەکانیشی لەناوخۆیاندا ململانێیـان بـۆ دەسـەلآت سـازکرد. خـانی ئۆزبـەکی محەمـەد شـەیبانی لەسـالّی ١٤٥١-١٥١٠زدا هـەراتی داگیرکـردو کورەکانی حوسێن بایقەرەش لێی دەرچوون.

محەمەد زەمـان دوایـین کەسـایەتی تەیمووریـەکان بـوو کـەتوانی تـاکو سـالّی ١٥٢٤ز حوکومرانی بەلەخ بکات و دوای ئەوە ئیسماعیل شای سـەفەویی کوشـتی. لەوکاتـەدا چەند خانەوادەیەك بەرهەلّستکاریی خۆیان بۆ حوکمی تەیمووریەکان لە ئێران راگەیانـد و لەکۆتاییدا چەند حکومـەتێکی بچـووکیان پێکهێنـا لەوانـە: حکومـەتی شـەروان شـا لەشەروان، محەمەد قـەرە لـە ئـەبرەقۆ و حوسـێن کیـای چـەلاوی لەسـیمنان و خـوار و فەیروزکۆه و ئیدیکەش. بەمەش حوکمی تەیمووریەکان لەئێران بەکۆتا هات.

## ململانێی نێوان هۆزەکانی قەرە قوینلوو و ئالاق قوینلووی تورکمان:

لەدوای نەمانی دەسەلآتی ئیلخانەکان لـەئێران لەسـالّی ١٣٣٥-١٣٣٦ز مولکـەکانیان بەسەر خانەوادە مەگۆلیەکاندا دابەشکرا و لەنێویشـیاندا خانـەوادەی جـەلائیری هـەبوو کەلەعیراق جێگیربوو و شێخ حەسەنی گەورە سەرۆکیان بوو و لەبەغداشـدا دەربـارێکی بۆخۆی دروسـکردبوو. لەهەمانکاتیشدا تورکمانـەکان کـاتێ هەلّکشـان بـەرە خـۆراوای ئاسیا بەهۆی هێرشـی مەگۆلەکانـەوە کەلـەخوارزم و دەوروبـەری دەریاچـەی ئـارال و خۆرەلآتی دەریای قەزوینـەوە هـاتبوون سـەریان هەلّدا و لـەباکوری خـۆراواو بـاکوری دورگەی فوراتیە جێگیربوون و، پاشانیش لاوازی ئێلخانەکانی ئێرانیـان بەهەلقۆزتـەوە، ئەویش لەدوای مردنی ئێلخـان ئـەبی سـەعیدی بـەهادوور لەسـالّی ١٣٣٥-١٣٣٦ز، دەستیان کرد بە خولانـەوە بەناوچـەکانی دەورووبـەردا. دوو لـە هـۆزە بەناوبانگـەکانی

تورکمان کە رۆڵی کاریگەریان هەبوو لەبزووتنەوەی سیاسی ناوچەکە بریتی بوون لە:
هۆزی قەرەقوینلووی شیعەمەزەب بەسەرۆکایەتی قەرەیوسفی کوری قەرە محەمەد و ئالاق قوینلووی سوننەمەزەب بەسەرۆکایەتی ئوزون حەسەن.

هۆزی قەرەقوینلوو لەزەویەکانی باکوری دەریاچەی وان لەئەرمینیا نیشتەجێبوون و ئەرغیش کە کەوتبووە باکوری خۆرەڵاتی دەریاچەکە کردیان بەپایتەختی خۆیان، کەچی هۆزی ئالاق قوینلوو لە خۆراوای ئەوان لەدیاربەکر نیشتەجێبوون و ئامەدیان کرد بەپایتەخت.

لەسەرەتای حوکمڕانی، قەرەیوسف دووچاری مەترسیەکی زۆری تەیموورلەنگ بووەوە کەلە خۆراوای ئاسیاوە هاتبوو بۆ لەناوبردنی هێزوتوانای حاکمە ناوخۆییەکان لەوانیش قەرەیوسف و ئەحمەدی جەلائیری حاکمی عیراق، بۆیە هەردووکیان لەپێناو رووبەروو بوونەوەی تەیموورلەنگ هاوپەیمانیان کرد، بەڵام نەیانتوانی ماوەیەکی زۆر لەبەردەم پەلامارەکاندا خۆرابگرن و ناچار بەرەو ئاسیای بچووك رایان کرد و پەنایان بردە بەر بایەزیدی سوڵتانی عوسمانی تا داڵدەیان بدا (١٣٨٩-١٤٠٣ز). تەیموورلەنگ لەساڵی ١٣٩٨زدا عیراقی داگیرکردو پاشان دەستی بەسەر خۆراسان و مازەندەران و کوردستان و ئازەربێجان و شەروان و ئەرمینیا و ئەرزەرۆم و ئەرزنجاندا گرت و دوایی ئەو دوو سەرۆك هۆزە روویان کردە میسر بۆ ئەوەی داوای یارمەتی بکەن، بەڵام شاهەنشا ناسر فەرەجی کوری بەرقوق لەپێناوی ئەوەی پەیوەندیەکانی لەگەڵ تەیموورلەنگ درزی تێنەکەوێ هەردووکیانی زیندانیکرد.

لەدوای مردنی تەیموورلەنگ ناسر هەردووکیانی ئازادکردو قەرەیوسف بەسەرۆکایەتی هەزار شەرکەر رووی کردە ئازەربێجان تاکو داگیری بکات، کەئەوکاتە لەژێر دەسەڵاتی ئەبی بەکر میرزای کوری میرانشابوو (١٣٩٩-١٤١٢ز). لەسەر رێگای خۆشیەوە دەستی بەسەر چەندین قەڵای تەیمووریەکاندا گرت و لەنزیك نەخجەوان تووشی بەرهەڵسکاری هات و سەرکەوت بەسەریانداو شاری تەورێزی لەژێر دەست دەرهێنان و تاگەیشتنەوە جەرجان هەر راویان نان و دووبارە شکستیان پێهێنانەوە، لەوێشدا میرانشای کوری ئەبی بەکر کوژراو قەرەیوسف دەستی بەسەر تەواوی ئازەبێجاندا گرت.

قەرەیوسف چاوی بڕیبووە ئەوەی کەوا عێراق و دیاربەکر بەیەکەوە بلکێنێ، بۆیە لەتشرینی یەکەم ١٤٠٦ز هێرشی کردە سەر قەرە عوسمانی بایەندەری سەرۆکی ئالاق قوینلوو و سەرکەوت بەسەریدا. دیاربەکریشی خستە پاڵ زەویەکانی خۆی، پاشان لەساڵی ١٤١٢زدا لەدوای شەڕێکی خوێناوی و سەخت لەدژی هاوپەیمانەکەی پێشووی ئەحمەدی جەلائیری کەلەشەڕەکەدا کوژرا عێراقیشی خستە پاڵ وڵاتەکەی و محەمەدشای کوڕیشی کردە حاکمی ئەوێ.

قەرەیوسف بەلای باکوردا دەستی بەهەڵکشان و فراوانبوون کردو، هێرشی کردە سەر شەروان و کەرەج و، دەستی بەسەر سوڵتانیە و ساوە و قەزوین و تارمدا گرت و پاشان بەرەو خۆراوا پێشڕەویی کرد تا گەیشتە حەلەب.

ئەم ئارەزووی فرانبوونییە قەرەیوسفی خستە بەردەم ڕووبەڕووبوونەوەی شاروخی حاکمی تەیموریی خۆراسان، هەربەکردەنیش دەورووخولی مولکەکانیدان و ئەویش لەهەڵکشانی زیاتری تورکمانەکان نیگەرانبوو، بۆیە هەوڵیدا قەرەیوسف لەناوبەرێ، بەلام بەهۆی نەخۆشیەوە قەرەیوسف لەساڵی ١٤٢٠ز کۆچی دوایی کرد.

لەدوای ئەویش ئەسکەندەری کوڕی بووە حاکمی وڵات و ئەوکاتە شاروخ بەرەو ئازەربێجان پێشڕەوی دەکردو لەهەمان ساڵیشدا جەنگێکی زۆر سەخت لەنێوانیاندا ڕوویداو لەئەنجامدا شاروخ سەرکەوت و ئەسکەندەریش لەگەڵ جیهانشای برای مەیدانی شەڕیان بەجێهێشت و هەڵاتن، بەمەش سەرکردە تەیمووریەکە چووە ناو وڵاتەکەیان و دوای ئەوەی کاروبارەکەی ڕێکخستەوە گەڕایەوە خۆراسان.

ئەسکەندەر گەڕانەوەی شاروخی بۆ وڵاتەکەی بەهەلزانی، بۆیە هێزەکانی خۆی کۆکردەوەو هێرشی کردە سەر مۆڵگەکانی تەیموریەکان لە ئازەربێجان، دەریکردن و وڵاتەکەی گەڕاندەوە ژێر دەسەلاتی خۆی، پاشان هێرشی کردە سەر شەروان و ئەرران و کوردستان و لەساڵی ١٤٢٩ز سەڵتەنەتێکی سەر بەشاروخ داگیرکردو سەرکردە تەیمووریەکە ناچاربوو جارێکی دیکە بگەڕێتەوە ئازەربێجان بۆ ئەوەی دووبارە ئەسکەندەر تەمێ بکاتەوە و لەسەلماس ڕووبەڕووی یەکبوونەوە، سەرەڕای ئازایەتی و بوێری سەرکردە تورکمانەکە کەچی دووچاری شکستێکی گەورەهات و مەیدانی

جەنگەکەی بەجێهێشت و بەرەو ئەنادۆڵ رایکردو دیسانەوە شاروخ لەدوای سەرکەوتنەکەی گەڕایەوە بۆ خۆراسان.

شاروخ بۆ جاری سێیەم لەساڵی ١٤٣٤-١٤٣٥ز هێرشی بردەوە سەر ئەسکەندەر و دیسانەوە ئازەربێجانی هێنایەوە ژێر رکێفی خۆی. هەر لەو کات و ساتانەشدا بوو کە جیهانشاو هەندێك لەمیرزادەکانی هۆزی قەرەقوینلوو هاتنە پاڵ هێزەکانی تەیموریی، ئەویش لەدوای ئەوەهات کە ئەسکەندەر لەیەکلاکردنەوەی کێشەکان لەدژی شاروخ نشوستی هێناو ناچار بوو مەیدانەکە بەبێ شەڕ چۆڵبکات و بەرەو ئەنادۆڵ رۆیشت و لەوێ داوای داڵدە لەعوسمانییەکان بکات، بەڵام قەرەعوسمانی بایەندەری لەنزیك ئەرزنجان رێگەی پێگرت، کەچی لەو شەڕەدا برینداربوو و لەئەنجامیشدا هەر بەو دەردەوە لە (ئابی١٤٣٥ز) کۆچی دوایی کرد.

ئەسکەندەر بەهۆی ئەو کودەتایەی کەوا برایەکەی بەسەری هێناو بەناچاری چووە پاڵ شاروخ زۆر پەشۆکاو و خەفەتباربوو، جگە لەوەش دووچاری شکست هات و بەناچاری بەرەو نەخجەوان رایکرد، لەوێشدا بەدەستی قوبادی کوڕی لەساڵی ١٤٣٧ز کوژرا.

جیهانشا جێی ئەسکەندەری برای گرتەوەو لەسەردەمی ئەویشدا ئیمارەتی قەرەقوینلوو گەیشتە ئەوپەڕی پێشکەوتن و ئەوکاتەش قەرەقوینلوو سەر بەشاروخ بوو و عیراق و فارس و کرمانیشی خستە سەر، بەڵام مردنی سەرکردە تەیمووریەکە لەساڵی ١٤٤٧ز بووە هۆی گۆڕانی باری سیاسی لەناوچەکەدا، ئەوەبوو جیهانشا سەربەخۆیی خۆی لەتەیمووریەکان راگەیاند و دەستی بەزەویەکانی خۆشیەوە گرت و بەئومێدی ئەوەبوو کەلەسەر حسابی ئەوان دەسەڵات و ناوچەکەی خۆی فراوان بکات، بۆیە بەرەو سوڵتانیە هەڵکشاو قەزوین و ئەسفەهانی داگیرکرد لەساڵی (١٤٥٢ز) و فارس و کرمانی لەساڵی دوای ئەوە داگیرکردو نازناوی سوڵتان و خاقانی وەرگرت، پاشان دەستی گرت بەسەر پایتەختی تەیمووریەکان لەساڵی ١٤٥٨زداو، کەچی لەناکاو لەفراوانکردن و هەڵکشان وەستا. چی بوو هانیدا تا ئەم هەڵوێستە وەرگرێ؟

لەراستیدا ئەم بەرفراونبوونەی وڵاتی جیهانشا بوو بەهۆی دروستبوونی دژایەتی کردنی لەلایەن هەریەك لە ئەبی سەعیدی کوڕی شاروخ کەلەتورکستانەوە سەری هەڵدابوو و

بەسەرکردایەتی سـوپایەکی زەبەلاحـەوە خـۆی ئامـادەکردبوو بـۆ گێڕانـەوەی مـولکی تەیمووریەکان و بەتایبەتی هەرات، لەلایەکی دیکەوە ئوزون حەسـەنی سـەرکردەی ئـالاق قوینلۆو دەترسا مەترسی بخاتە سەر مولکـەکانی جیهانشـا لـەخاکی دیاربـەکر. جگـە لەمانەش مەترسی سـێیەم کەرووبەرووی جیهانشا بۆوە ئەوەبوو دوو کوڕی یەکەم حەسەن عەلی لەئازەربێجان و پیربوداقی حـاکمی فـارس لـەدژی هەڵسـانەوەو دەسـتی بەسـەر بەغدادا گرت و لەوێشەوە شۆڕشەکەی راگەیاند.

بەمشـێوەیە جیهانشـا کەوتـە نێـوان دووبەرداشـەوە، تەیمووریـەکان لـەخۆراواو ئـالاق قوینلۆوەکانیش لەخۆرەلأت و، جگە لەمان کوڕەکانیشی لەناوخۆدا، بۆیـە ناچـاربوو واز لەهەڵکشان و پێشـەڕەوی بهێنێـت و خـۆی ئامادەبکـات بـۆ رووبەرووبوونـەوەی ئـەو مەترسیانە.

لەراستیشدا جیهانشا ویستی بەرەی جەنگی خۆرەلأت ساردبکاتەوە تاکو بـواری هـەبێ رووبەرووی شۆڕشی کوڕەکانی و ئـەو مەترسـیە ببێتـەوە کەلـەخۆراواوە بـۆی دەهـات، پاشان توانی پەیماننامەیـەك لەگـەڵ ئـەبی سـەعیددا مۆربکـات و بەهۆیـەوە دەسـتی لەخۆراسان هەڵگرت و گەڕایەوە بۆ تەوریز.

جیهانشا دەستی بەجموجۆڵ کردو لەساڵی ١٤٦٦دا شۆڕشی پیربـوداقی کـوڕی لەبەغـدا گەمارۆداو لەدوای ساڵێك و نیو رووخاندی و بەدەستی محەمەدی بـرای کـوژراو ئـەویش لەدواییدا جێگەی گرتەوە. هەروەها جیهانشا لەدامرکاندنەوەی شۆڕشی حەسـەن عـەلی کوڕیشی هەر سەرکەوتووبوو، پاشان رووی لەئالاق قوینلـوو کـرد بـۆ ئـەوەی کێشـەکە یەکلایی بکاتەوە. لەتشرینی یەکەم ١٤٦٧زدا بەسەرکردایەتی سـوپایەکەی رووی کـردە دیاربەکر، بەلأم زستانی ئەو ساڵە زۆر سـەختبوو، بۆیـە نـەیتوانی چـیدیکە پێشـڕەوی بکات و لەسنجاق مایەوە و لەوێشدا لـە١١تشـرینی دووەم ئـوزون حەسـەن کوشـتی و رایکرد.

لەدوای مردنـی جیهانشـا گێـرە شـێوێنی کەوتـە دەوڵـەتی قـەرەقوینلۆو، ئـەو وڵاتـە گرنگیەکەی خۆی لەدەستداو بەتایبەتی بەهۆی ئـەوەی کوڕەکـەی کەجێنشینیشـی بـوو بەناوی حەسەن عەلی ئەقڵ نوقسان بوو و مـاوەی ٢٥ سـاڵ جێنشـینی زۆرەملـێ کـرا

لەلایەن باوکیەوە و نەیدەتوانی کاروبارەکان بەچاکی بەڕێوەبەرێ و سامانی دەوڵەتەکەی هەموو بەفیڕۆداو، زۆرێـك لـەمیرزادەکانی هۆزەکەشـی کوشـت. کـاتێکیش لەنیسـانی ١٤٦٩ز هێرشی کرایەسەر بەرەو هەمەدان هەڵات و بـاجی ئـەم کارەشـی ژیـانی بـوو. لەوانەشە بەدەستی یەکێك لەدەست و پەیوەنەکانی خۆی کـوژرابێ یـا خـۆی کوشـتبێ، لەهەمان کاتیشدا ئەبو یوسفی برای کەلەهەوڵی گێڕانەوەی ئیمارەتی فارسـبوو ئـەویش کوژرا، بەمەش سەردەمی ئەم خانەوادەیە کۆتایی هات، خانەوادەی ئالاق قوینلۆو هاتە شوێنیان.

خانەوادەی ئالاق قوینلۆو لەدوای مردنی تەیموورلـەنگ بـەرەو ناوچـەکانی ناوەڕاسـت و خۆرئاوای ئێران کۆچیان کرد. لەدوای مردنی قەرەعوسمانی بایەندەری ئـوزون حەسـەنی نـەوەی جێگـای گرتـەوەو سـەرکردایەتی خانەوادەکەشـی لـەژێر دەسـتی جیهـانگیری براگەورەی دەرهێنا.

ئوزون حەسەن زۆر حەزی لەچالاکییە سیاسیەکان هەبوو، هەرکە دەسەڵاتی گرتە دەست یەکسەر بەرەو باکوری خۆرەلات هەڵکشاو دەستی بەسـەر ئـەرمینیای خـۆراواو دۆڵـی بەرزاییـەکانی رووباری دجلەدا گرت و کوردەکانی ئەو ناوچانەش هاتنـە ژێـر فـەرمانی، پاشان رووی بەرەو خۆرەلات وەرگێڕا تا لەسەر حسـابی بەرژەوەندیـەکانی قـەرەقوینلۆو لەئازەربێجان و ئێران وڵاتەکەی بـەرفراوانبکات، ئـەوەبوو وەك لەپێشـەوە باسمـان کـرد جیهانشای کوشت و ئازەبێجانیشی خستە پاڵ موڵکـەکانی خـۆی، لەلایـەکی دیکـەوە ئەبی سـەعیدی جێنشـینی شـاروخ کەبەسـەرکردایەتی سـوپاکەیەوە بـەرەو ئازەبێجـان هەڵمەتی هێنابوو بـۆ ئـەوەی خـۆراوای ئێـران بگێڕێتـەوە ژێـر دەسـەڵاتی خـۆی لـەو رووبەرووبوونەوەیەدا لەبەرامبەر ئوزون حەسەن شکستی خوارد و ئـەویش لـەدوای ئـەم سەرکەوتنە دەستی بەسەر نزیکەی سەرجەم خـاکی ئێرانـدا گـرت و تەورێزیشـی کـردە پایتەختی خۆی.

هێزەکانی ئالاق قوینلۆو لـەدوای مردنـی ئـوزون حەسـەن لەسـاڵی ١٤٧٧زدا دەسـتی بەپووکانەوە کرد، ئەویش بەهۆی ئەو ململانێیـەی کەوتـە نێـوان کـوڕو نـەوەکانی بـۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات، بەمەش پشێوی هەموو ئێرانی گرتەوە، لەم بێسەروبەریەشدا

ئیسماعیل سەفەویی شای تازەی ئێران پەیدابوو کە پرۆسەی یەکرێزی خاکی ئێرانی خستە سەرشانی خۆی و دەسەلاتەکەی و لەساڵی ١٥٠١ز شکستی بە سەرکردەی ئالاق قوینلوویی ئەلوەند میرزای کوڕی یوسف بەگی کوڕی ئوزون حەسەن لەنزیك نەخجەوان هێناو ئازەربێجانی هێنایە پاڵ موڵکەکانی خۆی.

## گەشەی هێزەکانی ئۆزبەک[٣] لەپشت رووبار:

ئۆزبەکەکان کەلەهۆزە کۆچەریەکان بوون لەگردۆڵکەکانی ئاسیاوە هاتوون و سەرکردە سەرەتاییەکانیشیان سەر بەخانەوادەی جەنگیزخانن و لەسەردەمی شاروخ و ئۆلوغ بەگدا هێزێکی سەربازی و سیاسی گەورەیان پێکدەهێنا. ئاشکرایە کەوا دەستیان گرت بەسەر بەشی خوارووی ولاتی خوارزم کە ئەوکاتە سەر بە جیغتاییەکانی مەگۆل بوو، هەروەها دەسەلاتی خۆشیان بەسەر لێوارەکانی رووباری سیحۆندا سەپاند و هەمیشە شاری ئەستەرئابادو کەرکانگ لەولاتی پشت رووبار دەخستە بەر هەڕەشەو گورەشەی خۆیەوە.

لەراستیدا ئۆزبەکەکان بەسەرکردایەتی ئەبی خێرخانی کوڕی دەولەت شێخ کێشەو ململانێیە دەرەبەگیی و خێزانییەکانیان لەدەوڵەتی تەیمووریەکان قۆزتەوەو، کەبەتایبەتی لەدوای مردنی ئەبی سەعید زیاتر پەرەی سەند، ئەویش بۆ ئەوەبوو تا بتوانن گەمارۆی هەرچوار دەووری ئەم دەوڵەتە بدەن و ببن بەمیراتگری هەمیشەیی موڵکەکانی و، بەدرێژایی چەندین ساڵ هێرشیان دەهێنایە سەر ولاتی پشت رووبار و دەستیان لەکاروباری ناوخۆشیان وەرداو بۆ ئەوەی بتوانن کێشەکانیان قوولتر بکەنەوەو بەمەش لەساڵی ١٤٦٠دا جگە لەسەمەرقەند و بوخارا و هەندێك شاری بەسەنگەر پارێزراوی دیکە نەبێ لەدەسبەسەردا گرتنی زۆربەی ناوچەکانی ئەم ولاتە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا.

---

٣ -ئەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆ ناوی ئۆزبەك خان کەلەساڵی (١٣١٣-١٣٤١ز) سەرکردایەتی هۆزی زێڕینی دەکرد لەخوارووی رووسیا و ئەویش لەنەوەکانی جوجیی کوڕی جەنگیزخان بوو.

ئەبوخێرخان دوو کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشـت بـەناوی شـابوداغ سـوڵتان و خواجـە محەمەد، کوڕی یەکەمی بوو بەجێنشینی و بوو بـەحاکمی ئۆزبـەك و وڵاتـی قـەبجاق، و چەند ناوچەیەکیشی لەدەستی حوسێن بایقەرەی تەیموری هێنایەدەر و لەسـاڵی ١٣٩٩ز دەستیشی بەسەر سـەمەرقەندو بوخـارادا گـرت، پاشـان گـەمارۆی بەلەخـیداو، بـەڵام لەبەرانبەر حوسێن بایقەرە شکـستی خواردو گەمارۆیەکـەی شـکاند و گەڕایـەوە وڵاتـی خۆی.

لەسـەر ئەم بنمایەش ئۆزبەکەکان دەوڵەتێکیان بۆخۆیان لەوڵاتی پشت رووبـار سـازکردو سەمەرقەندیشیان کردە پایتەخت و پاشان بەرەو خۆراسان چوون بۆ ئەوەی لەژێر دەسـتی پاشماوەی تەیموریەکان دەربیێنن.

لەسـاڵی ١٤٩٤-١٤٩٥زدا لـەنێو ئۆزبەکەکانـدا کەسـایەتیەکی بـەهێز پەیـدابوو کـە چەسپاندنی جێپێی ئۆزبەکەکانی لەوڵاتی پشت رووبار و فراوان بـوون بـەرەو خۆراسـانی خستە ئەستۆی خۆی، ئەویش محەمەد خانی شەیبانی بوو کەبە شاهی بەگ یـا شـیبەگ خان ناوبانگی هەبوو و کوڕی بوداغ سوڵتانی کوڕی ئەبی خێرخان بوو.

پشێوی و بێسەروبەرەیی بـاڵی بەسـەر بـاری سیاسـی لـەوڵاتی پشـترووبار و خۆراسـان کێشابوو و دەسەڵاتی ئۆزبەکی لەلایەنی پاشماوەکانی تەیموریەکانەوە فشـارو مەترسـی زۆری کەوتە سەر بەتایبەتیش لەلایەن بابرەوە ئەو مەترسیانە زەقتربوون، پاشـان هێـزی تەیموریەکان لەخۆرساندا بەردەوام روو لەلێکترازان و لاوازیی دەکـرد، لـەدوای زنجیـرەك شەڕو کوشتار سەرکردەی ئۆزبەکەکان توانی جێپێیـان (ئـەیلولی ١٥٠٣ز) لـە وڵاتـی پشت رووبار قایم بکات و پاشان بەمەبەستی داگیرکردن رووی لەخۆراسان کرد.

سوڵتان حوسێن بایقەرەی تـەیموری حـاکمی خۆراسـان دەرکـی بەمەترسـیەکانی سـەر وڵاتەکەی کرد، بەڵام بەهۆی نەخۆشیەکەی و ئەو لەژێر فەرمان دەرچوونەی کوڕەکانیەوە نەیتوانی وڵاتەکە لەمەترسیەکانی دەرەکی بپارێزێ، بۆیە هەموو بارەکە کەوتە ئەستۆی

بەدیع زەمانی کوڕی و لەپێناوی ئەوەی کەوا هەڵوێستی خۆی بەهێزبکاتەوە پەنای بـردە بەر هاوپەیمانی لەگەڵ خەسرۆشای فـەرمانڕەوای حەسـار کـە ئەوکاتـە لـەژێر مەترسـی ئۆزبەکەکان و میر زەنون ئەرغینی حاکمی قەندەهار بـوو و لەسـاڵی ۱۵۰۳زدا لەسـەر ئەوە ڕێککەوتن کەوا لەتەرمەز بەیەك بگەن و لەوێشەوە بۆ قووڵایی خاکی پشت رووبار بچن. پاشان بەدیع زەمان بەسەرکردایەتی سوپاکەیەوە لەبەلەخ وەدەرکەوت و میر زەنون ئەرغینیش بەسەرکردایەتی سـوپایەکی بچـووکەوە گەیشـتە شـوێنی مەبەسـت، بـەڵام چاوەڕێی خەسرۆشایان نەکرد.

وادیـاربوو کێشـەکانیان بـەهۆی هاوبەرژەوەندییـەوە سـەریهەڵدابێ، چـونکە لەلایـەك خەسرۆشا لەوە دەترسا مەترسیەك لەلایەن هاوپەیمانەکەی بەدیع زەمانەوە بـۆی سـازبێ ئەگەر شکستی بەشەیبانی خان هێنا و، لەوکاتەشدا هاوپەیمانێتێکی دیکە هاتەپێشەوە کە هانی سەرکردەی ئۆزبەکەکانیدا بـەردەوامیی بەچـالاکییە سـەربازییەکان بـدا و لـە (ئەیلوولی ۱۵۰۳ز) لەڕووباری جیحۆن پەڕیەوەو خۆراسانی داگیرکردو لەشوورەی بەلەخ نزیك کەوتەوەو گەمارۆیدا بەڵام نەیتوانی بچێتە ناویەوە، هیچ دانوسـانێکیش دروسـت نەبوو کەبەهۆیەوە بەئاشتیانە بچێتە نـاوی. لەهـەمان کاتیشـدا ساردیەکی سـەخت و دژوار رووی لە ناوچەکە کردو سەربازەکانی هەراسـانکرد، بۆیـە ناچـاربوو گەمارۆیەکـە هەڵوەشێنێتەوەو بگەڕێتەوە ولاتی پشت رووبار.

لەدوای ئەوەی لەزستانی ۱۵۰۵زدا دەسـتی بەسـەر خوارزمـدا گـرت، شـەیبانی خـان لەبەهاری هەمان ساڵدا سوپایەکی ناردەسـەر خۆراسـان و هێرشـی کـردە سـەر شـاری مەیمەنە و فاریاب و هەرچی بەرهەڵسکارێکیشی لێبـوو کەبەسـەرکردایەتی میرقاسـم میرزا و شیرین جەلایەر و ئەمیر باجاق دەستی پێکردبوو هەمووی لەناوبرد. لـەناو ئـەو کێشانەدا حوسێن بایقەرە کۆچی دوایی کردو لەئەنجامدا پشێوی و بێسەرەوبەرەیی بـاڵی بەسەر ولاتـدا کێشا ئـەویش لـەژێر سـایەی ململانێیـە ناوخۆییـەکانی نێـوان مـیر و حاکمەکانی هەرێم و ناوچەکاندا، ئەمەش هەلی بۆ شەیبانی خان ڕەخساند تـا ناوچـەکە

داگیربکات و هێزەکانی لـەرووباری جیحـۆن پەڕینـەوەو لەخۆراسـان و. ئـەم هەواڵـەش بەدرەنگە وەختەوە گەیشتە پایتەختی هەرات لـەمانگی حـوزەیرانی سـاڵی ١٥٠٦زداو پەشێویەکی زۆری لەنێوەندە حکومیەکاندا دروستکردو بەدیع زەمان یەکسەر سوپایەکی دوانزەهەزار سـەربازی بەسەرکردایەتی میر زەنون ئەرغین نارد بۆ ئەوەی بەر لەپێشـڕەوی ئۆزبەکەکان بگرێ و سـەرکەوتنێکی بەرچاویشـی لـەدژییان تۆمـارکرد، بـەڵام ئەوەشـی لەیادبوو کەوا سەرەڕای ئەم سـەرکەوتنە نـاتوانێ ئۆزبـەك لـەخاکی خۆراسـان و پشـت رووبار وەدەرنێ، بەمەرجێك ئـەم کـارەی بـۆ مەیسـەر دەبـێ ئەگـەر هـاتوو یـەکڕیزی دروسـتبوو، ئـەویش لـەناو ریزەکـانی تەیموورییەکانـدا بـوونی نـەبوو، بەتایبـەتیش کەسەروکاری هەموو شتێکیان دایە دەست شەیبانی خان و ئەویش بڕیاریدا لەگەڵ هێـزە تەیموورییەکان دانوستان بکات بەمەبەستی ئەوەی کات بەدەسبخات تـاکو بـواری هـەبێ هێزەکانی رێکبخاتەوە، بۆیە نێردراوێکی بۆ ناردن تاکو قایلیان بکـات کەبـەبێ شـەڕ خۆراسان بەدەستەوەبدەن. شتێکی ئاساییش بوو ئەم دانوسـانە لـەژێر سـێبەری هـەوڵی دەستپێوەگرتنی خۆراسـان لەلایـەن مـیرە تەیموورییەکانـەوە هـەرەس بهـێنێ و هـەموو لایەکیش خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد.

لە ئەیلوولی ساڵی ١٥٠٦ز شەیبانی خان هێرشی کردە سەر شـاری بەلـەخ و لەهـەموو لایەکەوە گەمارۆیدا. لەبەرانبەریشدا مـیرزادە تەیموورییـەکان کـاتێکی زۆریـان بـەهۆی شەڕەقسـە نەزۆکەکانیان لەدەسـتدا کەدەربارەی بەرپەچدانەوە گفتوگۆیان دەکرد، بۆیە زۆر سسـت و لەسەرخۆ بوون لەکارەکان و دوودڵیش بوون لەشـەڕکردن و لەدواییشـدا بەلـەخ هیچ هاوکاریەکی پێ نەگەیشت و لەدوای دوو مـانگ لەگەمارۆدان لە(تشرینی دووەمی) هەمان ساڵدا رووخا. لەدواییدا شـەیبانی خـان کانبـارا مـیرزای کـردە حـاکمی شـارو گەڕایەوە بۆ سەمەرقەندو بەم سەرکەوتنانە دڵی ئاسوودەبوو.

لەراسـتیدا مـیرزادە تەیموورییـەکان زۆر سسـت بـوون لەسـازدانی یـەکڕیزی هێزەکانیـان بەرانبەر بە مەرامەکانی شەیبانی خان و هەموویان بەرژەوەندیـە تایبەتیـەکانی خۆیـان

خسته پێش گشتیەکانەوە و ئەم هەڵوێستەشیان لـێکترازان و هەڵوەشـانەوە و پشـێوی سیاسیی زیاتری لێکەوتـەوە، تائـەوەی هـەل بـۆ شـەیبانی خـان رەخسـا کـەزەبرێکی کاریگەریان لێبوەشێنێ، ئەوەبوو لە١٣ئایاری ١٥٠٧زدا لـەرووباری جیحـۆن پەڕیـەوەو دەستی بەسەر خۆراساندا گرت و سەرجەم سەرکردەکانی شارەکان خۆیـان بەدەسـتەوەدا، پاشـان لـەرووباری مـەرغابیش پەڕیـەوەو لەسـنوورەکانی بـازغیش چـووە ژوورەوە، لەبەرامبـەردا بـەدیع زەمـان و موزەفـەر حوسـێن و تەیمووریـەکانی دیکـە هـیچ هەڵوێستێکیان نەبوو بـۆ بەرەنگاربونـەوە، ئەمـەش هـەلێکی دیکـەی بـۆ رەخسـاند کەبچێتە قووڵایی خۆراسانەوەو، ئینجا گەیشتە هەراتی پایتەختی تەیمووریەکان و تـرس و تۆقین باڵی بەسەر دانیشتوانەکەیدا کێشاو شازادەکانیشیان دەستیان کـرد بەهـەڵاتن، بەتایبەتیش بەدیع زەمان و موزەفەر حوسێن مـیرزاو سـەعید عەبـدوڵلا مـیرزا بـەرەو شوێنە دوورەدەستەکانی ئۆزبەکی رۆیشتن، وەك قەنـدەهار و ئەسـترئاباد. لەبەرەبـەیانی ٢٢ی ئایـاری هـەمان سـاڵیشـدا شـارەکە کەوتـە ژێـر دەسـتی شـەیبانی خـان و لەمزگەوتەکەشیدا وتاری هەینی رۆژی ٢٣ی ئایار بەناوی ئـەوەوە خوێندرایـەوەو وەفـا میرزاشیان کرد بەحاکم.

هەنگاوی دووەمـی شـەیبانی خـان بـۆ زیـاتر فراوانکـردن ئێرانبـوو، ئەمـەو لـەدوای داگیرکردنی هەرات هێزە سەرەکیەکانی ناردە سەر ناوچەکانی خۆرەڵاتی ئێـران: شـاهی جیهـان، جـام، مەشـهەد و هیدیکـەش، بەسـەرکردایەتی محەمـەد تـەیموور سـوڵتان و عوبێدوڵلاخان و بەڵام خودی خـۆی بەشـداری هەڵمەتـەکانی نـەکردو لـەپوولی سـەرای کەشارۆچکەیەك بوو لە دەورووبەر هەرات مایەوە.

هێزەکانی ئۆزبەك توانیان بەبێ هیچ بەرەنگاربوونەوەیەکی ئـەوتۆ بچـنە ناوچـەکانەوە. لەساڵی دواتریشدا سـەرکردەی ئۆزبەکـەکان جەرجانیشـی داگیرکـرد و بـەدیع زەمـانیش بەرەو ئازەربێجان رایکـرد، لەدەرئـەنجامی ئـەم سـەرکەوتنانەش تـوانی زاڵـبێ بەسـەر خۆرەڵاتی ئێران و توانیشی کەوا رووبەرێکی پان و بەرینی لەو زەویانەی کە کەوتبوونـە

لای چەپی رووباری جیحون کەوتە دەست، بەمەش مولکەکانی لەسنووری خۆراسان لەخۆراواوە هەڵکشان بەرەو هێڵی سیمنان لەنێوان رەوی و دامغان و بەدەخشان لەخۆرەڵات و ناوچەکانی کاخیندار و غوری چیایی لەناوەڕاستی ئەفغانستان لەلای باشوورەوە.

جا لەبەر ئەوەی شەیبانی خان زۆر سەرقاڵی کێشە ناوخۆییەکان بوو وەك: دژایەتی کردنی ئۆزبەکە کازاخیەکان و ئۆزبەکە قەبجاقەکان و میرزادە مەگۆلیە جغتانییەکانی تورکستان، بۆیە بواری ئەوەی نەبوو گرنگی بەو شوێنانە بدات کەوا داگیری کردبوون، لەهەمان کاتیشدا ئەو هەڵکشان و فراوان بوونەی ولاتەکەی بەلای خۆرەلاتی ئێران خستبوویە بەردەم رووبەرووبوونەوەی شا ئیسماعیلی سەفەوی، شتێکی ئاساییش بوو کەوا بەهۆی جیاوازی مەزەبی و نزیکی سنوورەکان و مەرامە سیاسیەکانیان لەداگیرکاری کەلەبەشی ئایندەدا تیشکی دەخەینە سەر، شەڕ لەنێوانیاندا دروست ببێ.



# بەشی دووەم
# پەیدابوونی خانەوادەی سەفەویی

## بنەچەی سەفەوییەکان:

لەوکاتەی کەوا ئێران لەسـەردەمی حـوکمڕانی ئـالاق قوینلـوو ببـووە مەیـدانی شـەڕو کوشـتاری داگیرکـارو تـەماعکاران، لـەلای بـاکور و لەئـەردەبیل لـەئازەربێجان خانەوادەیەکی تورك پێدەگەیشت کە تایبەتمەنـدبوون بـەوەعزو کـارە ئایینیـەکان و بـە خانەوادەی سەفەویی ناویان دەرکرد، ئاشکرایە ئەم ناوچەیە تورك زۆرینەی پێکـدەهێنێ ئینجا کورد و ئەرمەن.

سەفەوییەکان سەربە شێخ سەفیەدین ئیسحاقی ئەردەبیلین (١٢٥٢-١٣٣٤ز) کەئەویش باپیرەی پێنجەمی شا ئیسماعیلی سەفەویی دامەزرێنەری دەوڵەتی سەفەوییە لـەئێران، لەناوی سەفیەدینیەشەوە ئەم بەرەبابە پشتاوپشت ناوی خانەوادەی سەفەوییان وەرگـرت، مێژوونووسەکانی سـەردەمی خۆشیان نەسەبی لەلایەن باوکیـەوە دەبەنـەوە سـەر ئیمـام کازم موسا. لەهەمان کاتیشدا هەندێك مێژوو نووسی دیکـە لەبـەر نـەبوونی بەڵگـەی پێویست ئەم رایە رەتدەکەنەوە، بەڵام ئەو مێژوونووسانەی پشـتگیری لـەم رایـە دەکـەن پشتیان بەستووە بە کتابی (صفوە الصفا)ی کوڕی بەززاز کەخەڵکی ئەردەبیلـە، گوایـە لەسەردەمی شێخ سـەفیەدینی ئیسحاق ئەم کتابەی نووسیوەو لەوانەشە ئەو رایسـپاردبێ بنەچەکەی بگەیەنێتەوە ئالوبەیت، بەپشت بەستن رایەکانی بەشێخ تاجـەدین ئیبراهیمـی گەیلانی کەبەشێخ زاهید ناسرابوو. ئەوکاتەش ئەم کارە شتێکی بـاوبووە لەبـەر ئـەوەی مـەزەبی شـیعە لەوپەڕیـدابووەو ئێلخانـەکانی مـەگۆلیش مـەیلیان بـەلای مـەزەبی شیعەوەبوو و، بەهۆی ئەوەی ئێلخان ئۆلغایتۆ هاتە سـەر مـەزەبی دوانـزە ئیمامیەکـە لەساڵی (١٣٠٤-١٣١٦ز) هێندەی دیکە شیعەکان بەهێزبوون.

ئینجا میر ئەبونەلفەتح ئەلحوسێنی جارێکی دیکە شا تەهماسبی دووەمی پاشای سەفەوییەکانی راسپارد کەوا کتابی ئیبن بەززاز بنووسنەوەو بلاویبکەنەوە، بۆ ئەوەی دلنیایی ببەخشنە بیرۆکەی نەسەبی عەلەویەکان بەمەبەستی ئەوەی بیکەنە بەهانەیەك بۆ جێگیر کردنی مەزەبی شیعی. پاشان بەگوێرەی ئەو بەڵگەنامانەی کەنووسراونەتەوە لەسەردەمی شێخ سەفیەدین ئیسحاق و ئیسماعیل ئەوە روون دەکەنەوە کەوا خانەوادەی سەفەوییەکان لەهەموو لایەکی خاکی ئازەربێجاندا بلاببوون، کەواتە شێخی سەفەوییەکان لەبنەچەدا دەبێ لەئارییە کۆنەکان بێ و ئەمەش ئەوە رەت دەکاتەوە ئەو پیاوە لەنەوەی ئیمام کازم بێ.

ئاشکرایە ئەوانەی واتێگەیشتوون سەفەوییەکان لەئالوبەیتن مەبەستیان ئەوە بوو ئەم خانەوادەیە بکەنە خاوەنی شەرعی حوکومڕانیەکە، بێگومان ئەمەش بەفەرمانی چەند ئەندامێکی ئەو خانەوادەیە سازبووە، بەلام ئەوانەی بڕوایان وابوو سەفەوییەکان لەئارییە کۆنەکانن مەبەستیان ئەوەبوو ئەوە روون بکەنەوە سەفەوییەکان چ رۆڵێکیان هەبووە لەسەرهەڵدانی نەتەوەکانی ئێران کەلەسەر دەستی ئەوان بوونیان پەیداکرد.

ئاشکرایە سەفەوییەکان پشتیان بەست بەمافی خواوەندانە بۆ پاشا ئێرانیەکان بەر لەئیسلام و ئەویش بەمیراتگری ئەم مافە بلاویانکردەوە، کاتێکیش ئیمام حوسێنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کچی یەزدجەردی سێیەمی خواست کەدوایین پاشاکانی فارسبوو زەینەلعابدین عەلی لێبوو، بەمەش دوو مافیان بۆ پەیدابوو:

یەکەم: مافی ئالوبەیت لەخەلافەت، وەك چۆن ئیمامایەتی لەلای شیعەکان هەیە.

دووەم: مافی پاشاکانی ئێران وەك چۆن فارسەکان دەیانگوت ئەم پاشایانە مافی خواوەندیان هەیە لەدەسەلاتدا.

لەراستیشدا گێرانەوەی نەسەبی شێخ سەفیەدین ئیسحاق بۆ ئیمام موسا کازم، بەڵگەکانی زۆر لاواز بوون، ئەم راستیانە ئەمە دووپاتدەکەنەوە:

- هاوسەری شێخ سەفیەدین ئیسحاق ئاگاداری ئەم نەسەبە نەبووە.

- لەنووسـینەکانی ئـیبن بـەززازدا روونکراوەتـەوە، بەتایبـەتیش کاتێـك ئایـەتی ٦٧ لەسورەتی مائیدەی تەفسیرکرد زیاتری بۆ ئاسانبوو، کەدەفەرموێ: (یا أیها الرسول بلغ ماأنزل الیك من ربك وان لم تفعل فما بلغت رسالته، والله یعصمك من النـاس ان الله لا یهـدي القـوم الکـافرین). شـیعەکان ئەمـە بـۆ ئـەو فەموودەیـەی پێغەمبـەر (د.خ) دەگەڕێننەوە کەوا دەبێ عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب ببێتـە جێنشـینی پێغەمبـەر درودی خوای لەسەربێ. شیعەکانیش تەنها بەوەندە نەوەستان، هەروەك چۆن لەبـەردەم ئایـەتی (الراسخون في العلم) ئال عومران/ئایەتی ٧دا نەوەستان کەشیعەکان بۆخۆیان تەفسیریان کردبوو.

- بەهیچ شێوەیەك شێخ سەفیەدین ئیسحاق ئاماژەی بـە نـاوی هـیچ مێژوونووسـێکی شیعە نەکردووە، لەوکاتەی کـە نووسـەرە سـوننیەکانی وەك: غـەزالی و سـەهروردی و نەجمەدینی رازای ئاماژەیان بۆ کردووە.

- نابێ راستەوخۆ بێینە سەر رایەکانی شێخ سـەفیەدین ئیسحاق، لەبەر ئـەوەی زۆربـەی دانیشتوانی ئەردەبیل لەسونەکان بوون لەسەر مەزەبی ئیمام شافیعی بوون و لەهەمان کاتیشدا دەروێشی بوون، هەروەك چـۆن عوبێـدوڵڵاخانی سـەرکردەی ئۆزبـەك لەسـاڵی ١٥٣٠زدا نووسراوێکی بۆ تەهماسب نووسیوەو گلەیی لێدەکات و ئاماژە بـەوەدەکات کەوا شێخ سەفیەدین ئیسحاق لەسەر مەزەبی سوننەو جەماعەت بووە.

- ئەوەی کە زۆر لەراستیەوە دوورە ئەوەیـە نەسـەبەکە لـەکتێب و تۆمارکراوەکانیانـدا باسی گەیاندنی دەکات بۆ حوسێن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب و لەشێخ سـەدرەدین موسای کوڕی شـێخ سـەفیەدین ئیسـحاق و نـەوەکانی دەگێڕنـەوە کەئـەو نەیـدەزانی لەنەوەی حوسێنە یان حەسەن، ئەوەی زیاتر گومان دروست دەکـات هـەر لەسـەرەتاوە گەیاندنی نەسەبی فەیروزشای باپیرە گەورەی شێخ سەفیەدینە بە ئیمام کازم.

- جێی سەرسوڕمان نییە شێخ سەفیەدین ئیسـحاق ئەوکاتـە ئـەوە بڵاویکاتـەوە کـەوا لەنەوەی عەلەویەکانە، چونکە شێخ ئیبراهیمی گەیلانیش کەشێخی ئـەو بـووە ئەمـەی کردووە، جگە لەوانیش نەوەکانی شێخ عەبدولقادری گەیلانیش ئەمەیان کردووە.

- دوورنیە ئەو لقانەی بۆ نەسەبی عەلەویەکان زیـادکراوە تـەنها کـاری نووسـەرەکانیان نەبێ، لەپێش هەمووشیانەوە ئیبن بەززاز، یاخود شـێخ سـەردرەدین کـە ئـەویش ئـەم وتانەی بلاوکردبۆوە، هەروەك چۆن نەوەکانی عەبدولقادر گەیلانیش ئەنجامیاندا.

لەبەرامبەریشدا ئیبن بەززاز دەڵێ شـێخ سـەفیەدین ئیسـحاق لێدوانی هـەبوو لەسـەر شیعرەکانی رۆمی و عەتارو ئەوحـەدەدینی کرمـانی و فـەخرەدینی عیراقـی و ئەحمـەد جامی و رۆزبەهانی بەقلی و سەنائی و خاقانی و هەمووی لێکداوەتەوەو فەرهەنگی بـۆ داناون. لـەبواری تەسەووفییشـدا (وحـدە الوجـود)یـش چـوارینیەکی لـەدوا بـەجێماوە کەلەبارەی خۆشەویستی عەلی کوڕی ئەبی تالیب نووسیویەتی، لەوانەشە ئـەم چـوارینە لەداهێنانی ئەو مێژوونووسەبێ چونکە شێخ سەفیەدین ئیسحاق تورك بووەو تائێسـتاش روون نەبۆتەوە کەجگە لەیەك بەیت شیعری فارسـی هیچـی دیکـەی هـەبووبێ. تـورك ئەوکاتە بەسەرکردەی رووحی خۆیان ناویان دەبـرد. لەوانەیـە سـوننی بـووبێ و لەسـەر مەزەبی ئیمام شافیعی، و پاشان مەیلی بەلای مەزەبی ئیمام جەعفەری سـادق چـووبێ کە ئەوکاتە باروگوزەرانی ئێران لەرووی ئایینیی و سیاسیەوە کارگیەری لەسەر هـەبوو، ئاشکرایە مەگۆلە ئێلخانیەکان کەحاکمی دەوڵەت بـوون، لایـەنگیریی خۆیـان لـەرووی ئایینی و مەزەبیەوە بـەم شـێوەیە راگەیانـد: هۆلاکـۆ بـووزی بـوو، مـەحمود غـازان و هەندێکی دیکە لەسەر مەزەبی سوننی بوون و ئولغیتۆ لەسەر مەزەبی شیعە بوو.

بۆیە ئێمە دەبێ بپرسین و بڵێین، کـەی شـێخەکانی خانـەوادەی سـەفەویی هاتنـە سـەر مەزەبی شیعە؟

لەراستیشدا بیروبۆچوونەکانی شیعە سەرەتا خزیە ناو ریزەکانی سەفەوییەکان، ئـەویش لـەو کاتـەی کـە تەسـەووف لەسـەردەمی شـێخ سـەفیەدین ئیسـحاق لەسەرانسـەری کۆمەڵگای ئێراندا دەستی بەبلاوبوونەوەکرد، ئەمەش بەکردەنی کاریگەری لەسـەر ئـەو گەندەڵیە هـەبوو کـەوا بـاڵی بەسـەر وڵاتـدا کێشـابوو و دەسـەلاتدارەکانی مەغۆلیـە ئێلخانیەکان و پاشان تەیمووریەکان و میرزادە سەرکەوتووەکانی وەك شەروانشا لەشەروان پیادەیان دەکرد، ئینجا ئالاق قوینلو لـەئازەربێجان و بەشـێکیش لـەخۆراوای ئێـران و مورادبەگی بایەندەری لەیەزد و ...تـاد شـوێنەوارێکی زۆر وێرانکـراوی لـەدوای خـۆی

لەناو دەروونی ئێرانیەکان بەجێهێشت کەبەردەوام بێزاربوون لەو هەموو غەدرو تاوانانەی دەرهەقیان دەکرا. ئەگەر هاتوو بەتەواوی نەچەسپاو نەسەلمێندرا کەوا هەریەك لە شێخ سەفیەدینی ئیسحاق و سەدرەدین موسای کوڕی لەسەر مەزەبی شیعەن، ئەوا نەوەی یەکەم کەناوی خواجە عەلی سیاپۆوش بوو ئامادەیە بۆ بانگەوازی شیعەیی. لەراستیشدا جونێدی نەوەی بەتەواوی هەستی بەوەکرد کەوا لەهەڵگەڕاندنەوەی مەزەب بۆ بزووتنەوەیەکی سیاسی چەند سوودی پێگەیشتووە، ئەمەش پشت بەوە دەبەستێ کەبتوانێ ژمارەیەکی زۆری دەروێش لەدەوری خۆیدا کۆبکاتەوە. حەیدەری کوڕیشی جەختی کردەوە لەسەر ئەوەی کەوا نەسەبی ئەوانە دەگەڕێتەوە بۆ ئیمام موسا کازم و فێسێکی سووری دوانزە تقێمی کردە سەری سەرجەم شوێنکەوتووانی، ئاماژەیەك بوو بۆ ئەوەی مەزەبی شیعە چۆتە پاڵ مەزەبی دوانزە ئیمامەکە.

ئامانجیش لەم یەکگرتن و چوونە پاڵە ئەوەبوو کە شیعەکانی ئێران بەرزبکرێن و بنکەکانیشیان فراوان بکرێت، بەتایبەتی بنکەی سەربەداریەکان کە دژی حوکمی ئێلخانیکان بوون، ئاشکرایە دژەکانی ئێلخانیەکان پشتیان بە رەگەزە شیعە مەزەبەکان دەبەست و ئەمەش وای کرد کەوا سەفەوییەکان لەکاری سۆفیگەرییەوە بگۆڕێن بۆ کاری سیاسی و دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەویی شیعەمەزەبی لەسەر دەستی ئیسماعیلی سەفەویی لێکەوتەوە.

## باپیرە گەورەکان:

- فەیروزشا: مێژووی خانەوادەی سەفەوییەکان لەفەیروزشای کوڕی محەمەد شەرفشا دەسپێدەکات کەلەسەرەتادا لەدێی سنجانی سەر بە مەڕی پایتەختی خۆراسانەوە شۆڕشێکی هەڵگیرساندو بەرەو ئازەربێجان هەڵکشا و لەدژی کافرەکانی مۆقانیش لەولاتی کەرەج غەزای ئەنجامدا. لەئەنجامی ئەم چالاکیە ئایینی و لەخۆبردوانەیەی دەسەلاتی کێشا بەسەر ئەردەبیل کەبەناوبانگترین شارەکانی ئازەربێجان بوو لەگەڵ شارۆچکەکانی مۆقان و هەموو ئەو ناوچانەی کەسەر بەئەوانبوون، بەمەش بوو بەخاوەنی ماڵێکی زۆر و لەبەر زۆری ماڵاتەکانی ناچار بوو بەمەبەستی پەیدا کردنی لەوەڕگا رووبکاتە دێی زەنگین لەنزیك گەیلان.

- سەید عەوەز ئیسماعیل: لەدوای مردنی فەیروزشا بـوو بـە سـەرۆکی خانەوادەکـە و لەزەنگینەوە بەرەو گوندی سەفرەنجان کۆچی کرد کەیەکێك بوو لەلادێکانی ئـەردەبیل و لەوێ کۆچی دوایی کرد.

- محەمەد حافز: کاتێك سەید عەوەز ئیسماعیل محەمەد حافزی کوڕی کەتەمەنی حەوت ساڵبوو ونبوو سەفەوییەکان هەستیان بەلایەنگیریی لەلا پەیدابوو، پاشان لەدوای حەوت ساڵان ئەم منداڵـە دۆزرایـەوە و کـاتێکیش خـەڵك لـەهۆی دیـار نـەمانیان دەپرسـی؟ دەیـانگوت گوایـە پەریـەکان بردوویانـە بـۆ ئـەوەی قورئـانی پـێ رەوان بکـەن و شەریعەتەکانی ئیسلامی فێرکەن.

- سەلاحەدین رەشید: لەدوای مردنی محەمەد حافز سەلاحەدینی کوڕی جێـی گرتـەوە و پاشان لەوێوە بەرەو دێی کەلخوران کەسەر بە شاری ئەردەبیل بـوو کۆچـی کـردو لـەوێ مایەوەو خەریکی کشتوکاڵ بوو.

- قوتبـەدین یـەحیا: قوتبـەدین یـەحیا سـەرکردایەتی خانـەوادەی لـەدوای مردنـی سەلاحەدی رەشیدی باوکیەوە بۆ بـەجێما و ئـەویش لەکـەلخوران مایـەوەو موڵکـەکانی لەلایەن خەڵکی کەرەجـەوە دووچـاری پـەلاماردان هـات و لـەژێر سـێبەری ململانێـی موسـوڵمان و گاورەکان هێرشیان کردە سەر ئەردەبیل و ئەرمینیا و خەڵکێکی زۆریشیان لێ کوشتن.

- سـەیدساڵح: کەقوتبەدین کۆچی دوایی کرد سـەید سـاڵی کـوڕی بـوو بەجێنشـینی و هەروەك باب و باپیرانی خەریکی کشتوکاڵ بوو، ناوبانگیشی بە لەخواترسی و چاکسازی و یارمەتیدانی خەڵك دەرکردبوو، لەدوای مردنی لەکەلخۆران نێژرا.

- ئەمینەدین جوبرائیل: دوای ئەوەی سەیدساڵح کۆچی دوایی کرد، ئەمینەدینی کـوڕی لەجێی دانیشت و لەترسی پەلامارەکانی کـەرەج ناچـار بـوو بگوازێتـەوە بـۆ شـیراز و کەلخوران بەجێبهێڵێ و مـاوەی دە سـاڵ لـەوێ مایـەوە. لـەو ماوەیـەدا خـۆی لەشـێخ جەمالـەدینی بـاراتی ئـەردەبیلی نزیـك کـردەوە کـە یـەکێك بـوو لەسـۆفیە هـەرە بەناوبانگەکانی فارس و بوو بەموریدی و شێخیش دەولەتی کچی خۆی لێ مارە کرد.

لەمەوە بەدیار دەکەوێ کە ئـەم تێکـەڵاوییە و یەکگرتنـەی هـەردوو رەگـەزی فـارس و تورك، هـەر لەکۆنـەوە فارسـەکان بـەدڵیانبوو و لەتـەورێزی پایتـەختی ئازەربێجانـەوە بەتایبەتی پێشوازییان لێکردن و زۆریش بەم هاوسەرگیرییە دڵخۆش بوون، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ ئەم خانەوادە سەفەوییـە فارس نەبوون.

لەدوای رەوینەوەی مەترسی کەرەجیەکان ئەمینەدین ئیسماعیل بەمەبەستی کشتوکاڵ و بەڕێوەبردنی موڵکەکانی گەڕایەوە کەلخۆران و لەوێدا لەساڵی ١٢٥٢ز کوڕێکی لە ژنە فارسـەکەی بوو ناویان نا سـەفیەدین ئیسحاق. لەبەر ئەم هۆیە زیادەڕەویەکی زۆریان کرد لە وەسفی دەولەت لەزوهدو خواپەرستی و داوێـن پـاکی چـونکە لـەدایك بـوونی ئـەم منداڵەیان بە ویستێکی ئاسمانی لەقەڵەمدا.

سەفیەدین ئیسحاق: هەر لەمنداڵیەوە شێخ سەفیەدین ئیسحاقی ئەردەبیلی زانستەکانی فیکر و ئایینیی خوێند و پاشان بەناو نهێنیەکانی سۆفیگەری و خۆشەویستیی خوداییدا قوول بووەوە، لەسەر دەستی چەندین شێخی ئەو سەردەم دەرسی خوێند پاشان ویستی بچێتە فارس بەڵام لەشیراز گیرسایەوەو لەوێ پەیوەنـدی بەسـەعدی شـیرازی شـاعیرەوە کردو، ئینجا میرعەبدوڵلای فارسـی کەلـەپیاو مـاقولانی شـیرازبوو ئامۆژگـاری کـرد پەیوەندی بە شێخ تاجەدین ئیبراهیمی گەیلانی کەبەشێخ زاهید ناسرابوو بکات. ئەویش بەقسەی کرد و پاشان فاتیمەی کچی شێخی مـارەکرد و لەسـەر دەسـتی خەزوورەکـەی بووە میرێکی سۆفیی کە جیهان لەئامادەباشیدایە بۆ خزمـەتکردنی. لێـرەو دەگێڕنـەوە گوایە شێخ سەفیەدین ئیسحاق لەخەودا بینیوویەتی: (لەسەر چیای قـاف دانیشـتووە و لەناوەڕاستی چیاکە شمشێرێکی درێژ و پان هاتە دەرەوە سەرپۆشێکی لەپێستی سمۆرەی پێوەبووە و دوای ماویەکی کورت خـۆر هـەڵات و هـەموو جیهـانی لەبەردەم روونـاك کـردەوە). شـێخ ئـەم خەونـەی وا لێکدایـەوە کـە شمشـێرەکە دەسـەڵاتەو خۆرەکـەش رووناکیەکەیەتی، ئەمـەش بەیەکـەم هـەنگاو لەقەڵـەم دەدەرێ لـەکاروانی بانگـەوازی سیاسییانەی خانەوادەی سەفەویی. کاتێکیش شێخ زاهید کۆچی دوایـی کـرد ئـەو بـوو بەجێنشـینی و مـوردێکی زۆری لـەدەور کۆبـۆوەو هێنـدەی دیکـە ژمـارەی شـوێن کەوتووەکانی زیادی کردو رێزیشی لەناو پیاو ماقولاندا پتربوو و بەتایبەتیش رەشدەدین

فەزلوڵلا و غەیاسەدین محەمەدی کوڕی. ئەو کاتە ئازەربێجان لەژێر هەڕەشەی چەپۆکی مەگۆل بوو و، لەدوای زنجیرەیەك مـاڵوێرانی و دەردەسـەری کەلەئـەنجامی حوکـومڕانی ئـەوان سـازببوو مـابۆوە. خـەڵکیش بـەروون و ئاشـکرایی لەترسـی مـردن روویـان لەسـۆفیگەریی و دەروێشـی و گۆشـەگیریی کـرد، بـەو ئومێـدەی ببێتـە پەناگەیـەك کەهەندێك لەباری خراپی دەروونیان کەم بکاتـەوە، هـەر لەبەرژەوەنـدی شـێخیش بـوو کەبەردەوام ژمارەی ئەوانـەی پەیوەنـدییان بەخانەقاکەیـەوە دەکـرد لەزیادبوونـدا بـوو، هەرچەندە لەزۆر ناوچەکانی وڵات تەکیەو خانەقای دیکەش هەبوون.

سەدرەدین موسا: لەدوای مردنی شێخ سەفیەدین ئیسـحاق سـەدرەدین موسـای کـوڕی کەتەمەنی سی و یەك ساڵ بوو جێی گرتەوە و هەر لەمنداڵیـەوە لـە ئەلقـەکانی زکـری سۆفیگەرییدا پەروەردەبوو، هەمیشە پشـت و پـەنای وەلیـەکان و لاوەکـان بـوو، نـانی هەژارانی دەدا، بەم کارانەی توانی سـەرکردایەتی رۆحیـی بـۆ خـۆی مسـۆگەر بکـات. لەسەردەمی ئەویشدا خانەوادەکـەی سـەرەدەریان لـەکاری سیاسـەت دەردەکـرد، بۆیـە ئەشرەف جۆبانی تەیموورتاشی حـاکمی مەگۆلـەکان لەئـەردەبیل ئـەم هەڵوێسـتەی زۆر بەلاوە ناخۆش بـوو و لەدواییشـدا دەری کـرد و ناردیـە تـەورێز، بـەڵام زۆری ژمـارەی لایـەنگرانی سـەدرەدین موسـا لەئـەردەبیل حـاکمی مەگۆلـەکانی ناچـارکرد کـەوا بیگەڕێنێتەوە، کەچی جارێکی دیکە بیری لەوە کردەوە ژەهرخواردی بکات و بیکـوژێ. کاتێکیش شێخ بەمەی زانی یەکسەر ئەردەبیلی بەجێهێشت و چووە لای خاڵـەکانی لـە گەیلان و لەوێ نیشتەجێبوو، لەهەمان کاتیشدا شوێن کەوتووانی شێخ ئیبراهیم زاهیدی گەیلانی ئەشرەف جۆبانیان تۆقاند و لەوێ مایەوە تا ئەوکاتەی جـانی بـەگ کـەحاکمی مەگۆلی بوو لەخوارووی رووسیا هێرشی کردە سەر جـانی بـەگ لـەئازەربێجان لەسـاڵی ١٣٥٧زدا و لـەژێر دەسـتی دەسـەڵاتدارانی جۆبانیـەکانی دەرهێنـا، کەچـی یـەکێك لەسەرکردەکانی مـەگۆلی کـە نـاوی ئـەرگۆن بـوو تـوانی ئەشـرەف جۆبـان بکـوژێ و سەدرەدین موساش بەسەر بەرزی و شکۆوە گەڕایەوە ئەردەبیل، کـە ئەمـەش نیشـانەی بوونی لایەنگرانی سەفەوییەکان و پلەو پایەی شێخەکانیانە لەنێو ریزەکانی دەسەڵاتدارە نێوخۆییەکان.

لەسەردەمی ئەویشدا باری سیاسی لەعیراق و ئێران بەردەوام لەپشێویدا بوو، بەمەش وڵاتەکە بۆ چەند دەوڵەتێکی بچووك دابەش بوو، لەهەمووشیان دیارتر دەوڵەتی خانەوادەی جەلائیر لەعیراق، دەوڵەتی جوبانەکان لە ئازەربێجان، دەوڵەتی موزەفەرەکان لەیەزدو کرمان، دەوڵەتی ئەینجۆ لە فارس، دەوڵەتی سەربەداریی لە سەبزەوار بوون، ئەم بارە ئاڵۆزەش هەلی زیاتری بۆ ئەم تەریقەتە سازکرد تاکو خەڵکیی زیاتر بەمەبەستی وەدەست هێنانی ئارامیی دەروونی لەدەوریدا کۆببنەوە.

لەساڵی ١٣٩٣زدا سەدرەدین موسا کۆچی دوایی کرد و لەتەنیشت باوکی لە مەڵبەندی سۆفیەکاندا لەئەردەبیل نێژرا. گرنگی ئەم پیاوەش لەم خاڵانەی خوارەوەدابوو:

-پلەو پایەی خانەوادەی سەفەوییەکانی لەنێوەندەکانی دەسەڵاتدا گەیاندە ئەوپەڕی.

-لەسەردەمی ئەودا خانەوادەی سەفەوییەکان شارەزایی تەواویان لەبارەی سیاسەتەوە پەیدا کرد.

-مەزارەگەیەکی گەورەی بۆ باوکی سازکردو کردیە بارەگایەکی تایبەت بە شوێن کەوتووانی و لەدواییشدا بوو بەناوەندێکی رووحیی و سۆفیەکان لەوێدا کۆدەبوونەوەدو چەندین جۆر خێر و نەزریان تێدا ئەنجام دەدا.

-لە ئەردەبیلدا مزگەوتێکی گەورەی سازکرد و ناوی لێنا ئارامگای خانەدانانی سەفەویی (ارامگاه خاندان صفوی).

عەلای عەلی: عەلای عەلی لەدوای مردنی باوکی سەدرەدین موسا بووە خاوەنی مەقامی تەریقەتی سۆفیگەریی و بەوەش لەباب و باپیرانی جیابۆوە کە هەمیشە بەرگی رەشی دەپۆشی، بۆیە ناویان نا رەشپۆش (سیاە پوش) و زیادەڕەوی زۆری لەخواترسیدا دەکرد و لەساتەوەختی زۆربەی داگیرکاریەکانی تەیموورییەکان لەوڵاتە ئیسلامیەکانی خۆرەڵات کەتەیموورلەنگ بەرێوەی دەبرد بوونی هەبوو. لەئەنجامی خراپی بارو گوزەرانی خەڵکی ئێران کەبەهۆی تەیمووریەکانەوە دووچاریان هاتبوو رۆژ لەدوای رۆژ ژمارەی موریدەکانی زیاتر دەبوون.

عەلی سـیاپۆش لەلایـەن تەیموورلەنگـەوە چـاودێری دەکـرا و نێوانیـان زۆر خۆشـبوو، لەوانەش بوو کە تەیموورلەنگ مەیلی بەلای مەزەبی شیعەوە هەبووبێ و لەو ماوەیەشدا سێ جار کۆبوونەوەی لەگەڵ ئەنجامداوە. جار لەدوای جار تەیموورلەنگ هۆگریەکـەی بـۆ عەلی سیاپۆش زیاتر دەبوو. لەوانەشە گرنگترینی ئەو چاوپێکەوتنانەش ئەوەیان بـووبێ کەلەساڵی ١٤٠٢زادا لـەکاتی شکسـتهێنانی سـوڵتانی عوسمـانی بایەزیـد لەئەنکـەرە سـازکرا. هـەر لـەو شەڕەشـدا ژمارەیـەکی زۆری سـەربازە تورکـەکانی بـەدیل گـرت کەژمارەیان دەگەیشتە سی هەزار سەرباز و هـەموویان هێنایـە ئـەردەبیل. کـاتێکیش عەلی سایۆش داوای لەتەیموورلەنگ کرد کەوا دیلەکان بەوی ببەخشێ داواکاریەکەی بـۆ جێبەجێکرد. ئەویش لەنزیك ئارامگای باوکی لەئـەردەبیل و لەدەورووبـەری ئارامگـای گەنجە لە گول نیشتەجێی کردن و ناوی لێنان سۆفییە رۆملۆیەکان، لەبەر ئەوەی کەئەوان لەولاتی رۆمەوە هاتبوون و ئەوان ئێستا باپیرە گەورەکانی هۆزی رۆملۆی قزلباشی بوون کەبەهێزترین لایەنگری شائیسماعیلی یەکەم بوون و بەردەوام لەپێناویشـیاندا دژایـەتی تورکە سوننیەکانیان دەکرد و بەرگریشیان لەبەرنامە مەزەبیەکانی شیعەش دەکرد. ئـەم رووداوە بوو بەبنچینەیەك بۆ ئەوەی هۆزی قزلباش (سەرسوورەکان) خۆیان رێکبخەنەوە، بۆیەش ناویان نان سەرسوورەکان چونکە بە هێمـای سـوور سـەری خۆیـان دادەپۆشـی و لەگەڵ عوسمانییەکانیشدا هاورا بـوون لـە یـەکرِیزیی رەگەزپەرسـتی و بیروبۆچـوونەوە. لەلایەکی دیکەوە عەلی سیاپۆش کۆمەڵێکی لەو دیلانە ئازاد کرد تاکو بـبن بـە شـوێن کەوتووی ئـەو و سـەربازی هەمیشـە ئامـادە و یارمەتیـدەری سـەفەوییەکان لـەکاتی پێویستدا و ببنە چاوی تەیموورلەنگ لەئاسیای بچووك. شایانی باسە ئەمە یەکـەم جـار بوو لەهەموو مێژووی سەفەوییەکان کەوا تەیموورلەنگ موریدەکانی سـۆفیگەریی بخاتـە نێو ریزەکانی سوپاکەیەوە، ئەم دیاردەیەش پێشـکەوتنی بـەرەو رێکخسـتنی سـەربازی نیشان دەدا.

ئینجا شێخ چەندین ناوچەو هەرێمی لەلایەن تەیموورلەنگەوە لەعیراق و ئازەربێجـان پـێ بەخشرا و کوڕەکانیش چەندین گوند و زەوی کشـتوکاڵیان لەدەوروبـەری قـزل ئـوزون و گەمرەو ئەسفەهان و هەمەدان بەرکەوت، ئەمەش هەلی زیاتری بۆ خانەوادەی سەفەویی رەخساند داهاتێکی بەردەوامی زۆریان لەو ناوچانە وەدەست بکەوێ.

لەنێو پۆلین کردنی عەرەبەکاندا ناوی عەلای عەلی بەناوی عەلی سیاە عەلی هاتووە لەبەر ئەوەی شێخی سۆفیەکان بوو لەعیراقدا. لەساڵی ١٤٢٦زدا لەسەفەرەکەی بۆ حەج بەدیمەشقدا تێپەڕی کۆمەڵێکیشی لەلایەنگرانی ئەوانەی بەهەموو شێوەیەك پیرۆزیان دەکرد لەگەڵدابوو.

لەدوای سی و هەشت ساڵ سەرکردایەتی عەلی سیاپۆش لەقودس و لە١٥ئایاری ١٤٢٧ز لەکاتی گەڕانەوەی لەمەککە کۆچی دوایی کردو هەر لەقودسیش نێژراو مەزارگەیەکی گەورەشیان بۆ سازکرد، ئێستاش گۆڕەکەی بە مەزاری شێخ عەلی عەجەمی ناسراوە. شایانی ئاماژە پێکردنە کەوا سەرچاوە سەفەوییەکان مەیلی شیعایەتیەکی ئاشکرایان خستۆتە پاڵ و بەڵام گومان لەراستیەکەی دەکرێ و دەشڵێن گوایە یەکەم کەسبووە لەکوڕەکانی شێخ سەفیەدین ئیسحاق کەپەیوەندی بەمەزەبی شیعەوە کردووە، بەروون و ئاشکراش داوای کردووە کەلایەنگریی بکەن.

ئیراهیم: عەلی سیاپۆش سێ کوڕی هەبوو: شێخ شاە کەبە شێخ ئیبراهیم ناسرابوو و جەعفەر و عەبدولرەحمان بوون. بەڵام سەرەڕای ئەوەی کەهیچ کام لەو کوڕانەی لەئاستی پێویست نەبوون بۆ سەرکردایەتی کردن، کەچی ئیبراهیم سەرەڕای لاوازی کەسایەتیەکەی بوو بەجێنشینی، جگە لەمەش ئیبراهیم خاوەنی زیرەکی و شارەزاییەکی ئەوتۆ نەبوو کەبتوانێ کاروباری بانگەوازەکە هەڵبسووڕێنێ و نەخۆشیش بوو بەهۆی نالەباری هەڵسووڕاندنەکەشیەوە هەنگاوێکی دیکەش سەفەوییەکانی دواخست. بەڵام هەندێك سەرچاوە هەرگیز ئاماژە بۆ ئەم بابەتە ناکەن، ئیبراهیم لەساڵی ١٤٤٧زدا کۆچی دوایی کردو لەتەنیشت مەزاری باب و باپیرانی ناشتیان.

جونێد: شێخ ئیبراهیم چوار کوڕی هەبوو: جونێد، ئەبوسەعید، سەید ئەحمەد، سەیدبایەزید، خواجە جیهان میرزا و ئیبراهیم خواجەگی. جونێد لەهەموو کوڕەکانی دیکە بۆ سەرکردایەتی لێوەشاوەتر بوو، بۆیە بوو بەجێنشینی باوکی و سەرکردایەتی بزووتنەوەکەی گرتە دەست و ئارەزووی موڵکایەتیشی لەلا پەیدابوو و پاشان وێنەی پاشاکان هەڵس و کەوتی دەکردو نازناوی سوڵتانی پێبەخشراو بانگەوازە مەزەبیەکەشی

وەرگێڕا بۆ بزووتنەوەیەکی سیاسی پشت بەستوو بەژمارەی موریدەکان و ڕێکخستنیان لە ڕێکخراوێکی نیمچە سەربازی.

ئەوکاتە پشێوی باڵی بەسەر ئێراندا کێشابوو و لەدوای مردنی شاروخ وڵاتەکەی چەندین بزووتنەوەی سەربەخۆیی بەخۆوە بینی کە سەرکردە تەماعکارەکان سازیان دەداو لەدروستکردنی چەند ئیمارەتێکیش سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، شۆڕشی (مشعشعەکان)یش هەرە توندەکەیانبوو، چونکە هەڕەشەی داگیرکردنی خوارووو و خۆراوای ئێرانی دەکرد، جونێد ئەم بارەی قۆزتەوەو لەئەردەبیل جێگیربوو.

لەسەر دەستی شێخ جونێدیش لادانێکی مەزەبی گەورە لەبزووتنەوەی سەفەوییەکان بەلای مەزەبی دوازەیی بەئاشکرایی دروستبوو. ئەو سروشتە کۆمەڵایەتییەی کەباڵی بەسەر خۆراوای ئێران و خواررووی ئەنادۆڵ و باکوری شامدا کێشابوو، کەئەم ناوچانەش هۆزە تورکمانەکانی لێبوو دەسەڵاتێکی درێژخایەنیان لەنیوەی یەکەمی سەدەی پانزەهەمی زایینی لەدوای هەرەسهێنانی دەسەڵاتی ناوەندی عوسمانی لەئەنجامی هێرش و پەلامارەکانی تەیموورلەگ وەگیرخست. سەرەڕای ئەوەش چەسپانی دەسەڵاتی عوسمانی لەدوای ئازادکردنی قوستەنتینیەو هەڵکشان بەردەوامی عوسمانییەکان لەئەنادۆڵ دەسەڵاتی هۆزە تورکمانەکانی بچووك کردەوەو ئەو نیمچە سەربەخۆییەی کەهەشیان بوو گەمارۆ درا، بواری لەبار و رەخساو پەیدابوو بۆ ئەوەی پروپاگەندە ناییینیە تێکەڵ بەناوەڕۆکێکی سیاسی بەسەرکەوتووی بلاۆبکەنەوە.

لەم کاتەدا جونێد گەشتێکی لە ئەنادۆڵەوە بۆ ناوچەکانی وڵاتی شام دەسپێکرد و لەو ناوچانەدا ڕێکەوتی بیروباوەڕە شیعیە توندڕەوەکانی کرد، کاتێکیش لەئەردەبیل دەرکرا بەدوای لایەنگر و موریدیدا دەگەڕاو بڕیاریدا تورکمانەکان بەرزکاتەوە بۆ ریزەکانی خۆی ئەویش بەهۆی ئەوەی کە مەراسیمەکانیان بۆ سازبکات و خەرجیەکانیان بۆ بدات و بیانپارێزێ، پڕوپاگەندەی ئەوەش بلاۆبۆوە کە ئەو دەوڵەتە عەلەویەی بڕیارە لەکۆتایی سەردەمەکان بەدەرکەوێ ئەوا نزیکبۆتەوەو بەسەرکردایەتی ئەو دروست دەبێ و هەر ئەویش لەریزی سوپای مەهدیدا دەجەنگێ، لەمەشدا مەبەستی ئەوەبوو بناغەیەك دابڕێژێ بۆ پڕۆژەیەکی سیاسی ئامانجی دروسکردنی دەوڵەت بوو.

لەدواییدا جونێـد چـووە حەلـەب و لـەلای شـێخ محەمـەدی کـوڕی ئەویسـی ئـەربیللی کەیـەکێك بـوو لەشـوێن کـەوتووانی سـەفەویی مایـەوە، لەوێشـەوە چـووە کـەللز کەشارۆچکەیەکی حەلەب بوو و بارەگایەکی کۆنی تورکمانەکانیش بـوو، پاشـان چـووە چیای موسـا لەئـەنتاکیا، پێشـنیاری کـرد کـەوا تیپێکـی شـیعەی بـەڕێز سـازبکات کەموشەعشعەکان شوێن پێیان تێدا قاییم و گەورەبێ، ئەو هێزە رووحییەشـی کەلـەناو دڵ و دەروونی شوێنکەوتووە تورکمانەکاندا گەورەو پێگەیشتووبوو، قۆزتـەوە، بەمـەش شێخ محەمەد کە خانەخوێی بوو دژی وەستاو ئەم کـارەی پێپەسـەند نـەبوو بـۆ گەیشـتن بەمەرامە سیاسیەکانی و لەدوای ئەوەش هێندەی دیکە شوێنکەوتووانی چالاکیەکانیان زیادکرد. کۆمەڵگای حەلەبیش بەهیچ شێوەیەك ئەم بانگەوازەیان پێ قبووڵ نەبوو، بۆیە هەر بەخێرایی کۆبوونەوەیـەکی فیقهیـان سـازکرد بـۆ ئـەوەی جونێـد دادگـایی بکـەن بەتۆمەتی ئەوەی پێشەوای بەشتێکی پیرۆز وەسفکردووە. لـەو ئەنجوومەنەشدا بڕیـادار کەبیکوژن و، کاتیش بەمەی زانی بەنهێنی حەلەبی بەجێهێشت و بەرەو دیاربەکر چـوو و ئەوکاتە ئوزون حەسەن حوکومڕانی دەکردو پەیوەندیەکەی لەگەڵدا قوول کردو خەدیجە بیگەمی خوشکی مارەکرد بۆ ئەوەی ببێتە پەردەپۆشێك و پرۆژە سیاسیە-مەزەبیەکەی بپارێزێ، ئوزون حەسەنیش ئامانجی ئەوەبوو کەوا شیعەکان ببنە لایەنگری بـۆ دژایـەتی قەرە قوینلوو. لەهەمان کاتیشدا ئەم هاوسەرگیریە تەکانێکی دیکـەی دایـە جونێـد و مکوڕبوو لەسەر ئەوەی بگەڕێتەوە ئـەردەبیل و بـۆ ئەمـەش داوای یارمـەتی لـەئوزون حەسەن کرد ئەویش یارمەتیەکەی بۆ دابینکرد، پاشـان ئامـەدی بەجێهێشـت و بـەرەو وڵاتی خۆی بەرێکەوت، کاتێك گەیشتە شەروان سـوڵتانی خـەلیلی تورکمـانی حـاکمی ئەوێ کەلایەنگریی قەرەقوینلوو بوو رێگەی پێگـرت و لەنێوانیانـدا شـەڕێکی سـەخت روویداو لە٤ئازار١٤٦٠زدا جونێد کوژرا.

لەراستیشدا لەسەردەمی جونێد بزووتنەوەی سەفەویـەکان زیاتر مۆرکی بزووتنەوەیـەکی سیاسی بەسـەردا زاڵبوو، هەروەها لایەنگرانی لەوڵاتی عوسمانییەکان و عیراق و سەرجەم وڵاتانی ناوچەکەوە بۆی دەهاتن و هەنـدێگ لەدۆسـتەکانی ئـەوەیان بڵاوکـردەوە کـەوا جونێـد دوای ئـەوەی کـوژراوە زینـدوو بۆتـەوە، ئەمـەش نزیـك خسـتنەوەیەکە لـە بیروبۆچوونی موشەعشعەکان.

هەرچیەکبێ لەسەردەمی جونێد سەفەوییەکان وێنـەی حزبێکـی سیاسـی شۆڕشـگێڕیان پێوە نووساو، بەرزو پیرۆز راگرتنی سەرکردەکانیان خزاندە ناو بیروباوەڕو مەزەبیانـەوە و ئەمەش زیاتر لەسەردەمی خەلافەتی حەیـدەری کـوڕی جونێـد روون دەبێتـەوە کاتێـك لەدوای مردنی باوکی بوو بەسەرکردەی بزووتنەوەکە.

حەیدەر: حەیدەر جێی جونێدی بـاوکی گرتـەوەو تەمەنیشـی کـەم بـوو، بـەهاوکاری و چاودێریی لایەنگرلنی کەژمارەیان زۆر بوو بەهۆی کوشتنی جونێدی سەرکردەیان ورەیـان دابەزی، ناچار پەنای بردە بەر ئاشتی و چاوەڕێی کـاتێکی گونجـاوی دەکـرد بـۆ ئـەوەی جارێکی دیکە هەڵسێتەوە، لەو پێناوەشـدا بـەهۆی زیـاد بـوونی ژمـارەی لایـەنگرانی گەشەی بـەهێزەکانی دەدا، کاتێـك گەیشـتە بەهێزییـەکی تـەواو هـەنگاوی یەکـەمی هەڵهێناو رەوەرەوەی بزووتنەوەی سۆفیگەریی بەرەو مەزەبی شیعەیی دوانزەیی هاویشت و نیشانەیەکی تایبەتیشی بۆخۆی هەڵبژارد تا لەخەڵکی دیکـەی جیابکاتـەوە، ئـەویش فێسێکی سوور بوو کە دوانزە نقێمی سووری پێوەبوو و ئاماژە بوو بـۆ دوانـزە ئیمـامی شیعەکان، لێرەدا عوسمانییەکان ناویان لەو کەسانەی کـە ئـەو جـۆرە فێسـەیان لەسـەر دەکرد نا قزلباش واتە سەرسوورەکان.

حەیدەر هەر لەئەردەبیل مایەوە لەترسی ئەوەی نەوەکا لەئەنجامی کشانەوەی هێزەکـانی سەفەوی زیانیـان پێبگـات، کـە ئـەوکات ئـوزون حەسـەن دەسـتی بەسـەر عـێراق و ئازەربێجاندا گرتبوو، ئـەویش لـەدوای ئـەوەی کەلەسـاڵی ١٤٦٨-١٤٦٩ جیهانشـای کوڕی قەرەیوسف و ئەبی سەعیدی تەیووری لەناوبردو، هیچ شتێك لـەعێراق و ئێـران و پشت رووباردا نەما کە سڵی لێ بکاتەوە.

ئینجا سەرکردەی ئالاق قوینلوو داوای لـە حەیـدەری خوشـکەزای کـرد کـەوا دروشمـی تەریقەتەکەی بۆ بنێرێ تاکو خۆی و منداڵەکانی لەبەری بکەن، دوای ئەوە داوەتی کـرد بۆ دیاربەکر و کچی خۆشی لێ مارەکرد کـەناوی حەلیمـە بـەگم بـوو و بـە عەلەمشـا ناسرابوو، ئەو کچەشی لەو ژنەی بوو کەکچی ئیمپراتـۆر یوحـەننای چـوارەمی حـاکمی تەڕابزۆن بوو و ناوی دەسبینا خاتوون بوو. وادیـار بـوو کـە ئـوزون حەسـەن ئـارەزووی ئەوەی دەکرد یارمەتی زاواو خوشکەزاکەی بدات تا بتوانێ بۆخۆی قەوارەیـەك دروسـت

بکات. بەڵام ئـەو لەسـاڵی ١٤٧٧زدا کۆچـی دوایـی کـرد و نـەیتوانی ئـەو ئامانجـەی بهێنێتەدی. لەدوای ئەویش کورەکەی کە میراتگری یەکـەمی بـوو هاتـە جێـی، بـەڵام لەلایەن یەعقوبی برا بچووکەکەیەوە پیلانی بۆ سازکرا و دوای چەند مانگێـك لـەمردنی باوکی کوشتی و خۆشی کرد بە حاکمی قەرەقوینلوو.

پەیوندیەکانی نێوان حەیدەرو یەعقوب رووی لەخراپی کردو یەعقوب هەمیشە چـاودێری هەڵس و کەوتەکانی دەکرد، تا کار گەیشتە ئـەوەی بەتـەواوی نێوانیـان شـڵەژا، بۆیـە حەیدەرو لایەنگرانی ناچار بوون کەوا دیار بەکر بەجێبهێڵن و بگەرێنەوە ئەردەبیل.

لەلایەکی دیکەشەوە حەیدەر دەرکی بەوەکرد کە ئەم رووبەرووبوونەوەیـە کارێکـە هـەر دەبێ ئەنجامی بدات بۆیـە کەوتـە هـەوڵی بـەهێزکردنی خـۆی و دووجـار لەسـەر یـەك کـەرەجی داگیرکـرد، یەکـەم لەسـاڵی ١٤٨٣و دووەم لەسـاڵی ١٤٨٧زدا، ئـەویش بەمەبەستی ئەوەبوو کەوا جێپێیەك بۆخـۆی بکاتـەوەو دەسـکەوتێکی ئـەوتۆش پەیـدا بکات تاکو بەهۆیەوە بتوانێ بژێوی سوپاکەی دابـین بکـات، بێگومـان کـاتێکیش ئـەم هەنگاوانەی هەڵهێنا روخسەتی لە خەلیلی حاکمی شەروان وەرگرت، چونکە ناوچـەکەی ئەو دەکەوتە سەر رێی کەرەج، پاشان کەهەستی بەلاوازی کردن هەوڵیدا دەسبەسەر ئـەم وڵاتەشدا بگرێ و تۆڵەی کوژرانی باوکی بکاتەوەو هێرشی کردە سەر شـەماخی پایتـەخت. خەلیل ترسی لێ نیشتوو داوای یارمەتی لەیەعقوبی سەرکردەی ئالاق قوینلـوو و دوژمـنی حەیدەر کرد. هەردوولا لەو شەرە سەرکەوتووانەیەدا هاوکاری یەکتریان کـرد و لەتەبرسـتان لەنزیك دەربەند لەساڵی ١٤٨٨ز هەردوو لای شەرکەر بەیـەکیان داداو لەئەنجامـدا حەیـدەر کوژرا.

گرنگی حەیدەر لەوەدابوو کەوا بزووتنەوەی سەفەویی لە چوارچێوەی ئایینیەوە هێنایـەدەرو خستیە ناو چوارچێوەیەکی سـەربازی، ئـەویش لـەدوای ئـەوەی موریـدەکانی بەشـێوازێکی رێکوپێکی سەربازانە رێکخست و پۆشاکێکی تایبەتتری لە کڵاوە سوورە دوانزە نقێمیەکەی کەئاماژە بوو بۆ دوانزە ئیمامەکە بۆ سازکردن کـەزیاتر لەخـەڵکی دیکـەی جیادەکردنـەوە ئەمەش بووە دروشمێکی تایبەت بە هێزەکانی سـەفەویی.

سولتّان عەلی: لەدوای مردنی خۆی حەیدەر سێ کوڕی بەجێهێشت: ئیبراهیم و ئیسماعیل و سولتّان عەلی، ئەوەی دواییان بوو بەجێنشینی باوکی و سەرۆکایەتی خانەوادەکەی وەرگرت و سەرجەم موریدەکانیش لەدەوری کۆبوونەوەو هانیشـیان دەدا تـا تۆڵـەی خـوێنی بـاوکی بکاتەوە، ئەمەش یەعقوبی سەرکردەی ئـالاق قوینلـوی نیگـەران کـردو داوای لـەحاکمی ئەردەبیل کرد قۆڵبەستیان بکات، ئەویش ئەوان و حەلیمەی دایکیشیانی گـرت و بەدەسـت مەنسوری حاکمی ولاّتی فارسی دان ئەویش لەقـەلاّی ئەسـتەخەر زینـدانیی کـردن، بـەلاّم ماوەی زیندانیەکەیان زۆری نەخایاند و لەدوای چوار ساڵ و دوای مردنی یـەعقوب لەسـالّی ١٤٩١زدا کەلەئەنجامی ململانێی گرتنەدەستی دەسەلاّت لەنێوان هاوپەیمانەکانیدا کـوژرا، ئازاد کران.

رۆستەمی کوری مەقسودی کوری ئوزون حەسەن توانی ببێتە سـەرکردەیەکی سـەرکەوتووی ئالاق قوینلو لەدیاربەکر، بەلاّم لەلایـەن بایسـەنقەری کـوری یەعقوبـەوە دژایـەتی کـرا، کەئەویش داوای یارمەتی لە فروخ یەسارشای حاکمی شەروان کرد یارمەتی بدا، ئەم کارەش پاڵی بەرۆستەمەوە نا هەر سێ براو دایکیان ئازاد بکات و کورە گەورەکەشـی هانـدا تـاکو تۆڵەی کوشتنی باوکی لەخەلیلی باوکی فروخ یەسارشا بکاتەوە.

هەواڵی ئازادبوونی ئەمانە لەنێو موریدەکاندا بلاّوبووەوە هـەموویان لـەدەوری کۆبوونـەوەو سولتّان عەلیان بەرزکردەوە بۆ سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی خانەوادەکـەیان، ئینجـا شـەری لەگەڵ بایسنقەردا کردو لەسالّی ١٤٩٢زدا کوشتی، ئەم رووداوەش لەبەرژەوەندی رۆستەمدا بوو، بۆیە سولتّان عەلی خەلاّت کرد و زۆر بەگەرمیەوە لەدەرباری خۆیدا پێشوازی لێکـرد، رێشیپێدا بچێتە ناو ئەردەبیل و لەوێ سەرۆکایەتی موریدەکانی بکات.

وا دیار بوو کەوا ئەو کۆبوونەوە گەورەیەی موریدەکان رۆستەمی بێزارکردبـێ، بۆیـە کۆنـە قینەکان لەنێوان ئەو دوو خانەوادەیەدا سەری هەڵدایەوەو هـەر سـێ براکـەی بـانگ کـردە تەوریز بەمەبەستی ئەوەی پەیوەندیان لەگەڵ موریدەکانیان بچرێنـێ، بـەلاّم سـولتّان عـەلی دەرکی بەمەرامەکانی رۆستەم کرد و شەڕ لەنێوانیاندا بەرپابوو، لەو شەڕەشدا سولتّان عەلی کوژراو تەرمەکەیان بردەوە بۆ ئەردەبیل و لەوێ لە مەزارگەی بـاب و باپیرانیـان بـەخاکیان سپارد، ئینجا ئیبراهیم و ئیسماعیلی برای روویان لە گەیلان کرد. پاشان ئیبراهیم لـەکاتی

هەوڵدانی تا بگەڕێتەوە ئەردەبیل لەڕێگا کوژراو ئیسماعیلیش لەگەیلان مایەوەو چاوەڕێی دەرفەتێکی دەکرد تا بگەڕێتەوە ئەردەبیل. لەئەنجامی ئەوەشدا ململانێـی توونـد لـەنێوان هەردوو خانەوادەکەدا سـازبوو و کەسـەردەمی شا ئیسماعیل کێشەکان یەکلایی دەکاتەوە.

## رۆڵی هۆز لەدامەزراندنی دەوڵەتی سەفەویی:

لێکۆڵەرەوە لەمێژووی دەوڵەتی سـەفەویی سەرنجی رۆڵی گەورەی هۆزە تورکمانـەکان دەدات کە لەبنیاتانی دەوڵەتی سـەفەوییدا هەیان بوو و بەردەوامیشیان پێدا. لەراستیدا ئـەو هێـزە سەربازیانەی کەیاوەری شائیسماعیلی یەکەم بوون لەچالاکییە سەربازیەکانیدا، زۆربەیان لە پیاوەکانی هۆزە تورکمانەکانی مەسمات قزلباش بوون، ئەوانیش:

### رۆملوو:

وادیارە کە کۆنترین موریدی خانەوادەی سەفەویی لەکۆمەڵەی قزلباشەکانی هـۆزی رۆملـۆ بوون و ئەوانیش لە بەرەی دیلەکانی جەنگی تورکەکان بوون کەتەیموورلەنگ لەدژی سـولتان بایەزیدی یەکەمی عوسمانی هەڵگیرساندبوو و لەدوای جەنگەکە لەگەڵ خۆیدا بردبـوونی بـۆ ئەنکەرە. ئەوکاتەش عەلایی عـەلی سـەفەویی هـەوڵی ئـازادکردنی بـۆ دان تـاکو لەگـەڵ رۆژگاردا ببنە باشترین موریدی خانەوادەکەیان.

### شاملوو:

ئەم هۆزە سـەر بە شامن چونکە کاتی خۆی لەدەوروبەری حەلەب و ئەدەنـە و تەرسـووس و سەرجەم ناوچەکانی بـاکوری ولاتـی شـامەوە هـاتبوون، سەرکردەکانیشـیان لەسـەردەمی حوکـومڕانی سـەفەوییەکاندا پلـەو پایـەی بـەرزیان هـەبوو بەتایبـەتی لەسـەردەمی شـا ئیسماعیلی یەکەم، لەوانەش سێ برایان: حوسێن بـەگولّلا خـان و مـیری میرزادەکـان شـا ئیسـماعیلی یەکەم کە لە جەنگی چالدێران کوژرا، ئینجا دەروێش خانی بووە خاوەنی رێز و خۆشەویستیی لەلای شـا، هەروەهاحوسـێن خـانی برایـان کـە پلـەی مـیری میرزادەکـانی لەسەردەمی تەهماسبی یەکەم پێدرا.

**زەینەل خان: حاکمی هەرات بوو لەسەردەمی شا تەهماسبی یەکەم.**

عەلی قولی خان: پلەی وەزیری هەبوو لەسەردەمی شاعەباسی یەکەم و سەرجەم زەویــەکانی شاری رەی وەك خەڵات و ریزلێنانێك پێبەخشی.

**ئستاجلوو:**

هۆزێکی تورکمانی هەر لەسەرەتاوە پاڵپشتی لە خانــەوادەی دەوڵــەتی ســەفەویی دەکــردو لەناوچەکانی ئەرزەنجا لە ئەرمینیا بلاّوبوونەوە، لەسەرکردەکانیشیان:

محەمەدخان: حاکمی دیاربەکر بــوو لەلایــەن شائیســماعیلی یەکەمــەوە دامــەزرا، ئــەویش هێزەکانی لە بەرەی خۆرەلاّتەوە لە ئاسیای بچووك و بەشی بەرزاییەکانی رووبــاری فــورات لە مەرعەش بوستان و خەرتەبرت و ئامەد و رەهای گرتبـۆوە، بەمــەش هەرەشــەی لــە سوڵتان سەلیمی یەکەمی عوسمانی کردو لەجەنگی چالدێران کوژرا.

**قەزاخان:**

برای محەمەد خان و جێنشــنی بــوو لــە دیاربــەکر، کەچــی لــەماردین لەســاڵی ١٥١٦ز لەئەنجامی رووبەرووبوونەوەیەك لەنێوان ئەو و مستەفا پاشای عوسمانی کــوژرا کەیــەکێ بوو لەسەرکردەکانی سوپای سوڵتان سەلیمی یەکەم، بیست و حەوت شازادەی ئەم هــۆزە پلەو پایەی گرنگیان لەدەوڵەتی ســەفەوییدا هەبوو.

**تیکالۆ:**

هۆزێکی تورکمانی بوو لە دەورووبەری قونییە لــە ئاســیای بچــووك نیشــتەجێ بــوون و ئەندامانی خانەوادەکەشیان لە ئیمارەتی تەکــە لەباشــووری ئــەنادۆل بلاّوبوونــەوە، ئــەم هۆزە رۆڵێکی ئێجگار کاریگەریان هــەبوو لەدەرکــەوتنی تورکمانــەکان لــە بانگــەوازی شیعەمەزەبیی لەناوچــەی مەنتشــا و ئایــدین و یــەکێك لەشێخەکانیشــیان پەیوەنــدیان پێوەکرد، کەئەویش بابە حەسەن خەلیفەبوو و یــەکێك بــوو لەدامەزرێنــەرانی دەوڵــەتی ســەفەویی لەئەنادۆڵ: بەهۆی خزمەتی حەیدەری باوکی شائیسماعیلی یەکــەم کــە داوای لێ کرد بگەرێتەوەو بێتە ناو مەزەبی شیعەو موریــدەکان کۆبکاتــەوە. لــەدوای ئــەویش

نوری کوڕی کە پاشان بە شاقولی ناسرا، واتە (بەندەی شا) ئەم فەرمانەی جێبەجێکردو لەساڵی ١٥٠٩زدا سەرکردایەتی شۆڕشێکی لەدژی دەوڵەتی عوسمانی لە ئیمارەتی تەکیە بۆ بەرژەوەندی شا ئیسماعیلی یەکەم کرد و بیست هەزار چەکداریشی لەدەوری خۆی کۆکردەوە و خۆشی وەك مەهدی راگەیاند و پاشان سەدری ئەعزەم خادم عەلی پاشا لە ناوچەی تشوبوك لەنزیك سیواس بەرەنگاری بووەوە و شکستی پێهێنا و لەتەموزی ١٥١١زدا کوشتی. لە میرزادە بەناوبانگەکانیشی: جوهاسوڵتان و میری میران شا ئیسماعیلی یەکەم و ئەولەمەخان کە حاکمی ئازەربێجان بوو لەسەردەمی شا تەهماسب و محەمەد خان شەرەفەدین ئۆغلی حاکمی هەرات بوو لەسەردەمی شامحەمەدی خودابەندە (١٥٧٨-١٥٨٧ز).

## زولقەدەر:

سەرچاوەی ئەم هۆزە دەگەڕێتەوە بۆ تورکمانەکانی مەرعەش و بوستان و لەدیاربەکر نیشتەجێبوون و پاشان ئەندامانی ئەم هۆزە پەیوەندیان کرد بە خانەوادە سەفەوییەکانی سەردەمی شێخ جونێد و بەشداریان کرد لەئەو شەڕانەی ئەم خانەوادەیە لەدژی شەروان شایەسار کردیان و پاشان پشتیوانیان لەحەیدەری کوڕیشی کردو شائیسماعیلی یەکەم هەرێمی فارسی پێ بەخشین. لەهەمووشیان بەناوبانگتر محەمەدی کوڕی کوشای کوڕی عەلادەولە بوو.

## ئەفشار:

هۆزێکی تورکمانیە و ئەندامانی لەتورکستانەوە بەرەو ئازەربێجان و باکوری وڵاتی شام لەبەر فشاری مەغۆڵەکان کۆچیان کردو لەئازەربێجان و قەزوین و دەورووبەری تەهران و خۆراسان و فارس و کرمان و مازەندەران و خوزستان نیشتەجێبوون و، ناوی هۆزەکەشیان لە ئۆشاریا یاخود شارەوە هاتووە کە ئەویش نەوەی جەنگیزخان بوو. ئەم هۆزەش دابەش دەبێ بۆ قاسملو و قەرەخلو، لەبەشی دووەمدا نادرشای ئەفشاری پەیدابوو کەیەکێك بوو لەگەورەترین حاکمەکانی ئێران لەچەرخی نوێ و دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەفشاری بوو کە لەدوای سەفەوییەکان حوکمی دەوڵەتی سەفەویی کرد.

## قاجار:

رەچەڵەکی ئەم هۆزە تورکمانە دەگەڕێتەوە بۆ قاجارنویان کەیەکێك بوو لەسـەرکردەکانی مەگۆل و لەناوەراستی ئاسـیا و لـەکاتی داگیرکاریەکـەی مەگۆلـەکان کۆچـیان کـرد و لەچەندین شوێنی جیاجیای ئێران بلاّوبوونەوە بەتایبەتیش ئازەربێجان، بەلاّم بەشـێکیان لەئـەرمینیا و شـام نیشـتەجێبوون، کەچـی ماوەیـەکی زۆری نـەبرد ئـەوانیش لەگـەڵ تەیموورلەنگ کە لـەدوای ئـەوەی کۆتـایی بـەداگیرکردنی ناوچـەکە هێنـاو گەڕانـەوە و لەئازەربێجان جێگیربوون و پاشان پەیوەندیان بەسوپای شا ئیسماعیلی یەکەمەوە کـردو هەندێك لەئەندامانی ئەم هۆزە پلەو پایـەی گرنگیـان لەسـەردەمی شاعەباسـی یەکـەم وەرگرت.

## وەرساق:

هۆزێکی تورکمانیەو لەوەرساق لە هـەرێمی قرمـان لەئاسـیای بچـووك نیشـتەجێبوون، پاشان بەمەبەستی ئەوەی یارمەتی شائیسماعیل بدەن لەجەنگەکانیدا بەرەو ئازەربێجان کۆچیان کرد.

## سۆفیەکانی قەرەباغ:

ئەم بەشە لەچەند کۆمەڵەیـەکی ئـەو سـۆفیانە پێکهـاتووە کـە هاتنـە پـاڵ ریزەکـانی شائیسماعیلی یەکەم کاتێك هاتە نێو ئازەربێجانەوە.

لەهـەمان کاتیشـدا ژمارەیـەکی زۆر لەتورکمانـەکان هاتنـە بـەر خزمـەتی دەوڵـەتی سەفەویی، جگە لەمانیش:

-تورکمانەکانی دیاربەکر کەلەدوای ئەوەی لەسـاڵی ١٥٠٧ز لەسـەر دەسـتی قزلبـاش دەوڵەتەکەیان هەرەسی هێنا.

-چەند کۆمەڵەیەکی فارسەکان لەدوای ئەوەی قزلباش لەساڵی ١٥٠٣ز دەستی بەسـەر هەرێمی فارس و عیراقدا گرت کاریگەرییـەکی قوولیشـیان هـەبوو لەسـەر مێـژووی دانیشتوانی بەرزاییەکانی ئێران.

-دانیشتوانی خۆراسان (تورك و فارسەكان) بەهۆی ئەو جەنگەی كەلەنێوان سەفەویی و ئۆزبەكەكان لەساڵی ١٥١٠ز لەمەرو هەڵگیرسا.

-كۆمەڵەیەكی ئەفغانی سەردەمی شا تەهماسبی یەكەم.

-بلوجەكان، ئەوانە بەكۆچەریی دەژیان لەنێوان كرمان و سیستان و لەناوچەكانی لوجستان بلاوبوونەوە، هەروەك چۆن لەبیابانەكانی دەوروبەری دۆڵی سەند بوونیان هەبوو.

ئەم هۆزانە لەدەوری خانەوادەكانی سەفەویی كۆبببوونەوە خۆشەویستی شاو خۆبەخت كردن لەپێناوی بەجێهێنانی ئامانجەكانی شا كەبریتی بوون لەبەرگریكردن لەقەوارەی سەفەوییەكان و چەسپاندنی مەزهەبی شیعەی دوانزەیی. قزلباشەكان لەلای خۆیانەوە سەرباری بچووكی تەمەنیشی وەك پێشەوایەكی تەواو و بێكەم و كوری وێنەی باب و باپیرانی دانیان بە شا ئیسماعیلی یەكەم نا، چونكە ئەوان وایان دەبینی كە خۆبەختكردن و بەجێگەیاندنی فەرمانەكانی ئەركی ئایینی سەرشانیانە. بۆیە هەندێكیان بەبێ چەك دەچوونە جەنگەكانەوە، چونكە بڕوایان وابوو ئەم ڕێنشاندەرە بێكەم و كوڕییە لەمەیدانی شەڕدا پارێزگاریان لێ دەكات و لەدواییدا كار گەیشتە ئەوەی كە لەخوا زیاتر یادیان دەكردەوە.

هەرچیەك بێ كاتێك ئیسماعیل شا هاتە ناو سیاسەتی ژیان ئەو پروپاگەندانەی كە جاران بۆ جونێدی باوك و حەیدەری باپیری لەسەر بنچینەی مەزهەبی دەكرا هەر درێژەیان هەبوو، ئارەزووی گەیشتن بە تەختی پاشایەتی لەناوەڕۆكدا مەبەستەكەی لەناو ریزەكانی دژەكانی لەخانەوادەی حاكمی مەزهەبی سوننی لەئێران پێكا، كاریگەری ئەم پروپاگەندانەش زیاتر لەنێو دانیشتوانی شارەكانی خۆراوای ئێران بەدیاركەوت.

لەراستیشدا كۆبوونەوەی ئەم هۆزە توركمانانە لەدەوری خانەوادەی سەفەویی بەهۆی سێ هۆكاری مەزهەبی و ئابووری و سیاسی بوو.

چونكە لەلایەن هۆكاری مەزهەبیەوە، ئەم هۆزانە لەدەوری مەزهەبی شیعە كۆبوونەوە، كارێكی سروشتیش بوو پشتیوانی لەم بزووتنەوەیە بكات كە لەهەوڵی سازكردنی

دەوڵەتێکی شیعە مەزەبیی دایە لەو ناوچانەی رکابەریی دەوڵەتی سوننە مەزەبی عوسمانی دەکەن.

بەلاّم لەلایەن هۆکاری ئابوورییەوە عوسمانییەکان هەر لەسەردەمی سوڵتان محەمەد (١٣٥١-١٤٨٢ز) بەلایەنی کەمەوە تا بەرووداوەکانی گۆڕینیی یەکجارەکی دەگا لە ژێرخانی ئابووری بۆ چەسپاندنی مەرکەزیەت، ئەویش بەهۆی دەرهێنانی ئەو زەوی و زارانەی لەژێر دەستی دەرەبەگەکاندا بوون کەزۆربەیان تورکمان بوون، کاتێکیش ئەو هۆزانە شائیسماعیلی یەکەمیان بەرزکردەوە بۆ سەر تەختی حوکمڕانیی تەمەنی لە چواردەساڵ تێپەڕی نەدەکرد، چونکە دەیان ویست تۆڵەی ئەو زیانانە بکەنەوە کەبەهۆی دەوڵەتی عوسمانییەوە لێیان کەوت، پاشان زۆربەی زۆری جووتیار و خەڵکە هەژار و چەوساوە عەلەویەکان لەدەووری کۆبوونەوە.

لەرووی هۆکارە سیاسیەکەشەوە، هەموو سەرکردەی هۆزە تورکمانەکان لەسەر ئەوە کۆك بوون کەوا دژایەتی دەوڵەتی عوسمانی بکەن پشتگیریی لە سەفەوییەکان بکەن و هەوڵ بدەن کەوا رژێمێکی دیکە لەجێی عوسمانییەکان دابین بکەن.



# بەشی سێیەم
# شا ئیسماعیلی یەکەم
# ٩٠٧-٩٣٠ک/١٥٠١-١٥٢٤ز

## سەرەتاکانی یەکەم:

لەدوای ئەوەی سولتان عەلی کوڕی حەیدەر بەدەستی ئالاق قوینلوو کوژرا شوێنکەوتووانی خانەوادەی سەفەویی بەنهێنی هەردوو برا ئیسماعیل و ئیبراهیمیان لەساڵی ١٤٩٤ز لە ئەردەبیلەوە بۆ گەیلان گواستەوە بۆ ئەوەی دووربن لەچاودێری رۆستەمی سەرۆکی ئالاق قوینلوو، پاشان کارکیا میرزا عەلی حاکمی لاهیجا داوای لێکردن کەوا بێن لەگەیلان و لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا نیشتەجێبن و پەیمانیشی پێدان کەوا هاوکارییان بکات، کەچی ئیبراهیم گەڕایەوە ئەردەبیل و ژیانی خۆی لەسەر دانا. ئیسماعیل هەر لەلاهیجان مایەوە و چاوەڕێی دەرفەتێکی دەکرد تابگەڕێتەوە ئەردەبیل. کارکیا میرزا عەلی لەرووی سەربازی و ئایینیەوە ئامادە و تەیاری کرد و بەتەواوی پەروەردەی کرد، بۆ ئەم مەبەستەش شێخ شەمسەدینی لاهیجانی راسپارد گرنگی پێبدات و قورئانی پێ رەوان بکات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەوا هۆزەکانی نزیك ولاتی ئێران ئامادەن کەقەبوولی مەزەبێکی تازە بکەن هەرچەندە لەگەڵ هی ئەوانیش نەگونجێ.

ئیسماعیل ماوەی پێنج ساڵ لەلای کارکیا میرزا عەلی لەلاهیجان مایەوە و پێویستیشی بەسوپایەکی بەهێز و سەرەتایەکی سەرکەوتووانە هەبوو، بۆیە ئەوانەی کەشوێن کەوتووی بوون و بەبەردەوامی سەردانیان دەکرد سوپایەکی لێ پێکهێنان. لەلاهیجانیشدا رێکخستنە سیاسی و سەربازیەکان لەسەر دەستی سۆفیەکانی سەفەویی دەستی پێکرد، ئەو سۆفیانەی کەوا بنەماکانی مەزەبی شیعیان بلاوکردەوە. بەمەش ئیسماعیل هەرچەند گەنج بوو بەڵام توانی ببێتە سەرکردەیەکی خۆشەویست و موریدەکانیشی هەمیشە لەخزمەتیدابوون و بەهەموو شێوەیەك بەندەفەرمانیان دەکرد.

لەو ڕۆژەوە خەریکی کێشانی ئاسـۆیەکی سیاسی بـوو کـە پێکهـاتبوو لـە هێماکـانی کۆبوونەوەی سـەفەویی خاوەن ئامانجی بەدی هێنانی سـەرهەڵدانی خانەوادەی سەفەویی و چەسپاندنی مەزەب و سیاسەت، بۆیە ئەلوەند مـیرزا عـەلی سـەرۆکی ئـالاق قوینلـوو ترسی لەو کۆبوونەوەیەی سەفەوییەکان لێنیشت کـەنزیك بـوون لەوڵاتەکـەی و بـۆ ئـەم مەبەستەش نامەیـەکی بـۆ کارکیـا مـیرزا عـەلی نـارد و تیایـدا داوای لێکـرد کـەوا ئیسماعیل لەوڵاتەکەی وەدەرنێ و بیدا بەدەستیەوە، ئەمەشی کـردە مـەرجی سـەرەکی سازبوونەوەی پەیوەندیـەکانیان و هەڕەشـەی ئەوەشـی لێکـرد ئەگـەر ئـەم داواکاریـەی جێبەجێ نەکات ئەوا وڵاتەکەی داگیر دەکات. وادیار بوو لەمەرامەکانی کارکیـا دڵنیـا نەبوو بۆیە بۆ دەسگیرکردنی ئیسماعیل هێزێکی سەربازی نـارد کـە لەسـێ سـەدکەس پێکهاتبوو. کاتێکیش کارکیا میرزا بەمەی زانی یەکسەر ئیسماعیلی گـرت و خسـتیە ناو قەفەسێك بەدارێکەوە هەڵیواسی و سوێندی بـۆ نێردراوەکـەی ئەلوەنـد خـوارد کـە ئیسماعیل لەسەر زەوی ئەودا نییە و بەمەش کازم بەگ بەدەستی بەتاڵەوە گەڕایەوە بـۆ تەورێز.

ئیسماعیل و شوێن کەوتووانی کەمەرامی ئاشکرا کردنی بانەگەوازو گەڕانەوەیان هەبوو بۆ ئەردەبیل زۆر سوودمەندبوون لەو ڕووداوە تووندوتیژانـەی کەلـەنێوان خانـەوادەکانی ئالاق قوینلوو ڕوویاندا، بەڵام کارکیا میرزا عـەلی ئامۆژگـاری ئـەوەی کـردن چـاوەڕێ بکەن و ئارامبگرن تـا بەتـەواوی بـاری سیاسـی ئـەوێیان بـۆ ڕوون دەبێتـەوە، کەچـی ئیسماعیل ئەم ئامۆژگاریەی پشت گوێخست و بەهاوڕێیەتی حـەوت لەگەورەموریـدانی لەلاهیجانەوە بـەرەو ئـەردەبیلی بارەگـای ڕوحیـی سـەفەوییەکان لـەتارم بەڕێکـەوت. وادیاربوو حاکمی ئەوێ کەناوی عەلی بەگ جاکەرلوو بـوو ڕێگـەی پێنـەدان بێننـەوە، بەڵام لاری لەسـەر ئەوەش نەبوو کەوا سـەردانی مـەزاری شـێخەکانی سـەفەویی بکـەن بەمەرجێك لەدواییدا ئەوێ بـەجێبهێڵن. ئیسـماعیل لـەوێوە چووە قـەرەباغ و پاشـان ئەرزنجان لەئاسیای بچووك بـۆ ئـەوەی هـەوڵ بـدات شـوێنکەوتووانی سـەربخات و لـەو شوێنانەشدا نزیکەی حەوت هەزار کەس شـوێنی کـەوتن، پاشـان بـەداوەتێکی ڕەسمـی لەلایەن محەمەد سوڵتانی حـاکمی تالشـەوە بانگهێشـت کـرا و لـە ئەرجـەوان لـەنزیك

ئەستارا نیشتەجێبوو، لەوێدا و لەساڵی ١٥٠١ز سوپایەکی دامەزراند و ناوینا قزلباش ئەوکاتەش تەمەنی تەنها سیانزە ساڵ بوو.

یەکەم کاری سەربازیش کە ئیسماعیل ئەنجامیدا ئەوەبوو کەوا تۆڵەی کوژرانی باوکی کردەوە و لە کانوونی یەکەم بەسەرۆکایەتی سوپایەکی حەوت هەزار سەربازیەوە بەرەو شەروان بەڕێکەوت و هێرشی کردە سەر شەماخی پایتەخت و فروخ یەسارشای لەوێ گرت و پاشان کوشتی.

ئیسماعیل لەم هەنگاوانەیدا زۆر دڵڕەق و بێ بەزەییانە هەڵس و کەوتی دەکرد، ئەوەبوو تەرمی فروخ یەسارشای سووتاندو گۆڕی حاکمەکانی شەروانیشی تێك و پێکداو پاشان تەرمی خەلیلی باوکب فروخ یەسار شای لەگۆڕەکەی دەرهێناو سووتاندی و تاودرێکیشی بەسەری کوژراوەکان دروستکرد، ئینجا هەرچی سەروەت و سامانی ئەو خانەوادەیە هەبوو هەمووی بەتاڵانبردو کۆتایی بەدەسەڵاتییان هێنا، پاشان راوەدووی سوڵتان ئیبراهیمی کوڕی فروخ یەسارشا نا کە ئەوکاتە رایکردبوو، ئینجا دەستی بەسەر شاری باکۆداگرت.

## دروست بوونی دەوڵەتی سەفەویی:

دوای ئەوەی ئیسماعیل دەستی بەسەر تەورێزدا گرت مەزەبی شیعی دوانزەیی بەزۆر بەسەردا سەپاندن و بەزۆر هێمای قزلباشی پێ پۆشین و دژەکانیشی بەهەموو شێوەیەك دەچەوساندەوە و نزیکەی بیست هەزار کەسی لەسوننەکان کوشت و بەزۆر شێوازیش تاقیدەکردنەوە، فەرمانیشیدا کەوا تەرمی سەرکردەکانی ئالاق قوینلوو لەگۆڕەکانیان دەربهێنن و بیانسووتێنن. شوێنکەوتوو و لایەنگرانی کردیان بەشای ئێران و ناویشیان لێنا ئەبی موزەفەر شا ئیسماعیلی هادی والی لەساڵی ١٥٠١زدا، سکەشی بەناوی خۆیەوە لێدا و لەسەری نووسی (لا اله الا الله محمد رسول الله، علی ولی الله) پاشان ناوی خۆی نووسی. دوای ئەمانەش لەمزگەوتەکاندا وتاری هەینی بەناوی ئەوەوە دەخوێندرانەوە و مەزەبی شیعی دوانزەییشی بەزۆر بەسەر خەڵکی ئێراندا سەپاندو وەك تاکە مەزەبێکی سەپێنراو لە سەرانسەری ئێراندا راگەیاند. وادیار بوو راگەیاندنی ئەم مەزەبە بەرەسمی لەدەوڵەتی نوێ لەئێراندا لەزۆربەی ناوچەکاندا لەلایەك تەنها لەبەر

ئەوەبوو کەوا چوارچێوەیەکی ئیداری دەست نیشان بکات و لەلایەکی دیکەشەوە دڵڕاگرتنی ئایینەکانی دیکەی ناو ئێران، چونکە شیعایەتی لەسەر ئاستی میللی و سەرکردایەتی بلاوبووەوە. لێرەدا زاناکانی مەزەبەکە ترسیان لەم پەلەکردنە لێنێشت چونکە زۆربەی دانیشتوانی تەوریز و ئێران لە سوننە بوون و هیچ زانیاریەکیان لەبارەی رەوتی شیعیەوە نەبوو و بەرپەرچیشیان دەدایەوە.

بەلام هەلوێستی شا ئیسماعیل لەبارەی ئەم کێشەیە نەگۆڕبوو، بۆیە هەڕەشەی لەهەموو ئەو کەسانەکرد کەوا دژایەتی دەکەن، پاشان فەرمانیدا لە بانگەکانی مزگەوتدا دروشمی شیعەکان زیاد بکەن کەبریتی بوو لە (أشهد أن علياً وليُ الله) و (حي علي خير العمل)، نەفرەتیشی لەهەر سێ خەلیفەی راشیدی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان کردو زیادەرەوی زۆری لە پیرۆز راگرتنی دوانزە ئیمامەکە کرد، خەلکەکەش لەلای خۆیانەوە ملکەچی ئەم چوارچێوەیەبوون. لەراستیشدا ئەم سەپاندنی مەزەبەی شا ئیسماعیلی یەکەم بەسەر ئێراندا کردی هەموو ولاتی لەرووی کۆمەلایەتی و سەربازیەوە یەکخست و لەناوخۆشدا بەرقەراربوون بالی بەسەر ولاتدا کێشا.

لەدوای ئەوەی شا ئیسماعیلی یەکەم لەتەوریز سەقامگیر بوو چەند هەنگاوێکی دیکەی بۆ رێکخستنی کاروباری ولات هەلهێنا و لەسەرەتا حوسێن بەگولالی کردە جێگری خۆی و شێخ شەمسەدینی لاهیجی مامۆستا و پێگەیەنەریشی کردە هەلگری مۆرەکان و میر محەمەد زەکەریا کە لەئالاق قوینلوو وەزیر بوو کردیە وەزیری خۆی.

## بزووتنەوەی سەفەوییەکان لەناو ئێرندا:

دوای سالێك لەدامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوییەکان شا ئیسماعیل سوپایەکی رێکخست بۆ راوەدوونانی مورادی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئوزون حەسەن کە حاکمی هەر یەك لەفارس و عیراق بوو و دوایین میرزادەکانی ئالاق قوینلوو بوو و لەنزیك هەمەدان تووشی بوو، لەوێدا شکستی پێهێنا و ئالاق قوینلوو بەرەو بەغدا هەلات و بەمەش و هەرێمی فارس هاتە پال دەوڵەتی سەفەویی و ئەم هەلکشانە سەرەتایەك بوو بۆ ناو قولایی ئێران و بەمەش لەو مەلبەندەی کە حکومەتەکانی ئێران لەدەوری کۆببوونەوە بەدرێژایی مێژوو چووە دەرەوە.

دەبوایە شا ئیسـماعیلی یەکـەم لـەدوای ئـەوەی سـەرکەوتنی بەسـەر مـورادی کـوڕی یـەعقوب مـیرزا هێنـا لـە بەرزاییـەکانی ئێـران درێـژە بەدەسـەڵاتەی خـۆی بـدات و حوکمەکەی تێدا جێگیربکات، بۆ ئەوەی ببێتە سەرەتایەك بۆ بەرفراوان بـوونی دەرەکـی لەسـەر خاکی هاوسێکانیداو دەستی بەسەر شیرازدا گرت و مەزەبی رەسمی دەوڵەتیشـی بەسەردا سەپاندن، پاشان شازادەکانی ئەو ناوچەیە هەموو لەترسان لایەنگری خۆیان بـۆ راگەیاند، لەوانە: محەمەد قەرەی حاکمی ئەبرەقووەی نزیك ئەسفەهان و لەبەرامبەردا شا لەپلەی خۆیدا هێشتیەوە، فـەرمانی بـە جـان محەمـەد ئسـتاجلوو کەبـە خـان سـوڵتان ناسرابوو کرد دەسبەسەر کرماندا بگرێ، کاتێکیش محەمـەد بـەگ برنـاك هـەواڵی ئـەم پەلامارەی گەیشتێ یەکسەر بەرەو لای سوڵتان حوسێن بایقەرەی تـەیموری لەخۆراسـان رایکرد و وڵاتەکەشی بەکراوەیی بەرووی سەفەوییەکاندا بەجێهێشت و ئـەوانیش چـوونە ناوی و خستیانە پاڵ دەوڵەتەکەی خۆیانەوە، بەڵام دوای ئەوە حوسێن بایقەرە چووە بـەر خزمەتی شا ئیسماعیلی یەکەم و زۆریش لـەدڵرەقی و توونديەکـەی دەترسـا و لـەدوای ئەویش محەمەدی کوڕی خۆی بەدەستەوەدا. حاکمەکانی مازنـدەران ئەوانـەی لـەدەوری دەریای قەزوین بوون وەك نیزامەدین عەبدولکەریم و ئاغارۆستەم و لاهیجـان و کارکیـا مـیرزا عـەلی خۆیـان بەدەسـتەوە داو داوای دڵنیاییـان لێکـردو بەڵێنیشـیاندا کـەوا لایەنگریی و بەندەفەرمانیی بۆ بکەن.

لەدوای ئەوە شا ئیسماعیل رووی بەرەو عێراق وەرگێڕاو لەتەورێزەوە بەمەبەستی قاشـان دەرچوو و ئیلیاس بەگی زولقەدەری کردە حاکمی فارس و هەموو شـارەکەی داگیرکـردو پاشان دەستی بەسەر قومدا گـرت کـە شـارێکی پـیرۆزی شـیعەکانە و زسـتانی سـاڵی ١٥٠٣ز لەوێ بەسەربرد بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کەوا سـەرکەوتنی تـەواوی بەسـەر بەشـی باکوری هەرێمی عیراقی عەجەمیدا هێناوە.

وادیاربوو کەوا ئەم توندی و دڵڕقی و بێبەزەییەی شا ئیسماعیل بـووە جێـی نـارەزایی هەندێك لەسەرکردەکانی هەرێم و شارەکان. ئەوەبوو حوسـێن گـەلاوی حـاکمی خـوار و سـەمنان و فەیروزکوه و دەماوەند، دووری شا ئیسماعیلی لەتەورێز بەهەلزانی و هێرشی کردە سەرو ئیلیاس بەگی حاکمی کوشت و لەساڵی ١٥٠٤زدا شا ئیسماعیل رووبەرووی

بووەوەو لەدوای شەڕێکی سەخت شارەکەی گێڕایەوەو راوەدووی ناو پاشان گرتی، لەدواییدا کوشتی و تەرمەکەی خستە ناو قەفەسێك و بردیە ئەسفەهان و لەوێ لەناوەڕاستی شارەکەدا سووتاندی. ئینجا گەڕایەوە تەوریز بۆ ئەوەی رووبەرووی حاکمی یەزد ببێتەوە کە دانی بە دەسەڵاتدارێتیەکەی ئەودا نەدەناو هێزی سەفەوییەکان دەوری شارەکەیان گرت و داگیریان کردو خەڵکێکی زۆریشیان لێ کوشت. بەهۆی ئەم سەرکەوتنانەوە شا ئیسماعیلی یەکەم بەسەر باکور و خوارووی ئێراندا زاڵبوو و پاشان ئەم سەرکەوتنانە بەوەندە نەوەستان و زۆربەی بەرزاییەکانی ئێران و هەرێمی عیراقی عەجەمیشی گرتەوە.

## بەرفراوان بوونی بنکەی سەفەوییەکان لەدەرەوەی ئێران:

## سەرەتا:

دەسبەسەرداگرتنی تەختی پاشایەتی لەئێران لەلایەن شا ئیسماعیلی یەکەمەوە کارێکی سەرنج راکێش بوو لەسروشتی حوکمڕانی خانەوادەکانی ئێران، وەك: ئێلخانەکان، جەلائیریەکان، قەرەقوینلوو، ئالاق قوینلوو. چونکە هەردوو لایەنی سیاسی و ئایینی لەکەسایەتی خۆیدا کۆکردەوە و بوو بە یەکەم پیاوی دەوڵەت و پێشەوای مەزەبی شیعی دوانزەیی و لەشمشێر و بانگەوازەکەیدا چاکترین شێوازی هەڵبژارد، وەك شێوازە تەواوەکانی بۆ ئەنجام گەیاندنی ویستەکانی، لێرەوە گرنگی بزووتنەوەکەی لەدەسەڵات وەرگرتن لەتەوریز دەردەکەوێ. ئەوەش مانای ئەوە ناگەیەنێ کەوا لێرە بوەستێت و هەموو هیوا و ئاواتە دوورەکانی هاتوونەتەدی و ئیتر با بەسبێ، بەڵکو سیاسەتی میرزادەکانی دەورووبەر و رەوتە مەزەبەکانیان دووچاری رووبەروو بوونەوەی دەکەن، یاخود دەبێ بەردەوام بێ لەسەرکوت کردنیان و بەجێهێنانی ئامانجەکانی.

لەراستیشدا هێزە دژەکان لەهەموو لایەکەوە دەوریاندابوو:

- لەلای خۆراواوە عیراق بوو کە مورادی کوڕی یەعقوب پەنای بردبووە ئەوێ، دوایین میرزادەکانی ئالاق قوینلوو بوو، جێی چاوتێبڕینی شا ئیسماعیلی یەکەم بوو.

-لەلای باکوری خۆراواشەوە ئەنادۆڵی لێبوو کە دڵی دەوڵەتی عوسمانی سوننە مەزەب بوو، ئەو کاتەش لەلای بەڵکان رووی لەفراوان بوون دەکرد لەسەر بەرژەوەندی و خاکی ئەوروپی.

-لەلای باکووری خۆرەلآتیش هۆزەکانی ئۆزبەکی لێبوو کەبەسەرکردایەتی محەمەد شەیبانی سەرسەخت بوون لەولآتی پشت رووبار و توانی دەستبگرێ بەسەر خۆراسان و چەند بەشێکی باکوری خۆرەلآتی ئێران.

-لە خۆرەلآتیشدا، چەندین هۆزی بەهێزی ئەفغانی لێبوو کە لەو بیابانانەدا نیشتەجێ بوون و رێکردن و پەڕینەوە تێیدا کارێکی زۆر سەخت بوو و هەمیشە لەئامادەباشیدابوون هێرش بکەنە سەر ناوچە کشتوکاڵیەکان.

-لەکەنداوی عەرەبیشدا، کەشتیەکانی پرتوگالی بە ئارەزووی خۆیان لەئاوەکانی سەر بەئەوان دەسووڕانەوە ئەویش لەدوای ئەوەی کە دورگەی (رأس رەجای سالح)ی دۆزیەوە، کەوەك هێزێکی زاڵ بوو بەسەر سەرجەم رێرەوەکانی کەنداوبوو.

## داگیرکردنی عێراق:

لەدوای ئەوەی شا ئیسماعیل هۆزی ئالاق قوینلۆوی لەناو ولآتی ئێران لەناوبرد، دەبوایە لەدەرەوەی ئێران کۆتایی پێبهێنێ، ئەوکاتە ئەم خانەوادەیە لەدوو ناوچە کۆببوونەوە، یەکەمیان عیراق بوو بەسەرۆکایەتی موورادی کوڕی یەعقوب و ئەوی دیکەشیان بوستان بوو لەئەنادۆڵ بەسەرۆکایەتی عەلای دەولە.

ئەوەبوو هێرشەکەی بۆ سەر عەلا دەولە یەکەمین پەلاماری دەرەکی بوولەدوای ئێران. چونکە لەساڵی ١٥٠٦ز هێزەکانی سەفەویی لەتەوریز وەدەرکەوتن و بەرەو هەرێمی کوردستان و (کە ئێران و عیراقی جیادەکردەوە) ئەنادۆڵ تاکو داگیریان بکات، بەلآم لەبەرامبەر بەرەنگاری کورد بەسەرکردایەتی سارمی کوڕی سەیفەدینی مەکری شکستی هێنا، لەهەمان کاتیشدا چەند سەرکردەیەکی کوردیشی ملکەچ کرد. پاشان لەساڵی دوایی هێرشی کردە سەر مەرعەش و بوستان و لەلایەنی هێزەکان هاوپەیمانێتی موورادی کوڕی یەعقوب و عەلا دەولە بەریان لێگیراو شەڕێکی خوێناوی لەنێوانیاندا

رووپــداو هێــزی هاوپــەیمان ناچــارکرا بــەرەو بەغــدا پاشەکشــە بکــەن. دوایــی هێــزی سـەفەوییەکان دیاربـەکری داگیرکـردو لـەدوای ئـەوەی شـا ئیـسماعیل محەمـەد خـانی ئەستالجوی کردە جێگری خۆی لەوێ، بەجێی هێشت و زستانەکەی لـەخوی بەسـەربردو شەو و رۆژی دەژمارد تاکو دوایین مۆڵگەی ئالاق قوینلو کە عیراق بوو داگیربکات.

بەهۆی سـەرکەوتنەکانیەوە لەبوستان شا ئیسماعیلی یەکەم لـەدوو هێـزی زۆر گـەورەی ئیـسلامی لەرۆژهـەڵاتی خـوارووو نزیـك کەوتـەوە: هێـزی تورکـە عوسمانییـەکان کـە مولّکەکانیان لە چیای تـۆرۆس و ئەنادۆڵـەوە بگـرە تادەگاتـە ئـەورووپای خـۆرەڵات و ناودراستی گرتبۆوەو بـەردەوام لـەدژی ئـەورووپا لەجەنگـدابوون. دووەمیشـیان هێـزی مەمالیك بوو کە زەوییەکانی ئەوانیش لەچیاکانی تۆرۆس و شامەوە تاکو میسرو حیجاز هەڵکشـابوو و بــەردەوام لــەدژی پورتوگالیــەکان لــەئاوەکانی خــوارووی ئیســلام لەخەباتــدابوون. ئەوکاتــە بوســتان ســەر بــە دەوڵــەتی مــەمالیك بــوو لەمیــسر و عوسمانییەکانیش وایان ئـەژمار دەکـرد کـەوا لەسـنووری دەسـەڵاتی ئەوانـە و لەگـەڵ مەمالیکەکاندا رکابەریان لەسەر دەکرد. بۆ ئەوەی کە هـیچ یـەکێکیان نیگـەران نـەبن کونسـولگەرییێکی لەسـاڵی ١٥٠١-١٥١٦ز نـاردە قـاهیرە بەهۆیـەوە دڵـی سـوڵتانی مەملوکیی قانسووهی غـوری راگـرت و وەك بەڵگەیـەك کـە هـیچ نیـازێکی چـالاکی سەربازی نییە لەناوچەکەدا و ئەوی لەبوستان دەیکات تەنها بۆ خۆپارێزییــە، هــەروەها کونسولگەریەکی دیکەشی ناردە ئەستەمبووڵ بۆ لای سوڵتانی عوسمانی بایەزیدی دووەم لەساڵی ١٤٨١-١٤٥٢ز بۆ هەمان مەبەست.

لەدوای ئەم هەنگاوانە شا بیر لەوەکردەوە کە عیراق داگیربکات، لێرەدا پاڵنەرە مـەزەبی و سیاسیی و ئابوورییەکان بوونە هۆکـاری ئـەوەی کـە بـەگور و تینێکـی زۆرەوە بـەرەو بەدیهێنانی ئەم ئامانجە هەنگاوبنێ.

لەبارەی مەزەبەوە بزووتنەوەی شا پشتی بە مەزەبی شیعی دوانزەیی دەبەست، ئێرانیش خـۆی بەیەکـەم بـەرگریکاری ئـەم مەزەبـە هـەژمارکرد و خـۆی بەلێپرسـراویش دانـا لەبەرانبەر بلاوکردنەوەی، پاشانیش دەستی بەسەر کەربەلا و نەجەفدا گـرت، کەئەمانـە

دوو شوێنی پیرۆزن لەلای شیعەکان و دەبنە هۆی زیاتر بەگوڕبوونی بزووتنەوەکەیی و بەدیهێنانی ئامانجە مەزهەبیەکان.

جگە لەمەش شیعەکانی عیراق وەك پارێزگارێك تەماشای شای ئێرانیان دەکردو هەرجارێکیش پێویستیان بە پارە بووایەو کەوتبانە هەر تەنگژەیەك ئەوا هانایان بۆ دەبرد. حکومەتی ئێرانیش هەمیشە گرنگی بەبیناسازی دەدا لەو دوو شوێنە پیرۆزەدا، بۆیە شیعەکانی عیراق گەیشتنە ئەو بڕوایەی دەوڵەتی ئێران پشتگیریان دەکات لەو دژایەتیەی کەلەگەڵ موسوڵمانە سوننیەکانی عیراق هەیانە. بەو ئومێدەش بوون رۆژێك دابێ ئێران حوکمی عیراق بکات.

لەلایەنی پاڵنەرە سیاسیەکەشدا مەزهەبی دوانزەیی لەنێوان هەردوو دەوڵەتی سەفەویی و عوسمانی رۆڵێکی ترسناکی هەبوو بۆ هاندانی شا ئیسماعیلی یەکەم لەپێناو هێرش کردنە سەر عیراق و بیخاتە پاڵ موڵکەکانی خۆی. لەلایەکی دیکەوە لەخوارووی ئەنادۆڵ و دیاربەکر چەند هۆزێکی تورکمانی لێبوو و لەسەرەتای سەدەی شانزەهەمیشدا سەرکردەکانیان ئامادەیی ئەوەیان تێدابوو کەوا ئامانجە کۆن و کپکراوەکانی بزووتنەوەکەیان بهێننەدی، کاتێ شا دەستی بەسەر تەورێزدا گرت ژمارەی شوێن کەوتووانی رووی لەزیادی کردو بوو بە مەترسیەکی سیاسی روون و ئاشکرا بۆ دەوڵەتی عوسمانی لە خوارووی ئەنادۆڵ بەتایبەتیش کاتێك دەستیان بەسەر ویلایەتی تەککەدا گرت و حاکمەکەشیان کوشت، هەروەها شکستیشیان بە قەرەگۆزی پاشای حاکمی قەرمان هێناو هەموو تەوقەکانی ئەوێیان شکاندو بەناوی ئەویشەوە لەمزگەوتەکان وتاری هەینی دەخوێندرایەوە، جگە لەمانەش سەرکەوتنی لەعیراق جێگایەکی بەرزی لەلایەن شیعەکانەوە پێدەبەخشرێ. لەهەمان کاتیشدا نەبوونی سنوورێکی روون و ئاشکرا لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و سەفەویی کەبەتەواوی جیایان بکاتەوە کێشەیەکی زۆر ئاڵۆزبوو و هۆیەکی سیاسی دیکەبوو کە لەنێوانیاندا تەنگژەی سیاسی روویداتەوە، ئەویش زیاتر لەبەر ئەوەبوو کەوا هۆزە کوردەکان هەمیشە لەو شوێنانەدا لەجووڵەدابوون و لەسنوورەکان دەپەڕینەوەو کێشەو گرفتی ئاڵۆزیان دروست دەکرد، زۆر جاریش ئەم هاتووچۆیەی کوردەکان دەستدرێژی کردنە سەر حاجیەکانی ئێران و

کاروانـەکانیانی لێدەکەوتـەوە. ئـەوەی زیـاتر پـاڵی بـە سـەفەوییەکانەوەنا تـا عـیراق داگیربکەن ئەوبوو کەوا نیوەی دانیشتوانی عیراق سـەر بەمـەزهبی شیعەبوون و ئـەوەی یارمـەتی عوسمانییەکانیـدا تـابتوانن لەبـەردەم سـەفەوییەکاندا خـۆڕاگرن ئـەوەبوو کەنیوەکەی دیکەی خەڵکی عیراق لە سوننەبوون.

لەلایەن پاڵنەرە سیاسیەکانیشەوە زەوی و زاری بەپیتی عـیراق کـەزۆر گونجـاو بـوو بـۆ کشتوکاڵ زۆرێـك لـە پێداویسـتیەکانی خـەڵکی ئێرانـی دابـین دەکـرد، هـەروەها شـا دەیویسـت ڕێگای بازرگانی نێوان دیاربەکر و موسڵ بخاتە ژێر دەسـەڵاتی خۆیەوە، چونکە ئەو ڕێگایە بەناو قولایی دۆڵی رافیدەیندا تێدەپەڕێت و لەبەغداشـەوە بـەرەو کەنـداوی عەرەبی دەڕوات و، بێگومـان موسڵ بەدەروازەیەکی سروشتی ئەم ڕێگایەو ڕێگای نێوان باکوری عیراق و بەستنەوەی بە هەرێمەکانی ئەنادۆڵ و ولاتی شـام دادەنرێـت. شـایانی باسـە ئەو گەمارۆیەی هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەکۆتاییـەکانی سـەردەمی سـوڵتان بایەزیدی دووەم خستبوویە سـەر بزووتنـەوەکانی بازرگـانی ئێـران کاریگەریـەکی زۆری هەبوو لەسەریان و بازرگانە ئێرانیەکانی ناچارکرد کەوا بەرەو خوارووبڕۆن.

مورادی کوڕی یەعقوب حاکمی بەغدا درکی بەمەرامەکانی شا ئیسماعیلی یەکەم کـرد و دەیزانی کەوا ناتوانێ بەتەنیا ڕووبەڕووی بوەستێتەوە، بۆیە هانای بردە بەر ئیمـارەتی زیلقەدەر لەخوارووی خۆرەلاتی ئـەنادۆڵ، بـەلاّم ئـەم ئیمارەتـە بەهـەنگاوەکانی پـێش لەناوچوونیدا تێدەپەڕی و لەتوانایدا نەبوو هیچ هاوکاریەکی پێشکەش بکات. ئـەوکات چـووە لای سـوڵتان قانسـووهی گـوری لەمیسـر کەئـەویش درکـی بەمەترسـیەکانی ڕاکابەرەکەی شا ئیسماعیلی یەکەم کردبـوو و دەیزانـی کـە بـە چ شـێوازێك خـەریکی فراوانکردنـی دەوڵەتەیەکەیـەتی لـەخۆرەلاتی عەربیـداو دەسـتی کـرد بـە هەنـدێك ئامادەکاریی سەرەتایی تاکو بتوانێ لەداهاتوودا لەڕووی هێزەکانی سەفەوییدا بوەستێ، بەلاّم ئەو بارە سیاسیە حکومەتەکەی گوریی پێیـدا تێدەپـەڕی هێنـدە نالـەباربوو کـە لەمانۆری سـەربازی زیاتر هیچی دیکەی لەدەست نەدەهات.

لەڕاسـتیشدا مەمالیکەکانی میسر هەر لەو کاتـەوەی مـەگۆل عیراقیـان داگیرکـرد لـە سەدەی سیانزەهەمی زایینی لەوە ڕاهاتبوون کەحوکمی داگیرکەرەکانی مەگۆلی فارسـی

و تورکمانی لەولاتەکەی خۆیاندا ببینن، جگە لەمەش لەکاتی هـاتنی شـا ئیسـماعیل هیچ شتێکی نائاساییان نەبینی، تەنها ئەوە نەبێ کەهێزە گەشەسەندووەکانی سـەفەویی هێزێکە دەتوانێ مەترسی بخاتە جەماوەرەکـەیان لـە ولاتـی شـام بەپلەیـەك کەهیچـی کـەمتر نییـە لـەهی عوسمانییـەکان، سـەرەڕای ئەمـەش سـولتان قانسـووهی گـوری لەجەنگەکەی لەگەڵ پورتوگالیەکان شەکەت ببوو، چونکە بەردەوام هێزەکانی پورتوگالی لەخواروو پەلاماری کـەنارەکانی ئیسـلامیان دەدا، بەتایبـەتی کەشـیەگەلیەکانیان زاڵ بوون بەسەر دەروازەکانی دەریـای سـور و کەنـداوی عـەرەبی و لـەرووی بازرگانـەکانی ئیسلامدا دایانخست بەئاماجی ئەوەی کە ڕێگای بازرگـانی لەمیسرەوە بگـۆڕن بـەرەو ئیمارەتی رأس رەجای سالح.

شا ئەم بارەی بەهـەلزانی و دوو سوپاشـی ئامـادەکرد بـۆ ئـەوەی عـیراق داگیربکـات، یەکـەمیان بەسـەرۆکایەتی خـۆی و دووەمیشـیان بەسـەرۆکایەتی حەسـەن بـەگ لالا. کاتێکیش سەرکردەی ئـالاق قوینلـوو بەمـەی زانـی یەکسـەر بەغـدای بەجێهێشـت و هێزەکانی سـەفەوییش بەبێ شەڕ چوونە ناو بەغداوە، لـەوێش بـەناوی شـا ئیسـماعیلی یەکەمەوە خوتبە خوێندرایەوەو سکەی پارەشی بەناوی خۆیەوە لێدا، کەبەڵگەی ئەوەبوو ئەم ولاتەشی خستۆتە نێـو بازنـەی دەولـەتی سـەفەویی، ئەمـەش لەسـالی (٩١٤ك-١٥٠٨ز) بوو.

لەدوای ئەم هەنگاوانە شا دەستی کرد بەبۆیەکردنی عیراق بەبۆیەکی شـیعانەو چـەندین مـەزارگای بـۆ ئیمامـە شـیعەکان سـازکردو، سـەردانی مـەزارگای ئیمـام حوسـێنی لەکەربەلاو ئیمامی عەلی کـوڕی ئـەبی تـالیبی لەنەجـەف کـرد بەمەبەسـتی جـەخت کردنـەوە لەسـەر مـەزەبی شـیعی و پابەنـدبوونی و لـەزانا سـونیەکانی عیراقـیش هەڵگەڕایەوە و، بـەبێ هـیچ ڕوویەڕووبوونەوەیـەك لەلایـەن ئـەو دوو دەوڵەتـە سـونییە (عوسمانی و مەملوکی) گەورەوە بوو بەسەرۆکی عیراق و پاشان چاوی بڕیـە ولاتـەکانی پشت عیراق بۆ ئەوەی بتوانێ هیواو ئاواتی شیعەکان کەدروسکردنی دەولـەتی گـەورەی شیعەمەزەبی بوو بهێنێتەدی و هەریەك لەعیراق و ئیران و ولاتی شام لەخۆبگرێ و بـبێ بەگەورەی هەموو جیهانی ئیسلامیی.

شا کاروبارەکانی عیراقی ڕێکخست و پاشان خالد بەگی کــردە والــی عــیراق و نازنــاوی خەلیفەی پێبەخشی، ئینجا چووە حەوێزە کەکەوتۆتە نێوان بەسرە و واست، ئەوکاتــەش خانەوادەیەکی عەرەبیی لەوێبوون کەســەر بەموشەعشــەعەکان بــوو لەســاڵی ١٤٣٦ز، بەڵام زۆر بەوە نیگەران بوو کەوا سوڵتان فەییازی موشەعشەعی کە حاکمی ئــەوێ بــوو بنەماڵەکەشی لەنەوەکانی ئیمام عەلی بوون داوای لێبکات خۆی بەدەســتەوە بــدات و لەئەنجامدا تێکگیران و لەساڵی ١٥٠٩زدا کوشتی و دەستی بەسەر مولکەکانیدا گرت.

ئەوکاتەی شا بەرەو حوێزە بەڕێکــەوت ســوپایەکی بەســەرکردایەتی مەســعود و بــەیرام بەگی قەهرەمانی و حوسێن بەگوڵلا نارد بــۆ خــوررەم ئابــاد تــاکو مەلەکشــا رۆســتەم لەناوبەرن و ئەویش لەلای خۆیــەوە دانــی بەشــا ئیســماعیلدا نــەدەنا، بۆیــە ئــەو ســێ سەرکردەیە گرتیان و بەدیلیی هێنایانە بەردەم شا و داوای لێبــووردنی لێکــردو ئــەویش لێیخۆش بوو و پاشان کردی بەحاکمی لورستان.

لەدوای ئەوە شا بەرەو شیراز بەڕێکەوت و زستانەکەی لەوێ بەســەربرد، ئینجــا ئــەوێی بەرەو شەروان بەجێهێشت و لەوێش تۆڵەی خۆی لە شێخ شای کوڕی فروخیەسار کــردەوە و لەدواییدا شەروانی گەڕاندەوە بەردەستی خۆیی و مەنسوربەگی کردە حــاکمی ئــەوێ. شا ئەوێی بەجێهێشت و بەرەو قــەرەباغ کەوتــەڕێ بــەر لــەوەی بگەڕێتــەوە بــۆ تــەورێز لەساڵی ١٥١٠ز، ئەویش لەدوای دە ساڵی تەواو لەجەنگ و داگیرکاری و بڵاوکردنــەوەو سەپاندنی مــەزهەبی شــیعە لــەعیراق و ئێــران و دیاربــەکر و لــەناوبردنی دوژمنــەکانی، ئەوکاتەش تەمەنی گەیشتبووە بیست و پێنج ساڵی و جــێ پێــی خــۆی لەئێرانــدا قــایم کردبوو و لەیەکخستنی زۆربەی خاکی ئێرانیشدا ســەرکەوتنی بەدەســهێنا، دەوڵــەتێکی پێکهێنا لە شەروانەوە بــۆ خــوارووی خــۆرەلاتی قــەوقاز تــا دەگاتــە کرمــان لەوپــەڕی خوارووی خۆراوای بیابانی لووت تەنها خۆراسان نەبێ کە ئەوکاتــە لەدەســت ئۆزبەکــە بەهێزەکاندابوو. لەخۆراواشەوە بەرەو عیراق و دیاربەکر هەڵکشا و لەئەنادۆڵ و شــامیش نزیك بووەوە کەبەهۆیەوە لەگەڵ عوسمانییەکاندا دووچاری بارگرژی هات.

## پەیوەندیی سەفەویی و ئۆزبەکەکان:

لەسەردەمی محەمەد شەیبانیی خان: دەسەڵاتی شا ئیسماعیلی یەکەم بەسەر ئێراندا ناتەواو بوو، چونکە چەند بەشێکی خۆرەڵات و باکوری خۆرەڵات و بەتایبەتی خۆراسان هەر لەدەرەوەی دەسەڵاتەکەیدا مانەوە، لەبەرئەوە کارێکی سروشتی بوو کەوا هەوڵی داگیرکردنیان بدات و بیاغاتە پاڵ موڵکەکانی خۆیەوە. بۆیە زۆر بەتوندی رووبەرووی هێزە تووندوتۆڵەکانی ئۆزبەك هاتەوە لەباکوری خۆرەڵات بەسەرکردایەتی محەمەد شەیبانیی خان کەدەسەڵاتی بەسەر زەویەکی زۆر و پان و بەرینی لێوارەکانی رووباری جیحۆندا هەبوو تا دەگەیشتە سنووری دەوڵەتەکەی شا لەخۆراوا لەسەر هێڵی تەریبی سەمنان لەخۆراسان تاکو بەدەخشان لەخۆراواو لای خواروو تا دەگاتە ناوچەکانی کاخیندار و گوری چیایی لەناوەڕاستی ئەفغانستان، بەمەش دەرگاکانی بەری خۆراوای ئێرانی کەوتەووە بەردەست، لەبەر ناکۆکیی رەوتی مەزەبی و سیاسیی نێوان ئۆزبەك و سەفەوییەکان کارێکی سروشتی بوو کەوا لەنێوانیاندا جەنگ روویدات، چونکە محەمەد شەیبانیی خان دەیویست دەسەڵاتی بەرەو خۆراواو بەتایبەتی خاکی ئێران ببات لەبەر ئەوەی رۆژانێك ئەم خاکە لەژێر حوکمی باب و باپیرانی بوو و بەلێدانەوەی ئەو لەنەوەکانی جەنگیزخانبوو. لەلایەکی دیکەشەوە جیاوازی نێوان مەزەبی ئۆزبەك و شا ئیسماعیلی یەکەم هانیدا کەوا مەزەبەکەی خۆی لەنێوان ئۆزبەکەکاند بسەپێنێ! ئەمەش هۆیەکی دیکە بوو پاڵی بەهەردوولاوەنا لەدژی یەك بجەنگن.

چالاکیە سەربازیەکان لەلایەن محەمەد شەیبانیی خانەوە دەستی پێکرد و هەڵمەتی تەمێکردنی حامکمەکانی شەروان لەلایەن شاوە بەهەلزانی و هێرشی کردە سەر کرمان و خواجە شێخ محەمەدی حاکمی کوشت و، کەچی سەرەڕای ئەوەش شا دوو نێردراوی ناردە لای سەرکردەی ئۆزبەکەکان و داوای لێکرد کەوا پەیوەندی ئاشتیانە لەنێوانیاندا سازبکەن و رێز لەیەکتر بگرن و، ئەوەشی یادخستەوە کەوا کرمان موڵکی ئەوەو مافی بەسەرەوە هەیە. وادیار بوو کە ئەم پێشنیارەی تەنها بۆ دەستخستنی کات بووبێ و لەهەمان کاتدا چاوی تەماعی بڕیبووە خۆراسان، بەڵام لەبەر سەرقاڵی بەرێکخستنەوەی باری ناوخۆی دەوڵەتەکەی توندکردنی جێپێی لەحوکمدا بواری ئەوەی نەبوو رووبەرووی

ئۆزبەك ببێتەوە. لەلای خۆشیەوە محەمەد شـەیبانیی خـان پێشـنیارەکانی رەتکـردەوەو نامەیەکی بەحوسێن ئەبیوردی بۆ ناردو تێیدا ئەوەی رەتکردەوە کە شـا هـیچ مـافێکی بەسەر حوکمی ئێرانەوە هەبێ چونکە ئەگەر پاشایەتی بە بۆماوە بۆ نـەوەکان بـێ ئـەوا دەبێ لەنێرانەوە بتگاتێ نەك بەهۆی مێیەکان، چونکە وەچە بەنـدە بەلایـەنی باوکـەوە نەك لایەنی دایك. کاتێك شێخ جونێدی باپیری ئیسـماعیل خوشـکی ئـوزون حەسـەنی مارەکرد نابێتە هۆی ئەوەی حوکمڕانی ئێران بکات و بەبۆنەی ئـەو مافەشـی کەبەسـەر کرمانەوە ئەوا هیچ راستیەکی بەڵگەداری تێدا نییە، هەروەها ئاماژەی بەوەشـدا کـەوا ئێران کاتی خۆی لەژێر حوکمڕانی ئەبی خـەیری باپیریـدا بـووە، پاشـانیش ناوهێنـانی لەوتارەکانی مزگەوت و لێدانی سکەی پارە ناوی ئـەوەوە فـەرمانی سەرشـانن و، هـەر لەنووسراوەکەدا داوای لێکرد کەوا دەست هەڵگری لـەکاری بـەزۆر سـەپاندنی مـەزەبی شیعەو ئەگـەر گوێڕایەڵیشـیی نـەکات ئـەوا ئێـران داگـیر دەکـات. شـا ئیسـماعیلی یەکەمیش لەوەڵامی ئەم نامەیەدا بـۆی نووسـی ئـەویش ئامادەیـە بـۆ ئـەم رووبـەروو بوونەوەیە و ئەوا بۆ سەردانی مەزارگەی ئیمام رەزا دەچێتە مەشهەد.

لەدوای ئەم نامە گۆڕنانەوە هێزەکانی مەگۆلی ئۆزبەکی لەخواروی خۆراساندا کۆبونەوەو لەقەندەهاریش پەڕینەوە، ئەم کاردش بووە هۆی تورەبـوونی شـا ئیسـماعیلی یەکـەم و لەساڵی ١٥٢٠ز بەسەرکردایەتی سوپایەکی بەهێز لەخۆراسان نزیك کەوتەوەو چووە نـاو مەشـهەدو هـەراتی داگیرکـردو ئەحمـەد سـوڵتانی حـاکمی دامغـان و زاوای محەمـەد شەیبانیی خانی ناچارکرد کەوا ئەوێ چۆڵبکات، نەوەستا تا گەیشتە مەروو کە محەمـەد شـەیبانیی خـان زۆر بەتوونـدی دەیپاراسـت، بۆیـە رێـی لێگـرت و نـەیتوانی چـیدیکە پێشرەوی بکات بەرەو خواروو، لەلایەکی دیکەوە شۆڕشـی دانیشـتوانی فـەیروزکۆه و، جگە لەمەش گەیشتنی هەواڵی هەڵگەڕانەوەی بیونسـز حەسـەن لـەحوکمڕانی محەمـەد تەیموری کوڕی لەنزیك رووبار سیحۆن سەرکەوتن بەسـەریدا. بەمـەش رووبـەرووی سـێ بەرەی شەڕبووەوە لەیەك کاتدا.

لەکاتێکدا کە ئەیبادەر بـیری لـەوە دەکـردەوە لـەرووباری جیحـۆن بپەڕێتـەوە یـاخوود چـاوەڕێی دوژمنەکـەی بکـات، شـا ئیسـماعیلی یەکـەم بـەرەو لای ئـەو دەهـات و

بەئەنقەستیش فێڵی لێکرد، ئەوەبوو سوپاکەی بەرەو لای عێراق سوڕاند تاکو دوژمەکەی وا هەستبکات کە دەڕواو شەڕناکات و لەدووری دە میلی لای مەروو و لەنزیک گوندی مەحمود ئاباد بۆسەیەکی بۆ دانایەوە. کاتێکیش سەرەڕای نارازیی بوونی سەرۆکی ئەرکانی سوپاکەی خان بەسەرکردایەتی بیست هەزار سەربازەوە بۆ راوەدوونانی رۆیی و پاشان کەوتە بۆسەکەیەوەو هەموو سەرکردەکانی کوژران و ئەویش یان لەژێر پێی ئەسپەکاندا مرد یاخو شا بەتیرێك کوشتی. بەمەش شا سەرجەم خاکی خۆراسانی کەوتە دەست و رووباری جیحون بوو بەهێڵی یەکلاکەرەوە ئێران و تەوران و مەزەبی شیعیشی بەسەرجەم شارەکانی خۆراساندا سەپاندو دەدە بەگ سولتانیشی کردە حاکی مەروو و حوسێن بەگ لالا حاکمی هەرات و زۆر بەئاسانیش توانی دەسبەسەر بەلخ و فاریاب و مەیمەنەو چەندین شاری دیکەی بەلخدا بگرێ.

لەسەردەمی خەلیفەکانی شێخ محەمەد شەیبانیی خان: لەئەنجامی ئەم سەرکەوتنەی سەفەوییەکان بەسەر ئۆزبەکەکاندا سێ ئاامانجی سەرەکی وەدەرکەوت، ئەوانیش:

یەکەم: دروستکردنی دیوارێکی شیعی لەنێوان سونەو ولاتی پشت رووبار و نێوان موسوڵمانە سوونەکانی خۆراوای ئاسیا، بەتایبەتیش پچڕانی تورکەکان لەزێدی خۆیان، هەر ئەوەش بوو پاڵی بە سوڵتان سەلیمی عوسمانییەوە نا کە پەلاماری ئێران بدات و ئەو دیوارە لەشەڕی چالدێران بشکێنێ، هەروەك لەدواییدا باسی دەکەین.

دووەم: هیوایەك لەدەروونی بابەر کە (لەهیندستاندا دەوڵەتی مەگۆلیی دامەزراند) دروستبوو کە لەمێژبوو لەگەڵ ئۆزبەکەکاندا لەململانێدابوو بۆ دەسبەسەراگرتنی خاکی پشت رووبار و گێڕانەوەی تەختی پاشایەتی باب و باپیرانی بەتایبەتیش کە لەتبوونەکە کەوتە ناو خانەوادەی شەیبانیی لەسەر ئەوەی کێ ببێتە جێنشینی محەمەد شەیبانیی خان و ئامادەشبوو سەرەڕای جیاوازی مەزەبیان دەست بخاتە ناو دەستی شا ئیسماعیلی یەکەم.

سێیەم: خانەوادەی شەیبانیەکان هەڵوەشایەوەو، عوبێدوالله خان بووە حاکمی بوخاراو جان بەگ میان قەلآی وەرگرت ومحەمەد تەیموری کوڕی شەیبانیی خان سەمەرقەندی بەرکەوت.

کاتێکیش ئەم میرزادانە نەیانتوانی رووبەرووی هێزەکانی شا ئیسماعیلی یەکەم و بابەری هاوپەیمانی ببنەوە، هەوڵیاندا کەپەیماننامەیەکی ئاشتیانە لەگەڵ شا ببەستن و گوێ نەدەنە مەرجەکان و هەرچییەك بێ بۆی بکەن تەنها لەپێناوی ئەوەی لەم ململانێیە دەرچن و لەدوای ئەویش خەریکی تەماعەکانی بابەر بن لەولاتی پشت رووبار. بەهۆی هەوڵەکانی کەمالەدین حوسێنی ئەبیوردی وەزیری پێشووی محەمەد شەیبانیی خان و کەپاشان هاتە بەر خزمەتی شا، لەساڵی ١٥١٠ز لەنێوان هەردوولادا رێککەوتنێك مۆرکرا. ئەو کاتەش شا خەریکی هەڵکشانبوو بەرەو خۆراوای عوسمانییەکان، بۆیە بەم رێکەوتنە قایل بوو:

- سەفەوییەکان لەتورکستان رێگری لەئۆزبەکەکان نەکەن.
- خوارزم بگەڕێتەوە بۆ شا ئیسماعیلی یەکەم.

بەهۆی ئەم رێکەوتنەش ئەو زەویانەی کەکەوتبوونە سەر لێواری چەپی رووباری جیحون و خۆراسانیش لەژێر دەستی شەیبانییەکان دەربێت و بدرێ بەسەفەوییەکان، لەبەرانبەریشدا شەیبانییەکان لەپێناو ئەوەی بتوانن لەدژی بابەر بجەنگێن دەستیان لەخۆراسان و خوارزم هەڵگرت، کەئەمەش بەسەرکەوتن بۆ شا ئیسماعیلی یەکەم هەژماردەکرێ، چونکە هەموو ئەو دەوڵەتانەی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە.

ئەوکاتەی بابەر لەرووباری جیحۆن پەڕیەوەو لەساڵی ١٥١١زدا سەمەرقەندی داگیرکرد، شا ئەو رێکەوتنەی نێوانیانی هەڵوەشاندەوە لەگەڵ ئۆزبەك سازی دابوو، هێرشی کردە سەر ناوچەکانی خۆراوای ئێران کەبەولاتی پشت رووبارەوە نووسابوون، بەڵام ئەوان کێشەکانی نێوانیان خستە لاوەو کەجکونجی خانیان کردە جێنشینی محەمەد تەیموور و لەقولی مەلەك لەناوچەی خەیرئاباد کەزۆر لەبوخارا نزیکبوو رووبەرووی بابەر بوونەوەو شکستیان پێهێناو لەساڵی ١٥١٢زدا سەمەرقەندیان گەڕاندەوە ژێر رکێفی خۆیان.

ئەم سەرکەوتنەی ئۆزبەکەکان ئەوەی دەگەیاند کەوا لەتوانیاندا هەیە زەبری دیکە بوەشێننە باکوری خۆرهەلاتی ئێران و هەموو خەونەکانی شا ئیسماعیلی یەکەم بنگۆم کەن لەوەی دەیویست دەسەڵاتی خۆی بەسەر هەرێمەکانی خۆرهەلاتدا بسەپێنێ و،

دەرکیشی بەوە کرد ئەگەر ئۆزبەکەکان توانیان هێزەکانی بابەر لەناوبەرن و وەدری نێن ئەوا هەرگیز ناتوانێ ئامانجەکانی خۆی بهێنێتەدی.

شا ئیسماعیلی یەکەم دەرکی بەگرنگیی بابەر کردبوو لەرووبەرووبوونەوەی لەگەڵ هێزەکانی ئۆزبەك بەر لەوەی کە سەرکردەی ئۆزبەکەکان عوبێدوللە کەلەنزیك دەریاچەی قولی بەسەریدا زاڵبوو و لەبارێکدا بوو کەدەیتوانی بابەر ناچار بکات بەشێوەیەکی یەکجارەکی بچێتە درەوەو بەتەنیاش ناتوانێ شەڕ لەگەڵ هەموو لایەکدا بکات، بۆیە بەپەلە پێداویستیە سەربازیەکانی بۆ یارمەتیی سوپای بابەر بەسەرکردایەتی حاکمی خۆراسان ئەمیریار ئەحمەد ئەسفەهانی کەبە ئەستێرەی دووەم ناسرابوو نارد و لەنزیك تەرمز پێی گەیشت.

ئەم سوپا یەکگرتووە هێرشی کردە سەر قارشی و داگیریی کرد، بەڵام هەڵوێستی دوژمنکارانە و تۆڵەسەندنەوانەی ئەستێرەی دووەم لەدژی دانیشتووان و فەرمانبەران بووە هۆی ئەوەی بەشێوەیەکی بنەڕەتی هەڵوێستی بابەر بگۆڕێ. هەروەها ئەم هەڵوێستەش رووبەرووی ناوەندە خێڵەکیەکانی ناوەڕاستی ئاسیا بووەوە و بەچاوێکی پڕ لەترسەوە دەیانڕوانییە بەرفراوان بوونی دەسەلاتی شا سەفەویی، چونکە ئەگەر سەرکەوتنی تەواوی لەژێردەستخستنی لەسەرانسەری ولاتی پشت رووبار بەدەستهێنا ئەوا هەمیشە شمشێرەکەی دەکەوێتە سەر گەردەنی ئەو کەسانەی دەست بەمەزەبی سوننیەوە دەگرن و، لەو کاتەشدا بابەر خەریکی چاو خشاندنەوەبوو بە پەیوەندیەکانی لەگەڵ شا و زۆری پێنەچوو پەیوەندییەکانی پچڕاند و پشتی تێکرد و لێیگەڕا بەتەنیا بەرەو جەنگی بوخارا بچێ.

نەجمسانی (ئەستێرەی دووەم) دەرکی بەوە نەدەکرد کەوا هەلێکی بۆ رەخساوە و دەتوانێ زۆر بەئاسانی و بەبێ یارمەتی بابەری مەگۆلی بەسەر ئۆزبەکدا سەرکەوێ و هێرشی کردە سەر قەلا ناوخۆییەکانی ئۆزبەك و سەرکەوتنی بەدەستهێنا. ئۆزبەکەکانیش زۆر بەچڕی چاودێری هەڵسوکەوتەکانیان دەکرد و وازیان لێ هێنا تا بەتەواوی هێزەکانی خۆی لەولاتی ئەواندا کۆکردەوەو شەکەت بوو، کاتێکیش گەیشتە گەجدیوان گەمارۆی سوپاکەیانداو لەنێوانیاندا جەنگێکی سەخت بەرپابوو وەك

قەساخانەیەك دەهاتە بەرچاو، لەوێدا سوپای سەفەوی زۆر بەسەختی شکستی خواردو، لە ئەنجامـدا نەجمـــانی ســـەرکردەیان و لەگـەڵ چـەندین ســـەرکردەی گـەورەی دیکـەی سوپاکەی لەمیدانی شەڕکەدا کوژران و کەوتنە سەر زەوی.

بەرەئەنجامی جەنگی گەجدیوان بریتیی بوو لە:

- بەروونی ئەوە بەدیار کەوت کەوا لەبەرامبەر مەزەبی شیعەی توندڕەودا مـەزەبێکی سوننەی تونـدەڕەو هەیـە لەنێوانیشـیاندا شـەڕی وێرانکارانـە و پـڕ لەکوشـتوبڕ و لەناوبردن سازبوو.
- ئۆزبەکەکان لەژێر چەپۆك و پاڵەپەستۆی سەفەوییەکان هاتنە دەرەوەو، رووبەری ئەو خاکەی کەوا عوبێدوڵلاخان دەستی کەوت لەدوای جەنگی گەجدیوان نزیکەی لەگەڵ هی محەمەد شەیبانی خان وەکو یەکی لێهات.
- ئەم سەرکەوتنە هانی ئۆزەبەکەکانیدا کەوا زیاتر لە هەرێمـەکانی بـاکوری خـۆراواو بەتایبەتیش لەخۆراسان بیر لـەفراوان بـوون بکەنـەوە، ئەمــەش فشـارێکی زیـاتری خستە سەر شا ئیسماعیلی یەکەم لەو کاتـەی کەدووچـاری فشـاری عوسمانییـەکان لەبەرەی خۆراوادا دەبۆوە.

ئۆزبەکەکان خۆراسانیان داگیرکردو شارو لادێکانیان وێرانکرد و تێکشـکانی هێزەکـانی سەفەوییەکانیشیان لەشەڕی چالدێران لەسەر دەستی عوسمانییەکان بەهـەلزانی و بـەرەو نێران هەڵکشان بۆ لـەناوبردن و هەڵکێشـانی رەگوریشـەیان و بەمـەش توانیـان چـەند ناوچەیەکی خۆرەلاتی هەرات داگیربکەن و گـەمارۆی شارەکەشـیاندا، بـەلام سـەرەڕای ئەوەش نەیانتوانی سەرکەوتن بەدەست بهێنن، کاتێك شا ئیسماعیلی یەکەم هەڵسایەوە و بەرەنگاریان بووەوە ناچاربوون جارێکی دیکە خۆراسان بەجێبهێڵن و لـەرێگای سـاوەو فەیروزکۆهەوە بەرەو مەشهەد کەوتنەڕێ و، عوبێدوڵلا بـەرەو مـەروو و لەوێشـەوە بـۆ بوخارا قوچاندی و هێزەکانی ئۆزبـەك هانایـان بـۆ گورجسـتان بـرد. لەوکاتەشـدا شـا ئیسماعیلی یەکەم کۆچی دوایی کرد.

تۆزبەکەکان وایان دەزانی کەوا مردنـی شـا ئیـسماعیلی یەکـەم شـوێنەوارێکی خـراپ لەدەوڵەتی سەفەوی بەجێدەهێڵێ و هەلی ئەوەیان بۆ دەرەخسێ کەوا لەناوی بەرن یاخود هەر هیچ نەبێ هەرێمەکانی خۆرەلاتی لێ دابڕن و بیخەنە پاڵ ولاتەکەی خۆیانەوە، هەر بۆیەش شێخ عوبیدوڵلاخان دەستی کرد بەهێرش و پەلاماری توند و لەئەنجامدا مەروو و مەشهەد و ئەسترئابادی داگیرکرد، بەلام لەمانـەدا هـیچ سـەرکەوتنێکی وای دەست نەکەوت کەبتوانێ رێگا خۆشبکات بۆ ناو جەرگەی ئێران بچێ.

## پەیوەندیەکانی سەفەوییەکان و عوسمانییەکان:

## دروستبوونی دەوڵەتی عوسمانیی:

عوسمانییەکان دەگەڕێنەوە بۆ هۆزێکی تورکی بەناوی قایی کەیەکێکە لەخێڵە کۆنەکانی تورک و لەناوەڕاستی ئاسیاوە بەرەو بەرزاییەکانی جزیرەی سەر رووباری فورات هاتوون و لە لەوەڕگاکانی نزیك شاری خەلات جێگیربـوون. پاشـان بـەرەو ئـەرزنجان لـە ئاسـیای بچووك بەسـەرۆکایەتی تـوغرول کۆچیان کـرد، ئـەویش بـەهۆی ئـەو فشـارانەوە بـوو کەلەئـەنجامی رووداوە سـەربازییەکانی نێـوان دەوڵـەتی سـەلجوقیە رۆمیـەکان (خانەوادەیـەکی تورکـە سـەلجوقیەکان بـوون دەوڵـەتی ئیـسلامیان لەئاسـیای بچـووك لەسـالانی نێـوان ١٠٧٧-١٥٠٤ز دامەزرانـد) و خوارزمیەکانـەوە (ئەمانـە سـەر بـە ئەنوشتکین بوون کەیەکێك لەو تورکانەی لەشانشینیی سـوڵتان مەلەکشـای سـەلجوقیی دەژیاو کاری مەیگێڕیی دەکردو بەلام محەمـەدی کـوڕی بەزانسـت و ئـەدەب ناوبـانگی دەرکردبـوو) سـازببوون. لەسـالی ی١٢١٩-١٢٣٧ز تـوغرول پشـتیوانی لەسـوڵتانی سەلجووقی عـەلای کیقبـادی یەکـەم کـردو سـوڵتانیش لەبەرامبـەردا زەویـە بـەپیت و لەوەڕگاکانی نزیك ئەنەکەرای پێبەخشی. توغرول وەك هاوپەیمانی سەلجوقیەکان مایـەوە تا ئەو کاتەی سوڵتان ناوچەیەکی دیکەشی لە ئەوپەڕی باکوری خۆراوای ئاسیای بچووك پێ بەخشی کە لەسەر سـنووری بێزەنتیـەکان لەناوچـەیەکبوو بـەناوی سـکود لـەنزیك ئەسکی شەهر، ئەو جێگایەی کە خێڵەکەیان دەستی کرد بەژیانێکی نوێ و پیـادەکردنی چالاکی ئابووری تا بەهۆیەوە بتـوانێ بـوونی خـۆی لەناوچـەکەدا بسـەلمێنێ و چـالاکی سیاسیش بۆ ئەوەی بـوونی خـۆی لـەو ناوچـانەی بەدەسـتی هێنـاون جێگیر بکـات و

بیچەسپێنێ. لەسەردەمی شا عوسمانی کوڕی تـوغرول لەسـاڵی ١٢٨٨-١٣٢٦ز پلـەی فەرمانڕەوای بەهۆی چالاکییە فیداکاریەکانی لـەدژی بیزەنتییـەکان وەرگـرت، لەمـەوە ناوبانگی دەرکردو ئەم هۆزە بەناوی ئەوەوە ناسراو، بارێکی تایبەتیشی بۆ هێنایە ئاراوە کەبریتی بوو لە چەند کۆمەڵەیەك لەزاناو شێخەکانی تەریقەتی سۆفیگەریی و دەروێـش و پیشەوەری زیـرەك و بازرگـان و بەمـەش رۆشـنبیریەکی بـێ وێنـە و بزووتنەوەیـەکی بازرگانی چالاکی بۆ خۆی دەسخست و بەهۆیەوە لەیەکـە تورکمانیـەکانی دیکـەی نێـو ئەنادۆڵ جیابۆوە و پاشان عوسمـان بـە پادشـا و سـوڵتان ناوبـانگی دەرکـرد کەئـەویش ئاماژەیەك بوو بۆ دروستکردنی دەوڵەت.

عوسمان میرنشینیەکەی خۆی لەسەر حسابی بیزەنتیەکان فراوان کـرد یـەنی شەهریشـی کردە پایتەختی خۆی لەدوای ئەو ئۆرخانی کوڕی لەسـاڵی ١٣٢٦-١٣٦٠ی رایگـرت و بۆرسـەشی کردە پایتەختی خۆی کە یەکێکە لەگرنگترین خاڵە سـەربازیەکانی ئـەنادۆڵ و چونکە لەوێوە هەلی ئەوە بۆ عوسمانییـەکان رەخسـا کـە بـەرەو ناوچـەکانی دەوروبـەر هەڵکشێن و پاشان بەرەو رۆملی و بەلکان پێشرەوی بکەن.

## گەشەسەندنی دەوڵەتی عوسمانی:

جێپێ دەوڵەتی عوسمانی لەسـەردەمی خەلیفـە ئۆخـان و لـەماوەی هەڵکشـانی بـەرەو ئەنادۆڵ لەسەر خاکی بیزەنتیەکان و نیقیەو نیقۆمیدیـەو بـەلکان و گـالیبۆلی گەشـەی سەند. سەردەمی مورادی یەکەمی کوڕی ئۆرخان (١٣٦٠-١٣٨٩ز) وەك شۆڕشێك بـوو بۆ هەڵکشـان و فـراوان بـوونی عوسمـانیی. چـونکە نزیکـەی پێـنج ئەوەنـدەی خـاکی سەردەمی باب و باپیرانی دەوڵەتەکـەی فـراوان بـوو و سـنوورەکەی بـردە کـەنارەکانی رووباری دانوب و نزیك بۆسـنەو قوولایی ئەوروپای خۆرهەڵات و میرنشـینیی قـەرمانیش کە ئەوکاتە زۆر بەهێزبوو خستە پاڵ خۆی و، ئەمانەو جگـە لەمیرنشـینیی کـەرمیان و هەرێمی حەمید و تەککە.

کـاتێکیش بایەزیـدی یەکـەمی کـوڕی بـوو بەجێنشـینی لەسـاڵی ١٣٨٩-١٤٠٣ز ئامانجەکانی دەوڵەتەکە بەروونی و ئاشکرایی بـەدیار کـەوتن و سیاسـەتەکەشی لەسـەر دوو بنەما دەستنیشانکرد:

ئەکەم: لەناوبردنی خانەوادە دەسەلاتدارەکانی ئەنادۆڵ و بەلکان و پاشانیش داگیرکردنی خاکەکانیان و خستنیە پاڵ دەوڵەتە تازە گەشەسەندووەکەی.

دووەم: دامەزراندنی دەوڵەتی ناوەندی لەو ناوچانەو وێنەی رژێمە ناوەندیەکانی دەوڵـەتی ئیـسلامی لەخۆرەلاّت و پێکهێنانی دەزگاکانیی وەك بناغەیەك بۆ ئەم رەوتە.

لەراستیشدا ئەم سولتّانە هەموو ویستەکانی خۆی لەم بوارانەدا هێنایەدی و هەرچـەندە خەریك بوو لەناویش بچێ، ئەویش لەو کاتەی کە فەرمانڕەواکانی دەوڵەتــە بچـووکانەی تورکمانەکان کاتێك لەسەر حوکم لادران پەنایان بۆ تەیموورلەنگ بـرد تـاکو یارمـەتیان بدات و موڵك و سامانەکانیان بۆ لـە سـولتّانی عوسمـانی وەرگرێتـەوە ئـەویش بـەدەم داواکانیانەوە هاتوو و بەلێنی پێدان یارمەتیان بـدات، ئـەوەبوو گـەمارۆی زەویـەکانی سـولتّانی داو لەسـالّی ١٤٠٢ز بەسـەر سـولتّان بایەزیـدی یەکـەم لەشـەڕی ئەنکـەرا سـەرکەوت و بەدیلی گرت، بەلاّم هاوپەیمانەکانی توانیان ئەوەی لەکارەساتەکەی ئەنقەرە لەدەستیـان دابوو بیگێڕنەوە و سەربەرزی و شکۆمەندیش بدەنەوە بە دەوڵەتەکەیان و لەو سنوورانەش دەرچوون کە باب و باپیرانیان پێی گەیشـتبوون، بەتایبـەتیش لەسـەردەمی سولتّان محەمەدی فاتح لەسالّی ١٤٥١-١٤٨١ز کـە تـوانی فەلەسـتین رزگـار بکـات و لەژێر ناوی ئەستەمبووڵ کردیە پایتەخی دەوڵەتەکەی، هـەروەها لـەباکوری بـەلکانیش دەسـەلاّتێکی بۆخۆی دانا کەبەهۆیەوە توانی رووبـەرووی مەجـەر ببێتـەوە کەهەمیشـە بەربەسـتبوو بـۆ بـەرفراوان بـوونی دەوڵـەتی عوسمـانیی لەئـەوروپا. لـەدەوری ولاّتـی سربەکانیش کۆبوونەوەو چەندین شاریان ئازادکرد، بەلاّم بەلغراد لێی یاخی بوو و پاشان شاری مورەی لەیۆنان و ئەفلاق لەباکوری رووباری دانوب و بۆسنەوهەرسکی ئـازادکردو ئینجا هەریەك لەتەرابزۆرن کەدوایین مۆلّگەکانی بیزەنتیەکان بـوو لەئاسـیای بچـوك و سـینۆب و قەرمان، لەدواییدا ولاّتی قـەرەم و زەنتـاو کۆرفـۆو سـائۆری و کـەفالۆنیایان ئازاد کردو، ئینجا لەگەڵ ڤینیسیا چوونە ناو جەنگێکی درێژخایەنەوە کەماوەی شـانزە سالّی خایاند لەدواییدا ناچاریکردن دەست لەچەند ناوچەیەکی ژێر دەسەلاّتیان هـەلگرن لەیۆنان و دورگەکانی ئەرخەبیل.

## تەنگژەی نێوان سەفەوییەکان و عوسمانییەکان:

پەیوەندیەکانی نێوان سەفەوییەکان و عوسمانییەکان لەگەڵ رۆژگـاردا شـێوەیەکی بـەرەو بەرزەوەبووی وەرگرت و لەشـەڕی چالدێرانیشـدا گەیشـتە چـلەپۆپەی. ئاشـکرایە کـەوا پەیوەندی نێوانیان لـەدوای لـەناوبردنی خانـەوادەی ئـالاق قوینلـوو کـەمێك ئـارامیی بەخۆیەوە بینی، ئەویش لەبەر ئەوەبوو سـولتان بایەزیـدی دووەم کـە ببـووە جێنشـینی محەمەد فاتحی باوکی هەر بەسروشتی خۆی حەزی لەئاشتیی بوو، بیری لەهیچ هەڵمەت و ئازادکردنێکیش نـەدەکردەوە نـە لـەخۆرەلات و نـە لـەخۆراواو، ئامـادەش نـەبوو کـە یارمەتی ئەلوەندی سـەرۆکی ئـالاق قوینلـوو بـدات لـەدژی شـا ئیسـماعلی یەکـەمی دوژمنی هەردوو لایان، بەلاّم لەهـەمان کاتیشـدا هەمیشـە لەئامادەباشـیدابوو، داوای لەرۆستەم بـەگی مـەکری کـوردی حـاکمی دیاربـەکر کـرد کـەوا راپـۆرتێکی لـەبارەی مەرامەکانی دەوڵەتی سەفەویی بۆ بنووسێ لەبارەی فراوان بوون و سنووربەزاندن بـەرەو خۆراواو ئامادەکاریەکانی شا ئیسماعیل و ئەندازەی هێزەکانی بەبەراورد لەگـەڵ هێـزی ئەلوەند، بەلاّم ئەم داواکاریە بەدرەنگەوەهات، چـونکە شـا ئەلوەنـد شکسـتی خـواردو خەریك بوو لەگەڵ مەمالیکەکانی میسـر لـەپێناوی هاریکـاریی دژی عوسمانییـەکان و ناردنی هێزێکی سەربازی بۆ سەر دیار بەکرو مەرعەش دانوستانی دەکرد.

لەدوای لەناوبردنی ئالاق قوینلوو بەهۆی رکابەریان لەسەر دابەشـکردنی موڵکـەکانییان کەلەسەر سنووری هاوبەشیان بوو پەیوەندیەکانی نێوان سـەفەویی و عوسمانییـەکان روو لـەخراپی بـوو، کـارێکی سروشـتیش بـوو کـەوا رقوکینـە مەزەبیـەکانی نێوانیـان پەرەبسێنێت، کەچی بەدرێـژایی حـوکمڕانی سـولتان بایەزیـدی دووەم ئـەم رقوکینەیـە شاراوەبوو بەهۆی ئـەو پشـێوی و ئاڵۆزیانـەی کەلـەولاتی عوسمانییـەکان و لەئـەنجامی شۆڕشی شیعەکان و رکابەریان لەسـەر گرتنەدەسـتی دەسـەلاّت و ئەمانـە لـەناوەڕۆکی نامەکانی نێوانیان بەدیار دەکـەوێ. کـاتێکیش شـا دەسـتی بەسـەر عیراقـدا گـرت و خستیەپاڵ موڵکەکانی سەفەوی سولتانی عوسمانی نێردراوێکی بـەناوی محەمـەد چـاوش بالابان ناردو چەندین دیاریشیی پێبوو بۆ شا ئیسـماعیل و سـەرەڕای ئـەوەش نامەیـەکی پیرۆزبایی بەبۆنەی ئەو سەرکەوتنانەی کەلە عیراق و فارسدا بەدیهێنابوو بۆ نووسـیبوو،

وادیاربوو دەیـەوێ پەیوەندیـەکانی خـۆی لەگـەڵ شـا بـەهێزبکات بـەبێ ئـەوەی دەرك بەوەبکات کە چ مەترسیەکی بۆ سەر دەوڵەتەکەی ئەو هەیە، کـاتێکیش شـا بـەردەوام بوو لەراوەدوونانی موسوڵمانە سونەکان و هەڵاتنی ئەو سونیانە بۆ خـاکی عوسمـانی، نووسراوێکی بۆ نارد تێیـدا داوای لێکـرد کـە لەگـەڵ مـردوو و زینـدووی سـوننەکاندا چـاکەخوازبێ و شـوێن هـەڵگری بـاب و بـاپیرانی و مێـژووی ئێـران و شارسـتانیەتە رەسەنەکەی بێ.

شا کاردانەوەیەکی ئیجابی هەبوو، ئەوەبوو کاتێك لەشەڕی دژ بەعەلای دەولـەی زیقـارِ هێرشی کردە سەر مەرعەش و بوسـتان و ناچـاربوو لەسـنووری عوسمانییـەکان لـەنزیك قەیسەرِیە بیەڕێتەوە فەرمانی بەسەربازەکانیدا کەوا تخـونی مـاڵ و گیـانی خەڵکەکـەی نەکەون و هەڵسوکەوتی چاکیشیان لەگەڵدا بکەن و داوای لێبووردنیشی لەسـوڵتان کـرد بەهۆی ئەو سنووربەزاندنەی کردی و پێشی راگەیاند کـەوا بـەهیچ شـێوەیەك بـیر لـەوە ناکاتەوە گرژی بخاتە نێوانیانەوە.

سـوڵتانی عوسمانی زۆر دڵی بەم هەڵسوکەوت و نازناوە شکۆداریانە خۆش بـوو کـە شـا لەنامەکەیدا بۆی نووسیبوو وەك: گەورەترین پاشا و بەخشندەترین تاجبەسەر و پادشـای پادشاکانی عەجەم.

لەوکاتەی کە ئەو دوو شایە نامەیان بۆ یەکتر دەنـارد سـەلیمی کـوڕی بایەزیـدی دووەم شەڕی لەگـەڵ سـەفەوییەکاندا دەکـرد و بـەرەو دەرەوەی وڵاتەکـەی راوەدووی دەنـان و لەیەکێك لەهێرشەکانی بۆ ئەرزنجان ئیبراهیم و برای شـا ئیسـماعیلی یەکـەمی بـەدیل گرت و، بەمەش نامەیەکی پڕ لەگلەیی و نارەزایی بۆ سوڵتانی عوسمانی نـاردو تیایـدا دۆستایەتی عوسمانی و سـەفەوییەکانی وەبیرخسـتەوە، بـەڵام سـوڵتان بایەزیـدی دووەم بەشێوەیەکی شیاو و جوان پێشوازی لە نێردراوی سەفەوییەکان نەکرد.

لەبەرانبـەردا شـا ئیسـماعیلی یەکـەمیش بەهـەمان شـێوەیە رێـزی لـەنێردراوی عوسمانییەکان نەناو بەهەموو شـێوەیەك سـوکایەتی پێکـرد. لـەو سـاتەوە پەیوەندییـە دۆسـتانەییەکانی نێوانیـان هەڵگەڕایـەوە بـۆ رووبەڕووبوونـەوەی سـووك کـرد. ئـەم

وەرچەرخانەش یارمەتی دەرکەوتنی میر سەلیمیدا کەوەك جێنشینی چاوەڕوان کراوی باوکی و بەچاکترزانینی ئەو لەچاو ئەحمەد و قورقودی براکانیدا.

لەساڵی ١٥١١زدا پەیوەندیەکان روویان لەخراپی کرد، ئەویش لەئەنجامی ئەو شۆڕشەوە سەری هەڵدا کە شا قوولی کوڕی حەسەن خەلیفەی سەرکردەی هۆزی تەکەلووی قزلباشی لەویلایەتی تەککە لەئەنادۆڵ هەڵیگیرساند و کۆبوونەوەی شیعە توندڕەوەکان لەدەوری گوایە ئەو نوێنەری شا ئیسماعیلی یەکەمە. لەهەموو لایەکەوە شۆڕشگێران لەلایەن ئەو شیعانەی کەلەدوڵەتی عوسمانی بڵاوبوونەوە یارمەتیان بۆ هات و ئەو سەرکردەشیان کوشت کەلەلایەن سوڵتانی عوسمانییەوە راسپێردرابوو بۆ دامرکانەوەی شۆڕشەکەیان. کاتێکیش بەهێزبوونەوە هێرشیان کردە سەر ناوچەی قەرمەران و شکستیان بەقەرەگۆز پاشا هێناو ویلایەتی سیواسیان داگیرکرد، ئەمەش سوڵتانی عوسمانی دڵتەنگ کرد بۆیە سوپایەکی گەورەی بەسەرکردایەتی سەدری عەزەمی خادم عەلی پاشای نارده سەریان بۆ ئەوەی شۆڕشەکەیان دامرکێنێتەوە هەروەك لەپێشەوە باسمان کرد، بەڵام دوو سەرکردە لەشەڕەکەدا کوژران و زۆربەی لایەنگرانی شا پەنایان بردە بەر ئێران. سوڵتانی عوسمانی کە ئەوکاتە باری تەندروستی روو لەخراپی بوو بەوەندە دڵی ئاوی خواردەوەو، لەهەمان کاتیشدا چاوی لەو رکابەریەبوو کەلەنێوان هەرسێ کوڕی ئەحمەد و قورقود و سەلیمدا هەبوو و، لەو نێوەندەشدا نامەی بۆ شا ئیسماعیلی یەکەم ناردبوو تێدا دەست خۆشیان لێدەکرد بەهۆی ئەو هاندانەی کەبۆ لایەنگرانی لەخاکی عوسمانیدا دەیکات و یارمەتییان دەدات لەو راپەڕینەیان دژی دەسەڵات ئەنجامیان داوە.

## لابردنی سەلیم لەفەرمانڕەوایەتی عوسمانیی:

ئەو لێکترازانەی دووچاری ئەنادۆڵ هاتبوو بەهۆی ئەو کورتهێنانە روون و ئاشکرایەی سوڵتان بایەزیدی دووەم تەنگژەی سیاسی سەریهەڵدا و رکابەری نێوان سێ کوڕەکەی سوڵتان لەسەر دەسەڵات و کاردانەوەیەکی خراپی هەبوو لەسەر تواناکانی دەوڵەت. سەلیم لەهەموان زیاتر نیگەران و رق ئەستوور بوو بەرامبەر بە شا ئیسماعلی یەکەم، داوای لەباوکی کرد کەوا بیکاتە حاکمی یەکێك لەویلایەتەکانی ئەوروپاو باوکیشی ئەم

داوای رەتکردەوە، ئەوکاتە لەژێر فەرمانی باوکی دەرچوو و بەسەرکردایەتی سـوپایەکی خورتەوە بەرەو ولاتی رۆملی بەڕێکەوت و لەسـاڵی ١٥١١زدا لەشـاری ئەدرەنـە نزیـك کەوتەوە و بەمەش بەزۆر بەسەر باوکیـدا سـەپاندی کەداواکاریـەکی بـۆ بـەجێبهێنێ و بەوالی سەمەندەریەو ڤیدین و ئالاجەحیسار و نیکۆپۆلیس دایمەزراند و لـەوێش جێپێـی خۆی قاییم کرد و وادیاربوو مەبەستی سازکردنی دەوڵەتێکی نوێ بێ.

سەلیم ئەو یـاخی بوونـەی نێـو تەککـە و سـەفەرەکەی بـاوکی بـۆ دەرەوەی پایتـەخت بەهەلزانی لەبارەگای خۆیەوە بەرەو ئەدرەنە هەڵکشـاو لـەوێ دەوڵـەتێکی سـەربەخۆی عوسمانی راگەیاند و ئەمەش بـەهیچ شـێوەیەك لـە ورەی سـولتاندا نـەبوو کەبێـدەنگی لێوەبکات، بۆیە سولتان بایەزیدی دووەم سوپایەکی نـاردە سـەری و شکسـتی پێهێنـاو ناچاری کرد کەوا بگەڕێتەوە بۆ ولاتی قەرم. لێرەدا ئەحمەدی برای وایزانی کەوا دەتوانێ بەرەو پایتەخت بچێ و لەوێ وەك سولتانی دەوڵەتی عوسمانی خـۆی رابگەیـەنێ، بـەلام ئینکیشاریەکان ئەوانەی کە بەبێ توانایی وەسفیان دەکرد، لێی یاخی بـوون و ناچـاریان کرد بکشێتەوە.

هەموو رووداوەکان لەبەرژەوەندی شا ئیسماعیلی یەکەم دەشکایەوەو توانی لەسـەرەتای ساڵی ١٥١٢ز یاخیبوونێکی دیکەی سەرکردە نور عەلی خەلیفە لە تۆقات و ئەماسـیا سازبکات و بەتاکە یاخیبوون هەژمارکرا کە راستەوخۆ پەیوەندی بە شـا ئیسـماعیلەوە هەبێ و بۆ خۆی کاربارەکانی هەڵدەسووڕاند، ئەمەش بووە هۆی هەڵچوون و تووڕەبوونی ئینکیشاریەکان بەرامبەر زیان لێکەوتنی سولتان و سـەرکەوتنی شـاو جـەختی زۆریـان لەسەر ئەوە کردەوە سـولتان لەکوڕەکـەی خۆشـبێ و ئـەویش داواکـەیانی هێنایـەدی و گەڕاندیەوە بۆ سـەمەندەریە. بـەلام لـەکاتی گواسـتنەوەی ئـەو ئینکیشـاریانەی کـەوا یارمەتیاندا و پشتگیرییان لێکرد و متمانەی زۆریان پێی هەبوو چوونە ناو پایتەخت و فشاریان خسـتە سـەر سـولتان بـۆ ئـەوی لـەپێناوی کوڕەکەیـدا دەسـت لەتەختەکـەی هەڵگرێ، ئەویش بەناچاری رەزامەندی نواند و لە٢٥نیسان١٥١٢ز بەشێوەیەکی گشـتی لەژیانی سیاسی دەستی کێشایەوە.

## سیاسەتی سوڵتان سلیم لەخۆرەڵات:

لادانی سوڵتان ســەلیمی کــوڕی بایەزیــدی دووەم لەســاڵی١٥١٢- ١٥٢٠ز قۆنــاغێکی جۆریی بوو لەمێژووی عوسمانییەکان و راوەستان لەپێشڕەویی بەرەو خۆراوا و رووکردنــە خۆرەلاتی لێکەوتەوە. وەرچەرخانەکەش لەخۆراواوە بــەرەو خــۆرەلات دەســتی پێکــرد، ئەویش لە سەرەتای هەلکشانی شیعە بەرەو خاکی عوسمانییەکان و لەئەنجامی ئەمــەشدا سیاسەتی ئەم سوڵتانە لەخۆرەلات بریتیی بوو:

## یەکەم: دەسبەسەرداگرتنی رێگای بازرگانی نێوان خۆرەڵات و خۆراوا:

ئەم سوڵتانە لەهەوڵی ئەوەدابوو کەوا بگاتە هیندستان و لەوێوە دەسبگرێ بەسەر رێگــا بازرگانیەکانی باکوور لەدژی قۆرخکردنی پورتوگالیەکان لەبواری بازرگانی بەهاراتــدا و کۆنترۆڵکردنی رێگا بازرگانیەکانی خۆرەلات و هیندستان.

ئەمەو سەرەتای سەردەمی ئەو بەپێشکەوتنێکی بیرۆکراتی عوسمانی و کارسازی کــارە هونەریەکانی ئەوکاتی کەلەولاتدا باوبوون دەستی پێکــرد. ئــەم بــارە نوێیــەش وایکــرد داخوازیەکانی دەوڵەت روو لەزیادبوون بکات بەمەبەستی بەرەو پێشبردنی ئەم بوارانــە. پاشانیش بەرزبوونەوەی بەردەوامی نرخی دانەوێڵە لەئەوروپا هۆکارێکی ســەرەکی بــوو بۆ گەشەسەندنی بواری هەناردەی دانەوێڵەی ئەنادۆڵ و زیادبوونی ژمــارەی دانیشــتوانی ئاسیای بچووك و وامان لێدەکات دەرك بەوەبکەن کەلەبواری کشتوکاڵی رووی لــەفراوان بوون کرد. جگە لەمانەش بەکارهێنانی زۆری بەهارات و حەریر لەئەوروپا زیاتر هانیــدا کە هەوڵی قۆرخ کردن و دەسبەسەرداگرتنی رێگــا بازرگانیــەکانی خــۆرەلات و خــۆراوا بدات.

سەرەتا هەوڵیدا کەوا سەفەییەکان سوود لەماددەخامەکان وەرنــەگرن بــۆ دروســتکردنی چەك و تەقەمەنی وەك: مس و ئاسن کە ئەوکاتە ئەنادۆڵ پێوەی بــەناوبانگبوو، ئینجــا گەمارۆیەکی ئابووریشی بەسەر دەوڵەتی سەفەوییدا سەپاند بەتایبەتی بازرگانی حــەریر کەبەناو خاکی عوسمانییەکاندا تێدەپەڕی و بەرەو حەلەب-ئەســکەندەروونەو لــەوێوە بــۆ خۆراوای ئەورووپا دەڕۆیشت و لەوێشدا بەزێڕ ئاڵوگۆڕیان پێدەکرد، ئــەم هەنگاوانــەش

بوونە هۆی ئەوەی دەسکەوتەکانی دەوڵەتی سەفەویی بەشـێوەیەکی بەرچـاو روو لـەکزی بکات.

دوای ئـەوە سـولتان هـەنگاوێکی دیکـەی هـەڵێنا، کاتێـك دەسـتی بەسـەر کـاڵاو شتومەکەکانی ئەو بازرگانە ئێرانیانە دادەگرت کە لەبەری ئەوروپا لەرۆمللییەوە باریـان دەکردن، بێگومـان ئەمـەش کاریگـەریی زۆری هـەبوو بەسـەر رێگـای بازرگانـەکان و ناچاربوون بەناو دۆڵی رافیدەین بەرەو خواروو بـسوورێنەوە. لەکۆتاییشدا بڕیاریدا رێگای بازرگانی هیندستان کۆنترۆڵ بکات.

## دووەم: هەڵکشان لەناوچەی هێزە خۆرەلاتیەکان:

**ئەم پێوانەیەش لەسەر بنچینەکانی مەزەبی و سیاسی و هزری دامەزرا:**

دەربارەی لایەنی مەزەبی شا ئیسماعیلی یەکەم هەوڵی زۆریـدا کـەوا مـەزەبی شـیعی لەئەنادۆڵدا بلاوبکاتەوەو بەمەش بتوانێ قەوارەی دەوڵەتی عوسمانی لـەرەگ و ریشـەوە هەڵتەکێنێ، لەئاسیای بچووکیشدا شیعەکان بەسەرۆکایەتی شا قوولی لـەدوایین سـاڵدا لەدژی دەسەلاتی سولتان بایەزیدی دووەم بەپشت بەستن بەحاکمەکانی ئێـران راپـەڕین، هـەروەك پێشـی ئێسـتا ئاماژەمـان پێـدا و سـولتانی عوسمـانی ترسـی لێنیشـتوو لەمەرامەکانی شا گەیشت بۆیە سوپایەکی نارده سەر سنوور بۆ ئەوەی بەر لەم کارەیـان بگرێ، هەر لەوکاتەشدا بڕیاریدا ژمارەیەك لەلایەنگرانی شـا دوورخاتـەوە و بیانێرێتـە مووره، پاشان بەمەبەستی دابڕینیی شا لە بنکەکەی لەئەنادۆڵی خۆرەلات سـنوورەکانی داخست، کەچی ئەم کارە زۆر کاریگەریی نەبوو چونکە شـوێنکەوتووانی سـوودیان لـەو بازرگانانە وەردەگرت کەبەئارەزووی خۆیان هاموشۆیان دەکردو ئـەوانیش بەسـایەیانەوە توانیان لەناوجەرگەی ولاتەکەیاندا کۆببنەوە. وەك ئەوەی سـولتان بایەزیـدی دووەم زۆر بەپارێزبوو بـەهیچ شـێوەیەك ئـارەزووی ئـەوەی نـەدەکرد کـەوا لـەم ناوچـانەدا شـەڕ هەڵگیرسـێنێ، چـونکە هـەر یاخیبوونێـك دەبێتـە هـۆی نیگـەرانی بـۆی. لەپاشـان نێردراوێکی بەمەبەستی ناڕەزایی دەربڕین نـاردە تـەوریز کەباسـی ئـەو دەسـدرێژیانەی لەگەڵ شا کرد دەرهەق بە موسوڵمانە سوونییەکان دەکرا، لەبەرانبەریشـدا نێردراوێکـی شا هاتە لای و داوای لێکرد تـەڕابزۆن بگێڕێتـەوە بـۆ سـەفەوییەکان چـونکە مـولکی

ئەوانەو باب و باپیرە بێزەنتییەکانییشـی کـاتی خـۆی هـەر فـەرمانڕەوای ئـەوێبوون و ئیدانەی ئەو پەلامارانەشی کرد کە سەلیمی کـوڕی دەیانکاتـە سـەر زەویـەکانی سـەر بەدەوڵەتی سەفەوی و چەوساندنەوەی شیعەکانی وڵاتی خۆی.

لەوکاتەی کە سـوڵتان بایەزیدی دووەم دەرکی بەگەورەیی مەترسـیەکانی هەڵگەڕانـەوەی تورکمانەکانی ئەنادۆڵ بۆ سەر مەزەبی شیعە نەدەکرد، بەڵام سـەلیمی کـوڕی لـەبارەی ئەم هەڵگەڕانەوەیە زۆر بەهەستبوو. زۆر لەوە دەترسـا شـا لایـەنگرانی خـۆی بنێرێتـە خۆرەلاتی ئەنادۆڵ بەمەبەستی ئەوەی بیروباوەڕە مەزەبییەکەی لەناو هۆزە تورکمانەکاندا بلاوبکاتەوە، چونکە ئەوانە دەبوایە ئەوکاتە بەرگری لەمەزەبی شیعە بکـەن و ئەمـەش مەترسیەکی زۆر و راستەوخۆی لەولاتدا دروسدەکرد، لەهەمانکاتیشدا هەڵکشـانی شـا لەعیراق و دیاربەکر زۆر نیگەرانی کردبوو، چونکە ئەوە سنووربەزاندنێکی لێپەیدا دەبوو کە ئاراستەکانیی بزووتنەوەی سەفەویی ئـایینی راگەیەنـدراویان دەگـۆڕی بـۆ ئامانجـە سیاسیەکان لەپێناو ئەوەی دەسبەسەر خۆرەلاتی ئەنادۆڵدا بگرن کەخاوەن قورسـاییەکی بێوێنـە بوو لەبواری سیاسی و ئابووریدا.

بۆیـە هـەرگیز لـەبیری ئـەوەدا نـەبوو کـە هێـرش بکاتـە سـەر دەوڵـەتی شـیعەکان و دووبەرەکیەکانیان دابمرکێنێتەوەو، ئـەم هەڵوێـستەش وایکـرد سـەرکردە سـەربازیەکان بەتایبەتیش ئینکیشاریەکان هیوابڕبن لـەراگرتنی هەڵکشـان و پێشـڕەویی شـیعەکان و رزگارکردنی دەوڵەت لەمەترسەکانی شیعە و فراوانبوونی ئەو سەفەوییانەی کەهەمیشـە لەهەوڵی ئەوەدابوون هەیبـەتی دەوڵـەتی عوسمـانی بشـکێنن و لاوازی بکـەن، ئـەویش لەرێگای نانەوەی دووبەرەکی و پشێوی لەولاتدا.

بەمەش بزووتنەوە مەزەبییەکەی شا بەشێوەیەکی ئاشـکرا بانگـەوازی بـۆ دەکـراو بـاس لەبەرفراوانبوونـە سـەربازیەکانی دەکـرا کاریگـەریی روون و ئاشـکرای هـەبوو لەسـەر پارێزگاری زیـاتری مەزەبـە سـوننیەکەی عوسمانییـەکان و بـووە هۆکـارێکی کاریگـەر لەگۆڕینیی پلانە سیاسیەکانیان و رووکردنە بەری ئاسیای خـۆراوا لەوکاتـەی ئـەورووپا بەشتی دیکەوە سەرقاڵبوو، بۆیە یەکەم ئەلقـەی زنجـیرەی کێشـەکانی نێوانیـان بـەدیار کەوت، بەتایبەتیش هۆکاری مەزەبی یەکێك بوو لەپاڵنەرە سەرەکیەکان.

دەربارەی بنچینە سیاسیەکەش: ئەنادۆڵی تورکی بەشێوەیەکی سروشتی بەرەو ئێران و خاکی ئاسیای ناوەڕاست هەڵدەکشا، بەهۆی ئەوەی رەگەزی تورك کە خاوەن سروشتێکی ئاسایی بوون رۆژێك لەرۆژان دەسەلاتی تەواویان بەسـەر خـاکی ئاسـیای ناوەڕاسـت تـا دەگاتـە دەریـا سـپی ناوەڕاسـتەوە هـەبوو و لـەم ناوچانەشـدا دەوڵـەتێکی فراوانیـان دامەزرارند، سەلجوقیەکان لەسەرەتا و پاشانیش عوسمانییەکان پشـیان بـەو تورکمانانـە دەبەست کەلە خۆرەلاتـەوە بـەرەو ئـەویێ دەهـاتن لـەبونیاتنانی کۆمـەڵگای تـورکی و گەشەسەندنی ئەنادۆڵ یاخود بەلکان. ئەوەبوو دەوڵەتی سەفەوییش دیـوارێکی سیاسـی گەورەیان لـەنێوان عوسمانییـەکان و زێـدی بـاب و باپیرانیـان لـەخۆرەلات دروسـکرد، سەرەڕای ئەوەی کە شا ئیسماعیلی یەکەم ئەو کاتـە نوێنەرایـەتی جیهـانێکی دیکـەی تورکەکان دەکرد کەجیابوو لەگەڵ جیهانی تورکە عوسمانییـەکان، ئەمـەش بـووە هـۆی ئەوەی ئەو دیوارە سیاسیە هەڵبگیرێ و پەیوەندیەکانیان لەگەڵ خۆرەلاتدا سـازبکەنەوە، هەروەها سولتان سەلیم دەرکی بەوەکرد کەوا شا ئیسماعیل مەترسـیەکی زۆر گەورەیـە بۆ یەکریزیی ئەنادۆڵی تورکی و ماوەی فەرمانڕەوایەتی دوای سولتانیش ئـەم راسـتیەی سەلماند، چـونکە چارەسـەرکردنی کێشـەی ئـەنادۆڵ واتـە ریشەکێشـکردنی. سـەرەڕای ئەمانەش دەتوانرێ رووبەرووبوونەوەی سـەفەویی و عوسمانییـەکان وەهـاش سـەیربکرێ کەلەلایـەك پەیوەندیـەکانیان ناکۆکـە لەگـەڵ لایـەنی مـەمالیك و ئۆزبەکـەکان و فەرمانڕەواکانی هیندیە مەگۆلەکان لەلایەك و لەلایەکی دیکەشەوە خۆرئاوای ئـەورووپا کەپێکهاتبوو لە ململانێ لەسەر ناوچەکانی ئاسیای ناوەڕاست تا دەگاتە دەریـای سـپی ناوەڕسـت. سـەرکەوتنی شـا ئیسـماعیلی یەکـەم لەدروسـکردنی دەوڵـەتی سـەفەوی مەترسیەکی گەورەی بۆ عوسمانییەکان و ئۆزبەکەکان سازکرد، چونکە ئەم ترسە هەرچی سەقامگیرییەك هـەبوو لەناوچـەکەدا هـەموو شـێواند و ئـەوانیش ئـەم هەڵوێسـتەیان بەهەلزانی بۆ بەئەنجام گەیاندنی مەرامەکانیان. لەراستیشدا ئەم رووبـەروو بوونەوەیـەی عوسمانییـەکان و سـەفەوییەکان دوو لایەنـەبوو، لەلایـەك کاردانـەوەی عوسمانییـەکانی لەبەرانبەر تەماعکاریە سیاسیەکانی شا ئیسماعیلی یەکەمی لێکەوتـەوە، لەلایـەکی دیکەش خۆی لەخۆیدا رووبەروو بوونەوەیەکی مەزهەبیانە بوو لەنێوانیاندا.

لەلایەنی بنچینەی هزریش: رۆشنبیریی لەولاتی رۆم هەڵکشانێکی سرووشتی بـوو بـۆ رۆشـنبیری تـورکی و فارسـی کـە مەڵبەندەکـەیان ئێـران و ئاسـیای ناوەڕاسـت بـوو. لەبوارەکانی فەرمانڕەوایەتی و دەسەلات و بـەڕێوەبردن و یاسـاو زانسـتە ئایینیـەکان و ئـەدەب و هونـەر سـەلجوقیەکان و عوسمانییـەکان لـەدوای ئەوانـەوە دێـن و هەمیشـە بەئەندازەیەکی زۆر پشتیان بەو کۆچەرانە دەبەست کەلە خۆرەلاتەوە دەهاتن و پلـەکانی نێو کارگێڕی حکومیی و ئیداریەکانیان دەدانێ، نزیکەی هەموو ئەدەبـەکانی سـەلجوقی بەزمانی فارسی بوو، کاتێکیش بـەزمانی تـورکی ئـەدەب سـەری هەڵـدا لەسـەردەمی سەرەتای دەسەلاتداریتی عوسمانییەکان بوو و ناوەڕۆکەکانیان هەموو لە ئێران و ئاسیای ناوەڕاستەوە وەردەگرت، لەو کاتـەوە کەلەسـالّی ١٥٠١ز دەوڵـەتی سـەفەوی دامـەزرا تورکیا لە ئێران و ئاسیای ناوەڕاست دابڕا کەئەوان بەشدارییەکی زۆر گەورەو بەرچـاویان هەبوو لەپێگەیاندن و پێشخستنی بـواری رۆشـنبیریـیان، بەمـەش چوارچـێوەکە تەسـک بـووەو سەرچـاوە ئایینیـەکان تـەنها لـەناو سـنووری ئـەنادۆڵ و رۆملليـدا مایـەوە. عوسمانییەکانیش بەئاشکرا هەسـتیان بـەم دابڕانـە هزریـە لەرۆشـنبیرییە رەسـەنکەیان دەکردو پاڵنەرێك بوو بۆ کردنەوەی ئەم کەناڵە هزریانەی خۆرەلات.

## شەڕی چالّدێران:

پێشەکی شەڕەکە: جولاّنەوەکانی شا ئیسماعیلی یەکەم لەو کاتەی سەلیم لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی عوسمانی لادرا لەناوچەکانی خـۆرەلات و باشـووری نزیـك دەوڵەتەکـەی لەهەرێمی جزیرە نزیك کەوتەوە، ئینجا بەچاوێکی گوماناویەوە تەماشای کـرد چـونکە ئامانجی دەسبەسەرداگتنی بنکە ستراتیژیەکان بوو، بەتایبەتیش کاتێـك ئـەو ناوچـانەی ئەنادۆڵ و ئێران بەیەك دەبەستنەوە کوردەکـانی لێبـوو کەوتنـە بەردەسـتی قزلبـاش. سوڵتان سەلیم بۆ رووبەڕوو بوونەوەی شا ئیسماعیل خۆی سازداو بۆ ئـەوەش جـێ پێـی خۆی لەفەرمانڕەوایەتیدا قایم بکـات دەبوایـە کێشـەی سـەفەوییەکان یەکلابکاتـەوەو لەگەڵ دەوڵەتە ئەورووپییەکانیش دانوستان بکات بۆ ئەوەی بەرەی خۆراوا سـاردبکاتەوە، ئەوکاتـە هێشـتا ململانێیـە خانەوادەیـەکان و بزووتنـەوەی بەرهەڵسـتکاران هـەر لـەئارادابوون. سـەرەتا ئەحمـەد و قورقـوردی بـرای لـەخۆی کـردەوەو بزووتنـەوەی

یاخیبووەکانیشی دامرکاندەوە کە شوێنکەوتووی سروشتی شیعەکان بوو، لەئەنجامدا بەهۆی ئەو هەموو رقوکینە مەزهەبییەی کەبەرانبەر شیعەکان هەیبوو قەسابخانەیەکی بۆیان سازکردو هەرچی تەمەنی لەنێوان حەوت ساڵ و حەفتا ساڵ هەبوو هەمووی کوشت و زۆرانێکیشی خستە ناو زیندانە ونەکان و بەم شێوەیە بەرەی ناوخۆی لەناوبرد.

لەدوای ئەوە سوڵتان سەلیم بەرەو دامرکانەوەی بەرەی خۆراوا رووی سوڕاند، لەگەڵ ڤینیسیا و مەجەر و رووسیا پەیماننامەیەکی ئاشتیانەی مۆرکرد، بەمەش سەردەمێکی نوێی لەپەیوەندییە ئاشتی خوازانەکانی لەگەڵ رووسیا سازکرد و بەهۆیەوە سەرکەوتنێکی سیاسیانەی وەدەسخست.

بۆ ئەوەی هێزەکانی لێکبترازێنێ لەساڵی ١٥١٤زدا نووسراوێکی بۆ عوبێدوڵلاخانی ئۆزبەك ناردو تیایدا لەمەبەستی چالاکیەکانی لەخۆراوای ئێران ئاگادارکردەوە، لەهەمان کاتیشدا داوای لێکرد بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی محەمەد شەیبانی خانی مامی هێرشبکاتە سەر خۆراسان. مەرامی سەلیم ئەوەبوو کەخۆی لەلای خۆراواو ئەویش لەلای خۆرهەڵاتەوە هێرشی بۆ بکەن و ئەوسا شا ناچار دەبێ لەهەردوو بەرەکەدا بجەنگێ و بەمەش هێزەکانی لاوازدەبێ. وەڵامی ئۆزبەکیەکان بەئەرێنی گەڕایەوەو عوبێدوڵلاخان ئامادەباشی کرد بۆ هێرش کردنە سەر خۆرسان و پاشان هێرشی کردە سەر سەمەرقەند و هێزی سەفەوییەکانی لەوێ شکاند.

کارێکی سروشتی بوو کەوا شا ئیسماعیلی یەکەم وەڵامی پەلاماری دوژمنانی بداتەوە، بڕیاریدا کە ماڵ و خانوو ببەخشێتە ئەو تورکانەی کە یاخیبوون و لەئێران نیشتەجێبوون، بەمەبەستی ئەوەی لەپاشاندا بەهۆیانەوە دووبەرەکی و شۆڕش لەناوخۆی دەوڵەتی عوسمانی بخولقێنێ، هەروەها هەوڵی ئەوەشیدا کە لەگەڵ هەندێك دەوڵەتی ئەورووپایی هاوپەیمانێتی لەدژی عوسمانییەکان سازبکات و هەڵوێستی سوڵتانی میسری قاناسووهی گوری کەدوژمنی عوسمانییەکان بوو هێندەی دیکە پاڵی پێوەنا لەم پڕۆژەیەیدا بەردەوامبێ و داوای لەخۆی و عەلایی دەولە کەئەویش هەر سەر بەسوڵتانی مەملوکی بوو لەناوچەکانی خۆرهەڵاتی ئاسیای بچووك و بەشی سەرەوەی رووباری فورات کرد یارمەتی بدەن.

مەمالیکەکان لە شام و میسر زۆر بەنیگەرانیــەوە دەیانڕوانیــە ســەرهەڵدانی دەوڵــەتی عوسمانیی لەسەر سنوورەکانیان لەلای خۆرەڵات و خەریکە ڕێگا تایبەتیەکەی ئــەوانیش دەپچڕێنیّ! ئەم نازناوە سوڵتانیانەش لەلایەن عوسمانییەکانەوە ئاماژەبوو بۆ ســازکردنی دەوڵەتێکی جیهــانی و ئــەم سیاســەتەش بــووە هــۆی پچڕانی پەیوەندییــەکانی نێــوان عوسمانییــەکان و مەملوکــەکان و پاشــانیش ئــەم هەڵوێســتە شــەڕێکی لێکەوتــەوە کەمەبەست تێیدا دەسبەسەرداگرتنی جیهانی ئیسلامیی بوو.

قانسووهی گوری دەرکی بەوەکرد کە هەر لایەنێکی شــەڕەکە چ عوسمــانیی بــێ یــاخود ســەفەویی کەســەرکەوت، بەمەبەســتی چارەســەرکردنی کێشــەی جیهــانی ئیســلامی ڕوودەکاتــە مەمالیکــەکان و، بۆیــە بەچــاکی زانــی کــەوا لەئاســت ئــەم ململانێیــەدا بێدەنگبیّ و چاودێری ڕووداوەکانی دوای جەنگەکە بکات و بزانیّ لــەدوای ســەرکەوتنی سەفەوییەکان شا ئیسماعیلی یەکەم چ هەڵوێستێکی دەبــێ بەرانبــەر بــە مــەمالیك و هەولّبدا پەیوەندییەکی ئاست نــزم لەگــەڵ پورتوگالیەکانــدا ســازبکات. جگــە لەمــەش هەمیشە لەهەولّی ئەوەدا بوو خۆیّ بەبرینەکانی هەردوولادا بکات و بــۆ ئــەوەی یــەکیّ لەو دوو دوژمنە سەرەکیەی ئەوی دیکەیان لەناوببات و پاشــان مــەمالیك بەمەبەســتی ئەوەی وا خــۆی بناســێنیّ کــە ڕزگارکــەری ئیســلام و ســوننەیە خــۆی لەهەڵوێســتەکە هەڵقورتێنیّ. یاخود لەوانەیــە ببێتــە میراتگــری عوسمانییــەکان و هــیچ گومانێکیشــی لەتوانای خۆیدا نــەبوو و دڵنیــاش بــوو لــەوەی عوسمانییــەکان بەســەر ســەفەوییەکاندا سەرناکەون.

وادیــار بــوو کەســوڵتان ســەلیم دەیویســت کاروبارەکــانی لــە ناوچــە خۆرەڵاتیــەکانی دەوڵەتەکەی کەلەژێر مەترسی کوردەکان بوون بەسەرۆکایەتی عەلای دەولــەی زیلقــەدەر ســەقامگیربیّ، کــاتێکیش بەقەیســەرییەدا تێپــەڕی و بــەرەو ڕووبــەڕوو بوونــەوەی شــا ئیسماعیلی یەکەم کەوتەریّ نێردراوێکی نارد بۆ لای عەلای دەولەی زیلقەدەری حاکمی مەرعەش و بوستان و داوای لێکرد بەشداری بکات لەشەڕی دژ بە سەفەوییەکان، کەچی عەلای دەولە داوای لێبووردنی لێکردو گوتی کەئەو پیر بووە و نــاتوانیّ هــیچ کــارێکی سەربازیی ئەنجام بدات، چونکە ئەو ســەر بەمەمالیکــەو لــەژێر پارێزگــاری ئەواندایــە.

کاتێکیش سولتان بەرێوەبوو بۆ جەنگی سەفەوییەکان عەلای دەولە بەفەرمانی قانسووهی گوری هێرشی کردە سەر پێشەنگی سوپاکەی و لەئەنجامدا سولتان سەلیم هەواڵی ئەم پەلامارەی دایە قانسووهی گوری و ئەویش بەم شێوەیە لەنووسراوێکدا وەلامی سەلیمی دایەوە: عەلای دەولە یاخی بووە ئەگەر دەستت گەیشتێ بیکوژە. لەهەمانکاتیشدا نامەیەکی بۆ عەلای دەولە ناردو سوپاسی کردو ئاگاداری کردەوە کەوا بەردەوام بێ لەسەر هەڵمەت بردنە سەر هێزی عوسمانییەکان. بەلام ئەم سیاسەتە فێڵبازانەیەی مەملوکەکان کاریگەری خراپی بۆ سەر خۆیان و عەلای دەولە پەیداکرد.

## بەرەو جەنگ:

هیچ بەهانەیەکی راستەوخۆ نەبوو بۆ جەنگی نێوان ئەو دوو پاشایە، بەلام پێشرەوی سیاسی و عەسکەری سەفەوییەکان پالی بە سولتان سەلیمەوەنا کەوا بیرێك لەم کێشەیە بکاتەوەو سنوورێکی بۆ دابنێ پێش ئەوەی بەتەواوی تێکچێ. هەروەها هۆیەکی دیکەی ئەم جەنگە ئەوەبوو کەوا شا ئیسماعیلی یەکەم پیرۆزبایی لەسولتان سەلیمی عوسمانی نەکرد کاتێ فەرمانڕەوایەتی گرتەدەست. ئاشکرایە کەوا شای سەفەوییەکان دژی سەلیم بوو چونکە بەزۆرەملێ ببووە فەرمانڕەواو حەزی دەکرد ئەحمەدی برای ببێتە جێنشینی باوکی بەو پێوەرەی کەوا ئەو شەرعیترە بۆ ئەم پلەیە و سولتان بایەزید بۆخۆی لەسەردەمی خۆیدا کردبووی بەجێگرەوە.

سولتان سەلیم لە١٦ئازاری ١٥١٢ز ئەنجوومەنێکی جەنگیی لەشاری ئەردەنە سازکردو سەرجەم سەرکردە سەربازیەکان و پیاوماقوولانی خستە پێشەوەی بەرەکانی شەڕ، چونکە ئیسماعیلی یەکەم و دەوڵەتە شیعەییەکانی مەترسیەکی گەورەن بۆ سەر جیهانی ئیسلام و جیهاد لەدژی ئەم کافرە قزلباشانە فەرمانی ئایینی سەرشانی هەموو موسوڵمانێکە.

سولتان سەلیم لەدووشەممەی ١٩ئازار لەئەدەنەوە بەرەو ئەستەنبوڵ کەوتەرێ. لەوێشەوە چووە ئەسکوداری کەبەشی خۆرهەلاتی پایتەختەکەی بوو و لەوێشەوە بۆ ئێران بڕوا، لەدوای خۆشی کوڕەکەی کردە فەرمانڕەوای ئەستەنبوڵ. کاتێك گەیشتە ئەزمید نامەیەکی هەڕەشە ئامێزی لە ٢٣نسانی هەمان ساڵ بۆ شا ئیسماعیلی یەکەم نارد و

نووسراوێکیشی بۆ محەممەد بەگی کوڕی فروخشای فەرمانڕەوای ناوچەی کوردستان نارد کە پاشماوەی ئالاق قوینلوو بوو و هانیدەدا بەشداری شەڕەکەی بکات.

ئەوکاتەش ئیسماعیلی یەکەم ماندووبوو بە ڕووبەڕووبوونەوەو دەرکردنی ئۆزبەکەکان لەخۆراسان و، لەلایەکی دیکەشەوە و بەمەبەستی ئاستەنگ دروستکردن بۆ هێرشی عوسمانییەکان و دواخستنیان فەرمانی بەمحەممەدخانی ئەستاجلوو کەسەرکردەیەکی قزلباشەکان بوو کرد کەوا هەموو ڕێگاکانی ئەوان تێکبدات و هەرچی گوندو لادێی سەر ڕێی ئەوان هەیە هەموو کاول بکات و زەوییە کشتوکاڵییەکانیشیان بسووتێنێ و پاشان بگەڕێتەوە ئازەربێجان. شایانی باسە کە ئەم سەرکردەیە فەرمانەکەی سەرشانی زۆر سەرکەوتووانە بەئەنجام گەیاند. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانەش سوپای سوڵتان سەلیم بەردەوام بوو لەپێشڕەویی بۆ ئێران و لەڕێگای قونییەوە گەیشتە قەیسەرییە. بەمەبەستی ئەوەی لە دواوەی سوپاکەی دڵنیابێ و ئاساییشی ئەنادۆڵیش سەقامگیربێ لەوکاتەی خۆی لەوێ نییە، نێردراوێکی نارده لای عەلای دەولەی زیلقەدەری حاکمی مەرعەش و بوستانەو داوای لێکرد کەوا لەم شەڕەیدا بەشداری بکات لەدژی سەفەوییەکان، بەڵام ئەو داوای لێبووردنی لێکرد، بۆیە سوڵتان ناچاربوو نزیکەی چل هەزار سەرباز لەنێوان سیواس و قەیسەرییە بلاوبکاتەوە تاکو ئەو ڕێگایانە بپارێزن، هەر لەسەر ڕێی خۆشی سیخوڕێکی سەفەوییەکانی گرت و هەر بەخودی سیخوڕەکەشەوە نامەیەکی هەڕەشە ئامێزی بۆ نارد کەتیایدا جەنگی لەدژدا ڕاگەیاند.

سوپای عوسمانی لە١٣ تەمووز لەڕێگای ڕووباری چای سۆفییەوە گەیشتە سنوورەکانی ئێران و چووە ناو ئەرزنجان و عەسکەر لەبیابانی یاسی چەمەن کە نزیکی ئەوێبوو و چاوەڕێی شا ئیسماعیلی یەکەمی دەکرد بەڵام سیخوڕەکەی سوڵتانی عوسمانی پێی ڕاگەیاندن کەوا شا تەمای شەڕی نیە بەڵکو مەبەستی ئەوەیە ڕێگری لە سوپای عوسمانیی بکات و نەیەڵێ پێشڕەوی بکات بۆ ناو خاکی ئێران و تا ئەو کاتەی زستان دادێ و سوپاکەی لەبرسان و لەسەرما لەناو دەچن و ئەم هەواڵ و ڕاپۆرتانەش لەلایەن محەمەدبەگی کوڕی ئالاق قوینلووەوە بەناوی پیاز نووسرابۆوەو بۆی ناردبوو نەوەك شا پێی بزانێ و بیکوژێ.

وادیاربوو شا لـەوە دەترسـا کـە لـەدژی سـوپای عوسمانییـدا بجـەنگێ چـونکە لـەرێی سیخورەکانیەوە ئـەوەی پێگەیشـت کـە سـوپاکەی چ چـەك و جبەخانەیـەکی گـەورە و زیەللاحی لەگەڵدایە بەتایبەتی تۆپ هاوێژەکان کەبەبەراورد لەگەڵ هی سوپای قزلباشدا گەلێك گەورەتر و زیاتر بوون، بۆ دڵنیابوونیش هەموو سیخورەکانی خۆی لەبەندیخانـەدا بەنـدکرد تـاکو ئـەم هەواڵـە لـەنێو ریـزی سـوپای شـادا بلاونەبێتـەوە و ببێتـە هـۆی ورەرووخانیان و بلاوەلێکردنیان.

بەلام سولتان سەلیم بەردەوام هۆشداری دەدایە شا ئیسماعیلی یەکەم و هانی دەدا کەوا بێتە نێو شەرەکەوە. ئەوەبوو نامەیەکی هەرەشەئامێزیی بەزمانی تورکی لە ۱۹تەمووز بۆ ناردو تیایدا سەرزەنشتی دەکرد و لەگەڵیشیدا چەند دیارییەکی وەك گۆچان و کەوا و تەسبیح بۆ نارد کە ئاماژەبوو بۆ ترسانی لەجەنگ، کە ئەمەش کاری پیاوی ترسنۆکە و پێویستە بۆ خۆی خەریکی ئەم شتانەبێ هەروەك چۆن باب و باپیرانی سەرکردەیی تیپـە دەروێشییەکانیان دەکرد.

کاتێك سولتان گەیشتە کەماخ کە ماوەی رۆژەرێیـەك لەئەرزنجانـەوە دووربـوو، لـەرێگا نێردراوێکی شا هاتە لای و نامەیەکی بەهەمان زمـانی خـۆی بـۆ پێبـوو تیـایدا داوای شەرراگرتن و نوێکردنەوەی پەیوەندییە دۆستانەکانی نێوانیـانیی دەکـرددوو. پاشـانیش نووسیبووی کە ئەو ئامادەیە بۆ جەنگ ئەگەر سەلیم مکـور بـێ لـەم داوایـەی، بـەلام ئێستا لەدەوروبەری ئەسفەهان خەریکی راووشکارەو ماوەی شـەرکردنی نییـە، ئـەوەی زیاتر سولتانی بێزارو توورەکرد ئەو شووشە ئەفیونەبوو کەبەنێردراوەکەیدا بۆی نـاردبوو و ئامـاژەبوو بـۆ ئـەوەی کەئـەو دەبـێ بخـەوێ و لەخـەودا ئـەوەببینێ کەسـوپای شـا ئیسماعیلی یەکەمی شکاندووەو ئێرانی داگیرکردووە، بۆیە بریاریدا نێردراوەکە بکوژن.

لەپاشان سولتان نامەی چوارەمی لەمانگی ئابدا بۆ شا ئیسـماعیلی یەکەم ناردو تیایـدا بەوە وەسفی کرد کە لەروویەرووبوونەوە دەترسێ و بەشـێویەکی فـەرمی شـەری لـەدژدا راگەیاندو لەگەڵ نامەکەشدا چەند دیارییەکی وێنەی جلوبەرگی ئافرەتان و بۆنی خۆش و کەلوپەلی رازاندنەوەی ئافرەتانی بۆ نارد بەمەبەسـتی ئـەوەی سـوکایەتی بەکەسـایەتی بکات و لەگەڵ ئەمانەشدا هەندێ دەسـتەواژەی ئـەوتۆی بـۆ نووسـیبوو کـە هـەمووی

باسـیان لەترسـنۆکی و ناپیـاویی شـا دەکـرد، لەهـەمان کاتیشـدا نامەیـەکی بـۆ عوبێدوللاخانی ئۆزبەکی نـارد و داوای لێکـرد کـە پشـێوی و نیگـەرانی سـازبکات و نامەیەکی دیکەشی بۆ قانسووهی گوری لەمیسر ناردو پێـی راگەیانـد کـەوا دەوڵـەتی سـەفەویی لـەدوایین رۆژەکـانی تەمەنیدایـە و داوای لێکـرد کـە هەڵوێسـتی گـوری بێلایەنانەبێ و خۆی لەململانێیەکە نەگلێنێ، کاتێکیش گەیشـتە خـووی، نێردراوێکـی شای پێگەیشت و نامەیەکی دایەو تیایدا شـا رەزامەنـدی خـۆی لەسـەر شـەڕکردن لـە پێدەشتەکانی چالدێران نواندو بەم جۆرە لەنێوان ئەو دوو سەرکردەیەدا بڕیاری شەڕ درا.

ڕووداوەکانی ناو شەڕەکە: لـە٢٣ئـاب سـوڵتان سـەلیم بـەرەو چـالدێران و عەسـکەر و گردۆڵکەکان کەوتەڕێ و ئامادەبوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای سەفەویی کەلەبەرامبەر سوپای عوسمانیی سـەربازگەیان دامەزرانـدبوو. شـا لـەدوای ئـەوەی نشوسـتی خـوارد لەهەوڵەکانی بۆ رازی کردنی ڤینیسیا و ئـەورووپا بێنـە نـاو شـەڕەکە، خـۆی بەتـەنیا دیتەوە لەبەرانبەر ئەو سوڵتان سەلیمە بـەهێزە، چونکە ڤینیسـیا لەشـەڕێکی دۆڕاودا لەگـەڵ عوسمانییـەکان هـاتبووە دەرەوەو لەئەنجامـدا شکسـت و ڕووخـانی ژێرخـانیی ئابوورییەکـەی لێکەوتـەوە، لەوکاتەشـدا دەوڵەتـە ئەورووپییـەکان سـەرقاڵی کێشـە ناوخۆییەکانی خۆیان بوون.

ئەم دوو هێزە لەچالدێران لـەئازەربێجان و لـەنزیك مـاکۆی خـۆرەلاتی تـەورێز بەیـەك گەیشتن و لەنێوانیاندا شەڕێکی سـەخت ڕوویـداو لەئەنجامـدا سـەرکەوتنێکی بەرچـاوی عوسمانییەکان هاتـەدی و هـەزاران سـەربازی قزلباشـی تێـدا کـوژران و شـا بۆخۆشـی برینداربوو و لەگەڵ ئەو سەربازانەی کەبەزیندوویی مابوونەوە هـەڵاتن و مەیدانەکـەیان چۆڵکرد و چوونەوە بۆ ناو ئێران. هەر لەو شەڕەشدا بەهێزترینی سەرکردە سەربازیەکانی کەناوی محەمەد خانی ئەستاجلووبوو بەکوژراوی تـەرمی کەوتـە سـەر زەوی، هـەروەها یـەکێك لەژنەکانیشـی بـەدیل گـیرا کـەناوی تـاجلی خـانم بـوو، بـەلام سـوڵتان بـۆی نەگەڕاندەوە بەڵکو لەیەکێك لەنووسەرەکانی خـۆی وەك تۆڵـە سـەندنەوەیەك مـارەکرد. پاشـان سـوڵتانی سـەدری ئـەعزەم ئەحمـەد پاشـا دوقـاقین فەرمانیـدا کـەوا ڕاوەدووی هەڵاتووەکان بنـێن و لـەدوای ئـەوەی شـا تـەورێزی بەجێهێشـت و چـووە ئازەربێجـان

دەستییان بەســەرداگرت و دەرگاکــانی شــارەکەش بــۆ ســەرکەوتووەکان کرایــەوە و ئەتەیلوول سولتان چووە ناویەوەو دڵنیایی بە دانیشتوانەکەی بەخشی و دەستی بەسەر گەنجینەکانی شادا گرت و ناردنی بۆ ئەستەنبوڵ. پاشان بڕیاریدا لەوێدا بمێنێتەوە بۆ ئەوەی کاروباری هەرێمەکە و ریزەکانی سوپاش رێکبخاتەوە، تا ئامادەبێ بۆ هەڵمەت و پەلاوانی زیاتر لەناو خاکی ئێراندا.

## دواداچوونێک لەسەر شەڕی چاڵدێران:

-توانای سوپای سەفەوی و عوسمانیی چ لەرووی ژمارەو چ لەرووی چەك و تەقەمەنی و پێداویستیەکانی جەنگەوە وەك یەك نەبوون. ژمارەی سەربازەکانی سوپای عوسمانی نزیکەی سەد هەزار دەبوو، بەڵام هی سەفەوییەکان لەبیست هەزار تێنەدەپەڕی. سوپای عوسمانی پێکهاتبوو لەسوارچاك و پیادەو تۆپهاوێژ و لەولاشەوە هێزێکی دەریایی گەورە پاڵپشتی لێدەکرد، کەچی سوپای سەفەوییەکان ئامێر و چەکی وەك تۆپهاوێژیی پێشکەوتوویان نەبوو و هیچ زانیاریەکیشیان دەربارەی تفەنگ نەبوو کەعوسمانییەکان بەکاریان دەهێنا.

-ژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکانی هەردوولا کوژران و هی عوسمانییەکان زۆر لەهی سەفەوییەکان زیاتربوو، دەشکرێ ئەمە بۆ سروشتی عەقیدەیان بگێڕینەوە کە سەربازەکانی سەفەویی وا ناسرابوون لەپێش شەڕیشدا خاوەنی دەروونێکی ئاسوودەبوون و لەکاتێکدا سەربازە عوسمانییەکان چەندین جار یاخی دەبوون و ماندووبوونێکی زۆریشیان چەشت تاگەیشتنە مەیدانی شەڕەکە.

-سوڵتانی عوسمانیی مەبەستی ئەوەبوو لەوەرزی زستاندا لەتەورێز بمێنێتەوە تاکو بتوانێ لەبەهاردا درێژە بەهەڵمەتەکانی بدات، پاشان نەخشەیەکی روونکەرەوەیی کێشا بۆ دەسبەسەرداگرتنی ئازەربێجان و عیراق و فارس و ئەسفەهان، کەچی لەبەر ئەوەی شا هەرچی دانەوێڵەیەك هەبوو هەمووی لەدوای خۆی سووتاندبوو نەیتوانی ماوەیەکی زۆرتر بمێنێتەوەو رێگای هاوردەکردنی خواردەمەنی و پێداویستییەکانی رۆژانەی لەپایتەخت بڕی بەمەبەستی ئەوەی برسێتی و قات و قڕی باڵ بەسەر شارەکەدا بکێشێ و سەربازەکان لەدژی سوڵتانی عوسمانیی یاخی ببن، بەتایبەتیش

ئەوان بڕیاریاندابوو کەوا دەسدرێژی نەکەنە سەر دانیشتوانی تەورێز و بەشێوەیەکی ڕێکوپێك هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکەن، جگە لەمانە سوپای عوسمانیی چەند سەرکردەیەکی سەربازیی لەشەڕی چالدێراندا لێکوژرا.

## ئەنجامەکانی شەڕی چالدێران:

**ئەنجامەکانی شەڕی چالدێران بریتیی بوو لەچەند خالێك، لەهەموویان گرنگتر:**

- شەڕەکە دەسەلاتی تەواوی عوسمانییەکانی بەسەر ئەنادۆڵی خۆرەلات و خوارووجگە لەو شوێنانەی کەوا کەوتبوونە ژێر دەسەلاتی مەمالیك، داگرت.
- کوردە سوننە مەزەبەکان ئەوانەی کەلەژێر فەرمانڕەوایەتی سەفەوییە شیعەکاندابوون هاتنە پاڵ عوسمانییەکان.
- دامرکاندنەوەی کێشەی سەفەوییەکان بۆ ماوەی نزیکەی بیست ساڵ، چونکە ئەو زەبرەی بەر دەولەتی سەفەویی کەوت یەکلاکەرەوە و کۆتاییەکەی نەبوو، عوسمانییەکان نەیانتوانی بەیەکجاری دەسەلاتی سەفەوییەکان لەناوبەرن و ئێران وەك دەولەتی شیعەمەزەب هەر مایەوە.
- ئەنجامەکانی شەڕی چالدێران ئینکیشاریەکانی خستە بێهیواییەوە (ئەوانەی پێشنیاری ئەوەیان پێشکەشی سولتان کرد کەوا زستانەکە لەقەرەباغ بباتەسەر و یارمەتییان بدات لەو بارە ناهەموارەی ئەوانی پێدا تێدەپەڕن).

بەمەش ئەلقەیەکی نوێ لەپێشکەوتنی هەلوێستدا هاتە کایەوە، و لەئەنجامی ئەوەوە دروستبوو کە توانیان دەسبەسەر تەورێزدا بگرن و ئەو سەرکەوتنانەی بەرانبەر شا ئیسماعیلی یەکەم هێنایان و ئەو پێشڕەویەی دوایی سولتان سەلیم بەرەنجامێکی گشتی شەڕەکەبوو.

## ڕووداوەکانی دوای شەڕی چالدێران:

سولتان سەلیم سەرکەوتنەکانی شەڕی چالدێرانی قۆزتەوەو جارێکی دیکەو لەدوای هەشت ڕۆژ پشوو هەلمەتێکی دیکەی ڕێکخستەوە بۆ ڕاوەدوونانی شا ئیسماعیلی

یەکەم و تاگەیشتە رووباری رەس لەئازەربێجان، لەلای ئەم خاڵەش ئینکیشاریەکان وەستان و بەبیانووی ئەوەی کە خواردن و پێداویستییان نییە چیدیکە پێشڕەوییان نەکرد، ئەوکاتەش جەعفەر شەلەبی قازی سەربازەکانی ئینکیشاریی بوو و یەکەم هاندەریان بوو کە ئەم هەڵوێستە بنوێنن، ئەوەی سوڵتانی ناچارکرد کەوا تەوریز جێبهێڵێ و بگەڕێتەوە وڵاتەکەی خۆی ئەوەبوو کە زستانەکەی هەمووی لەشاری ئەماسیا بردەسەر و لەمەو دواش ئەم شارە دەبێتە بنکەی چالاکییەکانی سەربازی و مەڵبەندی سوڵتان.

لەراستیشدا سوڵتان سەلیم جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کەوا لەناو قولاییەکانی خاکی ئێراندا بمێنێتەوە بەڵام ئەمەی بۆ نەچووەسەر، جگە لەوەش ئینکیشاریەکان لەمەدا بەرهەڵستکاربوون، چونکە بەشێوەیەکی گشتی باری سوپاکەی زۆر سەختبوو بەتایبەتیش کەلەشەڕی چاڵدێراندا چەند سەرکردەیەکی لەدەستدا، کەمبوونەوەی پێداویستییەکانیشی بەسەردا هات و لەمەشەوە گرانبوونی خۆراك و تەقەمەنیی بەهۆی رێگەگرتنی قانسووهی گوری لەهاتنی ئەرزاق و تەقەمەنی لەرێی حەلەبەوە و سوتاندنی هەموو ئەو ئەرزاق و دانەوێڵانەی لەشاردا مابوونەوە بەدەستی شا ئیسماعیلی یەکەم لەپێش رەوکردنی.

لەئەنجامی ئەو بارە ناهەموارەدا سوڵتان ناچاربوو پلانە سیاسی و سەربازییەکەی خۆی بگۆڕێ. لەوانەشە دەرکی بەوەشکردبێ کەوا رووخانی دەوڵەتی سەفەویی بەهۆی گەمارۆیەکی ئابووری توندەوە روودات، بۆ وەدیهێنانی ئەم ئامانجەش دەبێ جزیرەی فوراتیی و وڵاتی شام بخاتە پاڵخۆی و پاشان رێرەوەکانی خۆرهەڵاتی عەرەبی لەرووی هاوردە و ناردراوەکانی ئێران لەبەرانبەر ئەورووپا دابخات.

بەمشێوەیە قۆناغی دوای ململانێیان لەگەڵ سەفەوییەکان لەشەڕی چاڵدێران دەستی پێکرد، کەدەبێ ئەرمینیا و کەرەج و کوردستان و هەرێمی جزیرەی فوراتیی و وڵاتی شام بخاتە پاڵ دەوڵەتی عوسمانی، بۆ ئەوەی لەهەرسێ لای باکور و باشور و خۆراوا بەپشدێنەیەکی توندو تۆڵ شا ئیسماعیلی یەکەم دەووربدا.

ســـولتان لـــە ١٥١٥زدا لـــەرێگای ئـــەنادۆڵی خـــۆرەلات و کوردســـتانەوە گەڕایـــەوە ئێـــران و ئازەربێجانی کردەوەو چووە ناو ئەیرەوانی پایتـــەختی ئـــەرمینیا و زاڵبـــوو بەســـەر بـــاکوری عیراقدا، لەهەمان کاتیشدا شێخ ئیدریسی بەدلیسیی هەولێدا میرزادەکانی کورد و سەرەك هۆزەکـــان و فـــەرمانڕەوای هەرێمـــەکان لـــەدژی دەســـەلاتداریتیی شـــا ئیســـماعیلی یەکـــەم هانبدات.

بەهۆی بێزاریی خەڵك لەدەســـەلاتداریتی ســـەفەوییەکان و لەلایـــەکی دیکـــەش دانیشـــتوانی عیراق و هەرێمی جزیرەی فورات لەچاوەڕێی ئەوەدابوون کەسێك بێت و رزگاریـــان بکـــات، بەدلیسی توانی سەرکەوتن بەدەستبهێنێ، لەلایەکی دیکەشەوە بەهۆی لایەنگریی ئـــایینی و شێوازە سیاسیەکانیەوە کە شا بەزۆر سەپاندبووی بەســـەر پیاومـــاقوولانی نێـــو کۆمـــەلگاو دانیشتوانی شارەکانی دیاربەکر و بەدلیســـی و ئـــەرزەن و بـــالۆ و میافـــارقین و هیدیکـــەش راپەڕین و ئەم راپەڕینەش لەدواییدا شاری کەرکووك و هەولێری گرتەوە.

جارێکی دیکە سولتان پەلاماری ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی سەفەوییەکانی دایەوەو دەســـتی بەسەر قەلای کەماخ کەلەخۆرەلاتی ئەنادۆڵبوو و ئینجا هەردوو سەنگەرەکانی مەرعـــەش و بوستان کەبەر لەوکاتە لـــەژێر دەســـتی عـــەلای دەولـــە بـــوون و ئـــەو لێـــی داگیرکردبـــوون و لەئەنجامیشدا عەلا لەشەڕەکەدا کوژرا و پاشان گەڕایەوە بۆ ئەستانبوول و لـــەدوای خۆشـــی سەرکردەکانی دیکەی بەجێهێشت بۆ ئەوەی ناوچەکانی دیکەی خۆراوای ئێران داگیربکەن و کاتێکیش گەیشتە جێگای مەبەست فەرمانیدا چەند سەرکردەیەکی ئینکیشاریی ئەوانـــەی سەرپێچی فەرمانەکانی ئەویان کردبـــوو لەگردبوونـــەوە لـــەئێران و لەناویشـــیاندا جەعفـــەری شەلەبی هەبوو بیانکوژن.

سوپای عوسمانیی لەساڵی ١٥١٦ز لەشکرکێشیان بۆ باکووری عیراق کردو دەستیان بەســـەر دیاربەکر و رەها و ماردین و حەســـەن کێف و رەققـــە و موســـڵدا گـــرت و، بەمـــەش کلیلـــی دەرگاکانی باکوری عیراق کەوتە دەست عوسمانییەکانەوە. لەهەمان کاتیشدا سولتان سـەلیم بەهۆی ئەو پشتگیرییەی نواندی بۆی والی عیراقی خەلاتی کرد.

بەهۆی ئەم شەڕە سەرکەوتوانەیە دانیشتوانە عەرەبەکەی ناوەڕاستی فورات چونە ناو بازنەی عوسمانییەوە و عوسمانییەکانیش لە خۆرەلاتی عەرەبستان بوون بەخاوەن جێ پێیەکی بەهێز.

کاتێك سەفەوییەکان لەدوای شەڕی چالدێران پشوویانداو هەناسەیان هاتەوەبەر، هەوڵیاندا ئەوەی لەدەستیاندابوو بیگێڕنەوە، ئەوەبوو قەزاخان ئەستاجلوو هێرشی کردە سەر بەرای محەمەد خانی فەرمانڕەوای پێشووی دیاربەکر، ئەم هەرێمە لەدوای ئەوەی هێزی لەماردین و رەها کۆکردبۆوە، بەڵام دانیشتوانی ئەم شارانە چونکە ئازار و ئەشکەنجەی زۆریان بەدەست سەفەوییەکانەوە چەشتبوو بۆیە بەرەنگاریان بوونەوە، لەوکاتەشدا سوپای عوسمانییەکان پاڵپشتییان لێکردن و دووریان خستنەوە و، لەئەنجامی شەڕێك کە لەنزیك ماردین هەڵگیرسا قەزاخان کوژرا.

سەرەڕای توندی گەمارۆدانی شا لەلایەن عوسمانییەکانەوەو لەناوبردنی ئەو هێزەی کە رووبەڕوویان دەبۆوە، توانی جارێکی دیکە هێز کۆبکاتەوەو سوپا رێکبخاتەوەو دەوڵەتەکەی بخاتەوە سەرپێ و کەلەدواییشدا ئەم هەنگاوانە دەبنە هۆی تێکچوونی پەیوەندییەکانی نێوان سەفەویی و عوسمانییەکان.

## پەیوەندییەکانی نێوان سەفەوییەکان و دەوڵەتە خۆراوابیەکانی ئەورووپا:

### پێشەکی:

مەترسیەکانی عوسمانیی کەهەڕەشەی لە سەفەوییەکان دەکرد یامەتیدەربوو بۆ نزیك بوونەوەیان لەدەوڵەتانی خۆراوای ئەورووپا، وەك ڤینیسیا و ئیسپانیا و پورتوگال. هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەوییەکان لەسەرەتای سەدەی شانزەهەمی زایینی فشاری عوسمانییەکان لەسەر ئەم وڵاتانە تا ئەندازەیەك کەمبووەوە، ئەوەش لەبەر ئەوەبوو کەوا عوسمانییەکان لەسەردەمی سوڵتان سەلیم رووی بەرەکانیان بەرەو خۆرەڵات وەرگێڕا. ئەمەو دەوڵەتە ئەورووپییەکان پەیوەندییەکانی خۆیان لەگەڵ شا ئیسماعیلی یەکەم لەرێگای رێکەوتنی سیاسیی و ئابوورییەوە بەهێزکرد، لەلای خۆشیەوە سەرکردەی سەفەوییەکان هەوڵیدا ئەم پەیوەندییە بقۆزێتەوە بۆ خۆی و لەناوچەکانی خۆراوای ئێراندا دەسەڵاتەکانی خۆی جێگیربکات.

ئەو کاتە مەمالیکەکانی وڵاتی شام دەستیان بەسەر رێگاکانی بازرگانی خوارووی هیندستاندا گرتبوو و باجی زۆریشیان خستبووە سەر کاڵا خۆرەڵاتیەکان کاتێك

بەلایاندا تێدەپەڕین، بەمەش توانیان کۆنترۆڵی بازرگانی خۆرەلات لـەنێو بەنـدەرەکانی دەریای سپی ناوەڕست بکەن و، ئەورووپییەکان ناچـاربوون بـەدوای ڕێگایەکـدا بگـەڕێن کەوا بیانگەیەنێتە هیندسـتان. لەراسـتیدا توانیـان ڕێگایـەك کەبـەدەوری ئـەفریقیادا دەسووڕایەوە بەهۆی زانستە دەریاوانییـەکانیان لەسـاڵی ١٤٩٨زدا بدۆزنـەوە، ئـەویش لەلایەن فسکۆ دی گاماوە سەرکردایەتی دەکرا. بـەهۆی دەسبەسـەرداگیرانی ڕێگاکـانی بازرگانی تەورێز و ئەنادۆڵی خـۆراوا عوسمانییـەکان تـەنگیان بـە بازرگانـەکانی ئێـران هەڵچنیبوو، بۆیە ئەوان ناچاربوون کەوا ڕێگای خۆیان بەرەو خوارووی کەنداوی عـەرەبی بگۆڕن، بەمەش ئەوروپاییەکان وایان هەسـتکرد کـە ئێرانیـەکان بەتـەواوی پارێزگـاری لەرێگا دەرياييەکان دەکەن کەدەیانگەیەنێتە هیندسـتان، جگـە لەمـەش بـەهۆی ئـەو دەسەلاتەی عوسمانییەکان هەیانبوو بەسەر شام و میسر و حیجـاز و یەمەنـەوە توانـای ئـەوەیان هـەبوو کێبڕکێـی پورتوگالیـەکان بکـەن لـەبواری بازرگانیـەکانی خـۆرەلات لـــەخوارووداو بەمـــەش بەرژەوەندییـــەکانی پورتوگالیـــەکان لەگـــەڵ بەرژەوەنـــدیی ئێرانییەکاندا یەکیگرتەوەو لەدواییدا ڕێکەوتنێکی دوو قۆڵیی لێپەیدابوو.

## پەیوەندی سەفەوییەکان و پورتوگالەکان:

پورتوگال لەپێشـەنگی ئـەو ولاتـە ئەوروپیانـەوەبوو کەتـەمای ئـەوەیان هـەبوو سـوود لەرێگایەکی نوێی دەریایی ببینن، بەمەرجێك ئەو ڕێگایـە ئاسـیا و ئـەوروپا بگەیـەنێ بەیەك و لەمەترسیی عوسمانییکانیشیان دوورخاتەوەو تـاکو بشـتوانن چـنگی خۆیـانی لێگیربکەن و ئەو ڕێگا کۆنەی کە بەرەو دەریای سوور دەچوو داخەن، لەم پێناوەدا چەند بنکەیەکی بۆ خۆی لەکەنداوی عـەرەبی و بەتایبـەتیش لـە دوورگـەی هـورمز لەسـاڵی ١٥١٥ز دامەزراندو پاشان کەمبرۆنی داگیرکردو کـردی بەناوەنـدێکی بازرگـانی لەگـەڵ ئێران، لەهەمان دوورگـەی ئـەو دوورگانـەی لەدەوروبـەری بـوون چـەندین سـەنگەری دروستکرد لەوانەش دوورگەی قەشم و، بەمـەش هەولێـدا بـەهۆی فرۆشـتنی کالاکـانی بەنرخێکی زۆر کەم ویتسی خۆی لەدانیشتوانی ئەو ناوچانە نزیك بکاتەوە.

لەراستیشدا ئەو کێشە و گرفتانەی دووچاری شا ئیسماعیلی یەکـەم بـووەوە هـەلی بـۆ پرتوگالیەکان سازکرد کەوا بتوانێ بازرگانیـەکانی خـۆی لەکەنـداوی عـەرەبی و ئێـران

گەشە پێبکات، کاتێکیش شا ویستی دەست لەکاروباری هورمز وەربداو داوای سەرانەی لێکردن، یەکسەر پەنایان بردە بەر فەرمانڕەوای پورتوگالیەکانی هیندستان ئالبۆکەرك کەئەویش رێگری ئەنجامدانی ئەو کارەی لێکردن و بەشا ئیسماعیلیشیان راگەیاند کەوا بۆ هیچ پاشایەك جگە لەشای پورتوگالیەکان نییە سەرانە لەدوورگەی هورمز وەربگرێ.

لەو کاتەی شا ئیسماعیلی یەکەم مەرامی ئەوەی هەبوو هێرش بکاتە سەر بەحرەین و قوتەییف نێردراوێکی بەمەبەستی سازکردنی رێکەوتنامەیەك لەگەڵ پورتوگالیەکان ناردە هیندستان و، لەسەر ئەم خالآنە رێکەوتن:

- هێزی پورتوگالیەکان شانبەشانی هێزەکانی شا ئیسماعیل هێرش بکەنە سەر بەحرەین و قوتەییف.
- هەردوولا هاریکاریی یەکتر بکەن لەدامرکاندنەوەی بزووتنەوەی یاخیبووەکانی مەکران و بلوجستان و، رووبەروو بوونەوەی عوسمانییەکان.
- سەفەوییەکان دەسبەرداری ئەو داواکاریانەیان بکەن کەبەسەر دوورگەی هورمزەوە هەیان بوو و دانیش بەوەدابنێن کەئەم دوورگەیە سەر بەپرتوگالە.

## پەیوەندییان لەگەڵ ڤینیسیا:

بەهۆی دەسبەسەرداگرتنی قوستەنیتینییە و قەرەم و یۆنان لەلایەن سوڵتان محەمەد فاتحی عوسمانی، بازرگانی نێوان ڤینیسیا و ولآتانی دەریای رەش گورجێکی زۆر توندی بەرکەوت، عوسمانییەکان دەستیان بەسەر هەموو دەربەند و رێگا بازرگانیەکاندا گرت. بۆیە بەناچاری لەگەڵ ئوزون حەسەنی سەرکردەی ئالاق قوینلوو رێککەوتنێکیان بۆ ئەنجامدانی شەری عوسمانییەکان سازکرد و ئەم ولآتانەش پەیمانی ئەوەیاندانێ چەندیان چەك و یارمەتیی بوێ درێغی بۆ نەکەن، بەلآم ئەم رێککەوتنە سەری نەگرت و ناچار بوون لەگەڵ عوسمانییەکان لەدوای شەرێکی شانزە ساڵی رێککەوتنێکی ئاشتیانە لەساڵی ١٤٨٣زدا مۆر بکەن. بەمەش ئەم دەوڵەتانە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئێرانیەکاندا هەڵوەشایەوە. کاتێکیش شا ئیسماعیلی یەکەم دەسەلآتداریێتی لەئێران بەدەسهێنا بەمەبەستی رووبەرووبوونەوەی عوسمانییەکان هەوڵیدا پەیوەندییەکانی لەگەڵ

ڤینیسیا زیندووبکاتەوە. لەدواییدا گفتوگۆ لەنێوانیاندا سازبوو و شا پێشنیاری ئەوەی کرد کە ڤینیسیەکان لەلای خۆراوای ئەوانیش لەلای خۆرەلاتەوە هێرش بکەنە سەر عوسمانییەکان، بۆ ئەوەی ڤینیسییەکان بتوانن ئەو بنکانەی کەلەیۆنان و دوورگەکانی ئەرخەبیل لەدەسدابوو بیگێڕێتەوە، بەلاّم ئەوان هاوڕایان نەبوون، چونکە ئەوان لەو کێشەو ململانێیە گلاببوون کەلەگەڵ پاپا و هاوپەیمانیان هەیانبوو، جگە لەو پەیماننامەیەی لەگەڵ عوسمانییەکاندا هەیانبوو لەبەرژەوەندیاندا نەبوو کەلەناوی بەرن و بە شا ئیسماعیلی یەکەمیان راگەیاند ئەوان دۆستایەتییە کۆنەکەیان لەگەڵ ئێراندا لەبیر نەرکردووە بەلاّم ناتوانن خۆیان وابەستەی هیچ بەڵێنێکی تازە بکەنەوە.

## پەیوەندیەکان لەگەڵ ئیسپانیا:

لەدەسدانی ویلایەتەکانی خۆراوای دەوڵەتی سەفەویی لەبەرانبەر عوسمانییەکان لەسەردەمی سولتان سەلیم، گوزێکی گورچکبڕبوو بۆ سەر سیاسەت و بواری سەربازیی شا ئیسماعیلی یەکەم، بۆیە لەپێناوی ئەوەی هەوڵێستی خۆی بەهێزبکاتەوە دەبوایە پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەو دەوڵەتە ئەورووپاییانەی دژی عوسمانییەکانن سازبکاتەوە. کاتێکیش هەوڵەکانی لەگەڵ ڤینیسیا سەری نەگرت، رووی کردە مەجەر کەبەهێڵی یەکەمی بەرگریی دادەنرا لەئەورووپا لەبەرانبەر هێزەکانی عوسمانیی و ئیسپانیا و، بۆ ئەم مەبەستەش دوو نامەی لە١٥٢٣ز بۆ هەریەك لەلویسی دووەمی شای مەجەر و چارلسی پێنجەمی پاشای ئیسپانیا کەلەهەمانکاتدا دەسەلاّتداریتیی سەقلیەو ناپۆلی و ولاّتە نزمەکان و نەمسا و ئەڵمانیا و بەشی گەورەی ئیتالیای لەخۆگرتبوو ناردو داوای لێکردن رێککەوتنێکی دۆستانە لەدژی تورکە عوسمانییەکان لەنێوانیاندا ببەستن. لەوەلاّمنامەیەکدا چارلسی پێنجەم رەزامەندی خۆی لەسەر ئەم داواکارییەی شا نواند، بەلاّم کاتێك نامەکە گەیشتە لای، شا ئیسماعیلی یەکەم کۆچی دوایی کردبوو.

## کۆچی دوایی شا ئیسماعیلی یەکەم:

ئەو شکستەی شا ئیسماعیلی یەکەم لە شەڕی چالدێراندا دووچاری هات کاریگەرییەکی زۆری لەدەروونیدا بەجێهێشت، بەتایبەتیش کە یەکەمجاری بوو لەشەڕێکدا بدۆڕێ و، لەهیچ شەڕێك بەر لەوە تەنانەت بریندارێش نەببوو، لەهەمان کاتیشدا ئەو شکستەی

تەنها ئەوەندە نەبوو کە چەند ناوچەیەکی ژێر دەسەڵاتی لەدەستدات، بەڵکو ئەو پیرۆزییەی کەلەنێو خەڵکیداو هەرهیچ نەبێ لەلای شوێنکەوتووانیدا هەیبوو لەرزینی تێکەوت، بۆیە پەنای بردە بەر گۆشەگیریی و بەردەوام جلی رەشی لەبەردەکردو فێسیشی نەسەرناو، ئالوودەی مەی خواردنەوە بوو و کارێکی ئەوتۆی نەکرد کە شایانی باسبێ، لەدواییشدا دەستی لەبنبڕکردنی دژەکانی مەزەبی شیعە هەڵگرت و هەڵمەتی دامرکانەوەی ئاشووب و دووبەرەکی کە جارجارە لەولاتدا سەری هەڵدەدا خستە دەست سەرکردەی قزلباشەکان، لەوانەیە ئەم لادانە رەوشتییەی هەلی بۆ عوسمانییەکان رەخساندبێ تا بتوانن دیاربەکریش بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و هەر ئەوەش بووە پارمەتیدەر بۆ ئۆزبەکەکان تا بتوانن بەلەخ و قەندەهار ملکەچ بکەن و هەوڵی چوونە ناو خۆراسان.

دوایین ساڵەکانی تەمەنی کەتەنها دە ساڵ بوو بەهاتوو چۆ و راوشکار و ئیدارەی دەوڵەت بەسەربرد. لەساڵی ١٥٢٤زدا تووشی نەخۆسی سیل هاتوو و بەرەو ناوچەی شەروان و پاشان شەکی کۆچی کرد و لەو نێوانەشدا تووشی نەخۆشی سیل هاتوو و بڕیایدا لەرێگەی ئەردەبیلەوە بگەڕێتەوە تەوریز، بەلاّم لەکاتی ئەوەی دەچووە سائینی کەدوکی نزیك شاری سەراب لەتازەربێجان و لەتەمەنی سی و حەوت ساڵی کەنزیکەی بیست و چوار ساڵی تەمەنی لەفەرمانڕەوایەتیدا بەسەربرد و لە٢٣ ئایار کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەشی گوازرایەوە ئەردەبیل و لەپاڵ باب و باپیرانی بەخاك سپێردرا.

## گرنگی شا ئیسماعیلی یەکەم:

گرنگی شا ئیسماعیلی یەکەم لەوەدابوو بناغەی بۆ دەوڵەتێك دارشت کەلەسەر سێ کۆڵەگەی سەرەکی دامەزرابوو ئەوانیش پێوانەکانی سیاسی و ئابووری و کارگێڕی بوون و تەمەنی ئەو دەوڵەتەش نزیکەی دووسەد ساڵ درێژەی کێشا، لەهەمان کاتیشدا سنوورەکانی ئێرانی گەیاندە ئەو سەردەمەی ساسانیەکانی لێبوون، کە جگە لەئێران، عیراق و خوزستان و کرمان و خۆراسان و بەشێکیش لەولاتی پشت رووباری بەخۆوە گرتبوو، سەردەمانێکیش دیاربەکرو مەروو و بەلخ و قەندەهاری لەژێر دەسەلاتدابوو و

لەهەموو ئەو وڵاتانەشدا مەزەبی شیعەی دوانزەیی سەپاند و ئێرانی بەبۆیەیەك رەنگکـرد کە تاکو ئێستاش کاریگەری هەرماوە.

شا ئیسماعیل خاوەنی خەسڵەتەکانی پیاوی دەوڵەت بوو، خاوەن ورەیەکی بـەهێزبوو، زۆر زیرەك بوو، لەتەنگانەدا ئارامگربوو، ئازاوبەجەرگ بوو، تەنانەت دوای مردنیشیان لەگەڵ دوژمنەکانی دڵڕەقبوو. پێشتریش باسی ئەوەمان کرد کە چی بەسەر تەرمی شەیبانی خان هێنـا، بەرچـاوتێربوو، یارمـەتی و دەسـگیرۆیی زۆرێـك لـەپیاوانی قزلباشـی کـردووە، نوێنەرایەتی جیهانێکی تورکی نیمچە کۆچەری کـرد، ئـەویش قزلباشـەکان بـوون و هـەر ئەوانیش گەیاندیانە تەختی فەرمانڕەوایەتی، هەرچەندە ئەو زمانی فارسی دەزانی بـەڵام بەشێوازێکی تورکانە و بەتورکی بیری دەکردەوە، ئەگەر کاروباری دەوڵەتەکەی پشـتی بـە کتێبـەکانی فارسـی بەسـتبێ ئـەوا هێزەسـەربازییەکانی هەمیشـە پشـتیان بـەو هـۆزە تورکانـەوە قـاییم کـردووە کـە پشـتیوانیان لـە بیروبـاوەڕە مەزەبیەکـەی دەکـرد، لەئازەربێجانیش دەوڵەتێکی تورکی نموونەیی دروستکرد.

شـا زۆری حـەز لەراووشـکار بـوو، بـەزمانی تـورکی و عـەرەبی و فارسـی هـۆنراوەی دەهۆنییەوە، کاریگەریی شیعرەکانیشی لە تورکییەکاندا بەرجەستە دەبوو، لەشیعریشـدا نازناوی خەتائی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو. شا ئیسماعیل فرچکی بە مەی خواردنەوە گرتبـوو بەتایبەتیش لەدوای ئەو شکستەی کە لەشەڕی چالدێران بەسەری هات. لەهەمان کاتیشدا زۆر زیادە رۆیی دەکرد لەگۆشەگیریی و دوورکەوتنەوە لـە ژیـانی هاوسـەریی و تایبـەتی، لەوانەشە ئەمانە لەو هۆکارانە بووبن کەبوونە هۆی ئـەوەی لەتەمـەنێکی کورتـدا کۆچـی دوایی بکات.

ئایا دەتوانین بڕیار لەسەر شا ئیسماعیلی یەکەم بدەین و بیخەینە ئـەو پلەیـەی کـە مـافی خۆیـەتی تێیـدابێ؟ سەرچـاوەکانی فارسـی – سـەفەویی بەشـێوەیەکی گشـتگیر باسـی کەسایەتیی شا ناکەن چونکە ئەوان تەنها لەیەك روانگـەوە تەماشـای دەکـەن و زۆر کـەم چاومان بەرەخنەیەك دەکەوێ، چونکە هەموو سەرچاوەکان نغرۆی ستایش و پیاهەڵـدانن، کەچی سەرچـاوەکانی دیکـە شـایانی ئـەوەنین ببنـە بابـەتێکی مێـژوویی. لەراسـتیشـدا سەردەمی ئەو وەرچەخانێکی گرنگی لەئێراندا سـازکرد، هەرچـەندیش ئـەو تـورك بـوو و

هەڵسوکەوتی لەگەڵ قزلباشە تورکمانەکان لەئێرانییەکان پێ باشـتربوو و زمـانی تـورکی کردە زمانی فەرمیی فەرمانگەکانی و بەزمانی تورکی شیعری دەنووسی، کەچی مـەزەبی شیعە کەبووە مەزەبێکی نەتەوایەتی بووە بەردی بناغەی یەکێتی ریزەکانی ئێـران، بـووە هێزێك کە هەسـتی نیشـتمانپەروەریی جولاّنـدن، یارمـەتی ئێرانیەکانیشـیدا کـەوا لـەو رۆژگارە سەختانەی کەلەسەدەی نۆزدەهەمی زاییـنی بەسەریاندا هـات بپەڕنـەوە ولـە ١١ شوباتی ١٩٧٨ز بەرەو دەوڵەتێکی نەتـەوەیی و پاشـان ئیسـلامی بـەهۆی هەڵگیرسـانی شۆڕشێکی ئیسلامیی بڕۆن.



## بەشی چوارەم
## تەهماسبی یەکەم-ئیساعیلی دووەم-محەمەد خودابەندە
## شا تەهماسبی یەکەم
## ٩٣٠-٩٨٤ھ/١٥٢٤-١٥٧٦ز

### ململانێیە ناوخۆییەکانی ئێران:

شا ئیسماعیلی یەکەم چوار کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشت: تەهماسب کە کوڕی گەورەو جینشینیی بوو، ئەلقاس، سام، بەهرام و، جگە لەوانیش پێنج کچیشی هەبوو: خانیش خانم، پەریرخان خانم، مەهین بانوسولتانوم، فەرەنگیس خانم و زەینەب خانم.

تەهماسب لەتەمەنی دە ساڵیدا بوو بەجێنشینی باوکی هەر لەو رۆژەی باوکی مرد لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دانیشت. لەبەر ئەوەی تەمەنی بچووك بوو کارێکی ئاسایی و سروشتی بوو کەوا سەرکردە قزلباشیەکان دەوڵەت بەڕێوەبەرن، لەم جۆرە هەلۆیستانەشدا بەرژەوەندیەکان هاوچەشن دەبن و بیروراش زۆر دەبن و لەهەمان کاتیشدا کێبڕکێ لەنێوان میرزادەکان لەپێناوی دەسەلاتی تاکە کەسی سەر هەڵدەدەن.

شا بەشداری زۆری هەبوو لەسەرهەڵدانی ئەم جۆرە دیاردانە، ئەویش بەهۆی ئەوەی هەمیشە لەسەداسەد پشتی بەقزلباشەکان دەبەست و بەم هۆیەش ئەوان بوون بەبەهێزترین لایەن لەناو دەوڵەتدا و زۆرێك لەهەرێمەکانیان وەرگرت و شا بەهەوسی خۆی نازناویی بەسەردا دابەش دەکردن تا وای لێهات ئێران بەمەملەکەتی قزلباشەکان ناسرا.

لەبەر زۆری لایەنگرانیان فەرمانڕەوایی لەئێراندا لەشێوازی لایەنگریی بۆ دەوڵەتی سەفەویی مەزەبی شیعی بوو بە فەرمانڕەوایەك کەکاریان کێبڕکێبوو لەسەر فەرمانڕەوایەتی و شا تەهماسب لەم کەشە پڕ لەململانێی و کێشەیەدا پیربوو.

لەنێو قزلباش سەرکردەکانی تەکالوو تەستاجلوو سەریان هەڵداو دەسەڵاتەکانیان لەنێوان خۆیاندا دابەشکرد و پاشان لەنێوان خۆشیاندا ململانێ سازبوو، ئەم هەڵوێستەش شا تەهماسبی ناچار کرد هەردووکیان لەپلەکانیان لادا و لەجێی ئەوان حوسێن خانی شاملوو بەپلەی خانی خانان دامەزراندو سەرکردەکانی ئەم هۆزە خۆیان بەهاوبەشی فەرمانڕەوایەتی دادەنا، لەبەر ئەوەی کەلەنێوان ئەوان و بنەماڵەی شا ئیسماعیل خزمایەتییان بەهۆی ژنخوازییەوە هەبوو، لەم پێناوەشدا دەستیان بەسەر زەویە کشتوکاڵی و بەپیتەکاندا گرت و لەبەرانبەریشدا هۆزە قزلباشیەکانی دیکە توڕەبوون.

ململانێی نێوان هۆزەکان پەرەی سەندو کار گەیشتە ئەوەی کێشەکانیان بەچەك یەکلایی بکەنەوە، لەساڵی ١٥٢٦ز تەکەلوو ئەستاجلووی شکاندو زیانێکی زۆری پێگەیاندو پاشان لە رۆمیلوو هەڵگەڕایەوەو ئەویشی بەزاند، ئینجا لەساڵی ١٥٣٠-١٥٣١ز رووبەرووی شاملوو بووەوە. ئارامە سوڵتانی سەرکردەیان لە ئازەربێجانەوە شۆڕشێکی چەکداری لەدژی تەهماسبی یەکەم هەڵگیرساند بەبیانووی ئەوەی ئەو زیاتر مافی ئەوەی هەیە ببێتە سوڵتانی دەوڵەت، لەسەر دەستی سەفەوییەکان شکستی خواردو بەرەو ئەستانبووڵ هەڵات و پەنای بردە بەر سەلیمی قانوونی سوڵتانی عوسمانییەکان لەساڵی ١٥٢٠-١٥٦٦ز هانیدا کە ئێران داگیربکات. کاتێکیش سوڵتانی عوسمانی بەرەو ئێران کەوتەڕێ، زۆرانێك لەقزلباشە شوێنکەوتووەکانی سەفەویی پشتیان لەسەفەوییەکان کردو هاتنە پاڵ عوسمانییەکان و بەڵگەی لاوازی دەسەڵاتی سەفەوییەکانیان دایە سوڵتان و رایانگەیاند ئەوان هەوڵی پارێزگاریکردنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەدەن.

لەساڵی ١٥٣٣-١٥٣٤ز خانی خانان حوسێن خان شاملوو ویستی شا تەهماسب بکوژێ و بەیارمەتی یەکێك لەوانەی لێی پەژیوان بوونەتەوە ژەهرخواردی بکات و سامی برای لەجێی دابنێ. سەرەڕای ئەوانەش شا زۆر ئاگای لەم جۆرە پیلانانە نەبوو و جاری واش هەبوو وەك بێلایەنێك تەماشی کێشەکانی دەکرد، ئەویش بەبیانووی ئەوەی دەیەوێ دەوڵەتەکەی لەشەڕی رکابەرەکان و کوشتنەوە بیپارێزێ.

## پەیوەندیەکانی دەرەوە

## پەیوەندی لەگەڵ ئۆزبەکەکان:

سەردەمی تەهماسبی یەکەم بەتەواوکەری سەردەمی باوکی دادەنرێ لەململانێی لەگەڵ سوننیەکان و یەکەم پەلاماریشی ئەوەیان بوو کەکردیە سەر ئۆزبەکەکان بەبیانووی گوایە ئەوان مەترسی سەرەکین بۆ سەر دەوڵەتەکەی، لەهەمان کاتیشدا پیاوەکانی لەدەوری کۆدەبوونەوەو هەریەکە بەلای خۆیەوە هەوڵی دەدا لەرێی هەڵمەتێکی گەورەی سەرکەوتووانەوە بیسەلمێنێ کە چەندە دڵسۆزیەتی. ئەوەبوو کەمیی تەمەنی شا، سەرکردەی ئۆزبەکەکان عوبێدوڵلا عەلی هاندا هێرش بکاتە سەر خاکی سەفەوییەکان لەخۆراسان و لەوێشدا لەگەڵ سەفەوییەکاندا لەشەڕێکی چوونیەك و سەردەم جیاوازدا رووبەرووی یەکتر بووتەوە و، کەسەفەوییەکان لەیەکیاندا نەبێ لەهیچیان شکستیان نەخواردووە.

عوبێدوڵلا سوپایەکی زبەللاحی ئامادەکرد و چاوەڕێی رووبەڕووبوونەوەی هێرشی سەفەوییەکان بوو، بەڵام دەسپێشخەری کردو لەساڵی ١٥٢٦ز هێرشی کردە سەر خۆراسان و مەروو و چەندین ناوچەی لەهەرات داگیرکرد، بەڵام هەرچەندە لەجێگیرکردنی جێپێی خۆی تێیدا سەرکەوتوو نەبوو کەچی توانی بەتەواوی خۆی لەناوچەکانی خۆرەلاتی مەرغاب بچەسپێنێ. لەساڵی دوای ئەویشدا مەشهەد و ئەستەرئابادی داگیرکرد و، ئەستەرئابادی خستە ژێر فەرمانڕەوایەتی عەبدولعەزیزی کوڕی و پاشان لەوێوە بەرەو هەرات رۆیشت و گەمارۆیدا. بەڵام شا تەهماسبی یەکەم توانی لەو ناوچانەی دەستی بەسەردا گرتوون وەدەریان نێ. لەساڵی ١٥٢٨ز جارێکیدیکە هێرشی کردەوە سەر خۆراسان، بەڵام ئەم هێرشەیان چ لەرووی ژمارەی سەربازەکان و چ لەرووی بەشداری کردنی زۆربەی خێڵەکانی ئۆزبەك زۆری جیاواز بوو لەگەڵ ئەوانی دیکەدا. ئەم سوپایە رووی کردە ئەو ناوچەیەی کە ئێران و ئەفغانستان لێك جیادەکاتەوە، واتە نێوان هەرات و خۆراسان، بۆ ئەوەی لەپێدەشتەکانی جام و زوورئاباد بەهێزی سەفەوییەکان بگات (١٩ئەیلوول١٥٢٨ز). شەڕێکی سەخت لەنێوانیاندا بەرپابوو و لەئەنجامدا سەفەوییەکان سەرکەوتن و ئۆزبەکەکانیش بەرەو تورکستان رایانکرد. شا سەرکەوتنەکەی بۆ خەونێك

گەڕاندەوە کـە لەخەونەکەیـدا چـاوی بەعـەلی کـوڕی ئـەبی تاڵیـب کـەوتووە و مـژدەی سـەرکەوتنی پێداوەو پێی گووتـووە: سـەرکەوتنێکی گـەورەت بـۆ مەیسـەربووە. کەچـی لەراسـتیدا هـۆی سـەرەکی سـەرکەوتنی سـوپای سـەفەوییەکان چـەك و جبەخانـە پێشکەوتووەکەیان بوو، چونکە لەدوای شکسـتیهێنانیان لەشەڕی چالدێران سـەفەوییەکان دەرکیان بەگرنگی پێدانی توانا سەربازیەکانیان کرد ئەگەر بیانەوێ دەوڵەتەکەیان بپـارێزن و فراوانی بکەن، دەبێ چەکی ئاگردار بەکاربهێنن و بـەکردەنیش سـەرکردەکانی سـەفەوی سوپاکەیان بەم جۆرە چەکانە پڕچەك کردو شەڕی ئۆزبەکـەکانیان پێکـرد. راسـتە سـوپای ئۆزبەکەکان زۆر بەورەو پەرۆشەوە شەڕیان دەکـرد و زۆرێکـیش لەسـەربازانی سـەفەوییان کوشت بەڵام چەکە ئاگردارەکانی سەفەوی سەربازەکانی ئەوانیان درووێنـەدەکرد. هـەروەك چۆن پاشووی سوپاکەیان کەوتە بەر ئـاگری تفـەنگ و تۆپـەکانیان و تێکیـان شـکاندن و بلاوەیان پێکردن، ئەم فێڵەش کاتی خـۆی لەعوسمانییەکانـەوە فێـری ببـوون و بەهۆیـەوە توانیان سەرکەوتنێکی گەورە و یەکلاکەرەوە بەدەسـبهێنن، بـەڵام سـەرەڕای ئـەوەی شـا تەهماسب سەرکەوتنی بەدەسهێنا نەیتوانی راوەدووی ئۆزبەکەکان بنێ بـەرە تورکسـتان و دەسبەسەر وڵاتی پشت رووباردا بگرێ، چونکە ئەم هەنگاوە پێویستی بەخەرجییـەکی زۆر و ماندووبوونێکی یەکجار گەورە هەیە و لەئەنجامیشدا جگە لـەخاکێکی دوژمـن هیچـی دیکەی دەسناکەوێ. لەکاتێکدا ئەو هیواکانی بەرەو گێڕانەوەی عیراق بوو، بۆیـە لـەدوای ئەم شەڕە و بەر لەوەی پرۆژەکەی عیراق جێبەجێبکات رووی بەرەو قەزوین و قوم وەرگێڕا.

لەدوای مردنـی کجوکـونجی لەسـاڵی ١٥٣٠ز ئـەو گۆڕانکارییانـەی کەلەسـەرکردایەتی دەوڵەتی شەیبانی هاتە ئاراوە، عوبێدوڵلا لەساڵی ١٥٣٤-١٥٤٠ز لـەدەزگای خانیـەتی بوخارا دەسەڵاتی گرتەدەست و پاشان لەوێنەبوونی تەهماسب شای لـەعیراق بەهـەلزانی و هێرشی دیکەی کردە سەر هەرێمەکانی خۆرەڵاتی ئێران و سەرەتا لە بەهرات و مەشهەد و ئەستەرئابادەوە دەسپێکرد و ماوەی یەك ساڵی تەواو هێزەکانی بەسەرانسەری خۆراساندا دەسووڕانەوە و بەئارەزووی خۆیـان تێکـدان و وێرانییـان دەکـرد، بـەڵام بـەهیچ جۆرێـك تەهماسب شا لەبەر ئەو شەڕەی کەلەگەڵ عوسمانییەکان لەئارادابوو نەیدەتوانی بگەڕێتەوە بۆ ناوچە خۆرەڵاتیەکان و کاتێکیش شەڕەکە وەستا بەرەو ئەوێچوو.

لەساڵی ١٥٣٣ز شا تەهماسب لەبەرەی خۆراٸاواوە گەڕایەوە بۆ ئازەربێجان تـاکو بتـوانێ جارێکی دیکە ریزی هێزەکانی خۆی رێکبخاتەوە و پلەو پایە ئیـداری و سـەربازییـەکانیش دووبارە دابەش بکاتەوە بەمەبەستی سـەقامگیریی و لـەناوبردنی دوژمنـەکانی و، مـیرزا سامی براشی کردە فەرمانڕەوای هەرات.

شاری هەرات لەهەموو ئەوانی دیکە زیاتر دووچاری پـەلاماری ئۆزبەکـەکان دەبـۆوە، لـە تشـرینی دووەمـی١٥٣٦ز خەلیفـە سـۆفیان روملـووی کـردە فـەرمانڕەوای مەشـهەد و فەرمانی پێدا کەوا رووبەرووی هێرشەکانی ئۆزبەك ببێتەوە. ئەوانیش پەلاماری هـەراتیان داو حاکمەکەشیان کوشت، بۆیە دانیشتوانی هەرات داوایان لەخەلیفە سۆفیان کـرد کـەوا هەموو دەسەلاتێکی هەبێ لـەپێناو بەگژداچـوونەوەی هێـرش و پـەلامارەکانی دوژمـن، ئەوەبوو عوبێدوڵلاخان گەمارۆی شارەکەیداو لەگەڵ هێـزە ولاتپارێزەکەیانـدا لێیـان بـوو بەشەڕو لەئەنجامدا چەند سەرکردەیەکی لێکوژرا و ئەمەش هیوای بەسۆفیان بەخشی کەوا سەرکەوێ، لەولاشەوە عوبێـدوڵلاخان ناچـاربوو گەمارۆیەکـە هەڵوەشـێنێتەوە و بچـێتە عەبدەل ئاباد و نیشاپوور و لەوێ جارێکی دیکە هێزەکانی خۆی رێکبخاتەوە، لەدوای ئەم هەنگاوە هێرشی بردە سەر هێزەکانی سەفەویی و شکستی پێهێنان و سـۆفیان خەلیفـەش لەو شـەڕەدا کوژرا، ئینجا بەرەو هەرات بەڕێکەوت و مـاوەی پێـنج مـانگ گەمارۆیـدا و پاشان داگیری کرد و ماوەی ساڵونوێك لەناویدا ماوەیەوە.

لەئەنجامی ئەو بارە نالەبارەی کەلەخۆرسان و بەهۆی پەلامارەکانی ئۆزبـەك سـازببوو شـا تەهماسـبی یەکـەم بەسـەرکردایەتی سـوپایەکی بـەهێز بـەرەو ئـەوێ رۆیشـت و عوبێدوڵلاخانیش ئەوێی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ ولاتی پشت رووبار. چونکە پێی وابـوو ناتوانێ بـەرەنگاری هێزەکـانی سـەفەویی ببێتـەوە، شـا ئەمـەی قۆزتـەوەو قەنـدەهاری داگیرکـرد، کاتێکـدا لـەناو شـارەکەدا بـوو شـا نامەیـەکی چـاوەڕوان نـەکراوی لـە عوبێدوڵلاخانەوە بەدەسگەیشت، کە تیایدا پیرۆزبایی ئەم سەرکەوتنەی لێدەکردو، ئەویش بەشێوازێکی زۆر رێکوپێك پێشوازیی لەنێردراوەکەی کرد.

وادیاربوو عوبێدوڵلاخان لەکۆتاییدا خۆی بەدەست ئەو بارە سەربازیەوە دابێ کەبەسەریدا

سـەپاوە ئەویش لەدوای ئـەوەی شکسـتی هێنـا لەهـەوڵی چـەندین جـارەی داگیرکردنـی خۆراسان و ئەم ویلایەتەش قۆناغێکی زۆر هێمانانـەی بەسـەربرد تاگەیشـتە ئـەو رۆژەی سەرکردەی ئۆزبەکەکان کۆچی دوایی کرد.

ئۆزبەکەکان لەدوای مردنی عوبێدوڵلاخان دووبارە هێرشیان کردەوە سەر هەرات، بەلاّم شا تەهماسبی یەکەم بەگژیاندا هاتـەوە و راوەدووی نـان، کەچـی ئـەوان لەسـاڵی ١٥٧٠ز و بەسـەرکردایەتی ئۆبـەك خـانی ئـەوەی جانیبـەگ پـەلاماری سـنوورەکانی سـەرخەس و جامیانـداو کوشـتارێکی زۆریشـیان لـە ئەندخونـد و شـیرغان ئەنجامـدا هەرچەندیشـە زەینەلخانی فەرمانڕەوای ناوچەی جـام زۆری هەوڵـدا کـەوا بـەرەنگارییان ببێتـەوە بـەلاّم بێسوودبوو.

## بەدواداچوونی پەیوەندیەکانی سەفەوی و ئۆزبەک:

ئەگەر بەچاوێکی رەخنە گرانە تەماشـای پەیوەنـدی نێـوان سـەفەوییەکان و ئۆزبەکـەکان بکەین لەسەردەمی شا تەهماسبی یەکەم، ئەم شتانەمان بۆ روون دەبێتەوە:

- لەدوای مردنی محەمەد شەیبانی خان ئۆزەبەکەکان لەپەیڕەوکردنی سیاسـەتی هێـرش بـردن و فراوانکردنـەوە چـوونە سـەر سیاسـەتی بـەرگری و پارێزگـاری کـردن لـە بەرژەوەندیەکانی دەوڵەتی پشت رووبار و، لەهەمان کاتیشدا ئەو هێرشانەی کە بۆ سەر خۆراسان دەیانکرد بەمەبەستی تالاّن و برۆ بوو نەك داگیرکردنی.
- سەفەوییەکان لەسەردەمی تەهماسـبی یەکـەم توانییـان لـەو تەنگژەیـەی کەبـەهۆی ئەنجامەکانی شەڕی چالّدێرانەوە سازبوون خۆیـان دەربـاز بکـەن و، توانیشـیان بچـنە قۆناغێکی تازەی هێرش و پەلامارەکان ئەویش بەهۆی بەکارهێنانی چەکی ئاگردارەوە، بەمەش سوپای سەفەوی توانی بەشـداریێ لـەو رێگریـەی کەلەپێشـڕەویی هێزەکـانی ئۆزبەکی بۆ هەرێمەکانی خۆراوا دەکراو جاری واش هەبوو شەڕەکەیان دەگواسـتەوە بـۆ ناو سنوورەکانی ئۆزبەك.
- بەهۆی ئەو رێکەوتنەی شا تەهماسبی یەکەم لەساڵی ١٥٤٤ز لەگەڵ عوسمانییـەکان، چیدیکە ئێران لەژێر مەترسی دووبەرەییدا نەبوو، لەبەرانبەریشدا ئۆزبەکەکان بەسایەی

ئەو فـەرمانڕەوا لاواز و بێتوانیانـەیان کەلـەدوای مردنـی عوبێـدوڵڵاخان پەیـدابوون کەوتنە ژێر مەترسی دوولایەنەی خۆرەلات و خۆراوا. تورۆز ئەحـمـەد ناسـراو بـە بـەراق خان کەلەشێوەی محەمـەد شـەیبانی خـان و عوبێـدوڵڵاخان بـوو سـەری هەڵـدا، ئـەو سەرکردەیە لەساڵی ١٥٥٣ز هێرشی کردە سـەر ناوچەکانی ئۆزبـەك و داگیریـی کـردن و بەشـێوازێکی زۆر ترسـناك وێرانـی کـردن. لـەریزی ئۆزبەکەکانیشـدا سـەرکردەیەك لەخانەوادەی محەمەد شەیبانی خان بەناوی عەبدوڵڵاخان و لەچـالاکیەکانی سـەرەتاییدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا. هەروەها سەرەڕای ئەو هاوپەیمانێتییەی لـەنێوان سـەفەویی و خوارزمەیەکاندا هەبوو کەچی توانی لەساڵی ١٥٥٥ز و بەیارمەتی هۆکارەکانی مەرگی پێشوادەی بەرراق خانەوە خاکە زەوتکراوەکانی شەیبانیەکان بگێڕێتـەوە بـۆ خۆیـان و، لەدواین ساڵەکانی فەرمانڕەوایەتی شا تەهماسـب و زۆربـەی سـالآنی سـەردەمی شـا عەباسـی یەکەمی گەورە توانی پارێزگاریی لێبکات.

## پەیوەندیەکانی لەگەڵ عوسمانییەکان:

## فەرمانڕەوایەتی سولەیمان قانوونی یەکەم:

سولتان سـولەیمان قانوونی لەدوای مردنی باوکی لەساڵی ١٥٢٠-١٥٦٦ز بوو بەجێنشینی سـولتان سـەلیمی بـاوکی و لەسـەرەتاکانی سـەردەمی ئـەودا چـەندین رووداوی گـەورە بەرپابوون، بەتایبەتیش لەئەوروپا. ئاشکرایە خۆشەویشتیەکەی بۆ ئاشتی دیارترین خاڵـە چاکەکانی ئەو سولتانە بوو. لەهەمان کاتیشدا خودی خۆی بەشداری لەو هەڵمەتانەدا کرد کەدەکرانە سەر ئەورووپا و ئاسیا، لەوانە دەیان بۆ سـەر ئـەورووپاو سـێ بـۆ ئاسـیاو ئـەم شەڕانەش چەندین قۆناغی جۆراو جۆربوون بۆ فراوانکردنـی زیـاتری دەوڵـەتی عوسـمانیی لەهەرسێ بواری سنور و لایەنگر و دەسەلاتدا.

لەراستیشدا دەتوانین سەدەی شانزەهەمی زایینی بەدووریانێکی مێژوویی لەقەلـەم بـدەین کە لەوێوەوە شێوەی دابەشـبوونی هێزەکـانی لەبـەرەی جیهـانی ئیسـلامی خـۆرەلاتی و گاورەکانی ئەورووپا لەخۆراوا لەخۆدەگرێت و لەوێشدا توندترین جەنگـەکانی دەریـایی و زەمینیـی هەڵدەگیرسـێن و بەهۆیانـەوە هەرسـێ دەوڵـەتی عوسمـانی و سـەفەویی و ئیمپراتۆریەتی رۆمانی پیرۆز شوێن و سنووریان بۆ دەسنیشان دەکرێ.

لەوکاتەی سوڵتان سولەیمان قانوونی هاتە سەر حوکم سیاسەتی عوسمانییەکان جارێکی دیکە بەرەو خۆراوا سوڕایەوە، بەڵام ئەمەش ماوەیەکی کەم بەردەوامبوو، بۆ ئەوەی قۆناغێکی نوێ دەستپێبکاتەوە لەپەیوەندییە متبووەکانییان لەگەڵ ئەورووپا کەئەم قۆناغە ناسرا بە فراوانبوون بەرەو بەلکان و دەریای سپی ناوەڕاست، کەچی سوڵتانی عوسمانی لەساڵی ١٥٣٣ز لەدوای ئەوەی لەگەڵ هابسبۆرگی فەرمانڕەوای نەمسا ڕێکەوتننێکی ئاشتیانەی مۆرکرد ئەورووپای بەجێهێشت و بەرەو جەنگی سەفەوییەکان لەچوارچێوەی ململانێیەکی بەردەوام لەئێران و عیراق کەوتەڕێ.

## هۆکارەکانی درێژەدان بەچالاکییە سەربازییەکان:

چەند هۆکارێکی سەرەکی هەبوون لەچالاك کردنەوەی بوارە سەربازییەکانی نێوان عوسمانی و سەفەوییەکان، کەلەوانەیە ئەمانە هەرە گرنگەکانیان بن:

- لەکاتی خەریکبوونی عوسمانییەکان لەو شەڕەی کەلەگەڵ نەمسا کردیان، لەنێوان سەفەویی و مەجەریەکان پەیوەندیی نهێنی سازبوو و دواجار گەیشتنە هاریکاریی نێوانیان لەدژی عوسمانییەکان، کەهەمیشە ئەم دوژمنە لەوان بەهێزتربوو.
- ئەو ڕووداوانەی لەسەر سنوورەکانی نێوان سەفەویی و عوسمانییەکان ڕوویاندەدا، هەموو لەئەنجامی جوجوڵی هۆزەکانی کوردبوون لەو ناوچانەو هۆیەکی ڕاستەوخۆش بوو بۆ زیندووکردنەوەی شەڕی نێوانیان، جگە لەمەش ئەو بارە سەرلێشێوێنەی فەرمانڕەوایەتیی باڵی بەسەر هەرێمە بچووکەکانی سەر سنوری نێوان هەردوولادا کێشابوو و سیاسەتە ناجێگیرەکەی فەرمانڕەواکانیان لەهۆیە سەرەکیەکان بوو.
- دەسەڵاتی سەفەوییەکان لەبەغداد لەساڵی ١٥٣٠ هەڕەشەی بۆ سەر ڕێگا بازرگانیەکانی نێوان خۆرەلات و ئەورووپا دروسکرد، بەهۆی ئەوەی کەعیراق ئەم ڕێگایانەی بەیەك گرێدەدا.
- عوسمانییەکان لەهەوڵەکانی شا تەهماسبی یەکەم نیگەرانبوون کەقزلباشیەکانی لەئەنادۆڵ هان دەدا، بەمەش شوێن پێی هەنگاوەکانی شا ئیسماعیلی یەکەمی باوکی دەکەوت.

بەشێوەیەکی گشتی ئامانجە سەرەکییەکان لەشەڕی ساڵی ١٥٣٤ز هـەروەك ئامانجـەکانی سوڵتان سـەلیم بـوو کەبـەر لەبیسـت سـاڵ ئێرانـی داگیرکـرد، کەواتـە ئەمـە شـەڕێکی خۆپارێزیی و سیاسی و مەزهەبییە.

## لەشکرکێشیی عوسمانییەکان لەئازەربێجان:

سەفەوییەکان بـەرەو خـاکی عوسمانییـەکان بەڕێکـەوتن و زۆر بـەپرتاوەوە بـەرەو بەغـدا دەچوون، ئەویش لەدوای ئەوەی شەرەفخانی فەرمانڕەوای بەدلیسی دابڕی کەنزیك بوو لـە خیلاتی باشوری دەریاچە و لەسەر سنووری نێوان عوسمانی و سەفەوی بوو و پاشان لەساڵی ١٥٣٠ز داگیریی کرد.

بۆ ئەوەی لەکارەکانیدا سەرنەکەوێ و بەردەوام نەبێ سـوڵتان لەسـاڵی١٥٣٣ز سـوپایەکی ناردە سەر سەفەوییەکان و شەرەفخان، کە ژمارەی سەربازەکانی زیاد لە سەدوچـل هـەزار کەس دەبوو بەسەرکردایەتی سەدری ئەعزەم ئیبراهیم پاشا، کـاتێکیش سـوپاکە گەیشـتە قونیە فەرمانڕەوای ئازەبێجانیش هاتە پاڵی و بۆ ئەوەش کـەنیازپاکی خـۆی بـۆ سـوڵتان نیشانبدات شەرەفخانی کوشت و سەری لێکردەوەو بۆ سوڵتانی نارد. بەر لـەهاتنی وەرزی زستان سوپای سوڵتانی عوسمانیی توانی هەموو ناوچەکانی بەدلیس و ئەو ناوچانەی کـەوا کەوتوونەتە نێوان ئەرزەرووم و دەریاچەی وان بگێڕێتەوە ژێر دەسەلاتی عوسمانیی. پاشـان ئیبراهیم پاشا بەرەو تەورێز پێشڕەوی کردو هەرچی قەلا و سەنگەرێکی تووندو تۆڵی سـەر ڕێگای نزیك دەریاچە هەبوو هـەر هـەمووی داگیرکـرد، بەمـەش ڕێگاکـە بەشـێوەیەکی ئاسۆیی و هێڵێکی راست لەبەردەمیدا والابوو.

سـەفەوییەکان لەبەردەم پێشڕەویی عوسمانییەکان پاشەکشەیانکردو شا تەهماسـبی یەکـەم بـەهیوای ئـەوەی پارێزگـاری لەسـوپا و دەوڵەتەکـەی بکـات دەسـتی لەخاکەکـەی ژێـر دەسەلاتی خۆی هەڵگرت، ئەوەبوو سـەدری ئەعزەم بەبێ هـیچ دژەبەرگرییـەك چـووە نـاو شاری تەورێزەوە لە (١٣تەمووز١٥٣٤ز) و شا بەرەو قەزوین قووچاندی.

سـولّتانی عوسمـانییش لـه ١١حـوزەیرانی ١٥٣٤ز ئەسـتەمبوڵی بەجێهێشـت و بـەرەو هەمەدان کەوتەرێ و لەوێوەوە بەرەو کۆشکە زستانیەکانیی عیراق رۆیشـت و بـەر لـەوەی بگاتە تەوریز لەوێ راوەستا.

سولّتان کاروباری ناوخۆی هەموو رێکخست و کـوڕی مـیری شـەروانی کـردە سـەرکردەی هێزی پارێزگاری تەوریز و لەوێشدا پێشوازی لەموزەففەرخانی میری گـەیلان و کۆمـەڵێك لەو فەرمانڕەوایانە کرد کەلە شاتەهماسبی یەکەم دابڕابوون و بەندەفەرمانی و لایـەنگریی خۆشیان بۆ دووپاتکردەوە.

سولّتان سولەیمانی قانوونی مکوڕ بوو لەسەر راوەدوونانی شا و لەم پێناوەشـدا لەتشـرینی یەکەم١٥٣٤ز بـەرەو شـاری زانجـان رۆیشـت و پاشـان بـۆ شـاری سـولّتنی کەکـەوتبووە خۆرەلاّتی گەیلان و لەوکاتەدا شا بەمەبەستی خـۆ لەشـەڕ دوورگـرتن لـەدژی هێزەکـانی عوسمانی پاشەکشەی دەکرد، بەلاّم لەبـەر سـەختیی کەشـوهەوای ناوچـەکەو رێگاکـان و هاتووچۆ و گواستـنەوەی تۆپەکان بەهۆی ئەو هـەموو بارانـەی کەلەناوچـەکەدا دەبـاری و بەهۆی زۆری ئەو هەموو قوڕوچڵپاوە سولّتان ناچاربوو واز لەبیرۆکەی راوەدوونان بهـێنێ و ئەوێی بەجێهێشت و گەڕایەوە بەغدا.

## ململانێ لەپێناوی عیراقدا:

لەسەردەمی شا تەهماسبی یەکەم ململانێـی نێـوان عوسمـانی و سـەفەوییەکان لـەعیراق بەردەوامبوو و ناوچـەکانی ناوەڕاسـت و خـواروو لـەژێر دەسـەلاّتی سـەفەوییەکانبوون و عوسمانییەکانیش دەسەلاّتیان بەسەر باکوورەوە هەبوو. فەرمانڕەواکانی بەغداش ئەوانـەی کە مەیلی سـەفەوییەکانیان هەبوو بەهۆی توندڕەویی مەزهەبییەوە ئەم هەلەیان قۆزتـەوەو لەسـەر دەسـەلاّت پێـداگرییان دەکـرد و ئـەو چەوسـاندنەوەو راوەدوونـان و سـووکایەتی پێکردنانەشیان هانی دانیشتوانەکەیان دەدا کە لەعوسمانییەکان نزیك ببنـەوە و ئـەوانیش لـەلای خۆیانـەوە جـەختیان لەسـەر ئـەوە دەکـردەوە کەهـەموو رێککـەوتنێك لەگـەڵ سەفەوییەکان رەتدەکەنەوە. ئەو نامانەی کە سولّتان سولەیمانی قـانونی لەسـاڵی ١٥٢٥ز بۆ شاتەهماسبی یەکەمی دەناردن ناوبانگیـان بـەوەدەرکرد کەهـەمووی هەڕەشـەئامێز و گاڵتەجاڕی بوون.

بەڵام لەخوارەوەدا سۆزی خەڵکی بەسرەو نیمچەدوورگەی عەرەبی بەلای عوسمانییەکان بوو و بەو چاوەش تەماشای عوسمانییەکانیان دەکرد کە رزگارکەری ئەوانن لەچنگی ئەو پورتوگالیانەی هاوپەیمانێتیان لەگەڵ سەفەوییەکاندا هەیە و سەرجەم هەرێم و شارەکانیان داگیرکردووە و دەسەڵاتی خۆشیان بەسەر بەندەری هورمز بەهێزکرد و باجی سەر عومان و قوتەییف و بەحرەین و مەسقەتیان زیادکردو چاودێریی توندیشیان خستە سەر گومرگەکان و لەبەسرەش بوونیان پەیداکردبوو.

لەئەنجامی بچووکی شا تەهماسبی یەکەم بەرامبەر عوسمانییەکان و دەسبەسەرداگرتنی ئەوان بۆ ئەو رێگا بازرگانیانەی کە فەرمانڕەوا ناوخۆییەکان بەکاریان دەهێنا بۆ بەگەڕخستنی سەرمایەکانیان لەبواری بازرگانی حەریر، ئەم فەرمانڕەوایانە بەرەو ئەستانبوڵ کەوتنەرێ و داوای پشتگیریی و یارمەتییان لەعوسمانییەکان دەکرد، هەروەك چۆن لەبەغداو بەسرە یارمەتییان پێگەیشتبوو.

لەساڵی ١٥٢٩ز و بەسەرکردایەتی زیلفیقاربەگی سەرۆکی هۆزی موسڵووی کوردیی لەعیراقی ناوەڕاستدا راپەڕین لەدژی سەفەوییەکان دەستی پێکرد. بۆیە ئەم سەرکردە کوردە مردنی شا ئیسماعیلی یەکەم و کەمتەمەنیی شا تەهماسبی بەهەلقۆزتەوە و بەرەو بەغدا هەڵکشا و ئیبراهیم سوڵتانی فەرمانڕەوای ئەوێی کوشت و سەفەوییەکانیشی لێدەرکرد، لەناو ئاپۆڕای لایەنگرانی دانیشتوانەکەی چووە ناو شارەکەوە و دەسەڵاتی خۆشی بەسەر هەموو عیراقی ناوەڕستدا سەپاند و پاشان بڕیاریدا هەموو پەیوەندییەکانیان لەگەڵ سەفەوییەکاندا بپچڕێنن و کلیلی بەغداشی بۆ سوڵتان سولەیمانی قانوونی نارد و لەسەکۆی مزگەوتەکانیشدا دوعا بۆ سوڵتان کراو ئینجا ناویشی لەسەر دراوی وڵات هەڵکەندرا.

بەهۆی ئەو بارودۆخەوە شا تەهماسبی یەکەم بڕیاریدا کەوا دەسبەسەر عیراقدا بگرێتەوە، بەڵام ئەم کارەی دەیخاتە بەردەم رووبەڕووبوونەوەی سوپای عوسمانی و دەرکیشی بەوە دەکرد لەتوانای ئەودانییە ئەم رووبەڕووبوونەوەیە بەتەنیا ئەنجام بدات، بۆیە رووی بەرەو ئەورووپا بەتایبەتی بۆ لای ئیمراتۆریەتی رۆمانی پیرۆز و مەجەر وەرگێڕا و نامەی بۆ هەردوو پاشاکە نارد (چارڵی پێنجەم و فەردیناند) و داوای هاوپەیمانیی لێدەکردن و

بەمەش سولتان ناچار دەکات لەدوو بەرەی جیاوازەوە شەڕبکات و ئەمـەش بـواری زیـاتر سـەرکەوتن دەداتە تەهماسب.

لەوانەبوو ئەم هاوپەیمانێتییەی نێوان سەفەوی و ئەورووپییەکان سەری بگرتبا، ئەگـەر ئـەوە نەبا کە ئەوان لەبڕیاری شەڕکردن لەگەڵ عوسمانییەکان شانبەشانی سـەفەوییەکان هـاورا نەبوون، ئەویش لەبەر ئەم خاڵانە:

- دووری نێوان ئەورپاو ئێران و ڕێگری عوسمانییەکان.
- نەبوونی کونسولگەریی ڕێکخراو لەنێوان ئێران و ئەوروپا.
- هیچ کام لەهاوپەیمانەکان ئاگاداری توانا سەربازییەکانی ئەویدیکە نەبوون.
- لەبەر سەرقاڵی ئیمپراتۆرییەتی پیرۆزی ڕۆمانی بەجەنگی فەرەنسـا و ئـەو کێشـانەی کە لایەنی پرۆتـستانت بۆی دروسکردبوون.

شاتەهماسبی یەکەم سەرقاڵی سولتان سولەیمانی قانوونی بە گـەمارۆی ڤییـەننا لەسـاڵی ١٥٢٩ز بەهەلزانی و هێزێکی سەربازیی پێکەوەناو هێرشی کردە سـەر تـەورێز و دەسـتی بەسەرداگرت و ئالامە تەکەلووی فەرمانڕەواش بـەرەو ئەسـتانبووڵ رایکـرد، پاشـان ئـەم هێزانە بەرەو عیراق وەڕێکەوتن. لەلای خۆیەوە زیلفیقاربەگ نەیتوانی دەسەلاتەکەی خۆی تا هاتنی سوپای عوسمانی بپارێزێ، ئـەوەبوو لەسـاڵی ١٥٣٠ز لـەدوای ئـەوەی براکـانی ناپاکییان لەگەڵدا کردو کوشـتیان سـەفەوییەکان توانیـان ولاتەکـە داگیربکـەن. لـەدوای ئەمانەشـدا شاتەهماسـبی یەکـەم والیـەکی نـوێی بـۆ بەغـدا دامەزرانـد، کەئـەویش محەمەدخانی تەکەللوو لەخانەوادەی هۆزەکانی قزلبـاش بـوو، ئـەویش تـوانی دامـەزراوە دەسـەلاتداریتییە سـەفەوییەکانی تێیدا سازبکاتەوە.

سـولتان سـولەیمانی قـانوونی بـەرەو بەغـدا بەڕێکـەوت و لـەدوای ئـەوەی شکسـتی بەسـەفەوییەکان هێنا رایگەیاند کە شارەکە مـوڵکی ئـەوە چـونکە زیلفیقاربـەگ ئـەوەتا کلیلی شارەکەی بۆ ناردووە و ئەم داگیرکاریەی لەلایەن تەهماسبی یەکەم بەدژایەتیکردنی خۆی دەزانێ.

دانیشـتوانی شـارەکە زۆر بەدڵخۆشـیەوە پێشـوازییان لەسوپای عوسمانییـەکان دەکـردو لەهەمان کاتیشدا بەرێبەریی پیاوە ئایینیەکان راپەڕینێك لەبەغدا سازکرا. بەڵام محەمـەد تەکەلووی فەرمانڕەوای سەفەوییەکان شارەکەی بەجێهێشت و لەساڵی ٢٨تشـرینی دووەم ١٥٣٤ز بـەفێڵ و تەڵکەبازیـەکی زۆرەوە بـەرەو ئێـران رایکـرد، ئینجـا سـوڵتان بەسەرکەوتوویی هاتە ناو شارەکەوە. شارەکانی دیکەی عیراقیش لایـەنگری خۆیـان بـۆ دەسەڵاتی باب عالی دووپات کردەوەو عیراقی خوارووش هاتە ریزی لایەنگرانی سـوڵتانی عوسمانیی و ئەوانیش توانیان بەسرە و قوتەییف و بەحرین بخەنە پـاڵ خۆیانـەوە، بەمـەش دەستیان گرت بەسەر یەکێك لـەرێگا گرنگـەکانی بازرگـانی نێـوان ئەوبـەری خـۆرەلاَتی ئەوروپا و بەهۆی کەنداوی عـەرەبی و بەغـداو موسـڵ و حەلـەب یـاخود بـەهۆی بەغـداو دیمەشـق و سـەیداو، ئەمـەش هێنـدەی دیکـە لێپرسـراوێتی بـەرگریکاریی سەرشـانی عوسمانییەکانی قورسکرد، بەتایبەتیش لەدژی پورتوگالیەکانی کەنداوی عەرەبی.

سوڵتان مـاوەی چـوار مـانگ لەبەغـدا مایـەوەو لـەو ماوەیەشدا تـوانی کاروبارەکـان رێکبخاتەوەو شوێنە پیرۆزەکانی سوننەکانیشی چاککردەوەو سولەیمان پاشای فەرمانڕەوای دیاربەکریشی کردە والی سەر بەغدا.

شایانی باسە کەنوێکردنەوەی دەسەڵاتدارێتی سوننیەکان هـیچ چەوسـانەوەیەکی ئـایینی یـاخود مـەزەبی لەگەڵـدا نـەبوو، بـەڵکو بەپێچـەوانەوە عوسمانییـەکان سیاسـەتی ئاشتیخوازانەو لێخۆشبوونیان پەیڕەو کردو شیعەکانیشـیان لەترسـی دانیشـتوانی بەغـدا پارێزگاری دەکردو هەروەها جولەکەو گاورەکانیشیان دەپاراست، زۆر بـەخێراییش بەغـدا لەژێر سێبەری ئاشتیپارێزیی عوسمانییەکان گەشـانەوەیەکی بەرچـاوی بەخۆیـەوە بـینی، لەدوای ئەویش بەسرە هاتە ژێـر فـەرمانڕەوای عوسـانیی و، ئینجـا دەوڵـەتی عوسمـانی سەرپەرشتی زەریای مەنگیشی کرد.

شا تەهماسـبی یەکـەم لـەوێ نـەبوونی سـوڵتان سـولەیمانی یەکـەمی قـانونی لەبەغـدا بەهەلزانی و لە٩ کانوونی یەکەم١٥٣٤ز شاری تـەورێزی گێڕایـەوە بۆخـۆی و سـوڵتانیش ناچاربوو کەوا جارێکیدیکە هێرش بباتەوە سەر شـارەکە تا دووبـارە بیگێڕێتـەوە بـۆ ژێـر دەسەڵاتی خۆی، شـا تەهماسـب بەئاشـکرا ئـەوەی راگەیانـد کـە نایـەوێ شـەڕ لەگـەڵ

عوسمانییەکاندا بکات و بەبێ شەڕ لەشارەکە هاتە دەرەوە، سولتان لە ٥ تـەمووز ١٥٣٥ز ماوەی پانزە رۆژ لەشارەکەدا مایەوە و دوایی گەڕایەوە بۆ ئەستانبوول، جارێکی دیکە شا شارەکەی داگیرکردەوەو ئەلوەندخانی ئەفشاریشی کوشت چونکە درێغی کرد لـەدەرکردنی عوسمانییەکان و بەم بۆنەیەشەوە ئاهەنگی سازکرد.

گرنگی هێرشی عوسمانییەکان لەوەدا بوو کە توانی عیراق بخاتە پاڵ دەوڵەتی عوسمانییـەوە و سـەفەوییەکانیشی بەیـەکجاریی لـەجیهانی عـەرەب دوورخسـتەوە، ئینجـا ویلایـەتی ئەرزەروومی دامەزراند و سنوورەکانی لەگەڵ قەوقازیش پاراست.

لەراستیشدا ئەو خستنە پاڵەی عیراق بۆ دەوڵەتی عوسمانی بەیەکجارەکی سـەفەوییەکانی لەعەرەب دوورنەخستەوە و هەردوولا بەردەوام ململانێیـان لـەپێناو ئـەم ولاتـە دەکـردو شەڕی نێوانیشیان لەسەدەی شانزەهەمدا بوو بەدیاردەیەکی ئاسایی.

## ململانێ لەسەر ناوچەکانی دەورووبەر:

جولانەوە چالاکەکانی سەفەویی بەرەو ئەنادۆڵ هاندەربوو بـۆ ئـەوەی سـولتان سـولەیمانی قانوونی بەرەو خۆرهەڵات بسوورێتەوە، چونکە ئاسایش لەسەر سنوورەکانی خۆرهەڵات هەر لەساڵی ١٥٣٥-١٥٣٦ز و لەکاتی هێرشە گشتگیریەکە جێگیرببوو، بـەڵام پڕوپاگەنـدەی سەفەوییەکان بەردەوامبوو لەبڵاوکردنەوەی مەزهەبی شیعی لەخۆراوای ئەنادۆڵ. نەشتوانرا کاروبارەکان بگەڕێننەوە سەر بنچینەی خۆی و بەمەش مەترسی نەمانی دەسـەڵاتی بـاب عالی لەم ناوچانەدا هەر بەردەوامبوو. ناکۆکی نێوخۆیی خانەوادەی سـەفەویی هـەلی بـۆ سولتان رەخساند بەئامانجی پشتگیریی لایەنگرانی عوسمانیی هێرشبکات.

لەلایەکی دیکەوە هێرشێکی دیکە بۆ سەر سـەرفەوییەکان بوو بەکارێکی پێویست، چونکە سـەفەوییەکان دەسـتیان کردبـوو بەپـەیڕەوکردن و بڵاوکردنـەوەی بـەهێزیی زۆرداریـی مەزهەبەکـەیان لـەنێو شـەروان لـەباکووری ئازەبێجـان و داغسـتانی خـۆرهەڵاتی قـەوقاز. ئاشکراشە کەوا شاتەهماسـبی یەکەم لەسـاڵی ١٥٣٩ز دەسەڵاتی خـۆی بەسـەر شـەرواندا سەپاند، ئەویش لەدوای ئەوەوە هات کەشاروخی فەرمانڕەوای کوشت و کە لێی یاخیبوو و

بڕیاریـدابوو هـیچ سـەرانەیەك نەداتـە سـەفەوییەكان، ئینجـا میرزاقـاسمی بـرای كـردە فەرمانڕەوای ئەو شارە. ئەو ویلایەتەش بەدوو خەسڵەت ناوبانگی هەبوو:

یەكەم: یەكێك بوو لەگرنگترین ئەو شارانەی حەریری بەرهەم دەهێنا.

دووەم: هێڵی بەیەك گەیشتنی نێوان قەوقاز و ئێران بوو.

قاسمیرزا پیاوێكی بەهیوابوو و بیری لەوەدەسهێنانی تەختی فەرمانڕەوایەتی سەفەوییەكان دەكردەوە، بۆیە لەنێوان خۆی براكەی كێشمەكێش سازبوو، پاشان سەربەخۆیی خۆی لـەم هەرێمەدا راگەیاندو براكەشی ناچاربوو هێرشێكی سەربازیی بكاتـە سـەر، بـەلاّم بـەهۆی سۆزیی برایەتییەوە كێشەكەی وەلانا. چونكە دایك و كوڕەكـەی خـۆی نـاردە لایـی و بـۆ ئەوەی داوای بەزەیی لێبكەن و شا لێی خۆشبوو، كەچی هەر لەگـەڵ ڕۆیشـتنی برایەكـەی قـاسمیرزا جـارێكی دیكـە سـەربەخۆیی هەرێمەكـەی راگەیانـدەوەو لەسـەر سـەكۆی مزگەوتەكانیشدا وتار بە ناوی خۆیەوە دەخوێندرایەوە و دراویشی بەناوی خۆیەوە چاپكرد كەئەویش ئاماژەبوو بۆ ئەم سەربەخۆییە. ئەوەبوو شا سوپایەكی ئامادەكرد و ڕووبـەڕووی بووەوەو شكـستی پێهێناو بەرەو ولاّتی عوسمانییەكان رایكرد و لەوێش لایەنگیریی خۆی بۆ سوڵتان راگەیاند و داوای لێكرد یارمەتی بدات تاكو ئێران داگیربكـات. لەوكاتەشـدا شـا ئیسماعیلی كوڕی كردە فەرمانڕەوای شەروان.

سوڵتان سولەیمانی قانوونی ئەم هەلەی لەتبوونی خانەوادەی فەرمانڕەوای ئێرانی قۆزتەوەو ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش زیاتر خۆی ئامادە دەكرد بۆ ئەوەی پڕۆژەكەی لەفراوانبوون لـەقوولایی خاكی ئێران تەواوبكات، چونكە بڕوای وابوو كـەوا ئـەم جارەیـان لەبەرئـەوەی قـاسمیرزای لەپاڵە كلیلی ولاّتەكەی بەدەستەوە، بڕیاریدا بۆخـۆی سـەركردایەتی ئـەو سـوپایەبكات و لەگەڵ قاسمیرزاو عـەلی سـوڵتانی كـوڕی خـەلیلی فـەرمانڕەوای پێشـوو بـەرەو شـەروان كەوتەرێ و بەسەركەوتوویی چووە ناوی و عەلی سوڵتانیشی كردە حاكمی ئەوێ، پاشان بۆ ڕەزامەندی و جەختكردنەوەی زۆری قاسمیرزا بەرەو تەورێز ڕۆیشت دوای ئـەوەی شـا لێـی كشایەوە لەتـەمووزی ١٥٤٧ز دەسـتی بەسـەرداگرت، ئینجـا قـەلاّی وانـی گیرایـەوە و داغستانی داگیركردو بەهیچ شێوەیەكیش شا تەهماسب ڕووبـەڕووی نـەهات، ئـەو بـەرەو قەزوین دەچوو و لەبەر دووری لەمەیدانی شەڕەكان لەجیاتی تەورێز كردبووی بە پایتەختی

خۆی. لەدواییدا داوای لە قاسمیرزا کرد ناوچەکانی قوولایی ئێران داگیربکات و دەستیان بەسەردابگرێ و دەستی بەسەر ئەسفەهان و ئەهواز و شوشتەردا گرت و بەڵام نەیتوانی بچێتە ناو دیزفوولەوە، ئینجا گەڕایەوە بۆ بەغداو ئەم سەرکەوتنانەش بوونە هۆی لووتبەرزی و لەوێشدا چەند کاروکردەوەیەکی ئەنجامدا و بەهۆیەوە سوڵتان لێی تووڕەبوو و پەیوەندیەکانیان رووی لەخراپیکردو فەرمانیدا کەشەڕی لەگەڵدابکەن و سوپای عوسمانیی هێرشیان بۆ کردو شکستیان پێی هێنا، لەکۆتاییدا وڵاتەکەی بەجێهێشت و بەدیلی کەوتە دەست کۆمەڵێك لەقزلباشەکان و ئەوانیش بردیان بۆ لای براکەی و ئەویش بەندیکرد، پاشان لەساڵی ١٥٤٨ز کوشتی، سەرەڕای کێشەی میرزا بەم شێوەیە کۆتایی هات کەچی کێشەی یاخیبوونەکەی بووە هۆی شەڕی نێوانیان بۆ ماوەی نزیکەی بیست ساڵ. شایانی باسە سوڵتان نەچووە ناو قولایی خاکی ئێران چونکە شا جارێکی دیکە هەرچی دارو باری ئەو ناوچانەی سەر رێی هەبوو بەر لەوەی تەورێز چۆڵبکات هەمووی سووتاند، بەمەش سوڵتان نیگەران بوو ئەو ماوەیش مەترسی هێرش کردنی سوپای سەفەوییەکانی هەبوو.

ئەم هێرشانە جێ پێی سوڵتان باب عالی لە خۆرەڵاتی ئەنادۆڵ جێگیرکرد، بەڵام بیری لەوە نەدەکردەوە کەوا ئامانجە سەرەکیەکەی کە رووبەروو بوونەوەی شا تەهماسب و لەناوبردنی سەفەوییەکانە بێنێتەدی و لەساڵی ١٥٥٣ز ئەوەبوو جارێکی دیکە شەڕ دەستی پێکردەوە.

شا بەهۆی ئەو سوودەی لەپێگەیشتنی هەستی مەزەبی نەتەوەیی لای خەڵك لەناوەوەی ئێران توانی سوپایەکەی جارێکیدیکە رێکبخاتەوە، دیاربوو کە هەزاران کەس بەمەبەستی پارێزگاری کردنی مەزەبی شیعەی دوانزەیی روویان تێکردو هەریەك لە عەبدوڵلاخانی ئستاجلوو و بەدرخانی ئستاجلوو و حوسێن قوولی بەگی حاکمی چەخوور و سەعدو محەمەد خانی موسڵووی تورکمان و شاوەردیخان و زیاد ئۆغلی فەرمانڕەوای قەرەباغی کردە سەرکردەی سوپاکانی.

لەناوەڕاستی بەهاری ١٥٣٣ز هەڵمەتە سەربازییەکان دەسپێکرد و عوسمانییەکان هەردوو شاری رەوان و نەهجەوانیان لەسەر کەناری باکوری رووباری رەس داگیرکرد کە مەڵبەندی ویلایەتەکەبوو و ئەیرەوان و قەرەباغیشیان وێرانکرد. پاشان عوسمانییەکان

لەرووباری رەس پەڕینەوەو بەرەو خوارووی ئازەبێجان رۆیشتن و ناوچـەکەیان لەشـا تەسـك کردەوە. لەلای خۆشیانەوە سەفەوییەکان شەروان و چەند بەشێکی ئـەرمینیایان گێڕایـەوە وەك خەلأت و ئەرغیش و لەوێش لەگەڵ ئەسکەندەر پاشـای حـاکمی ویلایـەتی ئـەرزەنی عوسمانی کەوتنە شەڕ و شکستیان پێی هێنا، لەراستیشدا ئـەو سوپایە بەسـەرکردایەتی ئیـسماعیل میرزای برای شا بوو.

لەوانەبوو ئەو شەڕە تاهەتایە بەردەوام بوایە و هیچ ئامانجێکیشی لێ پەیدا نەبووایە جگـە لەوێرانی، شا دەرکی بەمە کردو ئامادەیی خۆی دەربڕی کەوا ئاشتبوونەوەیەك سازبکات، بەمەش نامەیەکی بۆ سوڵتان نارد و تیایدا داوای رێککەوتنێکی ئاشتیانە و راگرتنی ئەو شەڕەی لێکرد کەماوەیەکی زۆری خایاندووە، بەڵام سـوڵتان ئـەم داواکاریـەی رەتکـردەوە چونکە ئاشتبوونەوە لەگەڵ ویست و ئارەزووەکـانی ئـەو نـاگونجێ و ئـەو هەمیشـە بـیری لەگێڕانـەوەی ئـەو ناوچـانە دەکـردەوە کەبـەم دوایـیـە بەدەسـت عوسمانییکانـەوەبوو، لەبەرانبەردا نووسراوێکی هەڕەشە ئامێزیی بۆ شا ناردو تیایدا شەڕی راگەیاند و بڕیاریـدا کەبەرەو تەورێز پێشڕەوی بکات.

## ئاشتبوونەوەی ئەماسیا:

سوڵتان سولەیمانی قانوونی لـە ئەسکەندەرپاشـای سـەرکردەی سـەربازیی باشـتر نـەبوو، چـونکە ئـەویش دووچـاری زۆرێـك لـەکاری سـەخت و دژواربـووەوە، لەیـەکێك لەرووبەروبوونـەوەکانی لەگـەڵ سـەفەوییەکاندا سـینان پاشـا کەسـەرکردەی سـەربازیی عوسمانیی بوو بەدیلگیرا، ئەوکاتە سەدری ئەعزەم محەمەد پاشا عەلی سـوڵتان پێشـنیاری ئەوەی کرد کەلەبەرانبەر ئازادکردنی سینا پاشا دەبێ ئاشتبوونەوە لەگەڵ شـا تەهماسـبدا بکات. کاتێکیش مەرجەکانی سوڵتان گەیشتە لای شا یەکسەر رازامەندی لەسەر نوانـدو نێردراوێکی ناردە لای لەئەماسیا کەناوی شاقوولی بوو و لەسەرکردەکانی هۆزی قاجـاری قزلباشی بوو تاکو گفووگۆ لەسـەر بەندەکانی ئاشتبوونەوەکە بکەن.

لەراستیدا هەریەکەیان ئـارەزووی ماوەیـەکی هـێمنی و دوور لەشـەڕیان دەکـرد چونکە هەردوو لایان دووچاری چـەند گرفتێکـی تایبـەت بـەخۆیان بـوون و باروگوزەرانەکـە زۆر

ئەباربوو بۆ ئەوەی لە٢٩ئایار١٥٥٥ز ئاشتبینەوەو مەرامی هەردووکیانی ئاشکراکرد، رێککەوتنەکەش لەم بەندانە پێکهاتبوو:

-ئازەربێجانی خۆرەلآت و ئەرمینیای خۆرەلآت و گەرجستانی خۆرەلآت بخرێنە ژێر دەسەلآتی سەفەوییەکان، لەوکاتەی کەوا ئەرمینیای خۆراواو گەرجستانی خۆراواو عیراق بکەوێتە ژێر دەسەلآتی عوسمانییەکان، بەمەش ویلایەتی قارس دەبێتە سنوورێکی روون و ئاشکرای نێوان ئەو دوو دەوڵەتە.

-سنوورەکانی ویلایەتی شارەزوور دەسنیشان بکرێ و هەموو رووداوێکیش کە کاریگەری هەبێ بۆ ریزەکانی ئیسلام تێیدا قەدەغەبکرێ.

-مسۆگەرکردنی سەلامەتی ئەو حاجیە شیعانەی کەلەئێرانەوە بەرە و شوێنە پیرۆزەکانیان دێنە عیراق و زەوییە پیرۆزەکانی ئیسلامی دەچنە حیجاز.

-هەردوولا نابێ دالّدەی خەڵکی دەسەلآتدارو پایەبەرزی نێو حکومەتی هەریەکەیان بدەن، هەرکەسێکیش پەنای بۆ هێنان دەبێ هەوڵبدەن بیدەنەوە دەست حکومەتی لایەنەکەی خۆی.

ئەم رێککەوتنە لەبەرئەوەی ژمارەی بەندەکانی کەمبوون هەندێ هۆی سەرەکیمان بۆ روون دەکاتەوە کەلەپاشان جەنگی لێوەدروستبوو:

- دەوڵەتی عوسمانی لەهەوڵی ئەوەدا بوو کەوا ئارامییەك لەسەر سنوورەکانی بەرەی خۆرەلآتی لە ئەنادۆڵ پەیدابکات و قارسیش یەکێك بوو لەو قەلآ سەخت و دژوارانەی کەبواری زیاتر بەعوسمانییەکان دەدا پارێزگاری لەسنورەکانی خۆرەلآتی بکات لەکاتی پەلامار و هێرشدا.

- کێشەی سنووری نێوان ئەو دوو دەوڵەتە ببووە هۆی سازبوونی تەنگژەی دوورودرێژی نێوانیان، لەهەموو کێشەکانیش ئالۆزتر دەسنیشانکردنی سنوورەکانی نێوانیان بوو کە کوردی لێنیشتەجێبوو لەبەرەی خۆرەلآت و هەریەکێکیشیان ئارەزووی ئەوەیان دەکرد کەوا سنووری خۆی بزانێت تاکو لەکاتی هێرش و جەنگەکاندا بتوانن پارێزگاری لەتەواوی سنوورەکانی خۆیان بکەن، عوسمانییەکانیش بەمەبەستی لەناوبردنی سەفەوییەکان شەڕ

هەڵنەگیرسێنن، لەبەرانبەردا سەفەوییەکانیش ئەم راستییەیان لا بەرجەستەبوو بەردەوامیی لەو دوژمنایەتییەی عوسمانییەکان هیچ سوودێکی بۆ ئەوان نییە، ئینجا کۆتایی بەدەسنیشانکردنی ئەو سنوورانە هات کەهەردوو دەوڵەتەکە لێك جیادەکاتەوە.

- دابەشکردنی ناوچەکانی دەورووبەر هەلی بۆ سەفەوییەکان رەخساند کەبەهۆی ئەوەی بەشەکانی ئەوان لێیانەوە نزیك بوو سنوورەکانی خۆیان مسۆگەربکەن، هەروەها هەندێك بەشی ئەوتۆی ئەو ناوچانەیان بەرکەوت کەبووە هۆی پاڵپشتییەك بۆیان لەبەرهەمهێنانی حەریر چونکە گەنجینەکانیان لەم ماددانە کەموکوڕی زۆری پێوەدیاربوو. لەبەرانبەریشدا عوسمانییەکان ئەو ناوچانەیان بەرکەوت کەحەریریان تێدا کۆدەبێتەوە بەتایبەتیش تەوریز و ناوچە ستراتیژییەکان و بەمەش جێ پێیەکیان لەناوچەکانی بەرهەمهێنانی حەریر لەئێران مسۆگەرکرد، ئەویش لەدوای ئەوەوە هات کە دەسەلاتیان لەبواری بازرگانی هیندی لەئەنجامی ئەوەی عیراقییان خستەپاڵ موڵکەکانی خۆیان لەساڵی ١٥٣٤ز.

- ئاشتبوونەوەکە لایەنی بیروباوەڕیی ئایینیشی گرتەوەو بەهۆیەوە عوسمانییەکان رێگایان بەسەفەوییەکاندا سەردانی شوێنە پیرۆزەکان و مەککە بکەن. ئاشکرایە کە دابین کردنی سەلامەتی حاجییە ئێرانیەکان یەکێك بوو لەهۆیەکانی ململانێی نێوان هەردوولاو، جگە لەمەش حەجاجەکان تاوانی ئەوەیان دەخستە پاڵ دەسەلاتداریتی عوسمانیی و دەسەلاتە ناوخۆییەکانی عوسمانی لەعیراق و خێڵە عیراقیەکان کەدەستیان بەسەر پارەی ئەواندا دەگرت و مامەڵەی زۆر نابەجێ و ناشایەستەیان بەرانبەر دەکردن، کەچی عوسمانییەکان خودی خۆیان هەڵسوکەوتی زۆر باشیان لەگەڵدا دەکردن چونکە سوودی زۆری ماڵییان لەو حەجاجانە دەبینی، بەلام هێزە خێڵەکیەکانی عیراقی بەبێ جیاوازی تەنگیان بە کاروانی حاجی و بازرگانەکان هەڵدەچنی و، ئەم کارەش دەبووە هۆی نیگەرانییەکی زۆر بۆ ئێرانییەکان.

بەمشێوەیە ئەم دوو دەوڵەتە چوونە قۆناغێکی هێمنی و ئارامی کەماوەی بیست و سێ ساڵی خایاند.

## ململانێـــی خانـــەوادەیی لـــەوڵاتی عوســـمانییەکان و کاریگـــەریی لـــە ئاشتبوونەوەی ئەماسیا:

پەیوەندیەکانی عوسمانی و سەفەوییەکان لەدوای پرۆسەی ئاشتبوونەوەی ئەمایـا هـێمنی بەخۆیەوە بینی، هەردوولاش ئەم کەشوهەوایەیان زۆر پێخـۆش بـوو چـونکە ببـووە هـۆی ئـەوەی خۆیـان ســەرقاڵی چارەســەرکردنی کێشــەی گەورەتربکــەن، بــەڵام ئــەم پرۆســەی ئاشبوونەوەیە رووبەرووی یەکەم تاقیکردنەوەی هەتەرانـە هـات، ئـەویش پەیوەنـدی بـەو ململانێیە هەبوو لەناو خانەوادەی عوسمانی سـەری هەڵـدا. سـوڵتان سـولەیمانی قـانونی نەساڵی ۱۵۵۹ز رێکخستنەکانی ریزی میرزادەکانی لـەنێوان بایەزیـد و سـەلیمی کـوڕی دەسپێکرد، یەکەمیانی لەفەرمانڕەوایەتی ئەماسیا لابردو کردیە حـاکمی قوونیـە، بـەڵام دووەمی لەفەرمانڕەوایەتی قوونیە لابـردو کردیـە دەسـەڵاتداری ئەماسـیا، کەچـی ئـەم گۆڕانکارییە لەگەڵ ئارەزووەکانی بایەزید یەکی نەدەگرتەوەو هێرشی کردە سەر براکەی تا نەگاتە شوێنی ئیشکردنی نوێی و لەئەنجامدا خۆی شکسـتی هێنـا، باوکیشـی پاڵپشـتی لەسەلیمی کوڕی کردو بایەزیدیشی ناچار لەرێی ئەرمینیاوە بەرەو ئێران رابکـات، کەلـەو رێگایەدا نزیکەی دە هەزار سەرباز و چوارکوڕی خۆی لەگەڵدابوو.

ڕادیاربوو شاتەهماسبی یەکەم رۆڵێکی کاریگەری هەبوو لەتیژکردنی ململانێی نێوان ئـەو دوو برایە تاکو بتـوانێ ئـەوەی مەبەسـتیەتی لەداڕشـتنەوەی بەنـدەکانی رێکەوتنامـەی ئاشـتەوایی ئەماسیا وەدەستی بهێنێ، بەڵگەش:

- زیادە ڕەوی زۆری کرد لەرێزگرتن و پێشوازی کردنی بایەزید.
- پەیمانی دایە بایەزید کەنەیداتەوە دەست باوکی.
- کاتێك ســوڵتان داوای لەشاتەهماســب کـرد کوڕەکـەی بداتـەوە دەسـت، لەوەڵامـدا ڕەزامەندییەکی مەرجداری بۆ دەربڕی ئەویش بریتیی بـوو لـە دووبـارە داڕشـتنەوەی بەندەکانی رێککەوتنامەی ئاشـتی ئەماسـیا، کەداوای دەکرد قەڵای قارسی سـتراتیژی نێوان هەرێمی ئەرزەروومی تورکی و هەرێمی ئەرمینیای ئێرانی بڕووخێنرێ.

بایەزید وای مەزەندە دەکرد کەوا شا یارمەتییەکی باشی سەربازیی دەدات تا بتـوانێ رووبەرووی باوکی ببێتەوە، بەڵام شا هیچ بەرژەوەندییەکی ئێرانی لـەم کـارەدا بـەدی نەدەکرد، هەموو مەبەستێکی ئەوەبوو وەك کـارتێکی فشـار پارێزگـاری لێبکـات و بەکاریبهێنێ، ئەوەبوو عەلی ئاغای نارده لای سولتان بۆ ئەوەی لێـی بپارێتـەوە تـا لێی خۆشببێ، بەڵام نێردراوەکەی لەم کارەیدا سـەرکەوتنی بەدەسـتەهێناو، ئـەویش لەپێناوی ئـەوەی پەیوەندییـەکانی نێوانیـان نەشـلەژێ بایەزیـدی بەنـدکرد. پاشـان لەنێوانیاندا دانوستان دەستی پێکرد و ماوەی دووسـاڵی خایاند (١٥٦٠تـا١٥٦٢ز)، لەو نێوانەشدا سولتان بەمەبەستی دەربڕینی هەڵوێستی ئاشـتیخوازانە و پارێزگـاری کردن لەرێککەوتنامەی ئاشتی ئەماسـیا عـەلی پاشـای فـەرمانڕەوای مەرعـەش و حەسـەن ئاغـای چاشـنی گـەرباجی و چـەند دیاریـەکی نـاردە قـەزوین، بـەڵام شـا لەبەرانبەردا نووسراوێکی بەنێردراوەکانیەوە بۆ نارد کەتیایدا لەبەرانبـەر گێڕانـەوەی بایەزید داوای بەغدای کرد. کەچی سـولتان ئـەو داوایـەی ڕەتکـردەوە، سـاڵی دوای ئەویش شا نێردراوێکی خۆی ناردە لای سولتان و داوای لێکرد کەوا کاروباری کەربەلا و نەجەف بخاتە ژێـر دەسـەلاتی کوڕەکـانی، دیسـانەوە سـولتان ئـەم داوایەشـی بـۆ جێبەجێ نەکرد، جاری سێیەم شا داوای لێکـرد دەسـکاری رێکەوتنامـەی ئەماسـیا بکرێ یـاخود رێککـەوتنێکی نـوێ سـازبکەنەوەو، دیسـانەوە جگـە لـەنارازیبوونی سولتان هیچی دیکەی وەرنەگرتەوە. لەساڵی ١٥٦٢ز نێردراوێکی سـولتان گەیشـتە قەزوین و نامەیەکی پێبوو بۆ شا کە لەسێ بەند پێکهاتبوو:

- شاتەهماسب بایەزید بداتەوە دەست باوکی.
- لەسەر داخوازی ئەو قەڵای قارس بڕوخێنرێ.
- رێککەوتنامەی ئەماسیا وەکو خۆی بمێنێتەوە.

شا بەم چارەسـەریانە قایـل بـوو، و بڕیاریـدا بایەزیـد و چـوار کوڕەکـەی ئـازاد بکـرێن و بدرێنەوە دەست نێردراوی سولتان و ئەوانیش لەنزیك قەزوین هـەموویان کوشـتن و ئینجـا تەرمەکانیان بردەوە بۆ سیواس.

بەمجۆرە رێککەوتننامەی ئەماسیا لەلەناوچون رزگــاریبوو، ئــەم کێشــەیەش بەســەریانەوە رژێــی بــەبێ ئــەوەی هــیچ کاریگەرییــەکی نالــەباری هــەبێ لەســەر پەیوەندیــەکانییان. لەراستیشدا هەڵسوکەوتی سوڵتان هۆی سەرەکی بوو لە رزگاری کردنــی پەیوەندییــەکانی نێوانیان.

گومانی تێدا نییە کە شاتەهماسبی یەکەم زۆر ئاسوودەبوو بەجێگیربوونی پەیوەندیــەکانی لەگەڵ عوسمانییەکان، بەتایبەتیش ئەوکاتە دەوڵەتەکــەیان لــەقۆناغێکی زۆر بــەهێزدابوو تەنانەت پاشاو میرزادەکان و فەرمانڕەوەکانی ئەورووپاش هیــوای ئــەوەیان دەخواســت کــە ســوڵتان رووی خۆشــیان تێبکــات، چــونکە ئەوکاتــە عوسمانییــەکان خــاوەنی چــەکی پێشکەوتووی وەك تۆپ و کەشــتی ســەربازیی و هونــەری ئەنــدازیاریی ســەربازیی بــوو، لەوکاتەی سەفەوییەکان جگە لەچەکە سەرەتاییەکان بەبەراورد لەگەڵ هــی ئــەوان هیچــی دیکەیان نەبوو، تا ئەم کاتەش هەر خەریکی تووندکردنی ئەستووندەکانی مەزەبی شیعی بوون لەولاتەکەیانداو، ئەم مەزەبەش هەمیشە دووچاری مەترسیەکانی نــاوخۆ و دەرەوە دەبوو.

## بــەردەوام بــوونی پەیوەندییــە دۆســتانەییەکانی نێــوان ســەفەویی و عوسمانییەکان تامردنی شا تەهماسبی یەکەم:

لەســاڵی ١٥٦٦ز کاتێك سوڵتان سولەیمانی قانوونی گەمارۆی شاری سیجتواری لــەولاتی مەجەر لەسەر سنووری نەمسا دابوو کۆچی دوایی کرد، لەدوای خۆیشی دەوڵەتێکی بەهێز و پان و بەرین و خاوەن توانایەکی زۆری بەجێهێشت، کــە ســەردەمی ئــەو پرشــنگدارترین ساڵەکانی دەوڵەتی عوسمانیی بــوو، ســەلیمی دووەمــی کــوڕی لــە١٥٧٤ز وەك ســوڵتانی عوســمانیی جێگــای گرتــەوە. هەرکــە دەســەلاتی گرتــە دەســت یەکســەر نێردراوەکــانی لەخۆرەلات و خۆراواوە دەهاتن بۆ لای و پیرۆزبایــیان لێــدەکرد. لەوانــەش شــا تەهماســبی یەکەم نێردراوێکی بەسەرۆکایەتی شاقوولیی خان کەلە هەشت ســەد کــەس پێکهــاتبوو و لەگەڵ کۆمەلێك دیاری بەنرخی بۆ نارد، ئەوەبوو سوڵتان چەند کەسێکی نزیکی خۆی نارد و لەنزیك ئەرزەرووم پێشوازییان لێکــردن و تــاکو ئەردەنــە و تاگەیشــتنە نزیــك ســوڵتان

یاوەریان بوون و لەوێش سولتان بەجوانترین شێوە پێشوازی لێکردن و ڕێزی زۆری لێگرتن. لەدواییدا وەفدەکە پیرۆزبایی خۆی پێشکەشکرد و ئینجا دیاریەکان.

دوای ئەوەی ماوەیەك وەفدەکە لەلای سەدری ئەعزەم مانــەوە جــارێکی دیکــە ســەردانی سولتانیان کردەوەو نامەیەکی دۆستانەو دەسودیارییان بۆ شا لێوەرگرت، شایانی باسە بەر لەوەی کە خاکی عوسمانی بەجێبهێڵن و بگەڕێنەوە بۆ وڵاتــی خۆیــان لەلایــەن حکومــەت پێــداگری عوسمانییــەکانیان لەســـەر بەنــدەکانی ڕێکەوتنامـــەی ئاشــتی ئەماسـیا بــۆ دووپاتکردنەوەو نێردراوەکەش هەڵیگرت و بردیەوە بۆ تەهماسب لەقەزوین.

لەئەنجامی داگیرکردنــی دوورگــەی قوبرســی ســەر بەڤینیسـیا لەســاڵی ١٥٧٠ز لەلایــەن عوسمانییەکانەوە، ئەوانە روویان بــەلای ســەفەوییەکاندا وەرگێــڕاو داوای هاوپــەیمانێتیان لێکرد لەدژی عوسمانییەکان و بۆ ئەم مەبەسـتە باڵیۆزێکیــان نــاردە قــەزوین، بــەڵام شــا ئەوەی رەتکردەوە بۆ لێدانی عوسمانییەکان لەگــەڵ ئەوانــدا هاوپــەیمانێتی بکــات ئــەویش لەبەر ڕێز و ئەمەکداری خۆی لەبەرانبەر ڕێککەوتنامــەی ئەماسـیا و ئــەو دۆسـتایەتیەی کەبەسولتانی عوسمانی دەیبەستێتەوە.

لەساڵی١٥٧٤ز سولتان سەلیمی دووەم کۆچــی دوایــی کــردو مــورادی سـێیەم (١٥٧٤-١٥٩٥ز) جێیگرتــەوە. هەرکــە شــا تەهماســبی یەکــەم ئــەم هەواڵــەی بیســت یەکســەر نێردراوێکی پایەبەرزی بەسەرۆکایەتی تــەقماقخانی ئەســتاجلوو و بــەیاوەری دوو ســەد و پەنجا سوارەوە و بەدەسـودیاریەکی زۆرەوە کــەپێکهاتبوو لــەباری پــەنجا وشــتر نــاردە لای سولتانی تازەو پێشکەشی کرد، هەروەها نامەیەکیشی دایێ کەتیایدا سەرەخۆشی مردنی باوکی لێدەکردو لەلایەکی دیکەش پیرۆزبــایی فەرمانڕەوایەتیەکــەی لێــدەکرد، هــەروەها لەلایــەکی دیکــەی نامەکــەدا داوای لەســولتان مــورادی ســێیەم کــرد کــەوا پشــتگیری لەحەیدەرمیرزای کوڕی بکات کەلەدوای مردنی دەبێتە شای سەفەوییەکان. چونکە بەهۆی ئــەو تەشەنەســەندنی ململانێــی نێــو خانەوادەکــەی ترســی دوارۆژی کوڕەکــەی هــەبوو، سولتانیش بەڵێنی پێدان داواکاریەکەیان بۆ جێبەجێبکات.

بەڵام بەمردنی شا تەهماسبی یەکەم پەردە لەسەر قۆناغەکانی هێمنیی و ئاسایش لادرا، کەلەوەتەی ڕێککەوتنی ئەماسیاوە لەنێوانیان بوونی هەبوو.

## هاریکاری نێوان سـەفەوییەکان و مـەگۆل لـەململانێی سـەر ئەفغانسـتان و هیندستان:

ئەماوەی ململانێی سەر هیندستان لەنێوان مەگۆل بەسەرکردایەتی هەمایۆنی کوڕی بابەر و ئەفغانسـتان بەسەرۆکایەتی شێرشا، یەکەمیان دووچاری شکسـتێکی زۆر گـەورە هـات ئەشەڕی قەننوج لە١٧ئایاری١٥٤٠ز و ناچاربوو کەلەهیندستان بێتەدەرەوە، پاشـان رووی کردە ئێران و بوو بـەمیوانی شـا تەهماسـبی یەکـەم و ئـەویش رێزێکـی زۆری لێگـرت و میوانداریەکی باشی کرد.

لەراستیدا هەمایۆن لەدوای شکستەکەی بەتـەمای ئـەوەبوو بچـێتە ئـەکرا و لـەوێوە بـۆ کشمیر ، بەلاّم کەمیرانی برای کە فەرمانڕەوای ئەفغانستانبوو رێی پێگرت و ناچـار رووی لەسـەند کرد کەئەوکاتە لەبارێکی زۆر ناخۆش و نارێکدابوو و کەس نەبوو هانای بۆ ببات، تەنانەت براکانیشی بەردەوام پیلانیان بۆ دەگێڕاو زۆربەی سەربازەکانیشی پشتیان تێکرد، تەنها میرجەهگەر نەبێ بەهانایەوە هات و یارمەتیدا، ئەوەبوو سی بەلەم و بیست هـەزار مـسقالّ زێڕ و دوو هەزار باری ئێستر و سێ سەد باری وشتری پێشکەشکرد.

ئینجا هەمایۆن بەرەو قەندەهار رێیگرتەبەر و کاتێکیش گەیشتە ئـەوێ هـەواڵی ئـەوەی پێگەیشت کەوا کەمیرانی برای بەرەورووی دێ و مەبەستی ئەوەیە دیلی بکات، بۆیە بیری لەپەناگەیەکی دیکە کردەوە بۆ ئەوەی هاوکاری بکەن. لەوێوە رووی بەرەو ئێران وەرگێـڕاو ئەوکات شا ئاگاداری مەبەستی ئەو سەردانەی هـەمایۆن بـوو، بۆیـە هـەمایۆن ژنەکـەو کوڕەکەی لەقەندەهار بەجێهێشت و بەیاوەری راوێژکارەکەی کەناوی پیرەخـان بـوو بـەرەو سیستان چوو.

جێگـری یەکـەمی تەهماسـب لەسیسـتان پێشـوازیەکی گـەرمی لەهـەمایۆن کـرد کەبەمەبەستی قەزوین بەرێکەوتبوو، کاتێکیش گەیشتە هەرات مـەحمودمیرزا پێشـوازی لێکرد کە گەورەترین کوڕەکانی تەیموورلەنگبوو، ئینجا بەردەوام نێردراوەکـانی شـا زیـاد لەپێویست و بەگەرمییەوە بەفـەرمانی شـا تەهماسـب پێشـوازییان لەهـەمایۆن دەکـرد تاگەیشتە کەنارەکانی قەزوین، لەوێ لەگەڵ شـا تەهماسـبدا کۆبـۆوەو شـا داوای لێکـرد

لەبەرانبەر یارمەتیەکانی بێتە سەر مەزەبی شیعە و قەندەهار بدرێ بەسەفەوییەکان ئەویش لەدوای ئەوەی کەوا دەستی بەسەردا دەگرێ.

سەرەتا هەمایۆن ئەم پێشنیارەی سەفەوییەکانی بەلاوە پەسەندنەبوو، بەلاّم بەئامۆژگاری پیرەمخانی راوێژکاری کەلەسەر مەزەبی شیعەبوو رەزامەندی نواند لەسەر گۆڕینی مەزەبەکەی، لەراستیشدا ئەو قایل بوونەی لەبەر ئەوەبوو تاکو شا نەرمی بنوێنێ لەیارمەتیدانی و لەدواییشدا بەقەندەهاریش قایل بوو. لەلایەکی دیکە هەمایۆن لەبەردەمی شا تووڕەیی و هەڵچوونی خۆی نیشاندا بەهۆی ئەو هەڵوێستەی براکانی لەبەرانبەریدا نواندیان و نکوڵیان لەبرایەتیەکەی کرد، تەنانەت بەهرامی برای شا خەریك بوو دەسپێشخەری لەلەناوبردنی براکانی خۆی بکات، ئەوەبوو هانی برایەکەی دەدا بیکوژێ بەبیانووی تۆڵەسەندنەوەی ئەو هەڵوێستەی بابەری باوکی نواندی لەکاتێکدا سەفەوییەکان پێویستیان بەیارمەتی هەبوو لەشەڕی دژ بەئۆزبەکەکان لەسەردەمی شا ئیسماعیلی یەکەم کەچی ئەو پشتی تێکردن. لەم کاتەدا سولتان بێگەمی خوشکی شا هاتە ناو کێشەکەو توانی بەزیرەکیی و دانایی خۆی ئەم پیلانە هەڵوەشێنێتەوە.

بەم بۆنەیەوە ئاهەنگێکی زۆر گەورە بۆ یادی ئەم رووداوە مێژوویە سازکراو لەسەر دیوارەکانیشدا وێنەی کێشرا و وەك نەقشێکیش لە جۆسەق چهلی ئەسفەهانیش هەڵکەندرا.

هەمایۆن لەئێراندا مایەوەو بەردەوام چاودێری باری ناوخۆی هیندستان و ئەفغانستانی دەکرد، چونکە لەوێدا جێنشینەکانی شیرشا لەسەر دەسەلاّت ململانێیان دەکرد. لەوکاتەدا براکانی فەرمانڕەوایەتی ئەفغانستانیان دەکرد، بۆیە بڕیاریدا کەوا دەسەلاّتەکەی خۆی بگێڕێتەوەو سەرەتاش لەئەفغانستانەوە دەستی پێکرد، لەم پێناوەشدا شا تەهماسبی یەکەم بەدوانزەهەزار سەربازی قزلباشەکان پشتیوانی لێکردو بەرەو قەندەهار پێشڕەویان کرد، لەئەنجامدا توانی شارەکە لەژێر دەستی کەمیرانی برای دەربهێنێتەوەو خستیە ژێر دەستی مورادخانی برای شا تەهماسبی یەکەم بەپێی ئەو رێککەوتنەی لەنێوانیاندا هەبوو و لەهەمان شەڕیشدا هەندالی برای کوژرا.

هەمایۆن داوای لەموورادخان کرد کەوا زستانەکە لەقەندەهار بباتەسەر، بەلاّم ئەو رەتیکردەوە، وادیاربوو لەمانەوەی نێو ئەو شارە دڵنیانەبێ، بەمەش هەمایۆن بەزۆریی دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و پەیمانی ئەوەی دایێ کەوا ئەگەر کابوڵ و بەدەخشانی داگیرکرد ئەوا قەندەهاری بۆ دەگێرێتەوە. کەچی زۆری پێنەچوو موورادخان کۆچی دوایی کردو شارەکەش بەدەست هەمایۆنەوە مایەوە، ئینجا توانی بەیەکجاری لەو هەموو ناسۆری و ناستەنگانە رزگاری بێ کە براکانی بۆیان دروستکردبوو و ئامادەنەبوون یارمەتی بدەن و بەردەوام پیلانیان لەدژی دەگێڕا هەتا ئەو کاتەی لەهیندستان وەدەریان خست، هەموو کاتێکی خۆشی بۆ گێڕانەوەی زەویەکانی خۆی لەم وڵاتە تەرخانکرد و پێرەمخانی راوێژکاریشی رۆڵێکی سەرەکی هەبوو لەم رووداوانەداو، پاشان دەستی بەسەر دەلهی و ئەکرادا گرت و لەوێشدا نازناوی خانی خانانی بەخشیە پێرەمخان و کردیە راوێژکاری کوڕە گەورەکەی.

بەمجۆرە هاوکاریەکی بەرهەمدار لەنێوان سەفەوییەکان و مەگۆل بەسەرکردایەتی هەمایۆن سازبوو و بەهۆیەوە توانرا ئاواتەکانی ئەم دواییەی کە گێڕانەوەی موڵکەکانی بوو بهێنێتەدی.

## پەیوەندەیەکان لەگەڵ دەوڵەتانی ئەورووپا:

بەهۆی گۆڕانی باری سیاسی شا تەهماسبی یەکەم ئارەزووی لە شا ئیسماعیلی باوکی کەمتر بوو بۆ سازکردنی پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتانی ئەورووپا. ئەو رێککەوتنەی ئەماسیای نێوان سەفەویی و عوسمانییەکان هەموو کێشەو ململانێیەکانی نێوانیانی کۆتایی پێهێنا و بەردەوام لەنێوانیاندا نامەی دۆستایەتی هاتووچۆی دەکرد و لەهەمووشیاندا جەخت لەسەر ئاشتی و رێزی نێوانیان دەکرایەوە. بەلاّم شا لەگەڵ پورتوگالدا تا ماوەیەکی کەم بەر لەمردنی هەر پەیوەندییەکانی باش بوو کە کەوتبووە سەر سنوورەکانی خوارووی دەوڵەتەکەی، لەساڵی ١٥٥١ز سپاستیانی شای پورتوگال نێردراوێکی ناردە لای شا بەمەبەستی رێکخستن و گفتوگۆ کردن لەسەر لایەنە بازرگانییە هاوبەشەکانیان و ئەندامانی بالاّی سەفەویی زۆر بەگەرمی پێشوازیان لە نێردراوەکەکرد، پاشان پێشکەوتنی سیاسی و بازرگانی لەکەنداوی عەرەبیدا دروستبوو،

هەروەها لەساڵی ١٥٧٤ز لەبەر بەرەنگاربوونەوەی دانیشتوانی هورمز لەرووی هێزەکـانی پورتوگالی نێو وڵاتەکەیان و سەرەتای دەسـوەردانی ئینگلیـز و رووسـیەکان لـەکاروباری بازرگانی خۆرەڵاتی خواروو، جارێکی دیکە پورتوگال نێردراوێکی دیکەی ناردەوە بـۆ لای شا، لەهەمان کاتیشدا ئەلیزابێـسی شاژنی بەریتانیا بـەهاوکاری رووسـیا نێردراوێـك کـە نوێنەرایەتی کۆمپانیای بازرگانیی ئینگلیزی دەکرد بەسـەرۆکایەتی ئـەنتۆنی جانکسـۆن ناردە ئێران تاکو بتوانن هاریکاری بازرگانیی لەنێوانیاندا سازبکەن، بەڵام شا کەهەمیشە ئارەزووی ئەوەی دەکرد بازرگانی لەگـەڵ پورتوگالیـەکانـدا بکـات و بـەهۆی ئەوانیشـەوە سوود لەشارستانێتی ئەورووپا وەرگرێ، ئەم پێشنیارە هاوبەشەی ئینگلیـز و رووسـەکانی رەتکردەوەو زۆر بەساردیش پێشوازی لەباڵیۆزەکان کرد.

## مردنی تەهماسب شای یەکەم:

لـەکۆتایی مـاوەی فەرمانڕەوایـەتی شـا تەهماسـبی یەکـەم ئێـران کەوتـە نـاو گێـژاوی کێشەکانی خانەوادەیی لەپێناو دەسـەڵات و سـەرکردەکانی قزلبـاش بـوون بـەدوو بـەش، یەکەم پێکهاتبوو لەسەرکردەکانی رۆملوو و ئەفشار و تەکـەللوو و شـەرکەس و ئەوانـەش پشـتگیرییان لـەمیرزا ئیـسـماعیل دەکـرد، لەهـەمان کاتـدا بەشـی دووەم پێکهـاتبوو لەسەرکردەکانی ئەستاجلوو خاوەنی پەیوەندییەکی زۆر خراپ بـوون لەگـەڵ ئیـسـماعیل و لەسـتەم و دڵڕەقییەکـەی دەترسـان کەئەگـەر دەسـەڵات بگرێتـە دەسـت لەوانەیـە زۆر بێبەزەییانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکـات، بۆیـە پشـتگیرییان لـە مـیرزا حەیـدەری کـوڕی سێیەمی شا کرد.

حوسێن بەگی یوزباشی سەرۆکی هۆزی ئەستاجلوو بـوو لەهـەمان کاتیشـدا وەسـی سـەر مـیـرزا مسـتەفای کـوڕی شـا بـوو، چـونکە شـا زۆر بـاوەڕی پێـی هـەبوو و لەهـەموو کاروبارەکانی دەوڵەتدا بەشداریی پێدەکرد، ئینجا بڕیاریدا کەوا حەیدەر بەرزبکاتـەوە بـۆ پلەی جێنشینیی. لەپێناوەی ئەوەی هەڵوێستی خۆی بەهێزبکات پەیوەنـدی بـە هەریـەك لەسەدرەدین خانی سـەفەویی سـەرۆکی هـۆزی شـێخاوەند و حاکمـەکانی کـەرەج کەلـە دایکیـەوە خزمـی مـیرزا حەیـدەربوون و میرزادەکـانی هـۆزی قاجـار ئەوانـەی خـاوەنی دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی بوون لەناوچەکەداو داوای لێکردن کە هەوڵـەکانیان یەکخـەن بـۆ ئەوەی میرزا حەیدەر بپاڵێون بۆ جێنشینیی.

لەبەرانبەریشـدا سـەرکردەکانی رۆملـوو و ئەفشـار و تورکمـان و تـەکللوو و شـەرکەس بەسەرۆکایەتی حوسێن قوولی نوێنەری شا وایان بەچاك دەزانی کە مـافی ئـەم پلەیـە هـی میرزا ئیسماعیلی کوڕی دووەمی تەهماسب شای یەکەمە لەلایەکی دیکەش لەبەر ئەوەی کوڕە گەورەکەی چاوەکانی لەدەستدابوو بۆ فەرمانڕەوایەتی نەدەگونجا.

ئەم دوو لایەنە بەردەوام و بـەنهێنیی هـەوڵیان بـۆ بـەجێهێنانی مەرامـەکانیان دەدا، تـا لەساڵی ١٥٧٦ز تەهماسب زۆر بەسەختی نەخۆش کەوت و، هەر لایەنێك لەوانە بەئاشکرا هەڵوێستی خۆیان راگەیاندو هیچ گرنگیشیان بەرای شا نەدا کەبەڕای ئەو مـیرزا حەیـدەر لەهەردووکیان باشتر بوو بۆ جێگرتنەوەی. بەلاّم پەریخان خانمی کچی دووەمی شا و لـەلای باوکی دیلبوو، ئەم بۆچوونەی باوکی رەتکردەوەو قایلی کرد کە سولەیمان میرزا ئەم پلەیـە وەرگرێ. وادیاربوو رای ئەم کچەی کاریگەریی زۆری هەبوو لەسەر شـا، بۆیـە بەشـوێنیدا ناردو هێنایە قەزوین بۆ ئەوەی لەسەر کاروبارەکانی حکومـەت رایبهـێنێ و لایـەنگرانی میرزا حەیدەریشی دوورخستەوە بەتایبەتیش حوسێن بەگی یوزباشی.

شاتەهماسبی یەکەم لەم باروگوزەرانە سـەخت و دژوارە سیاسییەدا لەتەمـەنی شەسـت و چـوار سـاڵی لـەدوای دەسـەلاّتدارێتیەکی سـی و پێـنج سـاڵی، لـەرۆژی سێشـەمە ١٥ئایار١٥٧٦ز کۆچی دوایی کرد.

## گرنگی تەهماسب شای یەکەم:

ئەم فەرمانڕەوایـە لەهـەموو ئـەوانی دیکـە زیـاتر تەمـەنی فەرمانڕەوایـەتی درێـژبوو، هەرچەندە کە بەراورد ناکرێ لەگەڵ ئیسماعیل شای یەکـەم لەلایـەنی ئیـدارەو هێـرش و داگیرکردنەوە، بەلاّم تـوانی پارێزگـاری لەدەسـکەوتەکانی دەوڵـەتی سـەفەویی بکـات و نەیەڵێ لەناوبچن، بەردەوامیش رووبەرووی دوژمنان دەبووەوە.

شا ناوبانگی بەئارامگریی لەکاتی تەنگانەو بەرگەگرتنی ناسۆریەکان دەرکردبوو، زاڵبـوو بەسـەر قزلباشەکان و توانی بۆ بەرگیکردن لەدەوڵەتەکەی سـوودیان لێـوەرگرێ، ئەمانـە خەریکی ئەوەبوون دەست لەکاروباری دەوڵەت وەربدەن کەهەرگیز ئەم کارە ئـەرکی ئـەوان نەبوو، بۆیە کۆمـەڵێك پلـەو پایـە و پـارە و زەوی و زاری پێبەخشـین و چـاوی شـکاندن، بەردەوام لەسەرانسەری ولاّتەکەیدا لێکـی جیادەکردنـەوەو هـەرگیز نەیدەهێشـت لـەهیچ

شوێنکدا ببنه خاوەن هێزی مەترسیدارو جاری واش هەبوو بەندی دەکردن یـا دەیکوشـتن، هەندێك جاریش هەڵسـوکەوتەکانی پشـگوێ دەخسـتن یـاخود وەك تەماشـاکەرێك لێـی دەڕوانین.

شا زیاتر لەخەڵکە هەژار و سادەکانی وڵات خۆی نزیك خستەوە و گوزەرانی بۆ رێکخسـتن و، هەر ئەم هەڵوێستەشی بـوو کـە وای لێیـان کـرد بـەرگریی لەمـەزەبی شـیعی بکـەن لەبەرانبـەر ئـەو مەترسـیانەی لەلایـەن سـوننەکانەوە دووچـاریان دەبـوەوە (عوسمـانی و ئۆزبەك) و، جگە لەمانەش باجی لەسەر سووك کردن.

شا لایەنی مەزەبیشی لەبەرچاو بوو و هەرگیز پشگوێی نەدەخست، کۆمـەڵێك هـەنگاوی ئەوتۆشی هەڵهێنا کە خزمەتی کێشەی سەفەوییەکانی دەکردو، هەمیشە سـۆزی ئـایینی لـەنێو دڵ و دەروونـی شـوێنکەوتووانی بـەهێزدەکردەوەو بیروبـاوەڕی ئـایینی لەناویانـدا دەچەسپاند، وەك:

-کۆمەڵێك لەپیاوە هەڵبژێردراوەکانی ئایینی لەدەوری خۆی کۆکردەوە(ئەوانەی فـەتوای بیروباوەڕی مەزەبی شیعەیان دەدا) وێنەی شێخ عەلی مەنشار و عەبدوڵلای شوشتەری و میرزاخانی شیرازی و هیدیکەش.

-فەرمانی بە ئەبافـەتحی حوسـێنی کـرد کـەوا جـارێکی دیکـە پـەرتووکی (صـەفوەت ئەلصەفا) بنووسێتەوە و پێیدا بچێتەوە کە ئیبن بـەززاز لەسـەردەمی شـێخ سـەدەردین موسا داینابوو، و داواشـی لێکـرد دەسـکاری هەنـدێك بابـەتی بکـات و ئامـاژە بـە سەرۆکایەتی شێخ سەفییەدینی ئەردەبیلی بکات و نەسەبەکەشی بگێڕێتەوە بـۆ ئیمـام حوسێنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب.

-دەسەلاتی خـۆی بەشـێوەیەکی فـەرمیی راگەیانـد، و نـاوی لەخۆشـی نـا تەهماسـبی سەفەویی حوسێنیی موسەویی و مەبەستیشی ئەوەبوو پروپاگەندە بـۆ مـەزەبی شـیعی بکـات و سـتاییش و پیاهەڵـدانی ئـەو پێشـەوایانە بکـات کەلەسـەرووی هـەموو رەچاوکردنێکەوە دادەنران و لەهەموو کەموکورتیەکیش دووربوون و، لەهەمان کاتیشدا ستاییش و پیاهەڵدانی سەرکردەکان و زیادەڕۆیی لەباسی پلەو پایەیان کرد.

شا لەلایەنی سیاسیەوە مرۆڤێکی دووربین بوو، بەڵگەشمان ئەوەیە هەمیشـە داڵـدەی ئـەو کەســانەی دەدا کەلــەولاتی خۆیــان رایــانکردووەو وەك و کــارتێکی فشــار لەبەرانبــەر ولاتەکەیان یاخود فەرمانڕەواکەیان بەکاری دەهێنان، هەروەك بایەزیـدی کـوڕی سـوڵتان سـولەیمانی قانوونی کەلەرێی کێشـەکەیەوە تـوانی لەگـەڵ عوسمانییەکانـدا رێککـەوتنیی ئاشتیانە سـازبکات و زیانێکی زۆر لەخۆی دوورخاتـەوە، لەلایـەکی دیکـەش هـەمایۆنی داڵدەداو بە یارمەتی ئەوەوە دوو شتی دەسکەوت:

یەکەم: ورەبەرزیی سـەفەوییەکانی هەڵکشـاند بـۆ ولاتـی هینـدسـتان و کەبەشـدابوو لـە پاڵپشتی قەوارەی سەفەویی.

دووەم: ئەم هێزانە وایان لە ئۆزبەکەکان کرد کەلەنێوان سنوورەکانی مەگۆلی و هینـدسـتان و سـەفەوییەکان بـوون لـەئێران و خۆراسـان، هێرشـی بـەربلاو نەکەنـە سـەر خـاکی سەفەوییەکان.

شا پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەورووپییەکان زۆر بـاش بـوو بـەلام هـەروەك بـاوکی لـەدژی عوسمانییەکان نەدەچووە هیچ هاوپەیمانێتیەکیانەوە، چونکە ئەوەی بـەباش دەزانـی کـەوا کێشەکانی خۆی لەرێگای گفتووگۆ و دانوستانەوە چارەسەربکات، لەسـەردەمی ئەویشـدا هیچ کام لەوانە بوونیان لەدەوڵەتەکەیدا نەبوو.

لەخەسڵەتەکانی شا خۆپـارێزی و وەسواسـی بـوو، لەبـەر ئـەوە بـەهیچ جۆرێـك رێگـای بەوەزیرەکانی نەدەدا بەئارەزووی خۆیان پارە خەرجبکەن، لەکەمترین شـتی دەپرسـیەوەو، لەکۆڕوکۆبوونەوەکاندا هەرگیز نانی نەدەخواردو، سەرەڕای ئەوەی شـەڕێکی زۆری بینیبـوو کەچی هەمیشە بۆ دەوڵەت و شوێنەوارەکەی بەپارێزبوو.



## شا ئیسماعیلی دووەم

## ١٥٧٦-١٥٧٧ز

### ئەو رۆژگارەی شا ئیسماعیلی یەکەم دەسەڵاتی گرتە دەست:

لەکاتی مردنی شا تەهماسبی یەکەم، حەیدەری کوڕی یەکسـەر تـاجی شـاهانەی کـردەی سەری و بەفەرمانی باوکی یاخود بەهۆی ئەو ئامۆژگاریانـەی دایکـی پێشکەشـی کـرد، یانیش پێشنیارەکانی لایەنگرانی لەهۆزی ئەستاجلوو خۆی بەپادشـای ئێـران راگەیانـد و ئینجا وەسـیەتنامەیەکی بـاوکی خسـتە بـەردەمی خەڵکەکـە کەبـەر لـەمردنی بـاوکی بڕیاریدابوو ئەو بکاتە جێنشین و شا لەدوای خۆی، بەڵام نەیتوانی ئـەم دەنگـە بگەیەنێتـە دەرەوە چونکە لایەنگرانی براکەی کەلەهۆزی رۆملوو و بەیاتی قزلباشی و ئەفشار بـوون و پشتگیریان لێی دەکرد دەوری کۆشکەکەیان گرتبوو، ناچار بەجلی ژنانەوە هاتـە دەرەوە، بەڵام لـەدوای ئـەوەی ناسـیانەوە یەکسـەر کوشـتیان. بەمـەش ئـەم رکابـەرە بـەهێزەی ئیسماعیل لەناوچوو و کۆتایی پێهات، بـەڵام دژەهەڵوێسـتێکی دیکـەی بـەهێز مایـەوە ئەویش برایەکەی دیکەی بوو و بەفەرمانی باوکی لەقەڵا بەندکرابوو، چونکە بەڕای بـاوکی ئەو بەکەڵکی فەرمانڕەوایەتیی نەدەهات لەبەر دڵڕەقیی و کەللەرقی، کـاتێکیش هـەواڵی ئەوەی پێگەیشت کە لەدەوڵەتەکەدا گۆڕاکاری کراوەو بەهۆی لەوێنەبوونی خەلیفە ئەنسار قەرەداغلوو سەرکردەی قەڵاکە و بەهۆی یارمەتیی لایەنگرانی خۆی دەستی بەسـەرداگرت و پاشان لە٢١ئایـار١٥٧٦ز ئـەوێی بەجێهێشـت و رووی کـردە ئـەردەبیل بـۆ سـەردانی مەزارگەکانی باوك و باپیرانی، پاشان لە١٤حوزەیران بەرەو قەزوین رۆیشت، بەڵام لەسـەر رای ئەستێرەناسان نەچووە ناو کۆشکی پاشایەتییەوە چونکە بەڕای ئەوان جـارێ مۆڵـەتی تاج لەسـەرنانی لە٢٢ئاب کاتی دیکەی ماوەو ئەو ماوەیە میوانی مـاڵی حوسـێن قـوولی خەلیفەی خەلیفەکان و جێگری شا کەلەلایـەنگرانی خـۆی بـوو و مـاڵی پـەریخان خـانمی خوشکی بـوو. کـاتێکیش ئـەو وادەیـەی ئەستێرەناسـان بۆیـان دانـابوو هاتـە پێشـەوە

ئیسماعیل لەناو هۆڵی چهل ستوون لەکۆشکی پاشایەتی لەقەزوین لەژێر ناوی شا ئیسماعیلی دووەم تاجی پاشایەتی لەسەرنا.

دیار بوو ئەو هەموو ماوەیەی شا لەبەدیخانەی بردەسەر کە بیست ساڵی خایاند هێندەی دیکە دڵی رەق بوو و لەجاران خێراتر هەڵچوون و کەللەرەقی پێوەدیاربوو، لەوانەشە ئەو کاریگەری رووداوەکانی نێو دەوڵەتی عوسمانیی بەسەرەوە بووبێ کە لەناو ئەواندا شتێکی ئاسایی بوو رکابەرەکان ئەگەر کەسی نزیکی یەکتریش بووبن یەکتریان لەناو بردووە تا کەس نەتوانێ لەگرتنە دەستی دەسەلاَت رکابەرییان بکات و ئەم دیاردەیە بەرای ئەو سەقامگیریی سیاسی لێپەیدابوو، هەرکە ئیسماعیل تاجی کردە سەر هیچ کەس لەبراو کەس و کار و دەورووبەرەکەی لەخۆی دڵنیان نەبوو، هەرچی رووبەرووی بوویێتەوە کوشتی و لەناویشیاندا مستەفای برای کەلایەنگری حەیدەر و سولەیمانی برای و پەریخان خانم و قوولی و ئەحمەد و کورەکانی و زۆربەی شازادەکانی سەفەویی بەتایبەتی ئەوانەی مافی ئەوەیان هەبوو داوای تاجەکە بکەن کوشت. بەلاَم زۆر بەخێرایی سروشتی توندی و دڵرەقی بەسەریەوە زاڵبوو و حوسێنی کوڕە گەورەی محەمەد خودابەندەی کوشت و جگە لەمحەمەد خودابەندەی کوێرو کوڕەکانی کەسی دیکە لەنزیکەکانی خۆی نەمایەوەو، کەچی هەرەشەی لەخۆی و کوڕەکانیشی کرد. کاتێکیش لەئەلوولی ١٥٧٧ کوڕێکیان بوو ناویان لێنا محەمەد هێندەی دیکە تینوویێتی خوێن رشتن لەدڵیدا پەرەی سەند و سەرەڕای ترسی ئەوەی کەسێك بێنێ لەنەوەکانی سەفەویی لەدوارۆژدا هەوڵی رکابەری کوڕەکەی بکات، بۆیە فەرمانی بەقوولی بەگی کورکان کرد کەیەکێك بوو لەسەرکردەکانی هۆزی شاملووی قزلباشی عەباسی کوڕی محەمەدی خودابەندە بکوژێ.

شا ئیسماعیل وای لێهات کەگومان لەنزیکترین کەسی خۆی بکات و لەم پێناوەشدا حوسێن قوولی دەسبەسەرکرد و چاوەکانی کۆڵی و رێگەشی لەپەریخانی خوشکی گرت دەسبخاتە نێو کاروباری دەوڵەتەوە و هەموو ئەو کەسانەی لایەنگری حەیدەری برایان دەکرد هەمووی کوشتن. ئەم کوشتارە درێژەی کێشاو تەنانەت سۆفییەکانیشی گرتەوە، ئەوانەی کەهەمیشە خەریکی خواپەرستیی و ئەو رێنماییە ئایینیانە بوون کەلەباب و باپیرانیانەوە بۆیان بەجێما بوو، ئەویش بەبەهانەی:

- ئەوانە دوژمنی شای سەفەویی بوون کەپێشەوایەکی تـەواو و بێکـەم و کـوڕی بـوو و ئەوانیش وەك و پاشایەکی خاوەن تەخت تەماشایان نەکردووە.
- خۆیان بەحوسێن قوولی دەسبەسەر کراو بەستەوە.

هەروەها نزیکەی سی هەزار کەسـی لەسـەرکردەکان و پیاوەکـانی بـاوکی و دەوروبـەری کوشت.

ئەم هەموو قەسابخانەیە لەماوەی کەمتر هەژدە مانگدا کۆتایی پێهات کە ئەمـە مـاوەی فەرمانڕەوایەتییە خوێنینەکەی بوو، کەچی وێڕای ئەو هەموو جـەور و سـتەمەی دەیکـرد خۆی بە دادپەروەر و دڵنەرم دادەنا، هەموو فەرمانـەکانی بـە(عـادل) واژوو دەکـرد و دوا دێڕی هۆنراوەکانیشی بە عادلی کۆتایی پێدەهێنا.

## ململانێ ئایینیەکانی شا ئیسماعیلی دووەم:

شا ئیسـماعیلی دووەم لەژیانی سیاسی خۆیـدا زۆر لەپەیوەنـدی کردنـە مـەزەبی سـوننی بێزاربوو، هەرچەندە ئەم هەنگاوە تائێستاش هەر نادیارە و ئەو بەهیچ جۆرێـك ئاشـکرای نـەکردووە کەچـوویێتە سـەر مـەزەبی سـوننی، تـەنها ئـەوە نـەبێ کەچـالاکی و کـارو هەنگاوەکانی ئاماژەیان بەوە دەکرد کەچوویێتە سەر ئەو مەزەبە، چونکە بەئاشکرا باسـی ئەوەی دەکرد کە دەبێ سنوورێك بۆ بالادەستی زانا ئایینیە شیعەکان دابندرێ و لەهـەمان کاتیشدا ئەو دروشمانەی دژیی بیروباوەڕی سـوننیەکانن و لەبنەڕەتیشـەوە ببـوون بـەهۆی نـاکۆکی و کێشـەکانی نێـوان شـیعە و سـوننە هـەمووی قەدەغـەبکرێن و لـەکۆڕ و کۆبوونەوەکانیشـیدا سەرزەنشـتی پەیوەندییـە ناکۆکـەکانی نێوانیـان دەکـردو زۆریـش سەرزەنشتی ئەو نەفرەتانەی دەکرد کەوا ئاراستەی سێ خەلیفەکانی راشیدی (ئەبوبـەکر و عومەر و عوسمان) و هەروەها عائیشـە دەکران ، سەرەڕای ئەم هەنگاوانە بەئەنقەسەت زانا شیعە توندڕەوەکانی دوور دەخستەوەو سوننیەکانی لەخۆی نزیك دەکـردەوە لەسـەرووی هەمووشیانەوە مەخدووم شەریفیی و دەیکردن بەراوێژکاری خـۆی، پاشـان بڕیاریـدا ئـەو نەفرەتانەی لەمزگەوتەکان و سەر شـەقام و کـۆڕ و کۆبوونـەوەکان ئاراسـتەی خەلیفـەکان دەکرا قەدەغەبکرێ و بەڵێنیشیدا هەر کەسێك ئـەو کارانـە بکـات ئـەوا سزای توونـدی

دەدات و ئەوەشی دەسبەرداربیان بێ پاداشتی دەکات، لەهەموو ئەو شوێنانەی کە دروشمی جوێناوی دژ بە خەلیفەکان و ستایش و پیاهەڵدانی عەلی دەکرا هەمووی قەدەغەکرد، بەهیچ شێوەیەك هەوڵی ئەوەی نەدەدا مەزەبی سوننی بەزۆر بەسەر خەڵکدا بسەپێنێ و خەڵکەکەی ئازادکرد لەهەڵبژاردن و لایەنگریی بۆ هەر مەزەبێك بەبێ ئەوەی کەس ڕێگری لەوی دیکەیان بکات.

ئەم هەوڵەی گۆڕینی شیعەمەزەبەکانی ئێرانی نیگەران و تووڕەکرد بەتایبەتی سەرکردەکانی تورکمان و تەکلیوو و ئەوانەش دەسەڵاتیان بەسەر زۆربەی پلەکانی دەوڵەتەوە هەبوو، لەم رووەوە کۆبوونەوەیەکیان دەربارەی بیروبۆچوونە نوێیەکانی شا سازکرد و تیایدا بڕیاریاندا کەئەگەر لەم هەڵوێستەی پاشگەز نەبێتەوە ئەوا لەسەر حوکم لایببەن و میرزاحەسەنی برازای لەجێگەی دابنێن، بۆیە نێردراوێکیان بۆ لای نارد تا ئەم بڕیارەی پێڕابگەیەنن و پێك هاتبوو لە ئەمیرخان موسڵووی تورکمانی و حەسیب خانی تەکیلوو، بەڵام یەکێك لەئەندامانی ناو کۆبوونەوەکە لەوانەش هەر خەلیفە ئەنساری قەرەداغلووی فەرمانڕەوای قەڵای قەهقەهە بوویێ هوشداری دایە شا و پێی ڕاگەیاند کە پیلانێك لەلایەن سەرکردەی ئەم دوو هۆزەوە بۆ لەناوبردنی لەئارادایە، لەم کارەشیدا مەبەستی ئەوەبوو تۆڵەی ئەو هەڵسوکەوتە نالەبارانەی بۆ بکاتەوە کەلەسەردەمیی زیندانییەکەی نێو قەڵا لەگەڵی کردبوو. لەهەمان کاتیشدا ئەمەکداری خۆی بۆ بسەلمێنێ.

شائیسماعلی دووەم کاتێك ئەم هەواڵەی بیست زۆر تووڕەبوو و بەدوایدا ناردن و هەڕەشەی لێکردن و ئەوانیش نکوڵیان لەو قسانەکرد کە درابووە پاڵیان، ئینجا فەرمانیدا حەسەن بکوژن و لەشاری تاران لەسێدارەیانداو ئەوکاتیش تەمەنی تەنها نۆزدە ساڵبوو.

لەراستیشدا لەوانەیە ئەو پاڵێوراوییەی حەسەنی کوڕی محەمەد بۆ پاشایەتی لەلایەن سەرکردەکانی ئەم دوو هۆزەوە لەبەر توندڕەوی مەزەبی نەبوویێ هێندەی ئەوەی کەوا شا ئیسماعیلی دووەم هەموو دەسەڵات و سوودە داراییەکانی وڵاتەکەی لەژێر دەست دەرهێنابون، ئاشکرایە زۆرێك لەسەرکردە قزلباشەکان زیاد لەناو یەك بۆنەدا دەسبەرداری مەزەبەکەی خۆیان بوون تەنها لەبەر ئەوەی سوودی ماددیان دەسکەوێت و دەستیان

لەلایــەنگری پێشــڕەوەکەیان واتــە شــای ســەفەویی هــەڵگرت چــوونە پــاڵ ریزەکــانی عوسمانییەوە.

شا ئیسماعیلی دووەم هیچ بڕوایەکی بەسەرکردەکانی ئەو دوو هۆزە نەماو جارێکی دیکە هەموو پاڵشتی و بڕوایەکی خستە سەر کۆنە دوژمنەکانی لەهۆزی ئەستاجلوو و سەرکردەکانی کردە خاوەن پلە یەکەمەکانی ناو فەرمانڕەوایەتی و وردە وردەش لەو بەئاشکرایی راگەیاندنەی لەبارەی مەزەبی سوننی پاشەکشەی دەکرد، ئەویش لەپێناوی ئەوەبوو کە سەرکردەکانی قزلباش لەخۆی رازی بکات و مقۆمقۆی نێو جەماوەرەکەشی کەمبکاتەوە، هەروەها لەترسی ئەوەی نەکەونە بەر شالاوی مەترسیەکان خەڵکی شیعە زانا سونییەکانی لەکۆشك دوورخستەوە. لەسەر دراوەکانی ولاتیش ئەم دێڕە شیعرەی زیادکرد:

زمشرق تابه مغرب گر امامست　　　　علی و ال أو مارا تمامست

واتە: گەر لەخۆرەلاتەوە تا خۆراوا هەمووی پێشەواو ئیمامبن، ئێمە تەنها عەلی و ئالی ئەومان هەبێ بەسمانە.

بەمجۆرە شائیسماعلی دووەم لەم تەنگژەیەی کوشت و بڕ و سووککردنەی خەڵکی رزگاری بوو، ئەمەش بەهەنگاوێکی پڕشنگدار لەمێژووی سەفەوییەکان بۆی هەژماردەکرێ.

## کۆچی دوایی شائیسماعیلی دووەم:

کارێکی سروشتی بوو کە ئیسماعیلی دووەم نەتوانێ بەبەردەوامی خۆی بپارێزێ لەپیلانەکانی قزلباش بەهۆی خراپی نالەباری هەڵسوکەوتی و فرچك گرتنی بە مەیخواردنەوە و ماددەی بێهۆشکەر (ئەفیون)، ئەوەبوو پەریهانی خوشکیشی هاتە سەر هێڵی پیلانی لەناوبردنی، چونکە سەرەڕای ئەوەی چاکەیەکی زۆری هەبوو بەسەریەوە لەکاتی دەسەلات گرتنە دەستی کەچی زۆر بەخراپی و ناشایەستەیی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکرد. ئاشکرایە کەلەهەموو پلەو پایەیەکی خست و هەرچی خزمەتکار و کەنیزەیەکیشی هەبوو هەمووی لێ ستاندو تەنانەت چاوپێکەوتنی سەرکردەکانی دەوڵەتیشی لێ قەدەغە کردو گۆشەگیرییەکی یەکجارەکی بەسەردا سەپاند، هەرگیز

کوشتنی سولەیمانی برای لەبیرنەدەکرد و توانی لەگەڵ ئـەمیرخان و چـەند سـەرکردەیەکی دیکـەی قزلباشـی وەك حەسـیبخان و محەمـەدخان و خـەلیلخان و شـەمخالخانی خـاڵی رێکبکـەوێت و هەمووشـیان سـوێندیان خـوارد لـەناوی بـەرن و، بەدەسـتی یـەکێك لەمەعشوقەکانی خۆی کەوا مێردەکەی بەکوشـتدابوو هێنابوویـە ریـزی مەعشـوقەکانی دیکەی ژەهریان بۆ خستە ناو دەنکەکانی ئەفیون و پاشـان بەهـەموویان هێرشـیان کـردە سەری و لە ٢٤ تشرینی دووەم ١٥٧٧ز کوشـتیان، ئەوکاتـەش تەمـەنی تـەنها چـل و سـێ ساڵبوو، نزیکەی بیسـت ساڵیشـی لەتەمـەنی لەقـەلای قەهقەهـە بەنـدکرابوو، مـاوەی فەرمانڕەوایەتییەکەشی هەژدە مانگبوو.



# شا محەمەد خودابەندە
# ١٥٧٨-١٥٨٨ز

## محەمەد خودابەندەی شای سەفەوییەکان:

هەموو گەورەپیاوانی دەوڵەت لەدوای مردنی شا ئیسماعیلی دووەم کۆبوونەوە بـۆ ئـەوەی کەسێك هەڵبژێرن و بیکەن بە شای سـەفەوییەکان، لـەو نێوەندەشـدا زۆرێـك لەپێشـنیار سـەریان هەڵـدا، سـوڵتان قـەلخانچی ئـۆغلی زولقـەدەری فـەرمانڕەوای هـەرێمی فـارس پێشنیارکرد و ئەبائەلفەوارسی شوجاعی کوڕی شیرەخۆرەی شای کۆچکردوو و پەریخانی تەمەن سی ساڵی وەسیەتداری بوو کاروبارەکانی وڵات بـەڕێوەببات وکـاتێکیش تەمــەنی گەیشتە بالق بوون بۆ خۆی کاروبارەکان بەدەستەوەبگرێ و هەر لەئێستاشەوە دراوی وڵات بەناوی ئەوەوە چاپبکرێ و لەمزگەوتەکانیشـدا وتـاری هـەینی بەناویـەوە بخوێندرێتـەوە، هـەروەها ببێتــە خـاوەنی بریکـاری شانشـینەکە، واتــە ببێتـە خەلیفــەی خەلیفــەکان، لەراستیشدا ئـەم پێشـنیارە رەزامەنـدی گشـتی بەدەسـتەوە نـەهێنا، ئـەوەبوو زۆربـەی سەرکردەکانی قزلباشی بەرەنگاری بوونەوە، چونکە ئەوانیش وایـان پـێ بـاش بـوو کـەوا محەمەد خودابەندەی کوڕە گەورەی تەهماسبی یەکەم ببێتە فەرمانڕەوا، بەڵام لەبەر ئەوەی کوێربوو بۆیە هەندێك لەسەرکردەکان وایان پێباشبوو کە یەکێك لـەکوڕەکانی ئـەم پلەیـە وەرگرێ.

لەکۆتییدا رای دووەم سەریگرت و محەمەد خودابەنـدە هەڵبـژێردرا بـۆ تـەختی پاشایەتی سـەفەوییەکان و هەموو لایەکیش سـوێندیان لەسەر ئەم بەڵێنەخوارد. پـەریخان بەمــەرجێك قایل بوو لەسـەر ئەم پێشنیارە بۆخـۆی کاروبـاری وڵات بـەڕێوەببات و خودابەنـدە تـەنها ناونیشانەکەی هەبێ و بەمەش کۆی سەرکردەکان لەسـەر ئەم پێشنیارە رێککەوتن.

ئەوکاتــە محەمــەد خودابەنــدە لەشـیراز دەژیـا و لـە١٢شـوبات١٥٧٨ز لەســەر تـەختی فەرمانڕەوایی سـەفەوییەکان دانیشت و پاشان چووە قـەزوین، ئینجـا بـەناوی خودابەنـدە ناوبانگی دەرکرد.

## باروگوزەرانی ناوخۆ:

## سەرەتا:

شــاحەمەدی خودابەنــدە توانــای بــەڕێوەبردنی کاروبــاری دەوڵــەت و لەئەســتۆگرتنی بەرپرسیارێتی فەرمانڕەوایی لەدەوڵەتی سەفەوییدا نەبوو، چونکە ئەو دەوڵەتــە پێویســتی بەپیاوێك بوو کەبتوانێ بەهێزیی بکات و لەو بێسەروبەرەیی و پشێوییەی لەئەنجامی ئــەو هــەموو قەســابەخانەیە شــا ئیســماعلی دووەم لــەدژی بــراو ســەرجەم شــازادەکانیدیکە سازیکردبوو رزگاری بکات، چونکە لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی ئەم شایە هێندەی دیکــە باری ناوخۆی دەوڵەتەکە رووی لــەخراپی کــرد، ئــەویش بــەهۆی نالــەباری بــەڕێوەبردن و دەستێوەردانی ئافرەتان لە کاروبــاری دەوڵــەت، لەهــەمان کاتیشــدا دەوڵــەت دەیناڵانــد بەدەست ئەو ململانێیانەی لەنێو سەرکردەکانی قزلباش لەسەر پلەبەرزەکانی سەرکردایەتی دروسببوو، بەمەش ئایندەی ئێران زۆر تاریك دەهاتە بەرچاو، جگە لەمانــەش دەوڵــەتی ســەفەویی دووچــاری هێــرش و پــەلاماری دەرەکــی لەلایــەن عوسمانییەکانــەوە بــووەوەو لەئەنجامدا عوسمانییەکان توانیان ئەرمینیا و ئازەربێجان داگیربکەن.

## دەسوەردانی هاوسەری شا لەکاروبارە گشتییەکانی دەوڵەت:

مەهدعەلیای هاوسەری شا محەمەد خودابەندە چاوکزی و کوێرییەکەی مێــردی قۆزتــەوەو بەهۆیەوە دەستی لەکاروباری نێوخۆی دەوڵەت وەردەداو بەئارەزووی خۆی پلەی لەخــەڵکی وەردەگرتەوەو دەیبەخشتی بەکەسی دیکەو، تەنانەت بەر لەگەیشتنی محەمەد خوادەبەنــدە بۆ شیرازیش ئەم کارانەی دەکرد، ئەم هەڵوێستە بــوو بــەهۆی نــارازیبوون و تووڕەبــوونی پەریخانخانم و پشتی بەو دەسەڵاتەی ئەستووربوو کەلەنێو قزلباشەکاندا هــەیبوو. بەمــەش دەوڵەت شێوازێکی دیکەی ململانێی بەخۆوەبینی ئەویش ململانێی نێوان ئەم دوو خانمــە بوو و هەریەکێکیان خەریکی ئــەوەبوو کەلــەدوریی ئەویدیکــەدا هێــز دروســت بکــات و چاودێریی هەنگاوەکانی بکات. لەم نێوانەشدا مەهدعەلیا لەپێشەوەبوو و چــونکە لەگــەڵ مێردەکەیدا رێککەوتن کە پەریخانخانم لەناوبەرن و بۆ ئەم کارەش خەلیلخانی ئەفشــارییان راسپارد کەلەسەردەمی شاتەهماسبی یەکەمەوە سەرپەرشتی و چاودێریی دەکرد بیکــوژێ

و لەبەرانبەریشدا هەرچی سامانی هەبوو هەمووی بـۆ خـۆی بـێ کەنزیکـەی چـل هـەزار تومەن دەبوو، ئەویش بەم سەودایە قایل بوو لەماڵی خۆیدا پەریخانخانمی خنکاند.

ئەم خانمە دەستی کرد بەکوشتنی هەرکەسـێکی کەنزیکیـەکی خزمایـەتی هەیـە لەگـەڵ پەریخان و دوورخستنەوەی هەر رکابەرێکی دیکەی. ئینجا شـەمخال سـوڵتانی شـەرکەس و خالی پەریخانخانمی کوشت و پاشـان ئـەبی فـەوارس شـوجاعی کـوڕی ئیسـماعیلی دووەم کەتەمەنی تەنها یەك ساڵبوو کوشتی، ئینجا کـوڕە گەورەکـەی کـەناوی میرزاهـەمزەبوو بەجێنشینی شا دامەزراند، بڕیاریشدا لەسەر هەموو فەرمانەکانی شـاهانە مـۆری ئـەوی بەسـەرەوەبێ، لەدواییدا هەرچی پلـەی بەرپرسـیارێتی بـەرزی دەوڵـەت هـەبوو هـەمووی بەسەر لایەنگرانی خۆیدا دابەشکرد، ئـەوەبوو سـەرەتا ئـەمیرخانی موسـلووی تورکمـان کەزاوای بوو و دەستی هەبوو لەکوشتنی شائیسـماعیلی دووەم کـردی بـە فـەرمانڕەوای قەزوین و پاشان عەلی کوڕیشی کردە وەسـیی عەباسـی کـوڕی خـۆی لەفەرمانڕەوایـەتی هـەرات و خـۆراوای خـۆرەلاتی خۆراسـان، لـەدوای ئـەویش مورشـید قـوولی سـوڵتان ئەستاجلووی کوڕی شاقوولی خانی کردە حاکمی خەزر و خـەواف و خـۆراوای خۆراسـان و ئازەربێجانیشی لەنێوان ئیسماعیل خـان و شـاقوولی براکـانی ئـەمیرخان و مورادخـانی کوڕی و ئیبراهیم تورکمان دابەشکرد.

لەبەرئـەوەی بارەکـەی ئـاڵۆزیی زیـاتری بـەخۆوەبینی، ئـەویش لەئـەنجامی نالـەباری فەرمانڕەوایەتی شامحەمەد خودابەندە کەبۆخۆی بەوە قایل بوو ببێتە دارەدستی ژنەکـەی و بەردەوام دڵنەوایی هۆزێکی قزلباشی لەسـەر حسـابی بەرژەوەندیەکانی یـەکێکی دیکـە دەرکرد و بەبێ هیچ پێوانەیـەك پـارەو سـامانی دەبەخشـیەوە، فـەرمانی سـوڵتانیی دژ بەیەکی رادەگەیاند، ئەمەش بووە هۆی زیاتر لاوازیی حکومەتی ناوەندیی و بڵاوبوونەوەی ئاژاوە لەوڵات و رووبەرووبوونەوەی تەماعی دراوسێکان.

مەهدعەلیا خوولیای ئاواتی سیاسی تێکەڵ بەکەللەرەقی و رقوکینەو بەغیلیی بوو، بۆیـە ئەو سەرکردە قزلباشانەی قایل نەبوون ئافرەت فەرمانڕەوایەتیان بکـات لێـی بێزابـوون و سکالاکەشیان گەیاندە شا و پێیان راگەیاند کەوا هەڵسوکەوتی هاوسـەرەکەی لـەدوارۆژدا دەبێتە هۆی نانەوەی دووبەرەکی و شەڕی ناوخۆیی و لەدواییشدا دەبێتـە هۆکـاری لاوازی

دەوڵەت و لەناوچوونی، لەبەرانبەردا شا ئامادەیی خۆی نیشاندا کەوا دەستبەرداری دەسەلاّت دەبێ بەمەرجێك ئازاری هاوسەرەکەی نەدەن.

وادیاربوو ئەوانە دڵیان بەوەلاّمەکەی شا خۆش نەبوو، بۆیە مکوڕبوون لەسەر کوشتنی شاژن و، ئەوەبوو لەرۆژ۲٦تەمووز۱۵۷۹ز سەدرەدین خان شێخ ئاوەند و میرزاقوولی موسڵوو لەکاتی نیوەڕۆدا لێی چوونە ژوورەوەو ئەو لەخەودابوو کوشتیان، ئینجا دایکە پیرەکەشیان کوشت و زۆربەی دەورووبەرەکەی کەخەڵکی مازەندەران بوون تالاّنی ماڵەکەیان کرد. کاتێکیش دانیشتوانی قەزوین بەمەیان زانی دەستیان کرد بەکوشتنی مازەندەرانییەکانی ناو شار و تاکو ئێوارە ئاژاوە هەر بەردەوامبوو، دوو بکوژەکەش تەرمی شاژنیان فڕێدایە دەرەوەی شار و، لەدوایدا شا فەرمانیدا کەوا بەدوای تەرمەکەیدا بگەڕێن و بیدۆزنەوە و پاشان لەمەزارگەی ئیمام زادە لەقەزوین بینێژن.

شامحەمەد خودابەندە دڵی بەم کوشتارە زۆر تەنگ بوو بۆیە بڕیاریدا لەماڵەکەی خۆیدا مان بگرێت و نەیەتە دەرەوە، کاتێکیش سەرکردە قزلباشەکان هاتنە لای و سوێندیان بۆ خوارد کەوا دڵسۆزبن بۆ خۆی و هەمزەی کوڕی جێنشین. لەدوای کوشتنی شاژن دەسەلاّتەکانی دەوڵەت درایە سەلمانی وەزیر و ئەو سەرکردە قزلباشانەی کەپیلانی کوشتنیان بۆ داڕشتبوو و، ئینجا ویلایەتکانیان بەسەر خۆیاندا دابەشکرد.

## سەربەخۆیی خۆراسان:

بەهۆی کوژرانی مەهدعەلیا هێندەی دیکە ئاژاوە لەولاّتەکەدا پەرەی سەند و بەمەش خانەوادای فەرمانڕەوا لێکهەڵوەشایەوە. ئەو دەسەلاّتدارانەی خۆراسان کەلەهۆزی شاملوو بوون ئەم هەلەیان قۆزتەوەو هەرێمەکەی خۆیان لەدەسەلاّتی ناوەندی قەزوین دابڕی و عەباسی کوڕی شا محەمەدی خودابەندەیان کەتەمەنی نەگەیشتبووە یانزە ساڵیی لەنیسانی ۱۵۱۸ز کردە فەرمانڕەوای خۆیان، چونکە ئەوکاتە لەنێو ئەواندا دەژیاو بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیشی عەلی قوولیخانیان هەڵبژارد.

لەم کاتانەدا محەمەد خودابەنەدە بەمەبەستی دەسکەوتنی ڕێککەوتنێکی ئاشتی خەریکی وتووێژبوو لەگەڵ عوسمانییەکان، بەلاّم کە هەواڵی ڕووداوەکانی خۆراسانی بیست، بەرەی

خۆراوای بەجێهێشت و لەهاوینەهەواری قەرەباغەوە گەڕایەوە بۆ قەزوین تاکو ئەم بزووتنەوەی یاخیبوونە دامرکێنێتەوەو هێزێکی سەربازی بۆ ئەم کارە ئامادەکرد و سەرکردایەتیەکەی دایە میرزاهەمزەی جێنشینی، ئەویش لەسەر داوای سەلمانی وەزیر کە هەڵسوڕێنەری کاروبارەکانی فەرمانڕەوایەتی و زاوای میرزاهەمزەبوو ئەم فەرمانەی دەرکرد.

بەمەش ئێران لەیەك کاتدا دووچاری دوو مەترسی بووەوە، ئەوانیش مەترسی لەتبوونی ناوخۆیی و مەترسی هەڕەشەکانی دەرەکی و ئینجا لێکجیابوونەوەی شازادەکان کە هەرکەسەو بەپێی بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی خۆی لەنێوان لایەنگرانی بۆچوونی ناردنی سوپا بۆ دامرکانەوەی ئاشووبی خۆراسان و دژەکانی ئەم پێشنیارە و ناردنی هێز بۆ رووبەروو بوونەوەی عوسمانییەکان لە لای خۆراوا رایان دەردەبڕی. لێرەدا سەلمانی وەزیر لایەنگری رای یەکەم بوو و بەسەر خودابەندەشیدا سەپاند. سوپا بەرەو خۆراسان جووڵەی کرد و دەوری قەڵای هەراتی گرت کەعەباس و لایەنگرانی لەوێ خۆیان شاردبۆوە. لەم کاتەشدا هەواڵی پێشڕەویکردنی سوپای عوسمانییەکان لەلای ئازەربێجانەوە بەرەو ئێران گەیشت و ناچاربوون کێشە ناوخۆییەکانی خۆیان وەلانێن و لەگەڵ عەباسدا رێکەوتنێکی ئاشتیانەیان سازکرد تا بتوانن رووبەرووی عوسمانییەکان ببنەوە، بەهۆی ئەو گەمارۆ توونددەوە هەڵوێستەکەی سەلمانی وەزیری زۆر نزمکرد و وازی لەم لاسارییە هێناو ئاشتبوونەوەکەش بەعوزرهێنانەوەی لایەنی خۆراسانی و دانپێدانان بە میرزاهەمزەی جێنشینی شا و بەدەسخشتنی خۆرسان کۆتاییهات.

## کوژرانی میرزاهەمزە:

خەسڵەتکانی میرزاهەمزە بریتیی بوو لەخۆپەرستی و خۆبەزلزانی و خێرا هەڵچوون و زیادەڕۆیی لەمەی خواردنەوەو گەڕان بەدوای بکوژانی دایکی تا تۆڵەیان لێوەرگرێتەوەو بیانکوژێ، بەلام لەگەڵ ئەوانەشدا شازاو بوێربوو و زیاد لەجارێکیش رووبەرووی عوسمانییەکان بووەوەو بەرگری لەتەورێز کردووە. دژەکانیش لەهۆزی تورکمان و تەکەلوو و زیلقەدەر هەوڵیاندا تەهماسبی برای بکەنە پاشای عیراقی عەجەمی و، بەشێکی گەورەی ئێران وەك ئەوەی لەخۆراسان روویدا سەربەخۆکەن.

لەراستیشدا ئەو ناکۆکیانە لەنێوان ئەم دوو لایەنە کاتێك سەریان هەڵدا کەئەوانە ئەوەیان ڕەتکردەوە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی عوسمانییەکان بەشداری لەریزەکانی سوپای سەفەوییدابکەن. ڕووداوەکانیش بەدەسگیرکردنی ئەمیرخانی تورکمانی فەرمانڕەوای ئازەربێجان شێواو، لەلایەکی دیکەش پشبەستنی میرزاهەمزە بەهۆزی ئەستاجلوو و شاملوو زیاتر بارەکەی ئالۆزکرد. لەنێوەندەکانی حوکمڕانیشدا دەنگۆی ئەوە بلاۆبووەوە کەئەم کارە بەرەزامەندی شامحەمەد خودابەندە دروستبووە ئەویش لەئەنجامی هەڵسوکەوتە سەرشێتانەکەی میرزاهەمزەی کوڕیەوەبووە، ئەم قسانەش بوونە هۆی ئەوەی نێوان کوڕ و باوکەکە ساردی تێبکەوێ. میرزاهەمزە هەوڵیدا تەهماسبی برای بەهێز لەنێودەستی دوژمنەکانی ڕزگاربکات، ئەوەبوو لەبیابانی هاوینەهەواری چەکچەکی پێیان گەیشت و شکستی پێهێنان و برایەکەی ئازادکرد.

لەراستیشدا هەڵسوکەوتە نارێك و دژبەیەکەکانی و دژایەتی کردنی سەرکردەکانی قزلباش و گەڕانی بەردەوامی بەدوای بکوژانی دایکی هۆکاری سەرەکی بوون بۆ لەناوچوونی و لە٦کانوونی١٥٨٦ز لەگوندی ئەبی شەحمە لەنزیك گەنجە لەئازەربێجان و لەشیرینی خەودا بەدەست پشتشێلە تایبەتییەکەی کەناوی خوداوێردی ئەرمەنیی بوو بە خوودی ناوبانگی دەرکردبوو کوژرا. ئینجا شا فەرمانیدا لەتەك شێخ سەفی باپیری لەئەردەبیل بینێژن و لەهەمان کاتیشدا مکوڕبوو لەسەر کوشتنی تاوانبارەکە. میرزاهەمزە لەکەنیزەکانی خۆی دوو کوڕی هەبوو یەکەمیان ئیسماعیل لەدایکبووی ٥تەمووز١٥٨٤ز و ئەویدیکەشیان حەیدەر لەدایکبووی ٤ئازار١٥٨٥.

## دەست لەکارکێشانەوەی خودابەندە:

شا لەدوای کوژرانی میرزاهەمزەی کوڕی بڕیاریدا خودی خۆی کاروبارەکانی دەوڵەت بەڕێوەببات، هیچ کام لەسێ کوڕەکانیشی نەکردە جێگری خۆی، هەرچەندە دەشیزانی کە ئەم کارە لەدوارۆژدا دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی دووبەرەکی و شەڕی ناوخۆیی و لەناوچوونی ئەوەی لەقەوارە لاوازەکەیان ماوەتەوە، چونکە قزلباشەکان لەنێوخۆیاندا دابەشببوون و هەریەکەیان لایەنگریی لەیەکێك لەکوڕەکانی دەکرد. هەندێکیان لایەنگری عەباسیان دەکرد لەخۆراسان، هەندێکی دیکەشیان کەلەنێویاندا بکوژانی میرزاهەمزەشیان تێدابوو

پشتگیرییان لەئەباتالیب دەکرد کەلەقەزوین بوو تالەبەر بچووکی تەمەنی بتـوانن خۆیـان حوکومڕانی دەوڵەت بکەن و جەختیشیان لەسەر لادانی شاحەمەد خودابەنـدە دەکـردەوەو داوایان لێی دەکـرد بۆخـۆی دەسـت لـەکار بکێشـێتەوە و هـەر بـۆ خۆشـیان (محەمـەدی مستەوفی مەمالیك)یان هەڵبژارد کەبیکاتە وەزیـر. هەرکـە ئـەم گۆڕانکاریانـە لەوڵاتـدا بڵاوبوونەوە هەردوو هۆزی شاملوو و ئەستاجلووی لایەنگرانی عەباس شۆڕشیان لەقاشـان و ئەسفەهان و فارس ڕاگەیاند و شاحەمەد خودابەندەش ناچار بوو دایرکێنێتەوەو، بۆ ئـەم مەبەستەش خۆی لەگەڵ حاکمی قاشان گونجاند و دەستیشی بەسەر ئەسفەهاندا گرتەوە.

عەباس لەلایەن هەندێك لەسەرکردەکانی هۆزی تورکمان و تەکـەللو بـەهۆی ئـەوەی ئـەو مافی پتری هەیـە بـۆ جێنشـینیی پشـتگیریی لێکـرا، هەمووشـیان بەیەکـەوە لـەڕێگای دامغانەوە بەرەو قەزوین ڕۆیشتن و لە ٣١تشرینی یەکەم١٥٨٨ز بەبێ هیچ بەرهەڵستییەك داگیریانکرد و، یەکسـەر فـەرمانڕەوای ئـەوێ ملکەچیی خـۆی بـۆ ڕاگەیانـدن، پاشـان بانگهێشتی مورشید قوولی خانی وەسـی (وصـی) لەسـەر عـەباس کـرد بـۆ سـازکردنی کۆبوونەویەك لەکۆشکی شاهانە کەشاحەمەد خودابەندە ئامادەی بوو، لەوێدا شا بڕیاریدا لەپێناو بەرژەوەندی عەباسی کـوڕی دەسـت لەکاربکێشـێتەوەو تاجەکـەی سـەری خـۆی هەڵگرت و خستیە سەر کوڕەکەی و بەمەش لەبارێکی زۆر نالەبار و پڕ لەکارەساتی شەڕی ناوخۆیی و یاخیبوون کۆتایی بەفەرمانڕەوایەتی محەمەد خودابەندە هات تـاکو چـەرخێکی نوێ لەبەرەوپێشەوە چوونی سەفەوییەکان لەسەردەمی شاعەباس ناسراو بە (کەبیر) گەورە دەسپێبکات.

## پەیوەندیەکان سەوفەویی – عوسمانیی:

سەرەڕای بوونی پەیماننامەی ئاشتەوایی کەچی لەسـەردەمی شـاحەمەد خودابەنـدە رووی لەکرژیی کردەوە، لەلایەکی دیکەشەوە دەست لەکارکێشانەوەی بـووە هـۆی سـەرهەڵدانی پێشووی و ئاڵۆزی لەسەرانسەری ئێراندا، ئەویش بـەهۆی ئـەو دابەشـبوون و دژایەتییـەی نێـوان قزلباشـەکانەوە سـازبوو. لەئەنجامیشـدا زۆر بـەخێرایی ڕووداوەکـانی لەبـەر ئـەم هۆکارانەی خوارەوە بەرەو شەڕ هەنگاویان نا:

- دارمانی دەسەلاتی ناوەندی دەوڵەت لەبەر لاوازیی محەمـەد خودابەنـدە و ڕێگـەدانی بەچەند شازادەیەك کەلەگەڵ مەهدعەلیا کاروبارەکان بەڕێوەببەن و ئەم هەڵوێستەش بووە هۆی لەتبونێکی زۆر توندی سەرکردەکانی قزلباش، لەکۆتاییشدا لەسەرجەم ناوچەکاندا پشێووی سەریهەڵداو کەس نەما پارێزگاری لێبکات.
- رمانی حوکمڕانێتی لەئێران هانی عوسمانییەکانیـدا کـەوا ویلایەتـەکانی دەوروبـەر داگیربکەن و دەستبەسەر مەڵبەندی دروسکردنی حەریریشدا بگرن، ئەویش لەوکاتەدا هات عوسمانییەکان نەیانتوانی دەسبەسەر ڕێگـای بازرگـانی خـواروو کەبـە ڕێگـای بـەهاردا ناسـرابوو بگـرن و ئـابووری جیهـانیش کاریگـەری خراپـی بەسـەر بەرژەوەندیـەکانی ئابووری عوسمانییەکان پەیداکرد.
- پاڵنەرێکی دیکە ئەوەبوو کەعوسمانییەکان کاتێك لەشەڕی لەیبانتی دەریایی لەساڵی ١٥٧١زدا نەیانتوانیی دەسەلات بەهێزبکەن و بیریـان لـەداگیرکردنی ئێـران کـردەوە تاکو ماڵیاتی زیاتر بۆ دەوڵەتەکەیان دابین بکەن جێی ئەو زیانانەیان بۆ بگرێتەوە کـە لەشەڕەکەدا دووچاریان هاتەوە.

تەنها یەك کاروانی بازرگانی عوسمانییەکان دووچاری پـەلامار بهاتبایـەوە بـەس بـوو بـۆ هەڵگیرسـانی شـەڕ و ئـاگری شـەڕ لـەزنجان، و دەوڵـەتی عوسمـانییش بـەرەو دوو بـەرە هەنگاویان نا:

یەکەم: سنوورەکانی بەرووی ئێراندا داخست و بەدرێژایی ڕێگاکان گەمارۆی خسـتە سـەر ڕێگای کاروانەکان.

دووەم: بڕیار بۆ کوردە سوننیەکان نێردرا کە بۆیان هەیـە هێرشـی سـەربازی بکەنـە سـەر خاکی ئێران.

بەکردەنیش کوردەکانی ویلایەتی وان و ئازەربێجان توانیان بچنە ناو سەڵماس و نورمیە و خووی و لەو شارانەشدا کاری تالاَن و بڕۆیان ئەنجام دەدا و زۆرێکـیش لەدانیشـتوانەکانیان کوشت و پاشان روویـان کـردە سـنوورەکانی لای خـۆراوای ئازەربێجـان و بەچـاوێکی پـڕ لەتەماعیشەوە دەیانڕوانییە ئەوێ.

ئەوکاتە ئەمیرخان موسڵو تورکمانی حاکمی ئازەربێجان و زاوای شاموحەممەد خودابەندە نەگەیشتبووە بارەگای تایبەتی خۆی بۆ ئەوەی رووبەرووی کوردەکان ببێتەوە، بەڵام ئەوکاتەی گەیشتە ئەوێ هیچی لەدەستنەهات.

ئەم پەلامارانەی بوونە هۆکاری هاندانی لایەکی دیکەی کوردەکان و بەمەش هێرشیان کردە سەر مەراغە و دانیشتوانی شەروان داوایان لەسوڵتانی عوسمانیی مورادی سێیەم کرد (١٥٧٤-١٥٩٥ز) کە ئەوکاتە لەجێی باوکی سوڵتان سەلیمی دووەم ببوە سوڵتان لەژێر دەستەیی قزلباشەکان رزگاریان بکات، ئەم داواکاریەش هەلێکی زێرینیی بەخشیە عوسمانییەکان تا لەسەر حسابی سەفەوییەکان دەسەلاّت فراوان بکەن و لە٤ئاپاری١٥٧٨ز بەسەرکردایەتی لالامستەفاپاشا سوپایەکی ناردە سەریان کەبەتۆپ و هەزاران سوارچاك پڕچەك کرابوو و لەلایەکی دیکەشەوە حەوت کەشتی دەریایی پاڵپشتی لێدەکردن و لەدەربەندی تەرابزۆن دەستیان کرد بەهەنگاو هەڵهێنان، شایانی باسە بەر لەم هەڵمەتە سوڵتانی عوسمانیی نامەیەکی بۆ محەممەد کرای دووەمی حاکمی قەرەم و لایەنگری عوسمانییەکان نارد و فەرمانی پێکرد لەبەرەی بیابانی خەزرو دەربەندەوە بەمەبەستی یارمەتیدانی لالامستەفاپاشا بچێتە ناو شەروان.

هەرکە هەواڵی پەلاماری عوسمانییەکان گەیشتە قەزوین شاموحەممەدی خودابەندە نامەیەکی بۆ سوڵتانی عوسمانی ناردو داوا لێکرد هۆی ئەم پابەندنەبوونەی بەرێککەوتنە ئاشتیەکەی نێوانیان بۆ روونبکاتەوە، بەلاّم لەبەر ئەوەی لەسەر سنوری نێوان ئەم دوو دەوڵەتە نێردراوەکەیان گرت، نامەکە نەگەیشتە شوێنی مەبەست.

لە١٠ئابی هەمان ساڵدا سوپای عوسمانیی بەرەو ناوچەکانی سەرسنوور پێشڕەویان کردو لەوێ رووبەرووی هێزی سەفەوییەکان بوونەوە، لەو شەڕەشدا قزلباشەکان کوشتارێکی زۆریان لێکەوت بەشێوەیەك کە سوڵتانی عوسمانیی توانی لەتەرمیی کوژراوەکان دوو تاوەر سازبکات، پاشان بەردەوام بوو لەهێرش و پەلامارەکانی تاگەیشتە کەرەج و دەستی بەسەر شەرواندا گرت و عوسمان پاشا کە والیەکی عوسمانیی بوو کردیە فەرمانڕەوا. ئینجا شەماخی و بادکوبە و رەس و پایتەختی تەفلیسی داگیرکرد و، پاشان گەڕایەوە بۆ ئەرزەرووم تاکو زستانەکە لەوێ بەسەرببات.

ـەفەوییەکان سەرەڕای نقووم بوونیان لەناو کێشەو لێکترازانەکانیان هەوڵیاندا پێشڕەویی ـوپای عوسمانیی رابگرن و بۆ ئەم مەبەستەش چوار تیپی سەربازیان بەسەرکردایەتی میرزاهەمزە نارده سەر شەروان و عوسمان پاشا ناچار بوو شارەکە چۆڵبکات و پەنا بباتە ـەر شاری دەربەند و، پاشان سەفەوییەکان توانیان شەماخی بگێڕنەوە بۆ خۆیان و عادل ـەرای برای محەمەد کەرای دووەمیشیان بەدیل گرت و لەدواییدا کوشتیان.

جارێکی دیکەو لەوەرزی بەهاردا سەفەوییەکان بەسەرکردایەتی محەمەد خودابەندە دەستیان کردەوە بەهێرش و پەلامار و هەوڵیاندا ئەو هەرێمانەی عوسمانییەکان لێیان ـ گیرکردبوون بگێڕنەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و لەتەورێزیش بنکەیەکی بۆ جموجۆڵە ـەربازیەکان دامەزراند، لەبەرانبەریشدا بەهرام پاشای سەرکردەی تورکەکان ـەرپەرشتی سوپایەك کە نزیکەی سی هەزار سەربازی لەخۆگرتبوو بەرەو کەرەج ـەرێکەوت، حەسەن پاشا بەچل هەزار سەربازی دیکەوە بۆ داگیرکردنی ئازەربێجان و ـەروان وەرێکەوت و عوسمان پاشاش لەلای خۆیەوە هێرشی کردە سەر داغستان.

کاتێك خودابەندە گەیشتە تەورێز هەواڵی ئەوەیان پێگەیاند کە سوپایەك لەوڵاتی قەرەمەوە بەرەو شەروان بەرێکەوتووە تاکو تۆڵەی خوێنی عادل کەرای بکاتەوە، بۆیە ـێدا سەلمانی وەزیر و ئەمیرخانی تورکمانی حاکمی ئازەربێجان و چەند سەرکردەیەکی ـیکەی قزلباش بنێرێ تا هەڵکشانی سوپای عوسمانییەکان راگرێ و نەهێڵن شەروان ـ گیربکات، بەڵام محەمەد کەرای بەر لەسوپای سەفەوییەکان گەیشتە شەروان و داگیری کرد و هەرچی کاری تاڵان و دزی و کوشتن هەبوو هەموو تێدا ئەنجامدا، بۆیە بەناچاری وەزیر و هاوڕێکانی گەڕانەوە بۆ تەورێز و، جارێکی دیکە دژایەتییەکانیان سەری هەڵدایەوەو عوسمان پاشاش ئەمەی بەهەلزانی و بەردەوام بوو لەبەرەوپێش چوون، ئەوەبوو ـەرکردایەتی سوپایەکی دووسەد و پەنجا هەزار سەربازیی چووە سەر ئازەربێجان و ـ گیریکرد و پاشان بەرەو شاری تەورێز رۆیشت و لە ٢٥ ئەیلوول ١٥٨٥ز داگیریی کردو ـەری ئەوەی شکستی بە میرزاهەمزە هێناو لەدوای خۆی هێزێکی پارێزگاری بەجێهێشت ـ گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی.

ئینجا بۆ ماوەی شەش ساڵی دیکە شەڕ لەنێوان عوسمانییــەکان و ســەفەوییەکان درێــژەی کێشا و لەو ماوەیەشدا محەمەد خودابەندە دەسەلاتی لـێ وەرگیرایــەوە و عەباســی کــوڕی جێی گرتەوە، لەئەنجامی ئەم شەڕانەشدا سەرجەم باغ و بێستانەکانی تەورێز ســوتێنران و بەمەش نرخی خواردەمەنی و دانەوێڵە بەرزبووەو قات و قڕی باڵی بەســەر وڵاتــدا کێشــاو ژمارەیەکی زۆریش لەهەژارەکان بەهۆی برسێتیەوە مردن.



# بەشی پێنجەم
# شا عەباسی یەکەم
# ١٥٨٨-١٦٢٩ز

## ناوخۆی دەوڵەت

### ئەو ڕۆژگارەی شاعەباسی یەکەم دەسەڵاتی لێ سەنرایەوە:

بەهۆی ئەو نەریتە پەیڕەوکراوەی لەدەوڵەتی سەفەوییەکاندا بوونی هەبوو شائیسماعیلی یەکەم کوڕە گەورەکەی کەشاتەهماسبوو، کاتێـك بۆخـۆی لەژیانـدا بـوو کردیـە حـاکمی خۆراسان و لەدوای ئەویش محەمەد خودابەندەی کوڕەگەورەی شا تەهماسب هاتە شـوێنی، بەلاّم لەکۆتاییەکانی سەردەمی ئەم پادشایە ناکۆکیەکی تووند لەنێوان محەمەد خودابەنـدە و سەرکردەی سوپا کەوتە ئاراوە، بەم بۆنەیەوە شا هەولێدا لەپێناو پاراستنی دەوڵەت ئـەم نەریتە ببەزێنێ و فەرمانێکی دەرکردو بەهۆیەوە میرزاهەمزەی کـوڕی کەتەمـەنی تـەنها هەشت ساڵ بـوو کـردە فـەرمانڕەوای خۆراسـان و پاشـان لایـداو عەباسـی کـوڕی کـردە فەرمانڕەوا کەچی ئەم فەرمانڕەوایە شیرەخۆرە بوو و تەمەنی لەیەك سـاڵ و نیوێـك ڕەتـی نەدەکرد، ئەوەش لەبەر ئەوەبوو میرزاهەمزە زۆر هۆگری دایك و باوکی بوو، لەو کاتەشـدا شاتەهماسـبی یەکەم بڕیاریدا قوولی سوڵتان ببێتە وەصی ئەم فەرمانڕەوا شیرەخۆرەیە.

بەمجۆرە ناوی عەباس کەوتـە سـەر زاران و واش باسـی لێـوەدەکرا کەمنـداڵێکی بچـووك حوکومڕانی خۆراسان دەکات و سەرجەم دەسـەڵاتەکانی ئەم شارە کەوتە دەسـتی. کارەکـە لەدوای مردنی تەهماسب شای یەکەم هەر بەم شێوەیە بـوو تـا ئـەو کاتـەی ئیسـماعیلی دووەمی کوڕی بووە خـاوەنی تـاجی سـەفەویی. لـەژێر سـێبەری ئـەو بـارە ناهـەموار و پشێویەی وڵات شا کۆمەڵێك شازادەی خانەوادەی سەفەوییەکانی کوشت و تەنها محەمـەد خودابەندەی برای و کوڕەکانی نەبێ. کـاتێکیش کوڕێکیـان بـوو لەترسـی ئـەوەی نـەوەو کوڕەکـانی ئـەم بنەماڵەیـە لـەدوارۆژدا ڕکابـەریی نەکـەن دەسـتی کـرد بەکوشـتنی

سەرجەمییان، بۆ ئەم ئەرکەش قوولی خانی شاملووی راسپارد عەباس بکوژێ و لە٧کانوونی١٥٧٧ زدا چووە هەرات و، دەبوایە یەکسەر ئەرکی سەرشانی جێبەجێبکات، بەلاّم وای بەچاکزانی ئەم فەرمانە بۆ دوای جەژنی رەمەزان دوابخات، ئەویش لەبەر رێزی مانگی رەمەزان. بەلاّم پێش ئەوەی کارەکەی ئەنجام بدات نامەیەکی بۆ هات و هەواڵێکی دڵخۆشکەری تێدابوو، ئەویش مردنی شائیسماعیلی دووەم و تاج لەسەرنانی محەمەدە خودابەندە بوو. ئینجا بەیەکجاری لەبەر دوو هۆ ئەرکەکەی بەجێنەگەیاند: یەکەم بۆ رازی کردنی دڵی شا و دووەم لەلایەکی دیکە بۆ سەوداگەرایی کەلەوانەیە بۆ بەهێزکردنی دەسەلاّتی خۆی پێویستی پێی هەبێ. بەم جۆرە عەباس لەمردن رزگاربیبوو و، ئینجا عەلی قوولی خان بوو بەوەصی عەباس و بەناوی ئەوەوە حوکمڕانی هەراتی کرد.

وادیاربوو شا محەمەد خودابەندە پێی باش بوو کورەکەی لەگەڵ خۆیدا بژی بۆیە بانگهێشتی کرد بۆ قەزوین، بەلاّم وەصییەکەی لەترسی سازبوونی پشێوی و ئاڵۆزیی لەویلایەتەکانی خۆرەلاّت بەم بڕیارە قایل نەبوو و نەیگێڕایەوە بۆ لای باوکی، چونکە بوونی شازادەیەکی فەرمانڕەوا لەویلایەتەکەدا متمانەی پێدەبەخشێ و ململانێکانی ناوخۆیی و ئۆزبەکەکانی لێوەدوور دەخات.

لەراستیشدا عەلی قوولی خان بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی خۆی ئەم هەنگاوەی هەلێنا، چونکە چاوی لەوەبوو ویلایەتەکانی خۆرەلاّت دابڕێ و بۆخۆی فەرمانڕەوایەتیان بکات، جا بۆ ئەوەش ئەم مەرامانەی مسۆگەربکات سەرجەم شازادەکانی خۆراسانی لەدەوری خۆی کۆکردەوەو هەموو سەکردەکانی هۆزی شاملوو هاتنە پاڵی، لەلایەکی دیکەش سەرکردەکانی هۆزی ئەستاجلوو بەسەرکردایەتی مورشید قوولی خانی حاکمی خەوان و باخەرز پشتیوانی لێکردو هەموو لایەکیش لەسەر ئەوە کۆکبوون کە رووبەرووی هۆزەکانی قزلباش ببنەوە کە دەستیان بەسەر حوکڕانیی لەقەزوینی پایتەختدا گرتبوو، لەکۆتاییدا عەلی قوولی خانیان بەسەرۆکی خۆیان هەلبژارد و ناویان نا (خانلەر خانی) واتە خانی خانان.

لەبەرانبەر ئەم رەتکردنەوەیەی عەلی قوولی خان و مورشید قوولی خان هێندەی دیکە مەترسیان لەسەر ژیانی کورەکەیان لێنیشت و بڕیاریاندا هەرچۆنێکبێ ئازادی بکەنەوە،

ئەوەبوو نێردراوێکی دیکەیان ڕاسپارد و ناردیانە هەرات تاکو کوڕەکەیان بۆ بهێنێتـەوە و هەڕەشەش لەعەلی قوولی خان و لایەنگرانیشی بکەن، بەڵام ئەو دوو پیاوە فەرمانی شا و شاژنیان بەجێنەگەیاند، ئینجا مەهدعەلیا فەرمانیدا کەوا عەلی قوولی خان لەدەسـەڵات دابماڵدرێ و هەموو دەسەڵاتەکەش بدرێتە مورتەزا عەلی قوولی خان کە حاکمی مەشـهەد بوو و هاوڕابوو لەسەر هێنانەوەی عەباس بۆ لای باوانی، ئەم پیاوەش بەهۆی ئەوەی عەلی قوولی خان چاوی بڕیبووە سەربەخۆیی لەخۆراسان و لایەنگریی هۆزەکانی ئەو قزلباشانەی لەقەزوینی پایتەخت کۆببوونەوە دوژمنی بوو ڕقـی لێـی دەبـۆوە. لـەنێوان هـەردوو لادا جەنگ بەرپابوو، ئەم شەڕەش لەپایتەختدا دەنگی دایەوە، ئینجـا شـا فـەرمانی دەرکـرد کەوا دایك لەگەڵ باوکی عەلی قوولی خان کەناوی سوڵتان حوسێن خان بوو بکـوژن و ئـەم کارەش هێندەی دیکەی بارەکەی ئاڵۆزکرد، لەبەرانبەردا عەلی قوولی خـان بەئاشـکرایی دوژمنایەتی خۆی بۆ خانەوادەی دەسەڵاتدار و شازادە قزلباشەکانی پایتـەخت ڕاگەیانـد و ئینجا هەنگاوێکی بوێرانەی هاویشت ئەویش ئـەوەبوو لەسـاڵی ١٥٨١ز عەباسـی کـردە فەرمانڕەوای سەرانسەری خۆراسـان و نـاوی لێنـرا شـا، و وتارەکـانیش بـەناوی ئـەوەوە پێشکەشکران.

## ئاشکرایە کەهۆکارەکانی هاندەری قوولی خان بـۆ ئەنجامـدانی ئـەم کارە بریتیی بوو لە:

- کوژرانی باوانی.
- لاوازیی خودابەندە، بەتایبەتی لەدوای کوژرانی مەهدعەلیای هاوسەری.
- نغرۆبـوونی میرزاهـەمزەی جێنشـینی شـا محەمـەد خودابەنـدە لـەناو بـەزمورەزم و ڕابواردن و گوێنەدانە کاروبارەکانی دەوڵەت.
- هەر لەسـەرەتاوە عەلی قوولی خان ئامانجی ئـەوەبوو کـەوا دەسـەڵاتی خـۆی بـەهێز بکات و کۆنترۆڵی سەرجەم ناوچەکان و کۆکردنەوەی پیاوماقوولان لەدەووری خۆیـدا، هەروەها ئامانجەکەشی بەڕوونی لەوەدا بەدەرکەوت کەعەباسی لەلای خۆی گلدایەوە.

لەدوای ڕاگەیاندنی تاج لەسەرنانی عەباس بۆ یەکەمین جار لەمێژووی خۆیدا دەوڵەتی سەفەویی لەتبوونی بەخۆوە بینی، ئەم لەتبوونەش کەوتە نێوان شا عەباس لەلای خۆرەلآت و کە پایتەختەکەی هەرات بوو و، شا محەمەد خودابەندەی پادشای خۆراوا پایتەختەکەی قەزوین بوو و هەر بۆخۆشی فەرمانڕەوای شەرعی ولآتبوو، شتێکی سروشتییش بوو لەئەنجامی ئەم لەتبوونە شەڕ هەڵبگیرسێ.

شا بەسەرکرایەتی سوپاکەیەوە بەرەو خۆراسان ڕۆیی تاکو دووبەرەکەیەکە لەناوبەرێت و لەبەرانبەریشدا عەلی قوولی خان و مورشید قوولی خان و لایەنگرانی بەرهەڵستکاران خۆیان ئامادەکرد بۆ بەرەنگاربوونەوە، بەلآم وادیاربوو سوپای خۆراسان لەبەر کەمیی ژمارەی سەربازان و چەك و تفاقیەوە نەیتوانی لەبەرانبەر سوپای شا محەمەد خۆراگری بکات بۆیە مورشید قوولی خان گەڕایەوە بۆ توربە و لەوکاتەشدا عەلی قوولی خان چووە هەرات و لەوێ خۆی قاییمکرد.

سەرەتا سوپای قەزوین بەرەو توربە چوو و گەمارۆیدا، بەلآم نەیتوانی بچێتە ناویەوە و لەکۆتاییدا چەند شازادەیەك لەنێوانیاندا ڕۆڵی پڕ لەچاکەیان گێڕا و لێکیان نزیك کردنەوە، بەم شێوەیەش لەنێوان خۆیاندا ڕێککەوتن:

- مورشید قوولی خان ئەو دانپێدانانەی بەقوولی خانی کردبوو بیکێشێتەوە و ملکەچی خۆشی بۆ شا محەمەد خودابەندە ڕابگەیەنێت و لەبەردەمیشیدا ئەم ڕەزامەندییە ڕابگەیەنێ. کاتێکیش ئەم کارەی ئەنجامدا شا دڵنایی پێداو دەسەلآتەکەی کەلە ناوچەکەی خۆیدا هەیبوو پێیدایەوە.

دوای ئەوە سوپاکە بەرەو هەرات کەوتەڕێ و لەوێش توانی بەرهەڵستکاران لەناو ببات و قەلاکەشی گەمارۆدا. بەلآم بەهۆی هێرشی عوسمانییەکان و پێشڕەوییان لەبەرەی ئازەربێجان و دەسبەسەرداگرتنی چەند بەشێکی خاکەکەی، شا محەمەدی ناچارکرد گەمارۆکەی سەر قەلا هەڵوەشێنێتەوەو بگەڕێتەوە پایتەخت بۆ بەرگریی لەهێرشی عوسمانیی و، ئەو کاتەش ئاشتبوونەوە لەنێوان هەردوولادا لەئاسۆی سیاسیدا بەدیدەکرا. لەکۆتاییشدا ئاشتەواییەکەش ئەم خالآنەی لەخۆگرتبوو:

- شا محەمەد خودابەندە عەباسی کوڕی لە فەرمانڕەوایەتی تەواوی خۆرسان بهێڵێتەوە.
- عەلی قوولی خان هەر بەوەصی عەباس بمێنێتەوە.
- عەلی قوولی خان ناوی شا بگەڕێنێتـــەوە نـاو وتارەکـان و دراویـش بـەناوی ئـەوەوە چاپبکرێ.
- عەلی قوولی خان و میرزاعەباس دان بەجێنشینیی میرزاهەمزەدا بنێن.

شا فەرمانیدا کەوا مورتەزاقوولی خان لەدەسەلاَت دابماڵدرێ و بەهۆیەوە جـارێکی دیکـە پشێوی خۆراسانی گرتەوە.

هەرکە شا محەمەد خودابەندە گەڕایـەوە قـەزوین مورشـید قـوولی خـان یەکسـەر پشـتی لەبەندەفەرمانی و گوێڕایەڵی شا کـردو، چـاوی بڕیـە ئـەوەی عـەباس لەگـەڵ خۆیـدا لـە هەراتەوە بباتە مەشهەدو لەوێ ببێتە وەصی و پاشان لـەو میانەشـدا دەسـەلاَتی تـەواوی هەبێ بەسەر هەموو خۆراسـانداو، ئینجـا بـەرەو مەشـهەد وەرێکـەوت و سـەلمان خـانی فەرمانڕەوانکەی دەرکرد و دەستیشی گـرت بەسـەر چـەند ناوچـەیەکی نزیـك لەسـنووری دەسەلاَتی بنچینەیی خۆی لەخـەواف و باخـەرز و پلـەکانی دەسەلاَتیشـی بەسـەر خـزم و کەسەکانی خۆی لەشازادەکانی هۆزی ئەستاجلوو دابەشکرد. کاتێکیش هەستی بـەوەکرد کەناوچەی ژێردەسەلاَتی خەریکە فراوان دەبێ پیلانی داڕشـت بـۆ ئـەوەی عـەباس مـیرزا لەهەراتەوە بباتە مەشهەدو، بۆ ئەم مەبەستەش هەمیشە بانگهێشتی عەلی قوولی خان و عەباسی دەکرد کەوا بۆ سەردانیی بچنە مەشهەدو، عـەلی هەوڵیـدا مورشـید بکـوژێ و لەدواییدا ململانێ لەنێوانیاندا دروستبوو تا گەیشتە هەڵگیرسانی شەڕ. ئەوەبوو لـەنزیك شارۆچکەی سووسەفید لەنێوان هـەرات و مەشـهەد پێکیـان داداو مورشـید خـان تـوانی عەباس دەسگیربکات و بینێرێتە مەشهەد تا بۆ خۆی ببێتە وەسیی ئەو. ئینجـا جـارێکی دیکە بووەوە پاشای خۆراسـان و بـەناوی ئـەوەوە وتـار خوێندرانـەوە و دراوی دەوڵـەتیش بەناوی ئەو چـاپکراو نـاوی لەخۆشـی نـا بریکـاری سـوڵتانیی و بەمـەش بـووە خـاوەنی گەورەترین دەسەلاَت لەنێو شازادەکاندا. ئەو کارتە براوەیـەی کـەوا عـەلی قـوولی خـان

لەبەرانبەر حکومەتی ناوەندی بەکاری دەهێنا لەدەستی چوو و ئەو هیوایانە هەمووی گوازرایەوە بۆ مورشید قوولی خان.

بارودۆخی سیاسی لەپایتەختدا زۆر ئاڵۆزبوو و کۆمەڵێك کاری تیرۆریی لێکەوتەوە. مەهدعەلیای هاوسەری شامحەمەد خودابەندە کوژرا، هەروەها جێنشینی شا کە میرزاهەمزەبوو ئەویش کوژراو دەمەتەقێ و گفتوگۆی زۆریش بۆ دۆزینەوەی جێنشینێکی دیکە لەوڵاتدا سازبوو. کەچی شا نیازی وابوو بۆخۆی فەرمانڕەوایەتی وڵات بکات و هیچ کام لەکوڕەکانی کەعەباس و ئەبوتالب و تەهماسب بوون نەکاتە جێگریی خۆی، ئەویش بەهۆی پەرتبوونی لایەنگریی قزڵباشەکان، بەڵام ئەوان بەم بڕیارەی شا قایل نەبوون و فشاری زۆریان خستە سەر خودابەندە تا یەکێك لەکوڕەکانی بکاتە خەلیفەو جێگریی خۆی چونکە ئەو چاوەکانی لەدەستداون و ناتوانێ ئەرکە قورسەکانی سەرشانی لەبەڕێوەبردنی وڵات ئەنجام بدات. ئەو قزلباشانەش بوون بەسێ بەش:

- بەشی یەکەم لایەنگریی عەباسیان دەکرد لەخۆراسانبوو.
- بەشی دووەم لایەنگریی ئەبا تالبیان دەکرد لە قەزوین نیشتەجێبوو.
- بەشی سێیەم رایەکی دووسەرەیان هەبوو لەنێوان دووبراکەدا، چونکە رایان وابوو کەوڵات بکرێتە دووبەش و هەر یەکە لەکوڕەکانیش ببنە خەلیفەی شا لەپارچەکاندا.

ئاشکرابوو کەهەر لایەنێك لەوانە هەوڵی سەپاندنی دەسەڵات و هێزی خۆی دەدا بەسەر کاروبارە گشتییەکانی دەوڵەت.

لایەنی دووەم فشاری خستە سەر شا و ئەبا تالیبی کوڕی کردە جێنشینی خۆی و مافی عەباس کوڕە گەورەکەی پێشێلکرد. ئەم بڕیارەش بوو بەهۆی ئەوەی پشێوی زیاتر پەیدابێ و مورشید قوولی خان کە عەباسیشی لەگەڵدابوو بەڕێی دامغان و سەمنانەوە بەرەو قەزوینی پایتەخت بەڕێکەوت و بەدرێژایی ڕێگاکەی هەرچی خەڵکی شارەکان هەبوو هەموو لایەنگریی خۆیان بۆ نیشاندا و لەناویشیاندا مورتەزا قوولی خان هاتە پاڵی و بەمەش هەڵوێستی هێندەی دیکە بەهێز بوو و بەبێ هیچ بەرهەڵستکاریەك چووە ناو شارەکەوە، ئینجا رایگەیاند کە عەباس بکرێتە پاشای دەوڵەتی سەفەوییەکان و بۆخۆشیی

بووە جێگری سەڵتەنەو وەسیی شا عەباس، ئەوکاتەش شا محەمەد خودابەندە بڕیاریدا بەر لە کاروانی کوڕەکەی بگاتە پایتەخت و کەچی مورشید قوولی خان پێشی ئەو گەیشتە شوێنی مەبەست، ئەویش بڕیاریدا بۆ رووبەرووبوونەوەی هەڵمەت ببات، بەڵام سەربازەکانی پشتیان تێکرد. بۆ دەربازبوونیش محەمەد خودابەندە ناچار بوو دان بەم رووداوە راستییە سیاسییەدا بنێ، بۆیە دەستبەرداریی خۆی لەتەختی پاشایەتی بۆ عەباسی کوڕی راگەیاند و پاشان لەناو ئاپۆرای پێشوازی گەرمی کوڕەکەی هاتنە ناو شارەوە. ئەرکانەکانی دەوڵەت لەچهل ستوون کۆبوونەوە، واتە لەو شوێنەی کە شا دەست لەکارکێشانەوەی خۆی راگەیاند، لەوێدا تاجی لەسەر سەری خۆی هەڵگرت و خستیە سەر عەباسی کوڕی و ئەویش لەسەر تەختەکەی دانیشت و، هەرچی بەڵگەنامەو ئەرشیف و داب و نەریتەکانی تایبەت بەخانەوادەی سەفەویی هەبوو هەمووی دایە عەباس، کەبەگوێرەی ئەوانە هەموو یاساکانی میراتگریی و یاسای گواستنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتی سەفەویی روونکراوەتەوە.

بەمجۆرە شاعەباس لە٦تشرین١٥٨٨ز بەشێوازێکی شەرعی بوو بەفەرمانڕەوای دەوڵەتی سەفەویی و، ئەوکاتەش تەمەنی تەنها هەژدە ساڵ و دوو مانگ و نیو بوو.

## ئەو دژایەتییانەی رووبەرووی شاعەباس یەکەم بوونەوە:

## لەناوبردنی مورشید قوولی خان:

شاعەباسی یەکەم لەدوای ئەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتی کەوتە دەست، بیری لەوە کردەوە بگەڕێتەوە بۆ زێدی خۆی و سەرهەڵدانی شائیسماعیلی یەکەمی باپیری، ئەمەش تەنها لەرێگای دەسبەسەرداگرتنی سەرجەم کاروبارەکانی دەوڵەت و تاکڕەوی لەحوکمدا نەبێ بۆی جێبەجێ نابێ، وادیار بوو دەرکی بەوەش کردبوو کە شاقوولی خان تا چ ئاستێك مەترسی بۆ سەر دەسەڵاتی ئەو هەیە، ئەویش بەهۆی ئەوەی هەمیشە رێگر بوو لەبەردەمی لەبەرێوەبردنی کاروبارەکانی دەوڵەت، لەلایەکی دیکەش بەبێ پرسی ئەو زۆرێك لەکاروبارەکانی دەوڵەتی رادەپەڕاند، لەبەرئەوەی تەمەنی هەژدە ساڵبوو تواناو دەسەلاتی کەمتر بوو و سنووری فەرمانەکانیشی تەسك دەکردەوە، چونکە وەسییەکەی

هەمیشە خاوەنی دەسـەلآت و هێـزی تایبـەتی زیـاتری هـەبوو و هـەوڵی دەدا لـەرێگای دەسبەسەرداگرتنی کاروبارە گرنگەکانەوە پارێزگارییان لێبکات.

شاقوولی دەستی کرد بەدابەشکردنی پلەکانی دەوڵەت بەسەر لایەنگرانی تایبەت بەخۆی، بەلآم شا هەرگیز نیازی ئەوەی نەبوو کە بەم زووانە لەناوی ببات، ئەویش لەبەر دوو هۆ:

یەکەم: خاوەنی شارەزاییەکی باش نەبوو لەبەڕێوەبردنی دەوڵەت و دەبوایە بەکردەنی فێری هەڵسورانی کاروبارەکانی دەوڵەتی بکردبایە ئینجا بیری لەوە بکردبـاوە تاکڕەوانـە حـوکم بکات.

دووەم: دەیویسـت بەسـایەی ئـەوەو کۆمـەڵێك لـەو سـەرکردە قزلباشـانە لـەناوببات کەلایەنگری خۆی بوون، بۆیە کاتێك ئەوانە هەڵوێستیان لەدژی وەرگرت لایـەنگری کـردو دواجاریش خۆی کرد بەحاکمی ناوچەی ئەسفەهان و موڵك و سامانی دەوڵەتیشـی خسـتە پاڵ موڵکەکانی خـۆی، کـەکاتی خـۆی ئـەم موڵکانـە درابوونـە میرزاهـەمزەو لـەدوای مردنیشی درانە ئەباتالێب، لەپاشان دەسـتی کـرد بەکوشـتنی سـەرکردەکانی قزلبـاش و سەری دەپەڕاندن و لەسەر کۆشکی شاهانە بەپێ هەڵیدەواسیین.

بەهۆی ئەو کارە نالەبارانەی شاقوولی خان ئەنجامی دەدان و لەبەر ئەو کـارە تاکڕەویانـەی لەکاروباری دەوڵەت دەیکردن، شا هێندەی دیکەی ئارەزووی ئەوەی لەلا دروستبوو لەناوی ببات، ئەوەی شاعەباسیان لێی بێزارکردبوو:

- مورشید قوولی خان ویستی بەهۆی ژن خوازیی لەخانەوادەی سـەفەوییەوە جـێ پێـی خۆی قاییم بکات و پارێزگاری لە سامان و دەسەلآتی بکات، بۆیـە داوای لەشـا کـرد کەوا رەزامەنـدی نیشـانبدات لەسـەر مـارەکردنی یـەکێك لەکچـەکانی خانـەوادەی سـەفەویی و ئـەویش ئەمـەی رەتکـردەوەو بـوو بـەهۆی یەکـەم هـەنگاوی رووبەرووبوونەوەیان.
- پێیان راگەیاند کەوا شاعەباس زوو یا درەنگ هەر لەناوی دەبات، بۆیـە لایـەنگرانی ئامۆژگاری ئەوەیان کرد لەم کارەدا دەسپێشخەری بکات، بۆ ئەم مەبەستەش محەمەد خودابەندەو کوڕەکانی کەبەبیانووی ئەوەی ناوچـەکە لەگەیلانـەوە نزیکـە و لەوێشـدا

بەردەنگاربوونەوە هەیە لەقەلاّی ئەلموت بەندی کردبوون هێنایە دەرو، بۆ ئەوەی لەکاتی سەرقاڵی شا بەجەنگی ئۆزبەکەکان هەلی بۆ بڕەخسێ زیندنییەکان ئازاد بکات و تاجی شاهانەی سەفەوییش بکاتە سەر یەکێکیانەوە، بەلاّم شا دەرکی بەمەرامەکانی وەسیی و ئامانجەکانی کرد، دەشیزانی کەتوانای ئەوەی هەیە لایبدات و یەکێکی دیکە لەخانەوادەی سەفەوییەکان لەجێگای ئەوەدا بکاتە فەرمانڕەوا، بۆیە جەختی لەلەناوبردنی کردوە.

- مورشید قوولی خان سەرەڕای پەلەپەلی شاعەباس کەچی هەر سستی و خاوەخاوی دەکرد لەناردنی هێزی یارمەتیدەر بۆ هەرات کە ئەو کاتە لەلایەن ئۆزبەکەکانەوە گەمارۆدرابوو، چونکە هیوای وابوو کەخۆی لەو رکابەرەی رزگاربکات و، بەتایبەتیش کەشا عەباس رێزێکی تایبەتی بۆ هەبوو بەمامۆستا و وەك پەروەردەکاری خۆی حسابی بۆ دەکرد. ئەوەشی لەبیرنەکردبوو کەئەوکاتەی ئەو وەسیی بوو چ هەڵسوکەوتێکی چاك و میهرەبانانەی لەگەڵ دەکرد. مورشید قوولی خان بەردەوام خاوەخاوی دەکرد لەناردنی هێزی یارمەتیدەر بۆ هەرات، تا کار گەیشتە ئەوەی ئۆزبەکەکان شارەکەیان داگیرکردو لەوێشدا عەلی خان قوولی و ژمارەیەك سەربازی قزلباشیشیان کوشت، لەوێدا شا هێندەی دیکە مکوڕ بوو لەو رایەی کە بەر لەوەی مەترسی زیاتری بۆ سازبکات بۆخۆی لەناوی ببات.

لە١٥٨٩ز شاعەباسی یەکەم هەلی لەناوبردنی مورشیدی بۆ رەخسا لەوکاتەی کەوا سوپای سەفەویی بەرەو خۆراسان و بەمەبەستی بەرلێگرتنی هێرشی ئۆزبەکەکان و دەرکردنیان دەچوو، کاتێکیش گەیشتنە شاهرود، لەگەڵ چوار لەسەرکردە دڵسۆزەکانی خۆی پیلانیان دارِشت بۆ کوشتنی و خەوکوژییان کرد.

شا عەباسی یەکەم وەسییەکەی خۆی لەناو برد و بووە خاوەنی سەرجەم دەسەلاّتەکانی ولاّت و هەرکەسێك سەرپێچی فەرمانەکانی بکردبایە دەیکوشت، تەنانەت ئەندامانی خانەوادەکەشی لەو دڵڕەقییەی نەبواردو پیاوانی دەوڵەتیش مەترسییان لێ نیشتبوو، بۆیە بەناچاریی بەندەفەرمانییان دەکرد و هەموو بڕیارێکیشیان بەبێ گفتوگۆ کردن بەجێدەگەیاند.

بەهۆی ئەم دەسەڵاتە تاکڕەوی و فراوانەیەوە مێژوونووسەکان گەیشتنە ئەو رایـەی کـەوا هاوولاتیەکانی دەبوایە پیرۆزیی بکەن و لەترسی زۆرداریيەکـەی و بـۆ خـۆ دوورخسـتنەوە لەخراپەکارییەکانی وەك بتێکی پەرستراو مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد، بەتایبەتیش کاتێـك ناوی لەخۆی نا (سێبەری یەزدان).

## لەناوبردنی ئەندامانی خانەوادەکەی:

شاعەباسـی یەکـەم لەگـەڵ ئەنـدامانی خانـەوادەی سـەفەویی زۆر دڵـڕەق و توونـد بـوو بەتایبەتیش کوڕەکانی خۆی، ئەم بێبەزەییەش پاشماوەی سـەدەی شـانزەیەمی سـەردەمی مەغۆلەکان و عوسمانییەکان بوو لەهیندستان و ئاسیای بچووك، بەهانەی بۆ ئەم توندی و زۆرداریەی ئەوەبوو لەوە دەترسا نەوەکا کەسێکی دیکە لەخانەوادەی سەفەویی دروسـببێ و وەك ئەوەی ئەو لەمنداڵیەوە لەبەرانبەر باوکی کردی بەسەری بهێنێتەوە و خۆی بەسەردا بسەپێنێ و تەختی فەرمانڕەوایەتی لێ بسەنێتەوە، ئەم سیاسەتەشی بەشێوەیەك توونـدو تۆقێنەر بوو تەنانەت وای لێکردبوو کەهەرگیز بیر لەدوارۆژی خانەوادەکـەیان نەکاتـەوە و بیر لـەوە نەکاتـەوە کـە ئەگـەر لـەدوارۆژدا کەسـێکی شـیاو نـەبێ لەخانەوادەکـەی بـۆ فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی سەفەویی ئەوا چ کارەساتێك دێتـە پـێش و چـۆن ئـەم دەوڵەتـە ئایندەکەی روو لەنەمان دەکات، ئەم سیاسـەتەش لاوازی کـردو لەکۆتاییشـدا بەتـەواوی هەرەسی هێناو لەناوچوو.

کاتێك شا عەباسـی یەکـەم بـووە خـاوەنی دەسـەڵات لەدەوڵـەتی سـەفەویدا لەسـەرجەم ئەندامانی خانەوادەی سەفەویی تەنها پێـنج کـەس مابوونـەوە ئـەوانیش: شـامەحەمەد خودابەنـدەی بـاوکی و ئـەبوتالیب و تەهماسـب و دوو کوڕەکـەی میرزاهـەمزەی بـرای (ئیسـماعیل و حەیدەر) بوو. هەموو لەقەڵای ئەلـەموت زینـدانی کـردن و خسـتنیە ژێـر چاودێرییەکی زۆر توندیشەوە، کاتێکیش مورشید قوولی هەرەشەی ئازادکردنی ئەوانـەی لێکرد یەکسەر هەمووی بردنە قەڵای وەرامین و هێنـدەی دیکـە چـاودێریەکەی سـەریانی توندکرد. کاتێکش گەڕایەوە قەزوینی پایتەخت و لەدوای ئـەوەی ئۆزبەکـەکانی وەدەرنـا لەهەرات فەرمانیدا باوکی بهێننە لای لەلای خۆی دەسبەسەری کرد و نەیهێشـت بـەهیچ

شێوەیەك تێکەڵاوی قزلباشەکان ببێ، بۆ هەر جێگایەکیش بچووبایە لەگەڵ خۆی دەیبرد. ئەم بارە تا مردنی محەمەد خودابەندە لەساڵی ١٥٦٩ز درێژەی کێشا.

ئینجا فەرمانیدا چاوی چوار شازادەکەی دیکە بکوێلن تاکو هەرگیز کەسێکیان نەتوانێ لەفەرمانڕەوایەتی نزیك ببێتەوە، دیسانەوە گەڕاندنیەوە بۆ قەڵای ئەلەموت و تا کۆچی دواییان کرد هەر لەوێ مانەوە، بەڵام لەساڵی ١٥٩٠ز حەیدەری وەك بارمتە ناردە دەوڵەتی عوسمانییەکان و لەوێ مایەوە تا دووچاری نەخۆشی کۆلێرا هات و هەر لەوێش لەساڵی ١٥٩٧ز کۆچی دوایی کرد.

شا عەباسی یەکەم لەسەر ئەم سیاسەتە توندو تیژیەی بەردەوام بوو تا گەیاندییە پێنج کوڕەکەی: محەمەدباقر ناسراو بەسەفی، حوسێن، خودابەندە، ئیسماعیل و مەقلی. هەر لەمنداڵییەوە حوسێن و ئیسماعیل کۆچی دواییان کرد. ئینجا لە٢شوبات١٦١٥ز لەترسی ئەوەی نەوەك محەمەدباقری کوڕی لاسایی خۆی بکاتەوە لەهەڵسوکەوتەکەی بەرامبەر باوکی کردی، بەتایبەتیش ببووە خاوەن دەنگ لەولاتەکەدا چونکە کوڕی گەورەو جێنشینی شا بوو کوشتی و لەناوی برد.

لەلایەکی دیکەش خودابەندەی کوڕی ناوبانگێکی باش و خوازراوی لەناو خەڵکدا پەیداکردو لەنێو ئەندامانی لایەنگر و دەروروبەرەکەیان و ئەو قزلباشانەی کەبەچاوی حاکمی دوارۆژی دەوڵەت لەدوای باوکی تەماشایان دەکرد بووە خاوەن پلەو پایەیەکی زۆر بەرز، بۆیە ئەمە نیگەرانی کردو سەرەتا مامۆستا و پەروەدەکارەکەی کوشت و چاوەکانی کوڕەکەشی دەرهێناو ئەویش ژەهریخوارد و خۆی کوشت.

چارەنووسی مەقلی کوڕی پێنجەم لەهی براکانی باشتر نەبوو، ئەوبوو شا لەساڵی ١٦٢٧ز فەرمانیدا کەچاوەکانی ئەویش بکوێلن تا نەتوانێ دەست بەتەختی پاشایەتیەوە بگرێ.

بەهۆی ئەو رەفتارانەیەوە شا عەباسی یەکەم لەکۆتاییەکانی ژیانی خۆیدا کێشەی هەڵبژاردن و دەستنیشانکردنی جێنشینی بۆ پەیدابوو، لەدواییدا تەنها میرزاسامی کوڕی محەمەد باقر نەبێ کەسیدیکە نەمابۆوە لەئەندامانی خانەوادەکەی، ئەویش دایکی

لەکوشتن رزگاری کردبوو و لەئەنجوومەنی شا و پیاوانی شانشـینیی دووریخسـتبۆوەو هـەر ئەویش لەدوای مردنی جێگای گرتەوە.

## نەهێشتنی بالاْدەستی سیاسی قزلباشەکان:

سەردەمی شا عەباسی یەکەم سەرەتای کۆتایی هۆزەکانی قزلباش و لاچوونی کارگـەریی سیاسـی و کۆمەلاْیـەتیانی بـەخۆوە بـینی، ئاشـکرایە کەئەوانـە هـەر لەسـەردەمی شائیسماعیلی دووەمەوە بەهۆی ئەو پشێویەی ئـەو کاتـە دروسـتببوو دەسـتیان بەسـەر سوپاو بواری کارگێڕیی دەوڵەتی سەفەوییدا گرتبوو و، دەسـەلاْتی خۆشـیان لەسـەردەمی شامحەمەد خودابەندەدەی کوێردا بەهێز دەکرد و، لەم پێناوەشدا رێگای زۆریـان گرتـە بـەر تەنانەت دایکی شاعەباس و مەهدعەلیا و میزراهەمزەی براشیان کوشت، ئـەم کردەوانـە برینی زۆر گەورەیان لەدڵی شا دروسـکرد، بۆیـە مکوڕبـوو لەسـەر ئـەوە لـەناویانببات، ئەوکاتـەش ژمـارەی هۆزەکـانی قزلبـاش لەسـی و دوو هـۆز تێپـەڕیبوو و ژمـارەی ئەندامانیشی گەیشتبووە شەست هەزار کەس و هەموو ئەوانەش مووچـەیان لەگەنجینـەی دەوڵەت وەردەگرت و بەمەش بارێکی زۆر قورسیان خسـتبووە سـەر دارایـی دەوڵـەت و، لەهەموو لایەکی دەوڵەتدا بلاْوببوونەوەو خاوەنی زۆرێـك لـەزەوی و زار بـوون، هـەروەها راستەوخۆ و بەبێ حکومەتی ناوەنـدی فەرمانڕەوایـەتی هەرێمـەکانیان دەکـرد و خۆیـان لەگەلی ئێران بەزیاتر دەزانی و، لەهەمان کاتیشدا دەووری شا عەباسـی یەکەمیان گرتبوو و کاتێکیش بەئاگاهات بینی هیچ دەسەلاْتێك و سەربەستییەکی نەماوە. بەمەش ئـەوەی بۆ روونبووەوە کەناتوانێ بەتەنها و تاکڕەوانە حوکمەکە بەڕێوەببات، لەبەر ئەم هۆیانـەبوو لەدوای ئەوەی تاجی لەسەرنا سەرکردەکانیانی قۆڵبەستکرد، بەتایبەتی ئەوانەی دەستیان هەبوو لەکوشتنی میرزاهەمزەی برای، لەوانەش عەلی قوولی خان و ئیسماعیلی قـوولی خان و چەندانی دیکەش و پاشان هەمووی کوشـتن. وادیـاربوو ئـەم بڕیـارەی بەهاوبەشـی لەگەلْ وەسـییەکەی مورشـید قـوولی خـان بەجێگەیانـد، جگـە لـەمانیش هـەموو ئـەو کەسانەی کەلەکوشتنی دایکی بەشداربوون هـەمووی کوشـتن، لەوانـەش: قورخەمـسـخان کەیەکێك بوو لەپیلانگێرانی تیرۆرکردنی دایکی و شا بۆ تۆڵە سەندنەوەی خـوێنی دایکـی بەدەسـتی خۆی کوشتی.

شا شۆڕشی هەندێك لەسەرکردەکانی قزلباشی بەهەلزانی کەلەژی مورشیدقولی خان هەڵیانگیرساندبوو کاتێك ئەسفەهانی خستبووە پاڵ موڵکەکانی خۆی، فێسە قزلباشیەکەیانی لەسەر داکەندن و پاشان هەمووی کوشتن و دەستیشی بەسەر هەموو موڵك و ماڵیشیانداگرت و لەسەر لایەنگرو شوێنکەوتووانی خۆی دابەشی کردن و زۆریشی نەبرد مورشید و لایەنگرانیشی کوشت.

شا بەئەنقەست لەپاڵ کوشتنی هەندێك لەسەرکردەکانی قزلباش وای کرد بۆخۆیان لەنێو خۆیاندا دەسەلات لەیەکتر بستێنن و هیچ پلەیەکی سەربازی و تیداری نەهێڵن و بەمەش توانا و هێزیان کەمبێتەوە، ئاشکرایە کەوا سوپای سەفەویی بەر لەفەرمانڕەوایەتی شا عەباسی یەکەم بەتەواوی پشتی بەهۆزەکانی قزلباش بەستبوو، بەلام دوو سوپای تازەی پێکەوەنا کەیەکێکیان لەئەرمەن و شەرکەس و کەرەجییەکانی سەر بەدەوڵەتی سەفەویی بوو دامەزراند، ئەویدکەش لەو هاوولاتیانە پێکهێنا کە راستەوخۆ سەربەخۆی بوون و هیچ کام لەهۆزەکانی لایەنگری خۆیشی بەشداری پێنەکرد و ناوی لەو سوپایەش نا (شاهسون) واتە ئەوانەی شایان خۆشدەوێ و، راستەوخۆش هەموو فەرمانێکیان لەخودی خۆی وەردەگرت. بەمشێوەیە شا دەسەلاتی قزلباشەکانی لەناو سوپا نەهێشت.

لەدواییدا شا هەموو دەسەلات و پلە گرنگەکانی کارگێڕیی لەسەرکردەکانی قزلباش سەندەوە بەتایبەتیش فەرمانداری ویلایەتەکان و هەمووی بەخشیە ئەو کەسانەی کە جێی متمانەی خۆی بوون، کەچی لەگەڵ ئەوانەشدا هەرکە گومانی لەدڵسۆزیی کەسێکیان بکردبایە ئەکسەر دەیکوشت.

شاعەباسی یەکەم چنگی خۆی لەو ویلایەتانە گیرکرد کەوا بەشێوەی لامەرکەزی خۆیان بەڕێوەدەبرد، ئەم سیستەمەش بەر لەدامەزراندنی دەوڵەتی سەفەویی بوونی هەر هەبوو. زانراویشە کە حاکمەکانی ئەم هەرێمانە خاوەنی سەربەخۆیی خۆیان بوون و جگە لەناردنی هەندێك پارەو دیاری بۆ شا هیچ شتێکیدیکە ئەوانی بەیەکەوە نەدەبەستەوە. شا لەدەسەلاتیدا هەبوو کە هەرکەسێکی بیەوێ پلەی دەداتێ و لەهەمان کاتیشدا دەتوانێ جەڵك لابداو پلەو پایەیان لێبستێنێتەوە، هیچ کەسێکیش بۆی نەبوو فەرمانەکانی ئەو پێشێل بکات. بەمجۆرە شا فەرمانڕەوای شارەکانی بە خۆی بەستەوە و مانەوەشیان

لەپلەوپایەکانیاندا بەرەزامەندی شا گرێدرابوو، کەچی لەسەردەمی قزلباشەکان ئەم کـارە هەمووی قۆرخکرابوو.

بەهۆی ئەم سیاسەتە توندڕۆییە شا توانی زاڵبوونی قزلباشەکان بەسەر بواری سـەربازی و دەستێوەردانیان لەکاروباری ناوخۆی دەوڵەتدا نەهێڵێت کەئەمانە هەرگیز لەتایبەتمەنـدیی ئـەوان نـەبوو، بەخوایشـت یـا بـەزۆری تـوانی ئەوانـە لـەدەووری خـۆی کۆبکاتـەوەو لەهەمانکاتیشدا یەکێتی سیاسی و ئیداری بۆ دەوڵەتەکەی گەڕاندەوە و بە گوێرەی داب و نەریتی سەردەمیش تاکڕەوانە فەرمانڕەوایی دەوڵەتی کرد.

## گەشەکردنی بواری سەربازیی:

بـەر لەئێسـتا باسـی ئـەوەمان کـرد سـوپای سـەفەوییەکان بەپلـەی یەکـەم پشـتی بـە قزلباشـەکان بەسـتبوو کـە ئـەوانیش هـەموو فەرمانـەکانیان لەسـەرکردەکانی خۆیـان وەردەگرت و شای سەفەویی بـۆی نـەبوو راستەوخۆ فـەرمانیان بەسـەردا بـدات، بـەڵکو دەبوایە شا فەرمانەکە بەسەرەك هۆزەکان رابگەیەنێت و ئەوانیش فەرمانیان پێبکەن، جـا لەبەر ئەوەی ئەم سەرەك هۆزانە ئەگەر کارێکیان بەدڵ نەبووایە و لەگەڵ بەرژەوەندی ئەوان یەکی نەگرتباوە ئەوا فەرمانەکەیان دەشاردەوە و بەمەش شـا دەسـەڵاتی بەسـەر لایـەنی سـەربازی ولاتەکـەی لاوازببـوو. لەهـەمان کاتیشـدا دەیـانتوانی دژایـەتی شـای سەفەوییەکانیشیان پێبکەن و، ئەو هەڵوێستەی عەلی قوولی خان و مورشید قوولی خـان لەخۆراسان نواندیان زیندووتریان بەڵگەی ئەم قسەیە بـوو، کاتێـك شـا عەباسـی یەکـەم خودی خۆی لەوێبوو سەرکردەکانی قزلباشیی بەرپەرچی فەرمانەکانیان دایەوە.

کاتێکیش شا عەباسی یەکەم دەسەلاتی گرتـە دەسـت، هەسـتی بـەوەکرد کـە سـەرکردە قزلباشەکان تا چ ئەندازەیەك مەترسیان لەسەر رژێم هەیە، بۆیە هەنگاوێکی سەرەتایی بۆ لاوازکردنییان هەڵێنا ئەویش بریتی بوو لەکەمکردنەوەی ژمارەی سەربازەکانیان بۆ نیوەی ژمارەی جارانیان و بووە سی هەزار.

لەلایەکی دیکەوە شا دەووری کۆمەڵەیەکی دیکەیدا کەهەمیشە لەدەوڵەتدا خاوەن هێـز و دەسەلاتبوون، ئەوانیش ئەو سۆفییانەبوون کـە هـەر لەسـەرەتای دروسـتبوونی دەوڵـەتی

سەفەوییەوە سەریان هەڵدابوو، هەمیشە ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کەخۆیان پشتگیر و بەرگریکاری ماڵی سەفەوییەکانن. لەسەردەمی محەمەد خودابەندە لاوازیی دەوڵەت و دەسەڵاتەکەیان بەهەلزانی و هێندەی دیکە دەستیان لەکاروباری دەوڵەت وەردەدا. لەسەرەتای سەردەمی شا عەباسی یەکەمیشدا ویستیان هەندێك پشێوی سازبکەن تا بەهۆیەوە شای لادراو بگێڕنەوە بۆ دەسەڵات، شا عەباسیش رەتیکردنەوەو لەبەشداریکردنی کاروبارەکانی دەوڵەتیش دووریخستنەوە، ئەمەش وای کرد دەسەلات و لایەنگریان کەمبێتەوە و هەموو جوڵەیەکیشیان سنووردارببوو، جگە لەهەندێك پیشەی پایەنزم هیچی دیکەی نەدانێ، وەك خاوێنکردنەوەی کۆشکەکانی وڵات و جەللادی و هەندێك فەرمانیی دیکەی دنیایی.

شا لەدوای ئەوەی قزلباشەکانی لاواز کردو کۆمەڵەی سۆفیەکانیشی لەدەوڵەت دوورخستەوە هەستی کرد پێویستی بەپێشخستنی بواری سەربازی هەیە تابتوانێ رووبەرووی دوژمنەکانی وەك عوسمانییەکان و ئۆزبەك ببێتەوەو لەلایەکی دیکەشەوە سەقامگیریی ناوخۆییش جێگیربکاتەوە. بۆ ئەم مەبەستە دوو سوپای پێکهێنا کە هەردووکیان لایەنگری تەواوی خۆی بوون و بەردەوامیش فەرمانەکانیان راستەوخۆ لەخودی خۆی وەردەگرت و زۆریش چاودێری چەك و تەقەمەنیەکانی دەکردن، و زۆر زیاتر لەسوپای عوسمانی تفەنگ و تۆپی بەم دوو سوپایە بەخشی کە دەیزانی عوسمانییەکان هەمیشە چەکی تازەبابەت بەکاردەهێنن، بۆیە شا نزیکە پێنج سەد تۆپ و شەست هەزار تفەنگی دایە سوپاکان، بەیارمەتی ئینگلیزەکانیش توانی کارەگەیەکی چەك و تەقەمەنی دروسبکات، لەهەمان کاتیشدا ئەندامانی نێردراوی بەریتانی بەشداریان لەدارشتنی پلانە سەربازیەکان جەنگی دژی عوسمانییەکان دەکرد، لەمەشەوە رۆبەرد چیللی سەرکردایەتی یەکێك لەتیپەکانی سەربازی سەفەویی لەنێوان ساڵەکانی ١٦٠٤-١٦٠٥ز لەشەری دژ بەعوسمانییەکان کرد.

بەم جۆرە شا عەباسی یەکەم سەرکەوتنێکی بەرچاوی لەبەرەوپێشبردنی بواری سەربازی وڵاتەکەی ئەنجامدا کەبووە هۆی سەرکەوتنی بەرچاوی بەسەر ئۆزبەکەکان و عوسمانییەکان و دامرکاندنەوەی بزووتنەوەی رزگاریخوازەکانی ناوخۆ.

وادیاربوو شا عەباس هەموو گرنگییەکی خستبووە سەر بواری پیادە و لایەنی دەریاوانی سەربازی پشتگوێخستبوو بەڵگەش ئەوەیە کەلەشەڕی دژ بەپورتوگالیەکان لەکەنداوی عەرەبی نەیتوانی رووبەرووبیان ببنەوە. کاتێکیش ویستی رووبەروویان ببێتەوە هانای بردە بەر کەشتیگەلی هاوبەشی هیندستان و ئینگلیز و بەبۆنەی هاوبەرژەوەندییان یارمەتیانـدا بۆ ئەوەی لەمەیدانی بازرگانی لەناوچەکە بەتایبەتی و لەخۆرەلات بەگشتی وەدەریان بنێن، ئەم کەمتواناییەش بووە هۆی ئەوەی هێزی پارێزگاریی لەناوچەکە لاوازبێ و هانی بەریتانیەکان بدات تا هەموو بۆشاییەکان پڕبکاتەوەو شوێنی هێزەکانی پورتوگال بگریتەوە، لەدوای ئەوەیش دەسەلاتی خۆیان بەسەر ناوچەکانی کەنداوی عەرەبیدا داخست.

## لەناوبردنی بزووتنەوەی یاخیبووان:

## بزووتنەوەی یەعقوب خانی زیلقەدەر لە فارس:

لەدوای ئەوەی شا تاجی خستە سەر بیری لەوە کردەوە دەسبەسەر تەواوی خاکی ئێراندا بگرێ، بەلاّم لەلایەن هەندێك لەفەرمانڕەوای ویلایەتەکان رووبەرووی بەرهەلّستکاری بووەوە کەپێشتر سەربەخۆییان هەبوو، بۆیە بڕیاریدا رووبەروویان ببێتەوەو ملکەچیان بکات بەر لەوەی ئەوان خۆیان بەهێز بکەن و مەترسیەکانیان پەرەبسێنێت.

ئەکەم رووبەرووبونەوەش لەنێوان خۆی و یەعقوب خانی زیلقەدەری حاکمی فارس روویدا، شایانی باسە شا بۆخۆی ئەوی کردبوو بەحاکمی ئەو ویلایەتەو ئەویش ئەوەی بەهەلزانی بوو و ولاّتەکەی بەرەو لای یەزدو کرمان فراوانکردبوو، لەلایەکی دیکەشەوە بەبێ ئەوەی پرس بەدەسەلاّتی ناوەندی بکات هەر لەخۆیەوە کاروبارەکانی رادەپەڕاند و هەرچی بڕیاری گرنگیش هەبوایە هەروای دەکرد و سوپایەکی تایبەت بەخۆشی پێکهێنا. شا عەباس بڕیاریدا مەترسیەکانی ئەم فەرمانڕەوایە لەناوببات و لەساڵی ١٥٩٠ز بەرەو ئەسفەهان بەرێکەوت و کاتێکیش گەیشتە ئەوێ داوای لەیەعقوبکرد بێتە بەردەمی و لایەنگری و ملکەچی خۆی رابگەیەنێ و ئەویش لەبەرانبەردا پەیمانی پێدا لێی خۆشببێ و سوێندیشی بۆ خوارد، بەلاّم شا تەنها بۆ ماوەی سێ رۆژ پابەندی ئەم پەیمانەی بوو و کاتێکیش یەعقوب بەتەواوی دڵنیابوو لەرۆژی چوارەمدا چووە کۆشکی شاو لەنێو کۆڕەکەیدا

دانیشت و شا فەرمانیدایـە پیاوەکـانی قزڵبـەسـتیان کـردو کوشتیان، پاشـان سـەرجەم ئەندامانی خانەوادەکەی بانگ کردە کۆشك و داوای لێکردن کـەوا قاچـی مـاچ بکـەن تـا لێیان خۆشبێ و ئەوانیش ئەمەیان کرد، کەچی شا ناپاکی لێکردن و هەموویانی کوشت.

بزووتنەوەی خان ئەحمەد خانی حاکمی گەیلان:

خان ئەحمەد خان لەلایەن شا تەهماسبەوە کرابووە حـاکمی گـەیلان بـەلاّم ئـەو دەیویـست سەربەخۆبێ و کەچی شا قزڵبەست کرد و لەقەلاّی ئستەخخەر بەندی کرد و ماوەی دە ساڵ لەوێدا مایەوە، پاشان کە محەمەد خودابەندە هاتە سەر تەخت لێی خۆشبوو و گەڕاندیەوە بۆ سەر فەرمانڕەوایـەتی گـەیلان و مەریـەم سـوڵتان بێگـەمی خوشکیشـی لێمـارەکرد، هیواشی وابوو کـە پەیوەندییـەکانی خانـەوادەیی ببێتـە هانـدەرێك تـا لەسـنوورەکانی دەوڵەتی عوسمانی نەچێتە دەرەوە. بەلاّم خان ئەحمەد خان کە بەوە ناسرابوو خاوەن ئاواتیی سیاسی تایبەت بەخۆیەتی بێهێـزی خودابەنـدەی بەهـەلزانی و بازنـەی دەسـەلاّتی خۆی فراوان کردو، زۆر بەپەلەش بەرەو سەربەخۆیی ناوەچەکانی ژێر دەسەلاّتی دەچـوو، تـا شـا عەباسی یەکەم دەسـەلاّتی وەرگرت هەر بەمشێوەیە مایەوە، کەچی خان ئەحمەد خان هـەر بەمەشەوە نەوەستا هەموو هەوڵێکی لێکتێکەیشـتن و نزیکبوونـەوە رەتبکاتـەوە بـەڵکو هەموو ئەو قزلباشانەی کەلەدەستی شا هەلاّتبوون دەهاتنـە لایـی و ئـەویش پێشـوازیی لێدەکردن، کاتێکیش داوای لێکرد کە بیانداتەوە دەست دەوڵەتی سەفەویی، خان ئەحمـەد رەتی کردەوەو، بەمەش پەیوەندییەکانیان هێندەی دیکە گرژبوو.

بزووتنەوەکەی ئەحمەد خان زۆر لەوەش دوورتر دەیڕووانی و هیـواو ئـاواتی دیکـەی زۆری بـەخۆوە گرتبـوو، لەگـەڵ عوسمانییەکانـدا گفتوگـۆی سـازکردو داوای لێکـردن لـەلای لاهیجانەوە هێرش بکەنە سەر خاکی ئێران و پاشـان بـەرەو قـەزوین و بـاقی شـوێنەکانی دیکەی ئێران پێشڕەوی بکەن و تەواوی هاریکاریشی بۆ دەربڕین.

شا عەباسی یەکەم بەم گفتووگۆ و دانوستانەی نێوانیـانی زانـی، لەگـەڵ عوسمانییەکانـدا رێککەوتنێکی ئاشتەوایی سازکردو پاشان مکوڕبوو لەسەر ملکەچکردن و لـەناوبردنیی، ئەوکاتـەی لەشـەڕی دامرکاندنـەوەی بزووتنـەوەی یـەعقوب خـان و دوورخسـتنەوەی ئۆزبەکەکان لەخۆراسان ماندووبوو، نیازی بەئاشتبوونەوەبوو لەگەڵ ئەحمەد خـان تـا ئـەو

کاتەی لەو دوو کێشەیە خۆی رزگاردەکات، داوای لێکرد هاوسەرەکەی کەپووری شا عەباس بوو هەروەها کچەکانیشی بنێرێتە لای بۆ قەزوین تاکو لایەنگری و ملکەچیی بۆ دووپات بکەنەوە و بەمەش نیازپاکی خۆیانی بۆ بسەلمێنن، بەلاّم خان ئەحمەد خان ئەمەی رەتکردەوە.

لەگێرانەوەیەکی دیکەدا هاتووە کەشا عەباس پەنای بردۆتە بەر ژنخوازیی لەنێوانیان تاکو بتوانێ بەهۆیەوە ئەو بزووتنەوەیە لەناوببات و بۆیە پێشنیاری ئەوەی بۆ کرد کە کچەکەی خۆی لەمیرزاسەفیی کوڕی شا مارەبکات، بەلاّم خان ئەمەشی رەتکردەوە بەبیانووی ئەوەی هێشتا کچەکەی بچووکە و تەمەنی تەنها چوار ساڵە.

بەهۆی رەتکردنەوەی هەموو پێشنیارەکانی دانوستان، شا بڕیاریدا بزووتنەوە یاخیبوونەکەی ئەم والییە لەناو ببات و سوپایەکی بەسەرۆکایەتی فەرهادخان ناردو لەگەیلان بەیەك گەشتن و لەئەنجامدا شکستی پێهێناو ناچار لەرێگەی شەروانەوە بەرەو دەوڵەتی عوسمانییەکان قوچاندی و نەشیتوانی کەوا ژن و کچەکەی لەگەڵ خۆیدا ببات، ئەوسا هەردووکیانی بردە لای شا و ئەویش لای خۆی هێشتنیەوە، ئەوەبوو لەساڵی ١٦٠٨ز ژنەکەی کۆچیی دوایی کردو کچەکەشی گەورەبوو کاتی مێردکردنی هات شا داوای لەکوڕەکەی کرد کەوا مارەی بکات بەلاّم کوڕەکەی ئەمەی رەتکردەوەو ئینجا شا لەخۆی مارەکرد. ئەمجارەیان خان ئەحمەد خان هەوڵی دەدا لەگەڵ شا ئاشتببێتەوەو بگەڕێتەوە بۆ گەیلان بەلاّم ئەویان قایل نەبوو.

## بزووتنەوەی شاوێردی خان:

شاوێردی خان حاکمی لۆرستانبوو و هەوڵی دەدا کەوا پێگەی وڵاتەکەی فراوانبکات، بۆیە هێرشی کردە سەر قەڵای سەدمەرە و داگیری کرد و بۆ ئەوەی هەڵوێستی خۆیشی بەهێزبکات داوای لە سەرجەم سەرکردەکانی لورستان کرد کەوا هاوپەیمانێتی لەگەڵدا بکەن و رووبەرووی شا عەباس ببنەوە، ئینجا شا سوپایەکی بەسەرکردایەتی مەهدی قوولی خان شاملوو ناردە سەری و لەناوچەکەی دەریکرد و بەرە و بەغدا رایکرد، بەردەوامیش هەوڵی ئەوەی دەدا کەوا هەلێك بدۆزێتەوەو بگەڕێتەوە بۆ لورستان. بەهۆی رۆیشتنی شا بەرەو خۆراسان و بەرەنگاربوونەوەی مەترسیەکانی ئۆزبەك ئەم هەلەی بۆ

ڕەخساو هێرشی کردە سەر لوڕستان و داگیری کرد، بۆیە شا ناچاربوو سوپایەکی دیکە بنێرێتە سەری و لەناوی ببات و سەرکردەی ئەم پەلامارەش شاوێردی گرت و لەوێدا کوشتی و لەدوای ئەویش سەری زۆرێك لەلایەنگرانی پەلدا و ئینجا شا فەرمانیدا هەردوو کوڕەکەی لەقەلای ئەلموت زیندانیبکرێن.

## لەناوبردنی سەربەخۆیی لار:

ناوچەی (لار) کەوتبووە سەر دەریا و زۆربەی دانیشتوانەکەشی بازرگانبوون و هەموو کار و چالاکیەکانیشیان هەر لەرێگای دەریاوەبوو، خاکەکەشی گەنم و خورماو لۆکەی لێدەچێندرا و خاوەنی باغێکی زۆریش بوو جگە لەئاوێکی زۆری سازگاریش، هەر لەوێشدا و لەسەردەمی تەیمورلەنگ پارەی لێ چاپدەکرا کە ئەوەش خۆی لەخۆیدا گرنگیەکی بەو ناوچەیە بەخشیبوو. لەهەمان کاتیشدا لار و ناوچەکانی دەوروبەری بەشێك بوون لەئێران و خاوەنی ئۆتۆنۆمییەك بوون کەبەر لەدامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوییەکانیش هەر هەیان بوو، هەمیشە فەرمانڕەواکانیان لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندی ئێران نێوانیان خۆش بووە و لەبەرانبەر پارێزگاری کردنی ئەم سەربەخۆییە هەرچی ئەوانیش داوایان کردبێ لەماڵ و سامان بۆیان ناردوون. ئەم بارە تا سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەوییش هەر درێژەی هەبوو، ئەوەبوو پەیمانیان دا بە شا ئیسماعیلی یەکەم کەبەردەوام پارەو پوولیان بۆ دەنێرن بەمەرجێك ئەو سەربەخۆییەی ئێستایان بۆ بپارێزێ و ئەویش لەسەر ئەم پێشنیارە رەزامەندی نواند. لەدوای ئەویش شا تەهماسبی یەکەم سیاسەتەکەی باوکی لەگەڵ فەرمانڕەواکانی (لار) گرتەبەر، بەلام بەهۆی ئەو پشێوی و ئالۆزییەی سەردەمی شا ئیسماعیلی دووەم و شا محەمەد خودابەندە چیدیکە دەسەلاتدارانی ئەوێ پارەو سامانیان بۆ حکومەتی ناوەندی نەنارد. کاتێك شا عەباسی یەکەم بوو بەفەرمانڕەوای دەوڵەتی سەفەویی داوای لێکردن کەوەکو جاران پارە و سەرانە بنێرن بۆ حکومەتی ناوەندی و پاشان هەڕەشەی ئەوەی لێکردن ئەگەر ملکەچی ئەم بڕیارە نەبنەوە ئەوا دەیانخاتە ناو سنووری دەوڵەتی سەفەویی، بەلام ئەوان هیچ گوێیان نەدایە داواکاریەکانی شا، بۆیە بەدوای بیانوویەکدا دەگەڕا تا تەمبێیان بکات. هەڵوێستەکە هێندەی دیکە ئالۆزبوو بەوەی کاتێك ئیبراهیم خانی فەرمانڕەوای لار دەستدرێژی کردە

سەر یەکێك لەبازرگانە بیانیەکانی نێو ئێران و دەستی بەسەر هەموو پارەوشتومەکەکانی خۆی و خێزانەکەیدا گرت و، لەوکاتەشدا شا مەرامی وابوو دڵی بازرگانە بیانیەکە رابگرێ و داوای لە ئیبراهیم خان کرد کە پارەکەی بۆ بگێڕێتەوە، بەلام خان زۆر سستی و خاوەخاوی دەکرد لەئەنجامدانی داواکەی شا عەباس، ئەوکاتە شا فەرمانیدایە شاوێردی خانی حاکمی فارس هێرش بکاتە سەری و ملکەچی بکات و هەرچی مافێکی بازرگانە بیانیەکە هەیە هەمووی بۆ بگێڕێتەوە. وێردی خانیش فەرمانی شا عەباسی بەتەواوی جێبەجێکرد و لەساڵی ١٦٠١ز ئیبراهیم خانی قۆڵبەستکردو ناردیە دەرباری شا لەئەسفەهان و لەدوای ئەوەش باجێکی زۆری خستە سەر دانیشتوانی لار و ئەویش بۆ پڕکردنەوەی ئەو سەرانەیە بوو کەوا چەندین ساڵبوو لەسەریان مابۆوە، لەدوای ئەویش دەستی بەسەر گەنجینەکانی دەوڵەتدا گرت.

بەم شێوەیە شا عەباسی یەکەم سەربەخۆیی ناوچەی لاری لەناوبرد و خستییە پاڵ سنورەکانی دەوڵەتی سەفەویی، چونکە گەلێك بەلایەوە ناخۆشبوو کە ناوچەیەك هەبێ لەناو سنووری ئێران و لەهەمان کاتیشدا لەژێر دەسەلاتی ئەودا نەبێ.

شانەبشانی ئەو دووبەرەکیانەی هی دیکەی بچووك و کەم بایەخیش پەیدابوون بەلام شا توانی بەئاسانی لەناویان ببات، کەلەوانەیە لە هەرە گرنگەکان کێشەی شا مەلیك بوو لەگەیلان و هەروەها کێشەی کۆمەڵەیەك بوو کە بەناوی سیاپوش و لەئیستەرئاباد بوون. ئەم سەرکەوتنانەی شا بوو بەهۆی ئەوەی بتوانێ ئاسایشی ناوەوەی دەوڵەتی سەفەویی سەقامگیربکات. بۆیە حاکمەکانی هەرێمەکان هەموو لەدەسەلاتی ئەو دەترسان و هەمیشە بەئومێدی ئەوەبوون کەوا لەژێر ئەم بارە ناهەموارەدا رزگاریان ببێ. لەکۆتاییشدا زیاتر گرنگی بەکاروبارەکانی ناوخۆیی لەرووی ئیداری و ئابوورەیەوەدا.

## بواری کارگێڕی لەسەردەمی شا عەباسی یەکەم:

لەسایەی ئەو داب و نەریتەی لەدەوڵەتانی خۆرەلاتدا هەبوو شا عەباس خاوەنی دەسەلاتێکی بێپایان بوو لەولاتەکەدا، ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی بتوانێ بەتەواوی دەسبەسەر دەزگای ئیداریی دەوڵەتدا بگرێ، بەلام بەهۆی سەرقاڵی زۆری لەجەنگەکان بەتایبەت و ملکەچکردنی بەرهەڵستکاران هانیدا داوای یارمەتی لەهەندێك وەزیر و

نووسەرەکان کرد کەوا بۆشاییەکانی بواری کارگێڕی پڕبکەنەوە، ئەمانەش بەپێی پلەو گرنگیانن:

١- ئیعتیماد ئەلدەولە، گەورەی وەزیران و کەسی دووەم بوو لەدوای شا لەلیستی کارگێڕانی گەورەی دەوڵەت، هەر ئەویش بەرپرسی کاروبارەکانی دارایی و خەرجیەکان و سەرجەم پێداویستیەکان بوو، هەروەها لەکۆڕو کۆبوونەوەکانیشدا لەلای راستی شا دادەنیشت و لەبەر ئەمەش بوو ناویان نا وەزیری دەستەراست، جگە لەمانەش هەموو نووسراوێکی دەبینی و واژووی دەکرد ئینجا بۆ لای شا عەباسی دەنارد. شایانی باسە لەسەردەمی شا عەباس حەوت کەسایەتیی ئەم پەلەیەیان بەدەستەوە گرتبوو ئەوانیش:

- میرزاشا وەلی، لەدوای تاج لەسەر نانی شا مورشید قوولی خان هەڵبژاردبوو بۆ ئەم پۆستە و تامردنی مورشید لەو پۆسەیەدا مایەوە، پاشان دوورخرایەوە.
- میرزا محەمەدی کرمانی، لەدوای کوژرانی مورشید قوولی خان ئەم پۆستەی وەرگرت ئەویش وەك پاداشتێك بوو لەلایەن شا عەباسەوە پێی درا بەهۆی ئەو بەشداری کردنەی لەکوشتارە تایبەتیەکانی شادا کردی. بەڵام وادیاربوو ئەم پیاوە وەك باب و باپیرانی هەمیشە ئارەزووی دیکتاتۆری و حوکمی تاکرەوی دەکردو، لەلایەکی دیکەشەوە کورەکەی بەهۆی هەڵس و کەوتە نالەبارەکانیەوە رۆڵی لەروو لێوەرگێرانی شا عەباسدا هەبوو، بۆیە لەدوای شەش مانگ و لەساڵی ١٥٩٠ز شا لەم پۆستە لایداو پاشان کوشتی.
- میرزا لوتفوڵڵای شیرازی، ماوەی دوو مانگ ئەم پۆستەی وەرگرت و لەساڵی ١٥٩٢ز لادرا.
- حاتەم بەگی ئەردۆباری، ماوەی بیست ساڵ لە ١٥٩٠-١٦١٠ز ئەم پلەیەی پێدرا، بەر لەوەش پلەی مستەوفی مەمالیکەکانی هەبوو، لەبەر ئەوەی زۆر بەتوانا بوو سەرنجی شای بۆخۆی راکێشاو پاشان لەدوایدا نارد و کردیە وەزیری دەستەراست.
- میرزا ئەبوتالب خانی کوڕی حاتەم بەگ، شا عەباسی یەکەم بەهۆی ئەو سەرکەوتنەی حاتەم بەگ لەکاروبارەکانیدا بەدەستی هێنا بڕیاریدا کوڕەکەی لەدوای خۆی لەهەمان

پلە دابنێ و توانی ماوەی دە ســاڵ لــەم پۆســتەدا بێنێتــەوە، بــەڵام لەبــەر نالــەباری هەڵســوکەوت و خــووگرتنی بەمــەی خواردنــەوە کۆبوونــەوەی خــەڵکی بەدرەوســت لەدەووری لەساڵی ١٥٢١ز شا لەم پۆستە لابرد.

- سەلمان خان ئەستاجلوو، ماوەی پێنج ســاڵ پلــەی وەزیــری گــەورەی دەوڵــەتی پێــدرا لە١٦٢١-١٦٢٥ز، ئینجا بەهۆی نەخۆشیەوە کۆچی دوایی کرد.

- سوڵتان ئەلعولەما خەلیفەسوڵتان، لەساڵی ١٦٢٥ز ئەم پلەیــەی بــەڕێوەبرد تــا ئــەو کاتەی شا عەباسی یەکەم لەساڵی ١٦٢٩ز کۆچی دوایی کردو لەدوای ئەویش کە شــا سەفیەدین دەسەڵاتی دەوڵەتی سەفەوییەکانی وەرگرت تا ساڵی ١٦٣١ز هێشتییەوە.

٢- ئەرکانی سەڵتەنەت، سەرۆکی هۆزەکانی قزلباش بوو، بەڕێوەبەری کارگێڕی پاسەوانە تایبەتیەکانی شابوو و واژووی لەسەر لیستی مووچەکانیان دەکرد، یەکێك لەوانەی کە سەردەمی شا عەباسی یەکەم ئەم پۆستەی پێدرابوو عیسا خــانی ســەفەوبی ســەرۆکی هۆزی شێخ ئاوەند و زاوای شابوو.

٣- روکن ئەلدەولە، ئەمە پلەی سەرۆکی ئەو سوپایەبوو کە شا عەباس بۆخۆی لەگەنجانی سازیکردبوو. یەکەم کەسیش ئەم پۆستەی وەرگرت شاوێردی خانبوو.

٤- گــەورەی یــاوەران، بەرپرســی میوانــداری و تەشــریفات و رێکخســتنی کــۆڕ و کۆبوونەوەکانی شا و دەسنیشانکردنی ئەو شوێنانە کە هەر ئەندامێك لێی دادەنیشــێ و دەسنیشانکردنی ئەو شوێنانەش بۆ ئەوانە بەپێوە دەوەستن و لەم کارەشیدا چل کەس یارمەتیدەری بوو.

٥- سەرکردەی هێرشی تفەنگ بەدەستان، ئەو کەسە بوو کە سەرۆکی ئەو سوپایەبوو شــا عەباسی یەکەم لە جووتیاران و دەسوپەیوەندەکانی نێــو ویلایەتــەکان و کرمانجــەکانی خۆزســتان پێکیهێنابوو و بەتفەنگیش پڕ چەکی کردبوون. ئەم ســەرکردەیەش بــەرپرس بوو لــەراهێنانی ســەربازەکان و جێبــەجێکردنی ئــەو فەرمانانــەی شــا عــەباس پێــی رادەسپارد.

٦- سەرۆکی دیوان، خاوەنی ئـەم پۆسـتە سەرپەرشـتیاری کۆشـك و گەنجینـە و سـامانە تایبەتیـەکانی شـای دەکـردو هـەروەها خەرجیـە تایبەتیـەکانی ئـەم کۆشکانەشـی ڕێکدەخـست و پاشان دەینارد بۆ جێیبـاوەڕی دەوڵـەت تـاکو واژووی لەسـەر بکـات و کاری پێبکرێ.

٧- نووسەری کۆبوونەوەکانی شا، ئەم کەسە لەدوای وەزیری دەسەراست لەشانشـینەکەدا لەهەموو کەسیدیکە بەڕێزتربوو، چونکە بەهۆی جـۆری کارەکـەی ئاگـاداری هـەموو نهێنییەکانی دەوڵەتبوو، لەکۆڕە تایبەتیەکانیشدا لـەلای چـەپی شـاوە دادەنیشـت و هەموو فەرمـانەکیشی بەدەستی خۆی دەنووسیەوە و دەیدانەوە بەخاوەنەکانیان، جگـە لەمانــەش نامــە هاتووەکــانی لایــەنی فــەرمانڕەواکانی ویلایەتەکانیشــی بــۆ شــا دەخوێندەوە، لەبــەر ئــەوە پێــی دەگــوترا (عــالی جــاهی موقــەررەبی خاقــان) واتــە پایەبەرزی نزیکیی شا.

زەینەب بەگمی پووری شا لەهەندێك کۆبوونەوەکانی شا ئامادەیی هـەبوو، ئـەویش تاکـە ئافرەتبوو کە ڕێی پێدرابوو لەم کۆبوونەوانەدا ئامـادەبێ و لەهـەمان کاتیشـدا ڕای خـۆی دەرببڕێ و هەندێك جاریش شا ئامۆژگاری و ڕایەکانی ئەوی پەسەند دەکرد.

سـەرەڕای بوونی ئەو هەموو وەزیـری و نووسـەر و فەرمانبەرانـە کەچـی ڕایـەکانی ئـەوان هەمیشە وەك ڕاوێژێك بوو بۆ شا، چونکە بەهۆی ئـەو دەسـەڵاتە ڕەهایـەی شـا هـەیبوو هەموو شتێکی بەئارەزووی خۆی دەکرد و ڕاو بۆچوونەکانیشی بۆ هەمووان فەرمان بـوو و کەسیش بۆی نەبوو گفتوگۆی لەگەڵدا بکات.

حوکمڕانی شا لەسەر تۆڕێکی بەهێزی سـیخوڕی و هـەواڵنێرەکان ڕاگیربـوو، چـونکە بـۆ هەموو لایەنێکی دەناردن و ئەوانیش هەموو هەواڵێکی ناوچە جیاجیاکانی دەوڵەتیان بـۆ دەنارد و هەواڵی هـەموو ڕووداوێکیـان پـێ ڕەدەگەیانـد. لەهـەمان کاتیشـدا فـەرمانی پێکردبوون کەوا گوێ لەقسەوقسـەلۆکی خـەڵك و ئـەو سـکاڵایانەیان بگـرن کەبەرانبـەر دەسـەڵاتدارەکانی خۆیـان هەیانـە و ئـەم ڕژێمـە گەیشـتە پلەیـەکی زۆر پێشـکەوتوو بەشێوەیەك کەس نەیدەتوانی باسی کەموکورتییەکانی شا بکات.

لەراستیشدا شا عەباسی یەکەم سـەرەڕای دڵڕەقیەکـەی تـوانی سـەرکەوتنێکی بەرچـاوی بواری کارگێڕی وەدەسبهێنێ. بەبەڵگەی ئەوەی کە سەردەمی دەوڵەتی سەفەویی بـەر لـە دەسەلاتدارێتی ئەو، سەرتاپای لەپشێوی بێ سەروبەرەیی ناوخۆیی بوو و ئـەو تـوانی ئـەم بـارە نالـەبارەی وڵات بگۆڕێـت و هەرێمـەکان یـەکخات و سـەقامگیری بچەسـپێنێ و لەلایەکی دیکەشەوە ئاسایش بەرقەراربکات و درێـژە بـەفراوان بـوونیش بـدات و ئینجـا جەنگەکانی بەئەنجام بگەیەنێت.

## باری ئابـــووری:

## داهـاتی دەوڵەت:

هەرچەندە بواری بازرگانی و دارایی پێشکەوتنی بەرچـاوی بەخۆیـەوە دیبـوو کەچـی شـا هەمیشە گرنگی بەم بوارە دەدا چونکە بەهۆیەوە داهاتی زۆری دەست دەکەوت و ئـەویش لەزۆرێك لایەنی ئیداری و بەرژەوەندیەکانی دەوڵەت خەرجی دەکرد.

ئێرنیەکان لەو سەردەمەدا توانیان دراوی زیوین چاپ بکەن و مامەڵەشـی پێبکـەن، لـەم جۆرە یەکانەش پێکهاتبوو: عەباسی یەکسان بوو بە دووسەد دینار، نیم عەباسی واتە نیـو عەباسی دەیکردە سەد دینار، شاهی، پەنجا دینار و بیستیی بیست دینار بـوو. هـەروەها لەسەردەمی شا عەباسدا دەوڵەت کۆمەڵێك سـەرچاوەی داهاتی هەبوو لەوانە:

- باجی سەر زەوییە کشتوکاڵیەکان، بێگومان ئەم باجە لەگـەڵ ئـەوەی دەخرایـە سـەر داهاتی تایبەتی حاکمەکانی ویلایەتەکان لەبەرهەمەکانی کشـتوکاڵیی و ئـاژەڵیی و مرۆیی. لەو کاتەشدا کوردستان لەسـەریبوو کەبەشێك لەرۆنەکەی بنێرێتە ئەسفەهان، وڵاتی کەرەجیش دەبوایە هەندێك لە خزمەتکار و کـەنیزە بنێرێتـە قـەزوین، کەچـی دەبوایە خوزستان ژمارەیەکی زۆری ئەسپی عـەرەبی بنێـرێ و گـەیلانیش بەشـێکی لەبەرهەمەکانی حەریر.
- باجی سەر موڵکە تایبەتیەکانی شا.

- باجی سەر خاوەن قازانجە زۆرەکان، هەروەها دەوڵەمەندەکانی وێنــەی خــاوەن مــەڕ و ماڵاتی زۆر و پیشــەوەرەکان و بەرهەمهێنــەرەکانی حــەریر (ئەوانــە لەســەریان بــوو سێیەکی بەرهەمەکانیان ببەخشنە دەوڵەت).
- ئەو ســەرانەیەی خرابــۆ ســەر خــەڵکی نــا موســوڵمان وەك: شــەرکەس و ئەرمــەن و کەرەجەکان و هیدیکەش لەئایینەکانی دیکەی وەك ئاگرپەرست و گاور و جولەکە.
- داهاتی گومرگەکانی بەندەرەکانی ئێرانیی کەلەسەر کەنداوی عەرەبی بــوون، ئەوانــە لەسەدا دەی نرخی ئەو شتومەك و کاڵایانــەبوو دەهاتنــە نــاو ئێــران، بــۆ زانیــاریش بازرگانی رێی وشکانی لەگەڵ عیراق و وڵاتی شام و ئاسیای بچووك بــەهۆی دژایــەتی نێوان دەوڵەتی سەفەویی و عوسمانیی پەکی کەوتبوو.
- باجی سەر تووتن، بەهۆی بەکارهێنانی زۆری تووتن لەلایەن هاووڵاتیــانی ئێرانیــەوە پارەیەکی زۆر دەست دەوڵەت دەکەوت، ئەم کارەش بووە هۆی ئــەوەی شــا مەترســی تەندروستی گشتی لەلا پەیدا ببێ، بۆیــە لەســاڵی ١٦١٨ز بڕیــارێکی دەرکــرد کــە بەهۆیەوە تووتن حەرام کرا، بەڵام لەبەر ئەوەی داهاتــەکانی گەنجینــە رووی لەکــەمی کرد ناچار بوو دووبارە رێگە بەبەکارهێنانی بداتەوە.

لەسەردەمی شا عەباسی یەکەم داهاتی دەوڵەت گەیشتە نزیکەی هەزار و دووســەد تومــان لەرۆژێکدا، لەبەرانبەریشدا خەرجیی دەوڵــەت تــەنها هــەزار تومــان بــوو، بۆیــە رۆژانــە دووسەد تومان لەداهاتەکان زیادی دەکرد و، شا عەباسیــش لەمانەدا خەرجی دەکرد:

- بواری بیناسازیی.
- جەنگی بەردەوامیی لەخۆرهەڵات و خۆرئاوا.
- دیاری گۆڕینەوە لەگەڵ پاشاکانی ئەوروپا و هیندستان.

## چالاکییە ئابوورییەکان:

چالاکییە ئابوورییەکان لەئێرانی سەردەمی شا عەباسی یەکەم لەسێ بەش پێــك هــاتبوو: بازرگانیی و کشتوکاڵیی و پیشەسازیی.

ئەوەی پەیوەندی بە چالاکییە بازرگانیەکانەوە هەیە، شا لەپێناویدا دەستی کرد بەکرانەوەی بواری بازرگانی بەرووی خۆرەلآت، چین و هیندستان و، خۆراوا، لەگەڵ دەوڵەتە ئەوروپیەکان و ئەسفەهانی پایتەختیشی کردە ناوەندی بازرگانی جیهانی سەرەکی بۆ بازرگانییەکانی خۆرەلآت، چونکە لەهەموو جیهانەوە بازرگانەکان بۆی دەهاتن، بەمەش هانی بواری بازرگانیداو بانگهێشتی بازرگانەکانی جیهانی کرد بۆ سەردانی کردنی ئێران و هەموو پێداویستیەکانیشی بۆ فەراهەم کردن، وەك هاتووچۆ و شوێنی حەسانەوەو، جگە لەدابین کردنی ئەم هۆکارە متمانەییانەی خوارەوە:

- هەموو دەسدرێژییەکی فەرمانڕەوای هەرێمەکانی لەسەر لابردن، هەروەها رێگای پێدان بەئارەزووی خۆیان بەهەموو خاکی ئێراندا بسوورێنەوە، ئەوەشمان باسکرد کەهۆی لەناوبردنی سەربەخۆییەکەی حکومەتی لار دەسدرێژی کردنە سەر بازرگانێکی بیانی بوو کەلەلایەن ئیبراهیم خانی فەرمانڕەوای ئەوێوە ئەنجامدرا و پارە و پوولییشیان لێی دزی.
- هۆشداری دایە پیاوە ئایینیەکانی شیعە بەتایبەتیش ئەوانەی توندڕەوبوون کەوا بەهیچ شێوەیەك دەسدرێژی نەکەنە سەر بیانیەکان و رق و کینەیان بەرامبەر هەڵرێژن و بواری ئەوەیان بۆ بڕەخسێنن کەوا کار و فەرمانە ئایینیەکانیان ئەنجام بدەن.
- ئەو نێردراوانەی شا بۆ ئەورووپای دەناردن هەمیشە جەختیان لەسەر لایەنی سیاسی و بازرگانی دەکردەوە. کاتێکیش چێرلی و حوسێن عەلی بەگ چوونە ئەورووپا توانیانیان هاوپەیمانێتی بازرگانیان لەگەڵ گرێبدەن بۆ فرۆشتنی حەریری ئێرانی بەو دەوڵەتانەی کە سەردانییان دەکردن، ئاشکرایە بەریتانیەکان حەریری ئێرانیان بەنرخێکی زۆر بەرز لەحەلەب دەکڕی، لەوکاتەی کە پەیوەندیی راستەوخۆیان بەئێرانەوە کرد و مامەڵەی بازرگانیان لەگەڵدا کردن هەلی ئەوەیان بۆ رەخسا بەنیوەی نرخەکەی ئەوان حەریرەکانی ئێران بکڕن، سەرەڕای ئەمانەش دەیانتوانی خوری ئینگلیزی لەبازارەکانی ئێراندا بفرۆشن و حەریری ئێرانی بەپارەکەی بکڕن.
- کارئاسانیی لەرێگاکانی بازرگانی، خۆشکردن و پارێزگاری کردنی ئەو رێگایانەی کەوا کاروانەکان پێیدا تێدەپەڕین. شا گرنگی بەهەموو ئەوانەدا، بەدرێژایی سەر

ڕێگا بازرگانیەکان خانی بۆ سازکردن تاکو بازرگانـەکان بتـوانن خـواردن و ئالیـك و شوێنی حەوانـەوە بـۆ خۆیـان و وڵاخـەکانیان دابـین بکـەن، جگـە لەمـەش بـەهۆی پارێزگاری سەربازییەوە پاسەوانی لێدەکردن، بـەردەوامیش دەوریـەکان بەرێگاکانـدا هاتووچۆیان دەکرد تاکو بتوانن ڕێگای کـاروانی بازرگانـەکان بپـارێزن و دەسـدرێژی ڕێگر و دزەکانیان لێدوور خەنەوە.

- گرنگی بەبەندەرەکانی سەر کەنداوی عەرەبی دەدا، مینـای بەندەر عەباسی سازکرد تا جێگـای مینـای کـامبرۆن بگرێتـەوە چـونکە ئـەم مینایـە لـەدوای دەرکردنـی پورتوگالیەکان گرنگی ئەو تۆی نەما، بەندەرەکانیش لەسەردەمی ئەودا گەشـانەوەی زیاتریـان بـە خۆیانـەوە بـینی، کۆمپانیـا بازرگانیـەکانی بیـانی ڕۆڵێکـی گرنگـی بازرگانیان تێدا گێڕا لەوانەش: کۆمپانیای خۆرەڵاتی هیندی-ئینگلیزی و خـۆرەڵاتی هیندی- هۆڵەندی.
- بازرگانیی سەفەوییەکان بەشێوەیەکی سەرەکی پشتی بە حەریریەکانـەوە بەسـت کـە ئەوکاتە شارەکانی ئێران ناوبانگیان پێوەی دەرکردبوو، ئەوەبوو شـا عەباسـی یەکـەم ئەم بازرگانییەی بۆ خۆی قۆرخ کرد، چونکە دەیزانی چ قـازانجێکی هەیـەو بۆخۆشـی سەرپەرشـتی فرۆشـتنەکانی دەکـرد، لەلایـەکی دیکەشـەوە مکوڕبـوو لەسـەر هەناردەکردنی حەریر بەهۆی دژایەتی عوسمانییەکان لەرێگای بەندەرەکانی کەنـداوی عەرەبییەوە، چونکە ڕێگاکانی بازرگانی هەمووی بـەخاکی ئەوانـدا تێدەپـەڕین وەك عێراق و شام و زۆری جەنگەکانی لەگەڵیاندا و بەتایبـەتیش حـەزی لەوەنـەبوو کـەوا باجی گورمرگ بداتە دوژمنانی. لەوکاتـەدا حـەریر لـەرێی دەریاییـەوە و لـەمینای هورمزەوە لەکەشتیە ئەورووپیەکان باردەکراو پاشان بۆ هیندستان یا ئەورووپا لـەرێی راس ئەلرەجا سـاڵحەوە دەڕۆیشـت، جگـە لـەم ڕێگـا ئاوییانـە ڕێگایـەکی دیکـەی وشکانی هەبوو ئەویش ئەوەبوو کە بازرگانەکان لـەخاکی رووسـیاوە بـەرەو ئـەورووپا دەڕۆیشتن.

لەو سەردەمانەدا مینای هورمز لەژێر دەسەڵاتی پورتوگالیەکاندا بوو، بەردەوام چـالاکیە بازرگانیەکانی خواروویان قۆرخ دەکرد، ئەمە هەر لەسەردەمی شا ئیسماعیلی یەکەمـەوە

درێـژەی هـەبوو، ئـەو کاتـە بـەهۆی ئەوانـەوە حـەریر بـاردەکراو دەگواسـترایەوە، ئـەم شێوازەشیان شا عەباسی زۆر بێزارکرد و هەوڵیـدا بەهاوپـەیمانێتی لەگـەڵ نێردراوەکـانی کۆمپانیای هینـدی-ئینگلیـزی لـەناویان ببـات و لـەم پێناوەشـدا کێبڕکێیـەك لـەنێوان بازرگانەکاندا دروسبکات کە بەهۆیەوە نرخی حەریری ئێرانی بەرز دەبێتەوە و لەمەشیاندا سەرکەوتنی وەدەستهێنا.

لەسەردەمی شا عەباسی یەکەم بواری بازرگانی کرانەوەیەکی زۆر گەورەی بەخۆیەوە بـینی کەبەهۆیەوە ئێران توانی تێکەڵاوی هەموو وڵاتانی جیهان ببێ و ئەسـفەهانیش هەمیشـە پڕبوو لەبازرگانە بیانیەکان. ئەم کرانەوەیەش بووژانەوەیەکی بازرگانی ئەوتۆی سازکرد کە کاریگەرییە زۆرەکەی لـەبواری بیناسـازیدا بەئاشـکرایی دەبینـرا، بەشێوەیەك ئێـران چ لەسەردەمی شا و چ لەدوای ئەویش هەرگیز شتی وەهای بەخۆیەوە نەبینیبوو، لەبـەر ئـەم هۆیەش بوو بە ئەسفەهانیان دەگوت نیوەی جیهان. بـەڵام ئـەم کرانەوەیـە کارەسـاتی زۆر گەورەی هێنایە سەر ناوچەکانی ئێرانی عەرەبی کەدەیانڕوانییە سـەر کەنـداوی عـەرەبی، چونکە کۆمپانیا بیانیەکانی هەموو جیهان روویان لەوێکرد و لەدوای ئەوانیش حکومەتـە ئەورووپیەکان لەهەوڵی ئەوەدا بوون هەر یەکێکیان بۆخویان جێپێیەك لەم شوێنە گرنگەدا بدۆزنەوە و زاڵ بن بەسەر سیاسەتی ناوچەکە، ئەم هەنگاوەش لەسـەردەمیی نوێـدا نـاونرا داگیرکاریی ئەورووپی، کەچی لەبەرانبەردا ناوچەکە خـاوەن بـیر و کەسـایەتییەکی ئـەوتۆ نەبوو بتوانێ رووبەرووی ئەم هەڵپەیەی داگیرکارەکان ببێتەوە.

چالاکی کشتوکاڵی، چالاکی کشتوکاڵی لەسەردەمی شا عەباسی یەکەم دابەشـکرابوو بـۆ چوار بەش لەوانەش:

١- زەوی و زاری هەرێمەکان کە فەرمانڕەواکانیان بۆخۆیان سەرپەرشتیان دەکردو بەشـی هەرە گەورەشی لەزەویە کشتوکاڵیەکانی ئێران پێکهێنابوو.

٢- زەوی و زاری تایبەت بە شا عەباسی یەکەم کە هەموو قازانجەکەی دەچووە گەنجینەی تایبەتییەوە.

٣- زەوی و زاری ئەوقافی خێرخوازی، ئەو زەویانــە بــوون کــە خاوەنــەکانیان پێشکەشــی دامەزراوەکانی ئەوقافیان کردبوو.

٤- زەوی و زارەکانی خەڵکە کرمانجەکــە، ئــەو زەویانــە بــوون کــە شــا دابونیــە خــەڵك لەبەرانبــەر کرێیەکی زۆر کەم و بۆ مــاوەی نــەوەدونۆ ســاڵ، لــەدوای ئــەو ماوەیــەش دەگێردرێتەوە بۆ حاکمی هەرێمەکە و لەدوای ئەویش بەهەمان شێوە یا دەدرێتەوە بە کرێچییە کۆنەکە یاخود کەسێ دیکە، بەڵام ئەم زەویانە رێژەیان زۆر کەمبوو.

بــەهۆی ئــەم بڕیــارەوە جووتیارەکــانی ئێــران لەخاوەنــدارێتی زەوی تایبــەت بــەخۆیان بێبەشبوون، بەڵام شا یارمەتی ئەو کەسانەی دەدا کەوا رۆژگار غەدری لێکردبوون و زەوی و ماڵاتی پێدەبەخشین و هەندێك لەزەویەکانی خۆیشی پێدەبەخشین کەبۆ خۆیان بــێ، ئــەم کارەش لەساڵی ١٦٠٧ز روویدا کاتێك شکستیان بەسەر عوسمانییەکان لەشەڕی شــەماخدا هێناو، ژمارەی ئەوانەی لەبواری کشتوکاڵیدا کاریان دەکرد بووە هێندەی پیشەوەران.

لەم دابەشکردنی زەوی و زارانــەدا ئــەوە بەرچــاو دەکــەوێ کــەوا شــا خــاوەنی زەویــەکی بەرفراوانی کشتوکاڵی ئێرانبوو، هەروەها تەماعیشــی لــەم بــوارەدا نەسنووری هەیــە و نەبەهیچ شتێکیش بەسراوەتەوە، هەموو کاتێك بۆی هەبوو زەوی خەڵکی دیکە بکاتە هی خۆی، نموونەش بۆ ئەم کارەی لەدوای لــەناوبردنی قزلباشــەکان هــەموو زەوی و زارەکــانی ئەوانی کردە هی خۆی و خستنیە پــاڵ ئەوانــەی خۆیــەوە. هــەروەها هــەموو زەویــەکانی تایبەت بەتەهماسب شای لەئەسفەهان داگیرکرد کەلەدوای خۆی لەدەســت میرزاهــەمزە و ئەبی تاڵبی برایدابوون.

بەڵام ئەوەی پەیوەندی بــەبواری چــالاکییەکانی پیشەســازییەوە هەیــە لەســەردەمی شــا عەباسیی یەکەم بریتی بوو لە:

- دروسکردنی چەك: بەهاوکاری کۆمپانیاکانی ئینگلیزی توانرا کارگــەی دروســکردنی چەك دابمەزرێ، کەتیایدا تفەنگ و داشقەی تایبەت بــەتۆپیان دروســت دەکــرد، ئــەم پێداویســـتییە ســـەربازیانەش یارمـــەتی شـــا عەباســـیاندا کـــەبتوانێ بـــەرەنگاری عوسمانییەکان ببێتەوە.

- هونـەر: شـا عەباسـی یەکـەم قوتابخانەیـەکی تایبـەت بەشـێوەکاری سـازکرد و قوتابیەکانیان دەبوایە بەناوباگترین مۆنۆمێنتەکان دروسبکەن، بەتایبـەتی ئەوانـەی کەوا نموونەی جوانی دەسکاری و وردی لەوێنە بوو بۆ بابەت و کەسایەتیەکانی بەر لـە لادانی هونەرەکە لەدابونەریتەکانی ئیسلام بەهۆی کارگەرییەکانی خۆراوا، ولاسـایی ئـەوان بکەنـەوە لەسـازکردنی مۆنۆمێنتـەکان کـەمرۆڤ تیایانـدا دەبـووە بیرۆکـەی سەرەکی، لەراستیشدا سەرەتا وێنەکێشانی مـرۆڤ قەدەغـە بـوو، بـەلاّم پاشـان بـوو بەشتێکی ئاسایی چونکە رایان وابوو کـە ئەمانـە شـتی لاوەکیین و لەقۆناغـەکانی کۆتایی و بەهۆی گەشەکردنی ململانێی تاکە کەسیەوە و بەهۆی دەسبەسـەرداگرتنی سـامان و پـارەوە وێنـەی راهێنـەری بـاز و شـاعیرێك لەچـیمەندا دانیشـتووە بـوو بەوەدەرخستنی وردەکاریەکانی دەسرەنگینی ئێرانییەکان لەم بوارەدا. جگە لەمانەش هەنـدێك وێنـەی سـەر دیـوار لەچهلسـتونیش نیشـانەی کارسـازیی ئـەوانبوون. لەرازاندنەوەی قورئان و ئاوزێرکردنی شـوێنەوارە ئەدەبیـە کۆنـەکانی وەك شـانامەی فیردەوسی و گوڵستانی سەعدی کە حەسەنی بەغدادی بۆخۆی ئاوزێریی کـرد، لـەناو هەمووشیاندا رەزا عەباسی لەشێوەکاریدا لەپێشی هەموانەوە بوو.

لەدوای مردنی شا عەباسی یەکـەم و رووخـانی دەوڵـەتی سـەفەویی ئـەم جـۆرە هونـەرە هەرەسی هێناو ئەوەبوو هەستیاری هونەر و روونی وێنـە هـیچ بایـەخێکی نـەما و بـوون بەشـتێکی ئاسـایی، بـەلاّم ئـەم جـۆرە هونـەرە کاریگـەری زۆری هـەبوو لەسـەر ئـەو مۆنۆمێنتانەی دەوڵەتی مەغۆلـەکان لەهیندسـتان هـەیانبوو، جگـە لەوانـەش لـەبواری بیناسازییدا بەکاریان دەهێنـا، هـەموو تـاجێکی ئەوکاتـەش بەشـێك بـوون لەهونـەری ئەسفەهان.

هونەری خۆشنووسیش وەك هونەرێکی سـەرەکی لەئێرانی سەفەوییەکاندا مایەوە، خـەریك بوو میرعیماد دەبووە خاوەن رێزێکی تایبەتی لەلای شا عەباسی یەکەم بەهۆی ئەو نووسین و هونەرانەی لەنووسراوەکانی کۆندا سازیکردبوو. چونکە ئەو کاتە کتێب بەهۆی نـاوەڕۆك و بەرگە پڕ لەهونەر و ئاوزێریەکەیەوە جێگای شانازی و خۆشەویستیی بوو.

شارەکانی ئێران ناوبانگیان بە دروسکردنی ئامان و قاپی پڕ لەهونەر و رازاندنەوە بەرەنگ و وێنەی بریقەدار دەرکردبوو، چونکە رەنگەکان بریسکەکانیان ماوەیەکی زۆر دوورو درێــژ دەمانــەوە، لەوانەشـــە ئەرمەنــەکان ســـوودیان لەهونـــەری ئێرانییـــەکان وەرگـــرتبێ لەدروستکردنی نەقش و نیگاری کلێســاکانیان لــەجولفا چــونکە وردەکاریــەکانی وێنــەی مۆنۆمێنتەکان بوو.

نەخشەساز و نەقاشەکانی ئەسفەهان و هیدیکەش بەردەوام بــوون لەنەخشەســازیی وەك: بوتڵ و مەسینە و قاپ و فینجانی ئاوەڕەنگ بەتێکەڵکردنی چــەند رەنگێــك. ئینجــا شــا عەباس یەکەم چەند کارێکی لەوانە لەچــین کــڕی و نەخشەســازەکانی ئــەوانیش ویســتیان وێنەیان لەبەر بگرنەوە بەڵام پێویستیان بــە کارامــەیی زۆرتــر و قــووڕی تایبــەت هــەبوو. لەدواییشدا نەخشەسازانی بواری مس بەپێش ئەوانەوە کەوتن.

لەلایەکی دیکەشەوە پیشەسازی دروسکردنی قوماش لەســەردەمی شــا عەباســی یەکــەم زیاتر گەشایەوەو شــێوەکار و تــەونکاران و بۆیاغچــیەکان بەشــێکی زۆری ئەسفەهانیان گرتبــۆوە و ژمارەشــیان بەهــەزاران بــوون، هــەموو بەرهەمەکانیشــیان بــریتی بــوو لــە هەناردەکردنی کاڵاکانیان. شا کارگەکانی دروسکردنی قوماشی تایبەت کرد بەو قوماشە چنراوانەی کە تەنها بۆ شــا و شــازادەکانی ئــەورووپای دەنــاردن و بەمــەش لــەنێوان ئــەو کارگانەدا کێبڕکێ دروستبوو لەسەر دروسکردنی چاکترین قوماش، لەهەمان کاتیشدا ئەو حەریرەی کە شا و پیاوە نزیکەکانی لەبەریان دەکرد و ئەو قوماشە چنراو و نەخشــدارانەی ئەوان دروستیان دەکرد زۆر لەو جل و بەرگانە جوانتربوون کە لەشانشــینە ئەورووپیەکانــدا لەبەردەکران و مەخمەلی کاشانیش لەهیچ شوێنێکی جیهان وێنەی نەبوو.

پیشەسازی چنین و وێنەو پێستە لەئێرانــدا گەیشــتە چــڵپۆپە، ســەردەمی شــا عەباســی یەکەمیش لووتکەی ئەم پێشکەوتنەی بەخۆیەوە بینی. وای لێهاتبوو کەوا مافوور ببــووە شتێکی زۆر پێویست بۆ مــاڵان هەروەك چۆن خەڵك پێویستیان بــە جــل و بــەرگی ســووف هەبوو، هەموو ماڵێکی ئێرانی ئەگەر هەژار و نەداریش بوونایــە و کەلوپــەلی ماڵیشــیان کەمبووایە دەبوایە مافوورێکیان هەبێ جا گرنگ نەبوو ئەو مافوورە باش بێ یا نــا، شــان

بەشانی ئەوەش لەماڵەکاندا هەندی کاری دەستی مسییان تێدابوو، بەکورتی لەهەموو ماڵێکدا مافوور هەبوو.

ئەوکاتە رەنگی قورمزیی تۆخ و سووری شەرابی تاریك باوی هەبوو، بەلاّم وێنەکانیان هێمنی و نەرمی بۆ تەماشاکەرانییان تێدابوو، زۆرێکیش لەرێکخستنی وێنەی گوڵەکان و نەخشەسازی عەرەبی لێرەو لەوێ دەبینران، هەروەها کارسازە ئێرانییەکان داوی زێڕ و زیوو و حەریریان لەکارەکانیاندا بەکاردەهێنا، ئەوەبوو شا فەرمانیدا کەوا لە حەریر مافوور دروسبکەن و ئەم پیشەسازییەش ناوبانگێکی زۆری پەیدا کردو کار گەیشتە ئەوەی پاشا هۆڵەندا کەهاودەمیی شا عەباس بوو داوای لەبازرگانەکانی کرد بچن مافووری حەریری لەئێران بۆ بکڕن تاکو کۆشکەکەی پێ برازێنێتەوە.

پیشەسازیی بەشێوەیەکی گشتی پێویستی بەدروسکردنی کارگەی نوێ و راهێنانی کرێکارەکان لەسەر پیشەسازیی جۆراوجۆر بوو کە ئەمە بووە هۆی بەرزبوونەوەی چینی پیشەوەران و کارسازان و زیادبوونی داهاتەکانیان و پاشان توانیان بۆخۆیان سەندیکایەك پێکبهێنن کە مافەکانیان بپارێزێت و بەرگرییان لێبکات.

بەمشێوەیە شا عەباسی یەکەم لەدوای ئەوەی سەقامگیریی بۆ ناوخۆی ولاّتەکەی گەڕاندەوە سەرکەوتنی وەدەسهێنا لەگەشانەوەی ئابووری، هەموو ئەوانەی لەدوای ئەویش دەسەلاّتیان گرتەدەست هەمان رێ و شوێنی ئەویان گرتە بەر بەلاّم نەگەیشتنەوە ئاستی ئەو گەشانەوەیە ئەو دروستی کرد.

## پەیوەندی شا عەباسی یەکەم و کرمانجەکان:

سەرەڕای ئەوەی شا عەباسی یەکەم لەگەڵ هۆزەکانی قزلباش و فەرمانڕەوای ویلایەتەکان و سەرکردەکان زۆر دڵڕەقبوو کەچی لەگەڵ کرمانجەکاندا زۆر دڵنەرم و میهرەبان بوو، هەمیشە جەختی لەیارمەتیدانی ئەوان دەکردەوەو باری سەختی سەرشانیانی سووك دەکرد و هەر دەسەلاّتدارێکیش غەدری لێکردبان ئەوا پشتی دەگرتن و دەیپاراستن، بەمەشەوە نەوەستا بەڵکو تۆڕێکی هەواڵنێریی تایبەت بەخۆی سازکرد تاکو هەواڵی دەسدرێژی و غەدری دەسەلاّتدارەکانی بۆ بهێنن کەدەرهەق بەخەڵکە هەژار و کرمانجەکانیان دەکەن.

کاتێکیش بەناو هەر شارێکدا گوزەری بکردبایە یەکسەر لەخەڵکەکەی دەپرسی حاکمەکەتان هەڵسوکوتی چۆنە لەگەڵتاندا؟ ئەگەر هاتوو سکالایان هەبووایەو لێی بێزاریان ئەوا یەکسەر لای دەدا. لەپاشانیش ئەو سەقامگیرییە سیاسییەی باڵی بەسەر ئێراندا کێشا هەلی بۆ گەشانەوە و بووژانەوەی بواری بازرگانی بۆ کرمانجەکان رەخساند، ئەم هاوسۆزییەی لەگەڵ ئەوان هیچ خەرجییەکی جەنگی نەدەخستە سەرشانیان، هەرکەسێك بەهۆی جەنگەکانیەوە دووچاری زیان بووبێتەوە ئەوا قەرەبووی دەکردنەوە، ئەم هەڵوێستەش پاڵی پێوەنان کەلەجەنگەکاندا خۆ بەکوشت بدەن و هەمیشە پشتگیری لەسیاسەتە سەربازییەکەی بکەن.

شا جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە، خواردن پێشکەشی ئەو کەسانە بکرێ کەسەردانی شوێنە پیرۆزەکان و مەزارگەکانی شیعە دەکەن، بەتایبەتیش سەردانیکەرانی مەزاری عەلی رەزا و گۆڕی شێخ سەفییەدین لەئەردەبیل و هەرکەسێکیش لەوانە پێویست بووایە یارمەتی دارایی پێشکەش دەکرد.

شا هەمیشە لەگەڵ کرمانجەکاندا هاوسۆز و نەرم بوو و لەکاتی کارەسات و برسێتی و هەژارییدا یارمەتی دەدان، تەنانەت هەندێك کەس بەهۆی ئەو هەموو دادوەری و سۆزەی بەرانبەر بە هەژاران هەیبوو بەئەنو شێروانی دووەمیان لەقەڵەم دەدا.

ئەم خۆنزیك کردنەوەی شا عەباس لەخەڵکە رەمەکەکەو سۆزدارییەی بەرانبەریان سیاسەتی دەسکردی خۆی بوو و لەکۆتاییشدا خزمەتی ئامانجەکانی خۆی پێکرد و هەر لەوانیش بەردەیەکی ناوخۆیی بەهێزی سازکرد و بەتەواوی پشتی پێی بەست و، ئەمەش بوو بە ستوونەدی ئەو سوپایەی کەلەدوای نەمانی دەسەلاتی قزلباشەکان لە سوپای سەفەوییەکاندا، دروستیکرد.

## کێشە ئایینیەکانی شا عەباسی یەکەم:

توندڕۆیی بۆ مەزەبی شیعە: شا عەباسی یەکەم ناوبانگی بەوەدەرکردبوو کەوا بۆ مەزەبی شیعی دوانزەیی زۆر توندڕۆیە و هەروەك و باب و باپیرانیش هەوڵێکی زۆری خستەگەڕ لەپێناو بلاوکردنەوە و سەرخستنی. لەنیشانەکانیشی ئەوەبوو شا لەهەموو بۆنە

ئایینی و مەزهەبییەکاندا بەشداری دەکرد و گرنگی زۆریشی پێدەدا، وەك لەدایکبوونی سەرجەم ئیمامەکانی شیعەو سازدانی پرسە لەساڵرۆژی شەهید بوون یا مردنیان، هەروەها لەرۆژی نۆزدەی مانگی رەمەزانەوە تاکو بیست و حەوت بەبۆنەی شەهیدکردنی ئیمام عەلی کوڕی ئەبی تالیب پرسەی سازدەکرد، جگە لەمانەش سازکردنی مەراسیمی پرسەداریی لەدە رۆژەکانی مانگی موحەررەم و شەوی عاشوورا بەبۆنەی شەهید کردنی ئیمام حوسێنی کوڕی عەلی.

هەروەها شا عەباس لەبانگێشدا دەستی بەو دەقەوە گرت کە شا ئیسماعلی یەکەمی باپیری زیادی کردبوو، ئەویش دەستەواژەی (اشهد ان عليا ولي الله)ی خستە پاڵ ئەو دەستەواژەیە کەلەسەردەمی فاتیمە زیادکرابوو (حي على خير العمل) و دەقە ئیسلامیە ناسراوەکەش. زۆریش سەردانی مەزاری شێخ و ئیمامەکانی شیعەی دەکرد و خزمەتی دەکردن و جارێکیشیان بەپێ خاوسی سەردانی مەزاری ئیمام عەلی رەزای کرد لەشاری مەشهەد و ماوەی سێ مانگ لەوێ مایەوەو بەردەوامیش خزمەتی دەکرد. لەساڵی ١٦٢٣ز کەبەغدای داگیرکرد و دەستی بەسەر شوێنە پیرۆزەکانی شیعەدا گرت لەکەربەلا و نەجەف و کوفە، پەلەپەلی کرد بۆ سەردانیان و ماوەی دە رۆژ لە مەزارگای ئیمام عەلی مایەوە و خزمەتی میوانەکانی دەکرد و زەوییەکەشی بەگەسك دەماڵی.

سەرەرای ئەو توندرەوییەی لەلایەنی مەزهەبی شیعەوە هەیبوو بەلام هەرگیز رێگەی بە پیاوانی ئایینی شیعەمەزهەب نەدەدا کەوا دەست لەکاروباری ولات وەربدەن و زۆر جاریش رووبەروویان دەبۆوە. ئاشکرایە ئەوانە لەدوای مردنی شا ئیسماعلی یەکەم و بەهۆی ئەو پشێوییەی کە ولاتی گرتبوۆوە دەستیان لەکاروبارە گشتیەکان وەردەدا، بەتایبەتیش لەسەردەمی حوکومرانی محەمەد خودابەندەی بێتوانا، ئەو کاتە پیاوانی ئایینی کاروبارەکانی ئایینیان فەرامۆش کردو لەدەوری ئەو کاروبارانەدا کۆبونەوە کەلێیانەوە پارەو پوولیان وەدەسدەکەوت ، کە ئاشکرایە هەموو ئەمانە دژبوون لەگەڵ پەیڕەویی ئایینی و ئەو حوکمە تاکڕەوییە بوو بەمۆرکی سەردەمی شا عەباسی یەکەم.

## هەڵوێستی لەدژی بێباوەڕەکان:

توندڕەویەکەی شا عەباسی یەکەم پاڵی پێوەنا کەوا دژایەتی خەڵکە بێباوەڕەکان بکات کە لەدەرەوەی ئایینی ئیسلامدا بوون و لەئێرانیشدا بڵاوببوونەوەو مەترسیان بۆ مەزەبی شیعی دوانزەیی دروسکردبوو، لەنێوانیشیاندا مەزەبی نوقتەویی (ئەم مەزەبەش لەوەوە هاتووە گوایە بەرای ئەوان هەموو بوونەوەرەکان لەبنچینەدا تەنها لەیەك خاڵ دروسبووینە و هەمووشیان دەگەڕێنەوە بۆ سەرەتا کەلەخاك دروسکراون و بەمەش بەمەزەبی نوقتەویی واتە خاڵبەندی ناسران).

(دەعوەی نوقتەویی) لەسەردەمی شا تەهماسبی یەکەم دووچاری راوەدوونان و قەدەغەکردن هات، بەڵام لەبەر ئەو پشێویەی کەلەسەردەمی شا ئیسماعیلی دووەم و محەمەد خودابەندە وڵاتی گرتبۆوە هەلی بۆ ئەم مەزەبە رەخساند کەوا پەرەبسێنێت و زیاتر پێبگات و لەیەکێك لەقۆناغەکانیشیدا مەترسی راستەوخۆی بۆ سەر مەزەبی دوانزەیی پەیداکردبوو. کاتێکیش شا عەباسی یەکەم بووە خاوەنی تاج و بەپێی بیروباوەڕەکانی تایبەتی خۆی دەبوایە لەناویان ببات و هەموو شوێنکەوتووانیشی بکوژێ، بۆیە سەرکردەکانی دەسگیرکرد کەلەنێوانیاندا دەروێش خەسرۆ و یوسف تورکیش دوز هەبوون و شوێنکەوتووانیشی پەرت و بڵاوکردن و هەشیان بوو بەناچاری روویان کردە هیندستان و چوونە پەنای جەلالەدین محەمەد ئەکبەری فەرمانڕەوا کە ناویانگی بە لێبووردەیی ئایینی و بەیەکەوە ژیان و یەکسانی لەنێوان سەرجەم ئایین و مەزەبەکاندا دەرکردبوو.

لەلایەکی دیکەشێ شا عەباس ئەو دووبەرەکی و کێشەیەی لەنابرد کە سەید محەمەد لەگەیلان سازیکردبوو و رایگەیاندبوو ئەو جێگری ئیمامی زەمان و مەهدی مونتەزیرە، بەمەش هەموو ئەو کەسانەی لەگەیلان ناکۆکییان لەگەڵ سەفەوییەکان هەبوو لەدەووری کۆببوونەوە. وادیار بوو لەبەر بەهێزی و جەماوەری زۆری شا پەنای بردە بەر فێڵ بۆ ئەوەی لەناوی ببات و پەرتە بەشوێنکەتووانی بکات. خۆی وانیشاندا کەبەتەمایە بچێتە ناو ئەو مەزەبەوە بەڵام لەپێشدا دەبێ دامەزرێنەرەکەی ببینێ و بیناسێ و لەرێگای خۆیەوە ئاشنایەتی لەگەڵ مەزەبەکەیدا پەیدابکات، بۆ ئەم مەبەستەش بانگهێشتی کرد بۆ

مازەندەران چونکە ئەو کاتە شا لەوێبوو، کاتێکیش هاتنە بەردەمی و خۆیـان پێناسـاند، خۆی و شوێنکەوتووانی قزڵبەسکرد و هەموو کوشتن.

هەڵوێسـتی بەرانبـەر مـەزهەبی سـوننە: توندڕۆییەکـەی شـا پـاڵی پێوەنـا کـەوا تۆڵـە لەسوننییەکان بکاتەوە و بەردەوام شەڕو پەلامار لەنێوانیانـدا بـەرپا دەبـوو، بەتایبـەتیش لەگەڵ ئۆزبەکەکان و عوسمانییـەکان و لەبـەر توونـدی دەسـگرتنی بەمەزهەبەکـەوە هـانی ئێرانیەکانی دەدا کەوا نەچنە مەکەو مەدینە بۆ حەجکردن بەڵکو ئەم فەرزەی سـەرشـانیان با لەمەشهەد و بەسەردانی مەزاری ئیمامی هەشتەم عـەلی رەزا بەجێبگەیـەنن، ئـەویش بەبیانووی ئەوەی کەوا فەرمانی سەرشانیان لەرووی نەتەوایەتییەوە رێگایان پێنادا بـەنێو خاکی عوسمانییەکاندا تێپەڕن و باجییان پێبـدەن، لەوێشـەوە دەسـتی کـرد بـەزیادکردنی سەردانەکانی خۆی بۆ مەشـهەد تـاکو هـانی ئێرانیـەکان بـدات لاسـایی بکەنـەوە. ئـەم رووداوانەش بەڵگەی ئەو توندی و دڵڕەقییەی شا عەباسن لەبەرانبەر سوننەکاندا:

- شا عەباس کوردەکانی ئێرانی کە هەموویان لەسوننەکان بوون لەناوبرد، چـونکە ئـەو هۆزە کوردانەی لەدەوروبـەری بـاکوری خـۆراوای ئازەربێجـان و ناوچـەکانی کوردسـتان دەژیان لایەنگری و هاوسۆزیی خۆیان بۆ دەوڵەتی عوسمانیی لەکاتی داگیرکردنی بەشـێکی زۆری خاکی ئازەربێجان راگەیاندبوو، کاتێکیش شا دەسـتی بەسـەر ناوچـەکانی ئەوانـدا گرت مکوڕبوو لەسەر ئەوەی تۆڵـەیان لێبکاتـەوەو ئاوارەیـان بکـات. لەسـاڵی ١٧١٤زا کاتێك هۆزی موکری لەدژی سەفەوییەکان راپەڕین، شا بڕیاریدا سوپا بەرەو شـوێنەکانیان هەڵمەت ببات و دەسبەسەر قەڵات و سەنگەرەکانیاندا بگرن لەوانەش قەڵای بسك و ماکۆ و لەوێدا دەووری شۆڕشگێڕەکانی گرت و سوپای سەفەویی فەرمانەکەی سەرشانی لـەدژی قەلا راپەڕیوەکان بەجێگەیاند و قەسابخانەیەکی گەورەیان بۆ سازکردن و زۆرێکیشیان لـێ دەربــەدەرکردن و ژن و منداڵیشــیان بــەتالان بــردن و لەدواییــدا ژمارەیــەکی زۆر خێزانەکانیشی بۆ شوێنی دیکە دوورخسـتەوە، ئینجا فەرمانیدا پانزە هەزار خێزانی کـورد لەکوردسـتانەوە بباتـە خۆراسـان و لەوێشـدا ئـەوانی کـردە دیوارێـك لـەنێوان خـۆیی و ئۆزبەکەکان، بەمەبەستی ئەوەی هەر پەلامارێك بکەن یەکەمجار ئەوان بگرێتـەوە و یـەکتر لەناوببەن و جگە لەوەش باجێکی یەکجار گەورەی خستە سـەریان و بـەردەوامیش لـەژێر

چـاودێرییەکی توونـدی دانـابوون کەبـەهیچ شـێوەیەك هـەلی رووبەرووبوونـەوەی بـۆ نەهێشتبوونەوە.

- شا عەباسی یەکەم قەسابخانەیەکی بۆ سەرجەمی دانیشـتوانی ولاتـی پشـت رووبـار ئەنجامدا لە شاری نەنـدەخود زۆریـش دلرەقبـوو بەرانبـەریان، لـەدوای ئـەوەی لەسـالی ١٦٠٢ز ئەم شارەی داگیرکـرد سـەرەتا دلنیـایی بەخشـیە دانیشـتوانەکەی و پێـی وتـن هەمووتان لەرووی کەسیی و مولك و سامانەکانتان دلنیابن کەس بەهۆی ئـەوەی چـووەتە سەر مەزەبی سوننە دەسدرێژیی ناکرێتـە سـەر، بـەلام لەسـالی ئایینـدە لـەدوای ئـەوەی لەگەمارۆی شاری بەلەخ و داگیرکردنی گەڕایەوە، بەبێ هیچ هۆشداریەك و هـیچ هۆیـەکی شایەستە فەرمانی کردە سەربازەکانی هەموو دانیشتوانی شارەکە لەناو بـەرن یـا دیلیـان بکەن، ئەوەبوو قازی و پیاو ماقوول و پیاوە بەناوبانگەکانی هەموو دیلکردو لەکۆتاییشدا هەر سەربازێکی سەفەویی دیلێکی لەپێشەوە دەڕۆیشت.

- شا عەباسی یەکەم بەرانبەر دیلەکانی ئۆزبەك و عوسمانییەکان زۆر دلرەقبـوو، ئەگـەر کەمترین ئازاری دابان بڕیاری دەدا چاویان بکۆلن، تـەنها لەیـەك کاتـدا دیلـەکانی ئـازاد دەکرد و لێیان خۆشدەبوو ئەگـەر وازیـان لەمەزەبەکـەی خۆیـان بهێنابـاو بهاتبانـە سـەر مەزەبی شیعی، یەکێك لەوانەش کە ئەمەی بەجێگەیاند شەریف بـەگی فـەرمانڕەوای وان بوو لە ئازەربێجان.

- کاتێك شا عەباس لەسالی ١٥٩٩-١٦٠٠ز لە شاری سیمنان دابەزی حـاکمی ئـەوێ ئەوەی رەتکردەوە کەوا ملکەچیی بۆ شا بکات، بۆیە لەتۆلـەی ئـەوەدا ژمارەیـەکی زۆری لەسوننەکانی لێگرتن و پاشان لەبەرنبەر لێخۆشبوون لەگوناهـەکانیان هـەر یەکـەی سـێ سەد تومەنی لێستاندن.

- لەسالی ١٦٠٩ز بە شا عەباسیان راگەیاند کەوا مەحمود دەبـاغی حـاکمی هەمـەدان کەلەسەر مەزەبی سوننەیە غەدر لەشیعەکان دەکات، بۆیە فەرمانیدا قۆلبەستیی بکـەن و بیکوژن، بەلام مەحمود توانی خۆی رزگاربکات، ئینجا شا هەڕەشەی ئەوەی لەدانیشتوانی هەمەدان کرد کە ئەگەر لەماوەی تەنها سێ رۆژدا مەحمود دەباغ خـۆی بەدەسـتەوە نـەدا

ئەوا هەرچی خەڵکی ئەو شارە هەیە هەموویان دەکوژێ و دەستیش بەسەر ماڵ و سامانی هەمووان‌دا دەگرێ، کاتێکیش مەحمود خۆی بەدەستەوەدا یەکسەر کوشتی.

ئەگەر هەستی بەوە بکردبایە لەبەرژەوەندی خۆی و وڵاتەکەیدایە واز لەدوژمنایەتی سوننەکان بهێنێ ئەوا بۆ ماوەیەک دەستی لەم کارە هەڵدەگرت. لەو پێناوەشدا پێشوازی لەبازرگانە سوننەکان دەکرد کە لەوڵاتی دیکەوە دەهاتنە ئێران و ڕێزێکی زۆری دەگرتن چونکە دەیزانی کە لەبەرانبەردا سوودێکی ماڵیی زۆریان لێدەبینێ.

ئاشکرایە بەهۆی ئەو دوژمنکارییەی بەرانبەر بەسوننەکان بەتایبەتی ئەو دوو دەوڵەتەی کە نوێنەرایەتیان دەکردن هەیبوو هەوڵیدا خۆی لەئەورووپییەکان نزیک بکاتەوە و پەیماننامەش لەگەڵ پاشاگاورەکانی ئەورووپا مۆربکات لەپێناوی ئەوەی دەوڵەتی عوسمانیی سوننە مەزەب لاوازبکات.

هەڵوێستی بەرانبەر بە گاورەکان: شا عەباسی یەکەم بەپێچەوانەی خەڵکی سوننە مامەڵەی لەگەڵ گاورەکاندا دەکرد و چاوپۆشی لەچالاکیەکانی مزگێنیدەرانی ئەورووپیەکان لەناو ئێراندا دەکرد کەبەئارەزووی خۆیان ئاینی مەسیحی تێدا بلاّوبکەنەوە، پێشتریش باسی ئەوەمان کردبوو کە سوپایەکی تایبەتی دروسکردبوو و هەموو سەربازەکانی لەو مەسیحیانە بوون کە دانیشتووی ئێران و ئەو شوێنانە بوون کەلەژێر دەسەلاّتی سەفەوییەکاندابوون، بەئەنقەستیش شەش هەزار ئەرمەنی لەساڵی ١٦٠٤ز لەخاکی خۆیان گواستەوە بەمەبەستی ئەوەی لەپەلاماری عوسمانییەکان بۆ سەر ئازەربێجان بیان پارێزێ و دابەشی کردن بەسەر ویلایەتە جۆربەجۆرەکانی ئێران و بۆ هەندێکیشیان کۆمەڵگای تایبەتی لەنزیک ئەسفەهان سازکرد و ناویشی لێنا جولفا کەناوی پایتەختەکەیان بوو لە ئازەربێجان و، لەهەمان کاتیشدا کڵێسایەکی بەمەبەستی ئەوەی هەست بەگۆڕانیی کەشوهەوای تازە نەکەن، بۆ دروسکردن و بۆ کەسیش نەبوو جگە لەگاورەکان لەوێدا نیشتەجێبن.

شا عەباس زۆر زیادەڕۆیی کرد لەو سۆزدارییەی بەرانبەر بە گاورەکانی ئێران دەریبڕی، هەروەها ڕێزێکی زۆری ئەو ئەورووپیانەی دەگرت کەدەهاتنە نێو کۆشکەکەی. لەوانەیە

ئەو هەڵسوکەوتە چاکانەی کە شاعەباس لەگـەڵ گاورەکـان بەشـێکی دیکـەی سیاسـەتی بازرگانی و سەربازیی بێ:

- وەدەستهێنانی سۆزی دەوڵەتە ئەورووپیە گاورەکان و سـازدانی هاوپـەیمانێتی لـەدژی دوژمنی هاوبەشیان کە ئەویش دەوڵەتی عوسمانیی بوو.

- سوود وەرگرتن لەشارەزایی گاورەکانی وڵاتەکەی تەنانـەت ئەرمەنـەکانیش لـەبواری چالاککردنی بازرگانی بەتایبەتیش بازرگانی حەریر.

جولفا بوو بەناوەندێکی نوێی چالاك بۆ گاورەکانی ئێران، هەروەها رۆڵێکی گرنگـی گێـڕا لەمانەوەی مەسـیحیەکان لەئێران و بلاْوکردنەوەی پەیڕەویی مەسیحیەت، ئـەم ناوەنـدەش تا ماوەیەکی زۆر پڕبـوو لەمەسـیحیەکان و بازرگانـەکانی ئـەورووپی. لەسـاڵی ١٦٠٨ز فەرمانیدا کەوا هـیچ کەسـێك دەسـدرێژییان نەکاتەسـەر و ئـازادیی تەواویشـیان هـەبێ لەگەڕان و سووڕانەوە بەهـەموو ناوچـەکانی دەوڵـەتی سـەفەویی. ئـەم هەڵوێسـتەی شـا ئەوانەی هاندا کەوا بەردەوام هامووشۆی ئێران بکەن و پەیوەنـدیی بازرگانیشـیان لەگـەڵ تووندو تۆڵ بکەن.

وادیاربوو شا تەنها دڵی بەوەندە خۆش نەدەبوو کەوا هەڵسوکەوتی چاك دەرهەق گاورەکان بکات، بەڵکو مکوڕ بـوو لەسـەر بەشـداری کردنیـان لەبۆنـە ئایینیەکانیانـدا. لەسـاڵی ١٦٠٩ز ژمارەیەکی زۆری بـەراز لەکەردجـەوە هێنـاو بەبۆنـەی جەژنـەوە وەك دیاریـەك پێشکەشی گاورەکانی گولفا کرد و پاشان سەردانی کردن و پیرۆزبایی جەژنەکەی لێکـردن و بەشداریکردن لەمەیخواردنەوەدا، دوایی فەرمانی بەدەووروبەری خـۆی کـرد کەئـەوانیش مەی بخۆنەوە، بۆ زانیاریش ئەو جەژنەی مەسـیحیەکان کـەوتبوە پـانزەمین رۆژی مـانگی رەمەزان و هیچ گرنگیی بەپیرۆزیی ئەو مانگە نەدا.

مەسیحیەکانیش هەوڵیاندا کەوا لەلای خۆیانەوە سـوود لـەم نزیکبوونەوەیـە وەربگـرن و نوێژەکـەیان بـەبوونی شـا قـوولترکردەوە و داواشـیان لێکـرد کـەوا رێگایـان پێبـدا لەبلاْوکردنەوەی ئایینی مەسیحی لەئێرندا و ئەویش ئەم داوای قبـوڵ کـردن و فەرمانیـدا کڵێسایەکی لەسەر خەرجی تایبەتی خۆی لەگولفا بۆ مەسیحیەکان دروستبکەن.

لەخەسڵەتەکانی دیکەی سۆزداری لەگەڵ گاورەکانیش ئەوەبوو دەچووە کڵێساکان و گوێی لەوتارە ئایینی و ڕێنماییەکانیان دەگرت و تەماشای مەراسیمە ئایینیەکانیشی دەکردن، هەروەها گفتوگۆی ئایینی لەگەڵدا دەکردن و تاگەیشتە ئەوەی شارەزاییەکی زۆری لەئایینی مەسیحی پەیداکردو ئەمەش هانی پیاوە ئایینیەکانی مەسیحیدا کەداوای لێبکەن بێتە ناو ئایینی مەسیحیەوە، بەڵام ئەو داوای لێبووردنی لێکردن و زۆر بەنەرمییەوەش وتی ئەم بابەتە دوابخەن بۆ کاتێکی دیکە.

بەهۆی نزیکبوونەوەی شا و سۆزدارییی لەگەڵ نەسارییەکان تۆمەتی لاوازی لەباوەڕی بەئایینی ئیسلامیی و مەزەبی شیعەییان خستە پاڵ، بەلاّم مێژوونووسە فارسەکان ئەم رەوشتەی دەکەن بیانووی ئەوەی کە پێویستیەکی سیاسی بووە لەو باروگوزەرانەی ئەو کاتەدا، چونکە بەردەوام لەگەڵ عوسمانییکاندا لەکێشەدابووە، هەروەها ئەوەشی دەخەنە پاڵ گوایە ئەو زۆرداریی لەکەرەجییەکان کردووە و وڵاتی لێ کاولکردوون و پاشان کڵێساکانی لێکردوون بەمزگەوت و هەروەها کاتێکیش بازرگانێکی گاور نەیتوانیبایە قەرزەکەی بداتەوە ئەوا لەبەرانبەردا داوای لێدەکرد ببێتە موسوڵمان و ئەویش لێی خۆشدەبوو.

لەراستیشدا ئەم هەڵسوکەوتەی لەگەڵ مەسیحییەکان کارێکی لاوەکی بوو، چونکە لەبنچینەدا ئەو مامەڵەیەکی زۆر باشی لەگەڵدا دەکردن. بەلاّم هێرش کردنە سەر کەرەجیەکان و کاولکردنی وڵات و کردنی کڵێسایان بە مزگەوت وەك سزایەك بوو لەبەرانبەر ئەو شۆڕشەی لەدژی دەسەلاّتی ئەو کردیان و بەهیچ شێوەیەکیش وێنەی ئەم کار و فەرمانانەمان بەرچاو نەکەوتووە لەسەردەمی هیچ کام لەفەرمانڕەواکانی سەفەویی.

## چالاکیەکانی شا عەباسی یەکەم لەبواری بیناسازییدا:

گواستنەوەی پایتەخت بۆ ئەسفەهان: شا ئیسماعیلی یەکەم تەورێزی کردە پایتەختی خۆی، بەلاّم بەهۆی نزیکی لەسنووری دەوڵەتی عوسمانییەوە هەمیشە لەژێر مەترسی پەلامارەکانیانبوو و چەندین جاریش داگیرییان کردبوو، شا ناچاردەبوو کە لەوێ رابکات و بەرەو قووڵایی خاکی ئێران ئۆغربکات، بۆیە شا تەهماسب قەزوینی کردە پایتەخت کەلەناوەوەی خاکی ئێرانبوو، ئەم پایتەختە بەم شێوەیە مایەوە تا سەردەمی شا

ئیسماعلی دووەم و شا محەمەد خودابەند و یەکەمین دە ساڵی سەردەمی شا عەباسی یەکەم و ئەم ماوەیەش دەکاتە لەساڵی ١٥٨٨ز وە تا ١٥٩٨ز. ئەم شایە هەستی کرد کەوا تەوریز شارێکی تەنگەو جێگای ئەو هەموو خەڵك و دەسوپەیوەندەی سوپای تیا نابێتەوە، هەروەها سەرچاوە تاوییەکانی زۆر کەم بوون و بەشی کشتوکاڵی هەموو خەڵکەکەی نەدەکرد، لەبەر ئەوە دەستی کرد بەگەڕان بەدوای شوێنێکی دیکە بۆ ئەوەی بیکاتە پایتەخی خۆی، لەکۆتاییدا چاوی کەوتە سەر ئەسفەهان کە ئەم شارە خاوەنی کەشوهەوایەکی ساز و خاوێن و لەبار و ئاوێکی زۆربوو و، لەوێدا گۆشت ئەگەر ماوەی یەك مانگ لەناو مەنجەڵدا بمایەتەوە هەرگیز بۆنی نەدەگۆڕا و، خاکەکەشی گونجاوترین خاك بوو لەهەموو جیهانداو سێویش بۆ ماوەی حەوت ساڵان تێیدا دەمێنێتەوە بەبێ ئەوەی بترشێ و تەنانەت گەنمیش لەوێدا بۆگەن ناکات هەروەك چۆن لەشوێنیدیکەدا گۆڕانی بەسەردادێ، لەوێدا جێگایەکی تایبەتی هەیە کەهەرگیز مردوو تێیدا نارزێ و دەکەوێتە سەر رووباری زایەندەروود و بەمەش دەتوانن کشتوکاڵێکی چڕوپڕ ئەنجام بدەن کەبەشی هەموو سوپا و دەسوپەیوەند و دەووروبەرەکەی فەرمانڕەوایەتی بکات جگە لەدانیشتوانەکەی خۆیشی. لەهەمان کاتیشدا دەکەوێتە قوولایی خاکی ئێران و بەمەش لەهێرشەکانی عوسمانیی دوور دەکەوێتەوە، و هەرگیز ناکەوێتە بەر هەڕەشەی داگیرکاری وەك ئەوەی هەمیشە تەوریز بەسەری دەهات، لەهەمان کاتیشدا دەکەوێتە سەر رێگای بازرگانیی بەیەك گەیەنەری کەنداوی عەرەبی و تاران لەلایەك و لەلایەکی دیکەش رێگای بازرگانیی حەریری نێوان چین و ئەورووپا کەبەناو دەریای قەزویندا دەڕوات بەیەکەوەیان دەبەستێتەوە، ئەوکاتەش شا خۆی ئامادە دەکرد بۆ دەرکردنی عوسمانییەکان لەئازەربێجان و بەشێکی زۆر و بەرینی عیراقی عەجەمی، لەبەر ئەم هۆیانە جەختی کردەوە لەسەر ئەوەی پایتەخت بگوازێتەوە قوولایی خاکی ئێران و لەساڵی ١٥٩٨ز ئەم پرۆژەیەشی بەئەنجام گەیاند.

## دامەزراوە مەدەنیەکانی پایتەخت:

شا گرنگی بە دامەزراندنی پایتەختە نوێیەکە و رازاندنەوەی دەدا، لەم پێناوەشدا زۆرێك لە باڵەخانەی گەورە و گۆڕەپانی گشتی و هەروەها باخ و چیمەنی گەورەی گشتیی تیادا

دروســـتکرد، لـــەجوانی و پێشـــکەوتن و رازاوەییـــدا هـــیچ شـــارێکی دیکـــەی ئێـــران نەیدەگەیشتێ، بۆیە پێیان دەگوت (ئەسفەهان نیـوەی جیهـان)، لەلایـەکی دیکـەوە ئـەم پایتەختە دانیشتوانێکی زۆری لێبوو کەژمارەیان دەگەیشتە نزیکەی شـەش سـەد هـەزار کەس.

## ئەمانەش لەگرنگترین دامەزراوە مەدەنیەکان بوون:

گۆڕەپانی نەقشی جیهـان یـا گۆڕەپـانی شـا: ئـەم گۆڕەپانـە کـەوتبووە ناوەنـدی شـار و شێوەیەکی لاکێشەیی هەبوو و درێژییەکەی نزیکەی ١٦٧٤ پێ دەبـوو بـەڵام پانییەکـەی ٥٤٠ پێبوو و هەر چوار دەووریشی بەدار رازابۆوە و لەتەنیشتەکانیشی شوێنی حەوانەوەی لێبوو کە بەچەتر سەریان گیرابوو، لەم گۆڕەپانەشدا پێشبڕکێی تیرهاوێژیی و ئەسپ سواری و شەڕە کەڵەباب و چەندین جۆر ئاژەڵی دیکە دەکرا. شـا لەهـەیوانێکی تایبـەت بـەخۆی لەباڵەخانەی عالی قاپی تەماشی دەکردن و لەهەندێك کاتیشدا بەشداری یاری قاشـوانێی دەکرد. لەدوای ماوەیەکیش شا ناوی ئەم گۆڕەپانەی گۆڕی لەنەقشی جیهانەوە کـردی بـە گۆڕپانی شا، کەتاکو ئێستا ئەم گۆڕەپانە هەر بەم ناوە ناسراوە.

عالی قاپوو: شا عەباس یەکەم لەدوای ئەوای پایتەخی گواستەوە بـۆ ئەسـفەهان لـەنزیك کۆشکە کۆنەکەی خۆیدا باڵەخانەیەکی بچووکی لێبوو کە دەیڕوانییە سـەر گۆڕەپانەکـەی نەقشی جیهان لەلای خۆراوایەوە و ئەم باڵەخانەیەش پاشـاوەی سـەلجوقی و تەیمووریـەکان بوو، ئەویش ئەم شـوێنەی پـێ بـاش و گونجـاو بـوو، بۆیـە بڕیاریـدا هـەر لەوێـدا چـەند باڵەخانەیەك لەتەنیشت یەکەوە دروسبکات ناوی لێنان عالی قـاپی واتـە دەرگـای بڵنـد، بەمەش لاسـایی عوسمانییـەکانی کـردەوە. شـا زیادەڕەیـەکی زۆری لەرازاندنـەوەی ئـەم کۆشکە شاهانەیەدا کرد، هەروەها گرێژەنەی دەرگای کۆشکەکەی لەنەجـەف هێنـا و ئـەم کارەشی زیـاتر کۆشـکەکەی بـەناوبانگ کـرد، بـۆ پـیرۆز راگرتنییشـی، هـەموو جـارێ لەنزیکیەوە شا لەسواری ئەسپەکەی دادەبەزیی و بەپێ دەچووە ناو کۆشکەوە.

ئەم کۆشکە بریتیی بوو لەسێ نهـۆمی سـەرەکی، هـەر یەکێکیشـیان لـەدوو قـات پێـك هاتبوو، بەمەش ژمارەی نهۆمەکانی دەبووە شەش و نزیکـەی چـل و هەشـت مـەتربوو و بەرزی دەروازەی سەرەکیەکەشی دەگەیشتە بیست و هەشت مەتر. هـەروەها نهۆمـەکانی

سەرەوەی تایبەت کردبوو بەخۆی و زۆربەی کاتیشی لەوێ بەسەردەبرد و هەر لەوێشەوەی کاروبارەکانی دەوڵەتی رادەپەڕاند.

هەر نهۆمێکیش لەهۆڵێکی گەورەی سەرەکی و چەندین ژووری بچووك و گەنجینە پێکهاتبوو، دیواری هەموو باڵەخانەکەش بەرەنگی زەرد و چەندین رەنگی دیکەی جوانی جۆراو جۆر رازابۆوە و لەهەمانکاتیشدا بنمیچیش بەرەنگی زێڕیی نەقشکرابوو. هۆڵە سەرەکیەکەشی کەوتبووە رووی پێشەوەی کۆشك و لەناوەڕاستیشدا چەندین ستووندەی داری تێدابوو، لەهەمان کاتیشدا شا ئەم هۆڵەی تایبەت کردبوو بە کۆڕ و کۆبوونەوە و یادە تایبەتییەکانی وەك: جەژنی نەورۆز و نمایشی سوپا و پێشوازی نێردراوە بیانیەکان، هەر لەوێشەوە تەماشای پێشبڕکێ و شەڕی ئاژەڵە دڕندەکانی ناو گۆڕەپانەکەی دەکرد.

کەچی سەرەڕای ئەو هەموو جوانیەی باڵەخانەکە لەدوای رووخانی دەوڵەتی سەفەویی ئەو و سەرجەم کارسازیەکانی سەفەویی پشتگوێخران.

مزگەوتی شێخ لوتفوالله: ئەم مزگەوتە کەوتبووە خۆرەڵاتی گۆڕەپانی نەقشی جیهان و لەتەنیشتیەوە قوتابخانەیەك دروستکرابوو بۆ ئەوەی ببێتە بارەگای شێخ لوتفوالله ئەلعاملی کە خەڵکی چیای عامل بوو لەلوبنان. لەساڵی ١٦٠٢ز دەستکرا بەدروستکردنی مزگەوتەکەو لەساڵی ١٦١٩ز کۆتایی پێهات و لەسەر زۆربەی دیوارەکانایش ئایەتەکانی قورئان نووسراو، شانبەشانی چەندین دەستەواژەی جوان و سەرنجراکێش. گونبەدەکەشی بەجوانترین گونبەدی سەردەمی سەفەوییەکان دادەنرێت و بەتاکە گونبەدی سەرجەم ئاسیاش دادەنرێ لەرووی پێکهاتەوە ئەو کارسازییەی کە تێیدا کراوە. تاکو ئێستا ئەو مزگەوتە هەر ماوەتەوە، شایانی باسیشە کەوا لەساڵی ١٨٨٩ و ١٨٩٠ز و لەسەردەمی رەزا شا پەهلەوی جارێکی دیکە سازکرایەوە.

مزگەوتی شا: ئەم مزگەوتەش کەوتبووە لای خۆراوای گۆڕەپانی نەقشی جیهان و نێوان کۆشکی عالی قاپی و مزگەوتی لوتفوالله. لەساڵی ١٦١٢ز دەستکرا بەدروستکردنی و بەدوو قۆناغ کارەکانی تەواوبوون: لەقۆناغی یەکەمدا توانرا رێڕەوی سەرەکی مزگەوتەکە کە رووبەرووی گۆڕەپانەکە بوو سازبکرێ و لەساڵی ١٦١٦ز کۆتایی پێهات و شا زۆر پەلەی لەتەواوکردنی ئەم قۆناغە دەکرد چوونکە ئارەزووی دەکرد جوانی و رازاوەیی

گۆڕەپانەکەی پێ تەواو بکات. بەڵام قۆناغی دووەم کە تاکو کۆتاییەکانی سەردەمی شا و لەوانەشە دوو ساڵ دوای مردنی ئەویشی پێچوو لەساڵی ١٦٣١ز تەواوبوو.

مزگەوتەکە لەسێ گونبەد و چوار سەرەکی پێکهاتووە، گەورەترین هۆڵییش ئەوەیان بوو کەرووی لەقیبلەبوو و گونبەدی ئەویش لەهی هەموویان گەورەتربوو، لەتەنیشت ئەم گونبەدەش دوو منارەی بانگی لێ دروستکرابوو، هەروەها لەنزیك میحرابی ئەم شوێن نوێژە گەورەیەدا لەیەك تاکەبەردی مەڕمەڕ سازکراو پاش ئەوەش کەرازانرایەوە کرایە سەکۆیەك بۆ وتارخوێنیی. ئەم مادەیەش لە رانغۆنی هیندستانەوە هێنرا، هەروەها ستووندەکانیشی زۆر بەرزبوون و هەمووی وەك یەکبوون و لەناو و دەرەوەشیدا بەنەخشی ئاوزێڕی مینا رازابۆوە و هەر چوار دەوریشی بەبەردی قەرمید رازابۆوە و لەناویشیاندا ئایەتەکانی قورئانی نوسرابوونەوە، لەناوەندی حەوشەکەشیدا حەوزێکی گەورەی تێدا بوو کە لەمەڕمەڕ سازکرابوو.

شەقامی چهارباغ: شا رێگای بەنێوان گۆڕەپانی نەقشی جیهان و ئەو باڵەخانانەی دەیانڕوانییە سەری بەدروسکردنی رووبارێك شەقکرد و لەسەر ئەم رووبارەش پردێکی بۆ پەڕینەوە سازکرد و بەپردی وێردی خان ناوبانگی دەرکرد و کەسەرکردەی سوپا و حاکمی فارسبوو، ئەم رووبارە تا کۆتایی چیاکانی خوارووی ئەسفەهان درێژەی دەکێشا، هەروەها فەرمانیدا کەوا چوار ریز دار لەسەر لێوارەکانی بڕوێنن، بۆیە بە چوار باغ ناسرا و درێژیەکەشی لەسێ کیلۆمەتر زیاتر بوو.

لەسەر گوزەرگای ئەم رووبارەشدا هەیوانێکیان سازکرد لەبەر بەرزیەکەی دەیڕوانییە سەر رێگاکان و ناویان لێنا جیهاننما واتە نیشاندەری جیهان. ئەو بەشەی کەجیهاننما و رووباری زایەندەروود بەیەکەوە دەبەستێتەوە ناوی رێگای چوارباغی خوارووبوو.

لەسەر کۆتایی رێگاکە باغێکی پان و بەرینی بەپلیکانەی لێدروستکرا کەبەرزیەکەی دەگەیشتە نۆ نهۆم و ناویان لێنا باغی عەباس ئاباد، لەناوەراستی ئەم باغەشدا کۆشکێك دروستکرا ناویان لێنا (هزار جريب) واتە هەزار هەزار مەتر، ئەو بەشەی کەلەرووباری زایەندەروود هەڵکشابوو بەرەو کۆشکی هەزار جریب بە چهارباغی سەروو ناوی دەرکرد.

شا ئــەم شــەقامەی بەســەر شــازادەکانی دەوڵــەت و پیــاو مــاقوولان و فەرمانڕەواکانــدا دابەشکرد و فەرمانی پێکرد کەوا بیڕازێننەوە و هەر کەســە و لــەنزیك پارچــەکەی خۆیــدا باغێك دروسبکات. ئەم ڕێگایە تا ئەندازەیەکی زۆریش بەلای گەشتیارە ئەوروپییەکانەوە جوان و دڵگیربوو. ئێرانییەکانیش بۆ پیاسەو رابواردن سەردانی باغەکانی ئەو ناوچــەیەیان دەکرد و بۆنی خۆشی گــوڵ و ئــاو و هــەوای خۆشــییان لــێ هەڵدەمــژی. لــەدوای هــەموو ئەمانەشدا شا ڕۆژێکی تایبەت کردبوو بەئافرتان.

دەسکەوتی دیکە: لەدەسکەوت و کارە بەرچاوەکانی لەبوارە جۆربەجۆرەکاندا شا هەمیشە مزگەوتی تازەی دروسدەکرد و مزگەوتە کۆنــەکان و مــەزار و گۆڕستانەکانیشــی ئــاوەدان دەکــردەوەو، لەوانــەش گونبــەد و مــەزارگای ئیمــام رەزای لەســاڵی ۱٦۰۱ز لەمەشــهەد ئاوەندانکردەوەو پاشان مەزارگای ئیمام عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەنەجەف ســازکردەوە و ئەویش لەدوای ئەوەوە هات کە لەساڵی ۱٦۲۳ز دەستی بەســەر بەغــدادا گــرت و پاشــان ئاوی لەرووباری فوراتەوە گەیاندە مزگەوتی کوفە، جگــە لەمانــەش چــەندین مزگــەوت و مەزارگەی دیکەشی لەسەرتاسەر ئێراندا چاککردەوە.

سەرەرای ئەمانەش شا چەندین کۆشك و باڵەخانە و باغی گشتی گۆڕەپــانی پــان و بــەرین دروست کردو، چەندین ناوچەی نیشتەجێبوونی تازەی سازکرد کەلەپاشاندا بــوون بەشــاری سەربەخۆ، وەك نەجەفی ئەشرەف و گولفای نوێ لەنزیك ئەسفەهان.

شا گرنگی زۆریشی دەدا بەدروستکردن و چــاککردن و ئاوەدانکردنــەوەی ڕێگاوبانــەکان و پارێزگــاری کردنیــان و دروســتکردنی شــوێنی حەوانــەوە و نــانخواردن و نووســتن تــاکو بازرگانەکان بەئارەزووی خۆیان پێیدا تێبپەڕن و ببێتە هاندەرێك بۆیــان بــۆ ئــەوەی زیــاتر پەرە بەچــالاکیەکانیان بــدەن، ئینجــا چــەندین کارگــەی دروســتکردنی چــەکی ئــاگرینی دروســتکرد.

هەروەها شا لەسەر رووبارەکاندا پردی زۆری دروسکردبوو، وەك پردی وێردی خــان لەســەر رووباری زایەندەروود کە بەشی خواروو و ســەرووی چــوارباغی لەیــەك بەســتبۆوە، ئینجــا پردی گولفــا کــە شــاری گۆلفــای نــوێی ئەســفەهانی بەیــەك دەبەســتەوە و لــەدوو نهــۆم پێکهاتبوو. کەدرێژیەکەی دوو سەد و پێنج مەتر و پانیەکەیشــی ســێزدە مــەتر و حــەفتا

سانتیمەتربوو و شەش ڕێگای پەڕینەوەشی لەسەر بوو، هەندێك لەوانەش تایبەت بوون بەپەڕینەوەی سوارەکان هەندێکی دیکەش تایبەت بوون بە پەڕینەوەی پیادەو هەندێکیدیکەشیان تایبەت کرابوون بەگەشتوگوزار، کەچی سەرەڕای ئەو هەموو درزەی کەتێی کەوت و زۆر بەشیشی لێ رووخا ئێستا هەر بەیەکێك لەپردە هەرە بەناوبانگەکانی جیهان دادەنرێت و تا ئێستاش ماوەتەوە.

گومانی تێدا نییە کە ئەو کارسازییانە شا عەباسی یەکەم لەئەسفەهاندا کردی بەتایبەتی بیناسازیی و ئاوەدانکردنەوە سەرنجراکێشەکان و نوێکردنەوەی بینا کۆنەکان و ئەو هەموو جوانکاریەی لەشارەکەدا کردی بەڵگەی ئەوەن کەبە نیوەی جیهان وەسفی بکەن.



# بەشی شەشەم
# شا عەباس یەکەم
# ١٥٨٨-١٦٢٩زایینی
# پەیوەندیەکانی لەگەڵ جیهانی ئیسلامی

## دژایەتی ئۆزبەک لەسەر خۆراسان:

بەرایی: شا عەباسی یەکەم ململانێی مەزەبی لەگەڵ سوننەکاندا بە بۆماوەیی پێیگەشتبوو مەبەستیش هەردوو دەوڵەتی ئۆزبەك و عوسمانییەکان بوون، هەروەها سەرکردەکانی سەفەویی هێندەی دیکە ئەم کێشەیەیان قوولتر کردبۆوە، هەمووشیان بەناوی پارێزگاری کردن لەتەختی پاشایەتی شا عەباسی یەکەم سازیان دەکرد. لەهەموشیان سەر سەختتر لەم ململانێیەدا مورشید قوولی خانی تەکیلوو و عەلی قوولی خانی سەرکردەی شاملوو بوون. ئەم ململانێیەش هەردووکیانی لاوازکرد و هەلی بۆ ئۆزبەکەکان رەخساند کە خۆراسان داگیربکەن.

بەهۆی سەرکەوتنەکانی مورشید قوولی خان کە وەسیی و سەرپەرشتیاری میرزا عەباسی لەعەلی قوولیل خان سەندەوە هەوڵی ئەوەی دەدا کەوا یارمەتی لەدەرەوە وەربگرێ بۆ ئەوەی جێگە و پایەی خۆی لەخۆراساندا بگێرێتەوەو بەمەش دەستی کرد بەپەیوەندی کردن بە عەبدوڵلاخانی دووەمی سەرکردەی ئۆزبەکەکان کە بەناوبانگترینی پاشاکانیانبوو لەساڵی ١٨٥٣-١٥٩٨ز و هانیدا کەوا هێرش بکاتە سەر خۆراسان و پەیمانی پێدا کەوا:

- ببێتە لایەنگری و بەندە فەرمانی.
- شاری هەراتی بخاتە دەست.
- یارمەتی بدات لەداگیرکردنی عیراق و هەمەدان.

مورشید قوولی خان لەو ماوانەدا و لەگەڵ عەباس میرزا بەرەو هەرات دەچوون بۆ ئەوەی لەدەستی دوژمنەکەیان بیهێننە دەرەوە، هەرکە لەشارەکە نزیک بووەوە هەواڵی ئەوەی

پێگەیشت کەوا سوپایەکی گەورەی ئۆزبەکـەکان بـەرەو شـار بەڕێوەیـە بەسـەرکردایەتی عەبدوڵلاخانی دووەمــەو بەمــەش لــەم هەڵمەتــەی پاشــگەز بــووەوەو بــەرەو مەشــهەد و لەوێشەوە بەرەو قەزوین گەڕایەوە، بۆ ئەوەی لەلایەکەوە لەمەترسیەکانی ئــۆزبەکی خــۆی دووربگرێ و لەلایەکی دیکەشەوە دەسەلاّت لەمحەمــەد خودابەنــدە وەرگرێتــەوەو بیخاتــە دەستی خۆی و وەسیی لەسەر کراوەکەی.

رووخانی هەرات: کاتێك عەبدوڵلاخانی دووەم لەشاری هەرات نیزك کەوتــەوە نامەیــەکی بۆ عەلی قوولی خان ناردو تێیدا ئاگاداری کردەوە کەوا لەسـەر داواکاریەکەی ئەو هــاتووەو دەبێ ئەویش پەیمانەکەی خۆی بەجێبهێنێ، هەروەها بەناوی ئــەوەوە لەســەر مینبــەرەکان وتاربخوێندرێ و دراویش بەناوییەوە چاپبکرێ، لەبەرانبەر ئەوەی کە ئەم شارە یاخود هــەر شارێکی دیکەی ولاّتی پشت رووباری بخاتە ژێر دەست.

وادیارە عەلی قوولی خان دەرکی بەوەکردبوو کەوا ئەو هەموو پابەندیی و جێبــەجێکردنی ئەو هەموو فەرمانانەی چ مەترسیەکی هەیە بۆیە بڕیایدا لەم ئاستەدا بوەستێ و چــیدیکە هەوڵی بەجێگەیاندنی ئەم پیلانە نەکات و لەوانەشە هەســتی بــەوەکردبێ کــەداگیرکردنی هەرات لەلایەن عەبدوڵلاخانی دووەم و پاشان خۆراسان مەترسی و هەڕەشەکانی سەفەویی لەسەر لادەبات کەلەسەر شانی هۆزە تورکمانەکان ئــەم دەوڵەتــە دروســتبووەو هۆزەکــەی ئەویش یەکێکە لەوان، و بڕیاریدا رووبەرووی هێرشی ئۆزبەکەکان ببێتەوە.

بەلاّم عەبدوڵلاخان لەبەزاندنی هێڵەکانی بەرگری شار ســەرکەوتنی بەدەســتهێناو مــاوەی یانزە مانگیش گەمارۆیەکی سەختی خستە سەر شــارەکە. کەچــی عــەلی قــوولی خــان و شوێنەکەوتووانی زۆر بەتووندی پارێزگاریان لەشارەکە دەکرد و بەهیوای ئەوەش بوو کــەوا لە قەزوینی پایتەختەوە یارمەتی پێبگات و بەلاّم وادیاربوو لەوێدا خانەوادەی دەسەلاّتدار سەرقاڵی کێشەی نێوان میرزاعەباس و شامحەمەد خودابەنــدەی بــاوکی بــوون و هیچــیش سەرنجی ئەو مەترسیانەیان نەدا کەدەووری هەراتی داوە.

کاتێکیش کێشەکە بەلای شا عەباســی یەکەمــدا کەوتــەوە بڕیاریــدا بــەهێزی ســەربازی یارمەتی مامۆستا و پەروەردەکاری خۆی عەلی قوولی خان بدات تاکو بتوانێ رووبــەرووی گەمارۆیی ئۆزبەکەکان ببێتەوەو، هەموو رۆژێکیش فەرمانی بــۆ مورشــید قــوولی خــانی

بەپرسی تواناکانی دەوڵەت دەنارد کەوا پەلە بکات لەناردنی یارمەتییە سەربازییەکان، بەڵام مورشید قوولی خان سستی و خاوەخاوی دەکرد لەجێبەجێکردنی فەرمانەکانی شا عەباس، ئەویش بەهۆی ئەو هەموو رقوکینەیەبوو کەبەرانبەر عەلی قوولی خان هەیبوو، لەهەمان کاتیشدا لەوە دەترسا کەوا پەیوەندییە دۆستانەکەی نێوانیان بگەڕێتەوە و ئەمەش ببێتە مەترسی بۆ سەر پلەو پایەی خۆی و ئەو دەسەلاتەی بەسەر شا و دەوڵەتەوە هەیەتی.

مورشید قوولی خان بەردەوام بوو لەسەر سستی و خاوەخاوکردن لەناردنی یارمەتیەکان بۆ عەلی قوولی خان تا شکستی خوارد و بلاوبوونەوەی برسێتی و نەخۆشی لەنێو سەربازەکانیدا و پاشان لەترسی لەناوچوون شارەکەی بەجێهێشت و چووە قەلایەکی بچووکی نزیك شارەکە، ئۆزبەکەکانیش چوونە ناو شارەکەو نەهامەتی زۆریان بەسەر خەلکەکە هێناو ژمارەیەکی زۆریشیان لەپیاوانی قزلباشی کوشت و ژمارەیەکی زۆریشیان لەژن و منداڵەکانی هۆزی شاملوو بەدیل گرت و ناردنیانە ولاتی پشت رووبار.

وادیاربوو کەوا عەلی قوولی خان لەتوانایدا نەبوو چیدیکە خۆراگری بکات، بۆیە خۆی و پیاوەکانی خۆیان دا بەدەستەوە و عەبدوڵلاخانی دووەمیش فەرمانیدا هەموویان بکوژن، ئەم رووداوەش لەکانوونی دووەمی ١٥٨٩ز بوو.

خۆبەدەستەوەدانی مەشهەد: هەواڵی رووخانی هەرات و کوژرانی عەلی قوولی خان بەدەستی ئۆزبەکەکان گەیشتە قەزوینی پایتەخت، ئینجا زۆر بەپەلە مورشید قوولی خان بەهۆی ئەوەی دڵنیا بوو لەنەمانی رکابەرەکەی هەتا هەتایە سوپایەکی بەهێزی سازکرد بۆ دەرکردنی ئۆزبەکەکان. ئەوەبوو سوپای سەفەوییەکان بەسەرکردایەتی شا عەباس و وەزیرەکان و ژمارەیەك لەسەرکردەکانی هۆزی قزلباشەکان بەرە و هەرات کەوتنەرێ. شا زۆر رقی لەوەزیرەکەی خۆی هەلگرت کە خاوەخاوی زۆری کرد لەناردنی یارمەتی بۆ ماموستای یەکەمی و بەمەش شاری هەرات کەوتە دەست دوژمنانەوە، بۆیە بڕیاریدا لەتۆڵەیدا وەزیرەکەی لەناوبەرێ، هەرکە سوپای سەفەویی گەیشتە شار و ئازادیان کرد یەکسەر مەرامەکەی خۆی بەجێگەیاند و کوشتی.

سوپای سەفەویی بەردەوام بوو لەپێشڕەوی و تا خۆراسانیشیان ئازاد نـەکردەوە نەوەسـتا، ئەوکاتە عـەبدوڵلاخانی دووەم کێشەی دەسـەڵات و خاوەخاوی ناردنی یارمـەتی بەهـەلزانی و بەرەو مەشهەد ڕۆیشت تا داگیری بکـات. لەهـەمان کاتیـشـدا هـەواڵی سـنوربەزاندنی عوسمانییەکان و پێشڕەوییان لەبـەرەی خـۆراواوە بـەرەو قـەرەباغ و ئازەربێجـان گەیشـتە قەزوین و هەواڵەکانیش رایانگەیاند کەوا فەرهاد بەگی سـەرکردە دەسـتی بەسـەر شـاری گەنجەدا گرتووە، هەروەها سەرکردەی عوسمانیی جیگاڵ ئۆغلی بەسەرکردایەتی سـوپایەکی دیکەوە بەرەو هەمەدان و نەهاوەند بەرێکەوت. وادیاربوو کەوا ئۆزبەکـەکان تەنسـیقییان لەگەڵ عوسمانییەکان کردبوو تـا بەیەکـەوە لەیـەك کاتـدا هێـرش بکەنـە سـەر دەوڵـەتی سەفەویی. هەڵوێستی شا عەباسـی یەکـەم بـەهۆی هێرشـی ئۆزبەکـەکان لـەخۆرەلات و داگیرکاری عوسمانییەکان لەبـەرەی خـۆراواو کێشـە ناوخۆییـەکانـەوە زۆر لاوازبـوو، ئـەو کێشـەو دووبەرەکیانـەش فـەرمانڕەوای ویلایەتـەکان لـەپێناوی دەسـگرتن بـە سـامانە تایبەتیەکانیان هەڵیان گیرساندبوو، لەکاتێکدا کەنەیدەتوانی لەسـێ قۆڵـەوە شـەڕبکات، لەساڵی ١٥٩٠ز رێککەوتنێکی سەرشۆڕانەی لەگەڵ عوسمانییەکاندا سازکرد و بەهۆیـەوە دەسبەرداری هەندێك شوێن بوو بۆ عوسمانییەکان و بەشێوەیەکی کاتیش وازی لەپرۆسـەی دەرکردنی ئۆزبەکەکان هێنـا لەخۆسـان و دەسـتی خـۆی والاکـرد بـۆ لـەناوبردنی کێشـە ناوخۆییەکان.

گەڕانەوەی شا عەباسی یەکەم بۆ قەزوین هـەلی بـۆ ئۆزبەکـەکان رەخسـان تـا بەتـەواوی لەخۆراساندا لەشکرکێشی بکـەن، لەلایـەکی دیکەشـەوە بەسـەرکردایەتی عەبـدولمولئمین خانی کوڕی عەبدوڵلاخانی دووەم بەرەو خۆراوا چوون، لەو کاتـەی کـە بـاوکی لەوێنـەبوو فەرمانڕەوایـەتی ولاتـی پشـت رووبـاری خـستبووە دەسـت کوڕەکـەی. بـەردەوام بـوون لەپێشڕەوی تا ئەو ئاستەی کەتوانیان هەرچی شار و شارۆچکەی نێوان هەرات و مەشـهەد هەیە هەمووی داگیربکەن و ئینجا بەتەواوی گەمارۆی مەشهەدیاندا، بۆیە حـاکمی ئـەوێ کەئەمەت خانی ئەستاجلوو بوو داوای یارمەتی لـە قـەزوین کـرد. شـا عەباسـی یەکـەم بەرانبەر ئەو هەموو هێرشە دەرەکیانە چاوەڕێی کرد و هـیچ جوولەیـەکی نـەکرد تـا ئـەو کاتـەی هـەموو کێشـە ناوخۆییـەکانی لـەناوبرد، پاشـان بـەرەی خـۆراوای لـەرووی عوسمانییەکاندا بەهێزکرد و ئینجا خۆی سـازکرد بـۆ رووبـەروو بوونـەوەی مەترسـیەکانی

ئۆزبەك. کاتێکی سوپای سەفەویی گەیشتە ناوچەی رەی نەخۆشییەکی ترسناك لەنێو سوپاکەیدا بلاوبووەو تەنانەت خودی شاعەباسیشی گرتیەوە، بەمەش نەیتوانی چیدیکە لەم هەڵمەتەیدا بەردەوامبێ، ئەمەش بووە هەلێکی زێرین بۆ ئۆزبەکەکان هێندەی دیکە گەمارۆی سەر شارەکەیان توند کردو لەدوای چوار مانگ رووخاندیان، لەپاشاندا چوونە ناوی و کوشتارێکی زۆریان دەرهەق بەدانیشتوانەکەی کردو دەستیان کرد بەدزی و تالانی شارەکە و ئینجا دەستیانگرت بەسەر داهاتی مەزارگەی ئیمام عەلی رەزا و هەموو چرا زێڕ و زیوەکانیشان دزی و جگە لەمانەش ژمارەیەك قورئان و نووسراویان دزی کەگوایە بەدەستی خودی ئیمامەکانەوە نووسرابوون. تەنانەت مردووەکانیش لەگۆڕەکانیاندا لەستەمەکانیان بێبەش نەبوون، ئەوەبوو سەربازە ئۆزبەکەکان گۆڕی تەهماسبیان هەڵکەندو ئێسك و پروسکیان فڕێدایە دەرەوە کەلەتەنیشت گۆڕی ئیمام عەلی رەزابوو نەفرەتی زۆریشیان ئاراستە دەکرد، بێگومان ئەوەش لەتۆڵەی ئەو هەڵسوکەوتانە بوو کە شا ئیسماعیلی یەکەم لەبەرانبەر مەزارگای سوننەکان دەیکردو سوکایەتیان بەروفاتیان دەکرد کاتێك شارەکانیان داگیر دەکردن.

عەبدولمۆئمین خان بەردەوام بوو لەپێشرەوی بەرەو خۆراوا و دەستی بەسەر خەواف و باخەرز و بوشەنگ و گۆریان و ئیسفەرایندا گرت، ئینجا نامەیەکی بۆ موورادی سێیەمی سوڵتانی عوسمانیی نارد و تیایدا سەرکەوتنەکانی لەم ناو اچانەدا پێڕاگەیاند، هەروەها ئەوەشی گوت کەوا بەردەوام دەبێ تاکو عیراقیش داگیر دەکات و پێشەوایانی مەزهەبی شیعە لەناو دەبات. بەڵام ئەم پلانە ئازایانەیە سەری نەگرت، چونکە عوسمانییەکان چیدیکە یارمەتیان نەدان، تەنانەت لەگەڵ شا عەباسی یەکەم ئاشتەواییان کرد و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی دەستی والابێ تەنها بۆ شەڕی ئۆزبەکەکان.

گێڕانەوەی مەشهەد: زۆر بەخێرایی شا چاکبووەو تەندروستی بەرەو باشی چوو و هەڵسایەوە بۆ ئەوەی بەرەنگاری ئۆزبەکەکان ببێتەوە و لەخۆراسان وەدەریان بنێ، ئەوەبوو لە ساڵی ١٥٩٣ز بەرەو بەرەی مەشهەد پێشڕەوی کرد و لەگەڵ خۆشیدا سوپایەکی گەورەی بردە سەریان و هەرکە گەیشتە سنووری شارەکە یەکسەر عەبدولمۆئمین

نووسراوێکی بۆ ناردو تیایدا داوای لێدەکرد کەوا ئاشتەوایی لەنێوانیاندا سازبکەن بەمەرجی ئەوەی خۆراسان بەدەست ئۆزبەکەکانەوە بمێنێتەوە.

شتێکی ئاسایی بوو کەوا شا عەباسی یەکەم ئەم داوایە رەتبکاتەوە و لەوەڵامدا هەرەشەی لێکردن و وتی ئەگەر ئەوان خۆراسان چۆڵ نەکەن و بەرەو وڵاتی پشت رووبار نەگەڕێنەوە ئەوا هێرش دەکاتە سەر شارەکە. بەرانبەر سەرنەکەوتنی ئەم دانوستانە عەبدولموئمین خان سوپایەکەی رێکخستەوە بۆ ئەوەی بتوانێ لەشەڕێکی یەکلاییکەرەوەدا رووبەرووی سەفەوییەکان بێتەوەو داوای لەهەموو ئەو سوپایانەکرد کە لەسەرانسەری وڵاتدا بڵاوببوونەوە کەوا لەمەشهەددا کۆببنەوەو زۆریش بەرێزەوە لەشارەکانی نیشاپوور و عەسکەر هاتە دەرەوە و لەوێشەوە نامەیەکی پڕ لەرێزی بۆ شا ناردەوە و هەمان شتی پێشووی بۆ نووسیەوە، بەڵام شا هیچ گوێی بەم داوایە نەداو بەرەو نیساپوور بەرێکەوت و بەبێ کوشتار چوونە ناویەوە و ئینجا چوونە ناو سەبزەوار و جاگەرم و پاشان بەردەوام بوون تا گەیشتنە دەوروبەری مەشهەد، لەوێدا وەرزی زستان تەنگی پێهەڵچنی و بەفر باری و سەرمایەکی سەخت رووی لەوێکردو هەموو رێگاکانیش بەهۆی قوڕولیتەوە داخران و شوێنی گونجاو بۆ مانەوەی شا نەمایەوە و، لەپاشان سوپاکەی کۆکردەوە و گەڕایەوە بۆ قەزوین و ناوچەکەی لەژێر چاودێری دەروێش محەمەد خان بەجێهێشت و لەهەمان کاتیشدا سەربازگەکانی ئەوێش هاوکاری بوون.

ئەوکاتە عەبدوڵڵاخانی دووەم لەچەندین لاوە زەبری کوشندەی پێکەوت و بەهۆیانەوە نەیتوانی بەردەوام بێ و هێزەکانیشی وێران کرد لەوانە:

- لەبەرانبەر خێڵەکانی قالیموق لەباکور شکستی گەورەی خوارد و زیانی گەورەشی بەرکەوت.

- شازادە خوارزمیەکان چوونە پاڵ سەفەوییەکان، بەهۆی ئەو کێشەیەی کەوتە نێوان نورمحەمەد خانی حاکمی مەر و ئۆکینگ و حاجی محەمەد خانی حاکمی خوارزمی ئامۆزای عەبدوڵڵاخانی دووەم و لەو کاتەدا سەکردەی ئۆزبەکەکان هەوڵیدا ئەم کێشەیە بۆ بەرژەوەندی خۆی بقۆزێتەوە و ئینجا هەردووکیانی لەوڵات دەرکرد و ئەوانیش روویان کردە شا عەباسی یەکەم.

شتێکی ئاسایی بوو کە شا پێشوازی لەم جۆرە هاوپەیمانێتیانە بکات چونکە بەهۆیەوە مەترسیەکانی ئۆزبەکی لە دەوڵەتی سەفەویی دوور دەخستەوە. عەبدوڵڵاخانی دووەم لەکاتی هێرشکردنی شا بەرەو خۆراسان لەساڵی ١٥٦٩ز زیانێکی زۆری بەرکەوت و زەویەکی زۆریشی لەدەسدا، کاتێکیش گەیشتە نزیک سنووری ئەسفەراین کەلەژێر حوکمڕانی ئۆزبەکدابوو، عەبدولمۆئمین خانی سەرکردە ناچار بوو کەشارەکە چۆڵبکات و نامەیەکی دیکەشی نارد بۆ شا عەباس و پێشنیاری ئەوەی بۆ کرد کەوا بەرەو عیراق پێشڕەویی بکات و خۆراسان بۆ ئۆزبەك بەجێبهێڵێ، بەلاّم شا نامەیەکی هەڕەشە ئامێزی بۆ ناردو پێشنیارەکەشی ڕەتکردەوە و ئینجا ئەسفەرایینی داگیرکرد، ئەمەو بەبێ هیچ هۆیەکی ئاشکرا بەرەو ئیستەرئاباد کەلەسەر ڕێی قەزوین بوو ڕۆیشت و عەبدولمۆئمینیش ئەمەی بەهەلزانی و هێرشی کردە سەر ئەسفەراین و قەسابخانەیەکی گەورەی بۆ دانیشتوانەکەی سەبزەوار سازکرد، کەئەم کارە شای ناچار کرد بگەڕێتەوە بۆ سەبزەوار و جارێکی دیکە گێڕایەوە بۆ خۆی و پاشان بەرەو نیشاپوور پێشڕەویی کردو لەدواییدا بەهۆی نزیك بوونەوەی وەرزی زستان گەڕایەوە بۆ قەزوین.

بارەکە بەمشێویە مایەوە لەخۆراسان و هەمیشە کەوتبووە نێوان پەلامار و داگیرکردن و گێڕانەوە تاکو ساڵی ١٥٩٨ز ئەوکاتە لەنێوان عەبدوڵڵاخانی دووەم و عەبدولمۆئمین خانی کوڕی شەڕ بەرپابوو خەریك بوو بەهۆیەوە شەڕ لەنێوانیاندا هەڵدەگیرسا، بەلاّم باوکەکە دەسبەرداری دەسەلاّتەکەی خۆی بوو و بەکوڕەکەی راسپارد.

گومانی تێدا نییە بەهۆی کێشەی نێوان باوك و کوڕەکەی و ئینجا بەهۆی ئەو هۆکارانەی کەباسمان کردن کەبریتی بوون لەوولاّتی پشت ڕووبار کەوتە بەر پەلاماری هێزە خێڵەکیەکانی ناوخۆ و لایەنگری هەندێك لەسەرکردە خوارزمیەکان بۆ شا عەباسی یەکەم جەنگیی ئۆزبەکی لاوازکرد و ئەمەش بووە هاندەرێك هێرش بکاتە سەریان لەتەواوی خۆراساندا وەدەریان بنێ و، هەرچی هێزێك هەبوو لەولاّتدا هەمووی لە بەستام کۆکردنەوە.

سوپای سەفەوییەکان بەسەرۆکایەتی فەرهادخان لە بەستامەوە بەرەو نیساپوور چوون و بەبێ هیچ بەرگریەك گێڕایانەوە بۆ خۆیان، لەدوای ئەوەش بەرەو مەشهەد بەرێکەوتن و

لەوێشــدا هــەواڵی کوشــتنی عەبــدولموئمین خــان کەبــەزۆرداری و خوێنڕێــژیی ناوبــانگی دەرکردبوو بەدەستی هەندێك لەپیاوەکانی خۆی ئەوانەی کە تەماعی دەســەڵاتیان هــەبوو کــوژرا، گەیشــتە شــا و ئــەم هەواڵــەش هێنــدەی دیکــە وورەی ســەربازەکانی ســەفەویی بەرزکردەوە و لە١٩تەمووز١٥٩٩ز بەرەو مەشهەد ڕۆیشتن و داگیریان کردەوە.

گێڕانەوەی هەرات: شــا عــەباس بەســەرۆکایەتی ســوپاکەی بــەرەو هــەرات وەڕێکــەوت، ئەوکاتە هەرات لەژێر دەسەڵاتی دین محەمەد خــانی ئۆزبــەکی بــوو و، توانیــان پلانێکــی سەربازی سەرکەوتوو دابڕێــژن و بەمــەش فــەرمانی بەفــەرهادخان کــرد کــەوا هێزەکــانی ئۆزبەکی بباتە دەرەوەی شورەی شارەکە تاکو زیان بەشارەکە نەگات، چونکە ئــەم شــارەی زۆر خۆشدەویــست لەبەرئەوەی لەوێ لەدایك بوو هەر لەوێشدا نەشونمای کرد. فەرهاد خــان ئەم پلانەی بەتەواوی بەجێگەیانــد، ئــەوەبوو لەشــورەی شــارەکە نزیــك کەوتــەوە پاشــان پاشەکشــەی کــرد وەك ئــەوەی لەشکســت بترســێ، ئینجــا دیــن محەمــەد خــان بــەخۆی هێزەکانیەوە هاتنە دەرەوەو راویان نــاو کەوتنــە بۆســەکەوە. لەوێــدا شــەڕێکی ســەخت و یەکلاکــەرەوە لــەنێوان ئــەو دوو ســوپایەدا دروســت بــوو و لــەدوای دوو خــولی شــەڕ سەرکەوتنێکی بەرچاو بوو بەنەسیبی سوپای ســەفەوییەکان، لەپێکــدادانی یەکەمــدا شــا شکستی سەفەوییەکانی خــتە نەستۆی فەرهاد خان و بەســتی نوانــدن تاوانبــاری کــردو کوشتی، پاشان ریزەکانی سوپای یەکخســتەوەو هەڵمــەتی بــردە ســەر ســوپای ئۆزبــەك و هەمووی هاڕی و لەو شەڕەشدا سەرکردەی ئۆزبەك کوژراو شــا بەســەرکوتووی چــووە نــاو هەراتەوە.

بەم شێوەیە شا توانی زۆربەی شارەکانی خۆرسان بگێڕێتەوە و مەترسی ئۆزبەکەکانیش کە هەر لەسەردەمی شائیسماعلی یەکەمەوە بوونی هــەبوو نەهێشــت، ئینجــا بەمەبەســتی دەسبەســەرداگرتنی تــەواوی ناوچــەکە بــەرەو بەلــەخ پێشــڕەویکرد و لەســاڵی ١٦٠٢ز گەمارۆیدا، بەڵام بەهۆی بلاوبوونەوەی نەخۆشی لــەنێو ســەربازەکانیدا نــەیتوانی بچــێتە ناویــەوە، لەهــەمان کاتیشــدا دووچــاری پــەلاماری زۆر تونــدی ڕەوەنــدە ئۆزبــەکــەکانی بیابانەکانی دەووروبەری شــار بووەوە، پاشان بەبێ ئەوەی هیچ سەرکەوتنێك بەدەســبهێنێ و بەناچاری گەڕایەوە و گەمارۆیەکەی شکاند.

سازبوونی پێشێوی لەوڵاتی پشت رووبار: لەدوای مردنی عەبدولمۆئمین خان ململانێـی زۆر بەهێز بۆ دەسبەسەردا گرتنی تەختی پاشایەتی لەوڵاتی پشت رووبار بەرپابوون و شازادەکان کەوتنە کێبڕکێی پەنا بردنە بەر دەوڵەتی سەفەویی تا بۆ وەگیرخستنی تاجەکە هاوکاریان بکات. لەوانەش لەساڵی ١٦١١ز کاتێك وەلی خانی ئۆزبەکی تەختەکەی لەدەسدا پەنای بردە بەر شا عەباسی یەکەم دەسەلاتەکەی بۆ بگێڕێتەوە و رکابەرەکانی لەناوببات، ئەویش یارمەتیدا، کاتێکیش سەفەوییەکان سەرقاڵی شەڕی عوسمانییەکان بوون ئەو بەپارەیەکی زۆر یارمەتیدان و یەکێك لەسەرکردەکانیشی نارد تاکو یاوەری بکات و بیگەیەنێتە سنوری خۆراسان، لەوێشەوە دزەی پێبکەن بۆ ناو خاکی پشت رووبار بۆ ئەوەی شوێنکەوتووانی رێکبخاتەوە و دەسەلاتەکەی بگێڕێتەوە، بەلام لەو شەڕەدا کوژرا. دەوڵەتی ئۆزبەك لەرووخانی یەکجارەکی نزیك بووەوە، هەروەها ئەو ناوبانگە بەرزەی لەسەردەمی محەمەد شەیبانی خان و عوبێدوڵڵاخان هەیبوو هەمووی لەدەسدا.

سەرەڕای ئەوەی هێزەکانی ئۆزبەك پاشەکشەیان کرد و مەترسیەکانیان رەویەوە، کەچی شا بۆ ئەوەی سنورای نێونیان مسۆگەربکات و بوار بۆ هیچ شازادەیەکیان نەمێنێ کەوا سەرقاڵی ئەوان بەشەڕی عوسمانییەکانەوە بقۆزنەوە، رووی بەرەو خۆراسان وەرگێڕا، بۆ ئەم مەبەستەش ژمارەیەکی زۆری لەکوردە سوننەکانی کوردستان بۆ سنوری خۆراوای خۆراسان راگواست و کردنی بەبەربەستێك لەنێوان سەفەویی و ئۆزبەکەکان.

## ململانێ لەگەڵ عوسمانییەکان:

## قۆناغەکانی ململانێکان:

پەیوەندیەکانی سەفەویی و عوسمانییەکان لەسەدەی حەڤدەمینەوە ئالۆزیی زۆری بەخۆیەوە بینی، لەئێرانیش شا عەباسی یەکەم سەری هەڵداو وەك سەرکردەو پیاوی خەمخۆری دەوڵەت بەدەرکەوت و هەموو ئەرکی گێڕانەوەی ئەو خاك و شارانەی دەوڵەتی سەفەویی لەدەستی دابوون لەلای خۆراوا خستە سەرشانی خۆی.

لەراستیشدا پەیوەندی ئەم دوو دەوڵەتە لەسەردەمی ئەم شایەدا بەسێ قۆناغ تێپەڕی:

- قۆناغی یەکەم لەفەرمانڕەوایەتی شا عەباسی یەکەم لەساڵی ١٦٠٢ز وە دەستپێدەکات کە تێیدا عوسمانییەکان پێشڕەویان دەکرد و سەفەوییەکانیش خەریکی پاشەکشەو خۆبەدەستەوەدان بوون.

- قۆناغی دووەمیش بریتی بوو لەململانێیە سەخت و دژوارەکانی نێوانیان و پڕیبوو لەشەڕی ناوخۆیی سەفەوییەکان، هەروەها مکووڕی شا لەگێڕانەوەی ئەو شوێنانەی دەوڵەتی عوسمانیی دەستی بەسەرداگرتبوون و ئەم قۆناغە لەنێوان ساڵی ١٦٠٢-١٦٢٣ز خایان.

- بەڵام قۆناغی سێیەم پاشەکشەی بەرچاوی عوسمانییەکان و پێشڕەویی بەرچاوی سەفەوییەکانی بەخۆوەبینی و لەو ماوەیەدا سەفەوییەکان توانیان کەوا بەشێکی زۆر بەرفراوانی خاکی عیراق لەژێر دەستی عوسمانییەکان بهێننە دەرەوە، ئەم قۆناغەش ماوەی نێوان ساڵانی ١٦٢٣-١٦٢٩ز خایاند.

## قۆناغی یەکەم: ڕێکەوتنامەی ئەستانبولی یەکەم

عوسمانییەکان پشێوی ناوخۆی ئێرانیان بەهەلزانی کەلەسەردەمی شا ئیسماعیلی دووەم و شا محەمەد خودابەندە دروستبوو، هێرشیان کردە سەر ئێران و خاکێکی بەرفراوانیان داگیرکرد. فەرهاد خان توانی قەرەباغ داگیر بکات و بیخاتە پاڵ گەنجەی ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، لەلای خۆشیەوە جەغفەرپاشای حاکمی تەورێز دەسەڵاتی بەرەو ناوچەکانی دەوروبەر شارەکە درێژکرد تا گەیشتە ناوچەی سەراب، هەروەها جغال ئۆغلی توانی لەبەرەکانی عیراقدا پێشڕەویی بکات و بگاتە شاری نەهاوەند و سنوری لورستان و، لەنەهاوەندیشدا قەڵایەکی گەورەی دروسکرد.

کاتێك شا عەباسی یەکەم بوو بەفەرمانڕەوای دەوڵەتی سەفەویی خۆی لەنێوان دوژمنایەتی دوو دەوڵەتی سەرسەختدا دۆزیەوە ئەوانیش عوسمانییەکان بوون لەخۆرهەڵات و ئۆزبەکی بوو لەخۆراوا، لەبەر ئەوەی نەیدەتوانی لەیەك کاتدا شەڕی هەردوو لایان بکات، هەوڵیدا بەرەی خۆهەڵات ساردبکاتەوە تابتوانێ بەرووی ئۆزبەکەکاندا بووەستێتەوە. چونکە بەلای ئەوانەوە سەرسەخترین دوژمنی سەفەوییەکانبوون، بۆیە

گەڕایەوە بۆ قەزوین و لەوێشەوە هەوڵیدا ڕێکەوتنامەیەکی ئاشتەوایی لەگەڵ عوسمانییەکاندا مۆربکات.

عوسمانییەکان ڕێککەوتن رازی بوون و ماوەی شەش مانگ لەنێوانیاندا دانوستان بەردەوامبوو، تا لە ۲۲ئازاری ۱۵۹۰ز گەیشتنە ڕێکەوتنێك کە ئەم بەندانەی تێدابوو:

١-سەفەوییەکان دەسهەڵبگرن لەم شارانە و بیدەنەوە عوسمانییەکان: تەورێز و بەشی خۆراوای ئازەربێجان و ویلایەتەکانی ئەرمینیا –شەکی و شەماخی و شەروان و کەرەج و قەرەباغ و بەشێکی ناوچەی لورستان و قەلاّی نەهاوەند.

٢-سەفەوییەکان واز لەجنێودانی سێ خەلیفە راشیدیەکە بهێنن کەئەوانیش ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان بوو و ئینجا عائیشەی دایکی باوەڕدارانیش.

٣-میرزاحەیدەری برای شا عەباسی یەکەم وەك بارمتەیەك لەئەستانبوڵ بمێنێتەوە وەك بەڵگەیەکی نیازپاکی و نەشکاندنی پەیماننامەکە.

٤-هەردوولا پەیمان بدەن کەوا دیلەکانیان ئازاد بکەن.

٥-هەردوولا پەیمان بدەن کەوا هیچ هەلاّتوویەك دالّدە نەدەن.

خوێندنەوەی بەندەکانی ڕێکەوتنامەکە دەمانگەیەنێتە ئەم تێبینیانە:

- عوسمانییەکان مەرجەکانی خۆیان بەسەر سەفەوییە باڵشکاوەکاندا سەپاند، وەك ئەوەی دەوڵەتێکی سەرکەوتوو بەسەر دەوڵەتێکی ژێر کەوتوودا دەیسەپێنێ.

- جگە لەتەورێز سەرجەم ئەو شارانەی کە حەریریان بەرهەم دەهێنا کەوتنە ژێر دەسەلاّتی عوسمانییەکانەوە، ئەمەش دەسکەوتێکی زۆر گرنگ بوو کەبەهۆیەوە توانیان زاڵبن بەسەر زۆربەی ئەو ڕێگا بازرگانییانەی خۆرەلاّت کە یا ئەوەتا بۆ روسیا دەچوون یاخود بەرەو ولاّتی عوسمانییەکان، یانیش بە دەریای سپی ناوەڕاستەوە بۆ ئەورووپا.

- لەپەیماننامەکەدا لایەنی مەزهەبیشی تێدابوو بۆ هەردوولا و باسی ئەوەی دەکرد کەنابێ سەفەوییەکان جوێن بەسێ خەلیفەکەو عائیشەی دیکی باوەڕداران بدەن و ئەمەش

بۆ رەزامەندی هەست و نەستی ئیسلامی بوو بەگشتی و بەهانەیەکیش بوو بۆ لـەناوبردنی هۆکارێکی سـەرەکی شەڕی نێوانیان.

- پەیماننامەکە سـەردانەواندنێکی مەعنـەوی ترسـناکی بـۆ سـەفەوییەکان تێـدابوو، ئەویش ئەوەبوو کەیەکێك لەئەنـدامانی خانـەوادەی دەسـەلاتدار دەبـێ وەك بارمتەیـەك لەلای عوسمانییەکاندا بمێنێتەوە بەمەبەستی لانەدانبوو لە دەقی پەیماننامەکـەو هـەروەها هەوڵنەدەن بۆ لەباربردنیشی، ئەم پەیماننامەیە واقیعێکی زۆر تاڵی بۆ شا عەباسی یەکـەم لەدوارۆژدا لێدەکەوێتەوە، ئاشکرایە کە میزراحەیدەر یەکێك لەئەنـدامانی ئـەو وەفـدەی کەچووبووە ئەستانبوڵ بۆ جێبەجێکردنی کاروباری پەیماننامەکە.

- دوو بەندەکەی کۆتایی باسی پەیوەندییە سیاسیەکانی نێوانیانی دەکرد و کەبەهۆیەوە بتوانن دەرگای گفتووگۆی نێوانیان بکەنەوەو تابیێتە سەرتایەك بۆ پەیوەندیەکی هێمنیان، لەلایەکی دیکەوە سەفەوییەکان ژمارەیەك لەسەرکردەکانی عوسمانییان بەدیل گرتبـوو لـە قەلای قەهقە لەقەرەباغ بەندیان کردبوون کەلەنێویاندا موراد پاشا هەبوو، پاشا هـەمووی ئازادکردن. لەبەرانبەریشدا عوسمانییەکان هەموو دیلەکانی لای خۆیان ئازادکرد کەلەوانـە شاروخ سولتان میهردار و مەهدی قوولی خان شاملوو و هیدیکەش هەبوون.

هەرچەندە عوسمانییەکان دەیانتوانی کەوا بەشێکی زیاتری خاکی ئێران داگیربکـەن بـەلام وادیاربوو بەم ئاشتەواییە قایل بوون، چونکە بـەم پەیماننامەیـە دوو ئامـانجی سـتراتیژیان پێکا: یەکەم: پەیوەندی بەدڵنیایی بەرەی خۆرەلات هەیە کەبەهۆیەوە دەتـوانن بەتـەواوی خۆیان بە کێشەکانی ئەوروپاوە خەریك بکەن.

دووەم: ئەو پەلامارانەی رادەگرت کە دوژمانی دیکـەی دەوڵـەتی عوسمـانیی بەیارمـەتی سـەفەوییەکان دەیـانکردە سـەر عوسمانییـەکان و مـەزەبی سـوننی و دژی خەلیفـەکانی راشیدین و عائیشەی دایکی باوەڕداران.

لەدوای مـۆرکردنی ئـەم ئاشـتەواییە هـێمنی بـاڵی بەسـەر سـنوری نێـوان سـەفەویی و عوسمانییەکاندا کێشا و بەمـەش قۆنـاغێکی شـەڕی نێوانیـان کـەماوەی نێـوان سـالانی ١٥٧٧-١٥٩٠ز خایاند.

لەلای خۆشیەوە شا عەباسی یەکەم زۆر دڵی بەم پەیماننامەیە خۆشبوو چونکە دەستی واڵابوو بەبەرەنگاربوونەوەی دوژمنەکانی بەرەی خۆراسان لەلایەك و لەلایەکی دیکەشەوە نەبوونی ئەو توانایەی کە پێویستی بوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوپای عوسمانییەکان و دەرکردنیان لەو شوێنانەی دەستیان بەسەردا گرتبوون. کاتێکیش خان ئەحمەد خانی لێی هەڵگەڕایەوە و پاشان پەنای بردە بەر دەوڵەتی عوسمانیی و لەوێشدا زۆر بەگەرمی پێشوازیی لێکرا هیچ لاریەکی نەنواند بەرانبەر ئەو هەڵوێستە هەرچەندە دژی بەندێکی سەرەکی پەیماننامەکەی نێوانیان بوو، هەروەها لەبەرانبەر هەلاتنی شاوێردی خان و چوونە پاڵ عوسمانییەکانیش هەمان هەڵوێستی نواند، جگە لەمانە هەر بۆنەیەك هەبوایە ئەوا هەوڵی دەدا بەهۆیەوە زیاتر لێیان نزیك بێتەوە و وای نیشاندەدا کە وەك ئەوان دوژمنی ئەورووپیەکانە، لەهەمان کاتیشدا لەهەوڵی ئەوەدابوو کەوا لەگەڵ ئەورووپیەکاندا گفتوگۆبکات بۆ هاریکاری لەدژی دەوڵەتی عوسمانیی. کە سوڵتان مورادی سێیەم کۆچی دوایی کردو محەمەدی سێیەمی کوڕی شوێنی گرتەوە وەفدێکی سێ سەد کەسی بەسەرکردایەتی زولفیقارخان قەرمانلووی حاکمی ئازەربێجان ناردە ئەستانبووڵ بۆ پرسە و سەرەخۆشی، کاتێکیش گەیشتنە ئەوێ سوڵتان سەرقاڵی شەڕی ئەورووپیەکان بوو و ئەندامانی نێردراوەکەش تا گەڕانەوەی سوڵتان هەر لەئەستانبووڵدا مانەوە و چاوەڕێیان کرد و پاشان سەرەخۆشیان ئاراستە کرد و پیرۆزبایی گرتنەدەستی دەسەلاتیشیان لێکرد.

**قۆناغی دووەم: ململانێ لەگەڵ ئەرمینیا**

دوای ئەوەی لەمەترسی ئۆزبەکەکان رزگاربوو، شا عەباس یەکەم رووی بەرەو دەوڵەتی عوسمانیی وەرگێڕا بۆ ئەمەش پلانێکی داڕشت تا بەهۆیەوە بتوانێ رووبەروویان ببێتەوە، و بۆ ئەوەش سەرکەوتنەکەی مسۆگەربکات چەند هەنگاوێکی هەڵێنا بۆ بەهێزکردنی هەڵوێستی لەوانە:

- لەبەر نزیکی لە ناوچەکانی رووبەرووبوونەوەی سەربازی پایتەختی لەقەزوینەوە گواستەوە بۆ ئەسفەهان چونکە ئەوەیان دووربوو لەمەیدانی رووبەرووبوونەوەکان.

- هەوڵێکی زۆری خستە گەڕ بۆ سازکردنەوە و رێکخستنەوەی ریزەکانی سوپا و راهێنان و چەکدارکردنیان بەچەکی ئاگریی پێشکەوتوو بۆ ئامادەبوون بۆ رووبەروو

بوونەوە چـاوەڕوانكراوەكە، تائـەو ئاسـتەی كـە سـوپای سـەفەوییـەكان لـەرووی توانـای سەربازیی و چەكەوە گەیشتە ئاستی هی عوسمانییـەكان و لەلایـەن رەخنـە لەخۆگرتنـەوە بەپێش عوسمانییەكان كەوتن، چونكە عوسمانییـەكان بـەهیچ شـێوەیەك هـەوڵیان نـەدەدا سوود لەتواناو شارەزایی بیـانی وەربگـرن، بـەڵام ئـەوان سـوودی زۆریـان لـەو ئەفسـەرە بەریتانیانـە وەرگـرت كەلەوڵاتەكـەی ئەوانـدا بـوون لەوانـە ئـەنتۆنی چـێرلی لـەبواری تازەكردنـــەوەی توانـــا ســـەربازیەكانی ســـەفەویی لـــەرووی راهێنـــانی ســـەربازەكان و چەكداركردنی بەتفەنگ و تۆپەوە.

- هەندێك یاسای راگەیاند و پەیوەندیان بە بزووتنـەوەی بازرگـانی هـەبوو بونـە هـۆی دڵنیاییان لەمەترسیەكانی پێشكەوتنی بازرگانیی كەلەسەردەمی ئەودا بوونی هەبوو.

پاشەكشـەی هێزەكـانی عوسمـانیی لەسـەدەی حەڤـدەی زایـینی: دەوڵـەتی عوسمـانی و دەســەلاتدارانی نێـو حكومەتەكـەی لەسـەدەی حەڤدەهەمـدا تووشـی گەندەڵیـەكی زۆر بەهێزبوونەوە. لەوكاتە چـەند سـوڵتانێك فەرمانڕەوایـەتییان دەكـرد كەهیچـیان شـیاوی پلەكانیان نەبوون و هەمیشە لەرێی وەزیرەكانەوە كاروبارەكانی دەوڵەتیان بەڕێوە دەبـرد و ئەوانیش زۆر جار لایەنی گەندەڵیان دەگرتە بەر و جاری واش هەبوو بـەزەییان بەدەوڵەتـدا دەهاتەوە كاتێك لەلەناوچوون نزیك دەبۆوە. بەبەراورد لەگەڵ سەردەمی سەدەی شـانزەهەم ئەم سـەدەیە شێوەكی كەمتری گەشبوونەوەی بەخۆیـەوە بـینی، كەچـی لـەم سـەردەمەدا چەندین كەسایەتی ناودار پەیدابوون و هەوڵی زۆریاندا شـكۆی دەوڵەتەكـە بپـارێزن بـەڵام بێسوودبوو.

ئـەو نسـكۆیانەی دوچـاری عوسمانییـەكان هـاتن لەكۆتاییـەكانی سـەدەی شـانزەهەم و سەرەتای سەدەی حەڤدەهەم لەمەجـەر و بـەلكان و كـەرەج و ئازەربێجـان و بزووتنـەوەی یاخیبووەكانی ئەنادۆڵ، بەتایبەتیش شۆڕشی سەركردەكانی تەریقەتی جەلالیی كەزاڵبوون بەسەر چەند ناوچەیەكی خۆرەلاتی ئازەربێجان و یارمەتیشیان لەعەباسـی یەكەمـەوە بـۆ هات، هەموو ئەمانە بەڵگەی لاوازی دەوڵەتی عوسمانیی بوون و شەڕی لیبانتی دەریاییش بەلای خۆیەوە كەشێكی نوێی بۆ ئەورووپا رەخساند لەرووبەرووبوونەوەی عوسمانییەكان.

لەراستیشـدا لاوازی دەوڵـەتی عوسمـانیی لـەو ماوەیـەدا بەئاشـکرایی بەرچـاوکەوت، کەئەویش دەگەڕایەوە بۆ چەند هۆکارێك هەندێکیان پەیوەندی بە خانەوادەی عوسمانییـەوە هـەبوو و بەتایبـەتی لایـەنی پەیوەنییـەکانی دەرەوەی دەوڵـەتی عوسمـانیی. ئەمـەو ڕووداوەکانی سەدەی شانزەهەم ئەوەیان سەلماند کە دەوڵەت بەبێ شەڕ بەردەوامیی نابێـت و لەهەمان کاتیشدا دەبوایە خۆی لەگەڵ باری نـوێ و پێشـکەوتووی جیهـان بگـونجێنێ و ئامادەکاریش بکات بۆ پێداویستییەکانی ئاشتەوایی. بەڵام سوڵتانەکانی ئەم سـەردەمە پیاوی شیاوی ئەم ڕۆژگارە نەبوون، هەروەها ئەو نەریت و باوەڕە لاسایی کەرانەوەی کەلای عوسمانییەکان جێگیربوو گوایە ئەورووپییەکان بەتـەواوی بـەکوفرەوە گرێـدراون. ئەمـەش هەموو کەموکورتی دەوڵەتی نیشاندەدا لەپەیوەندی کـردن بـەژیانی خـۆراوا و پێشـوازی کردن لەپێویستیەکانی سەردەمیی تویدا.

لەو سەردەمەدا لاوازی سوڵتانەکان بەرچاو دەکـەوێ لەبـەڕێوەبردنی کاروبـاری دەوڵـەت، چونکە ژمارەیەکیان دەرچووی بەندیخانەکان بوون و ژیانی ئەوێشیان زۆر بـەخراپی ڕەنگـی دابۆوە سەر هەڵسوکەوتیان، هەنـدێك لەوانـە زۆر نـەزان و زەلامکوژبـوو، هەشـیان بـوو خـەریکی مـەی خواردنـەوە و گەنـدەڵی و دەسبەسـەرداگرتنی داهـاتی دەوڵـەت بـوو و بەرتیلیان وەردەگرت و پلەو پایەیان دەفرۆشت، زۆر جاریش کچۆڵەی بچـووك دەگەیشـتنە تەختی حوکومڕانی.

بـۆ یەکـەمجاریش تیپـە ئینکیشـاریەکان هاتنـە نـاو بازنـەی حوکـومڕانی و دەسـتیان لەکاروبارەکان وەردەداو سوڵتانیان لادەدا و جاری واش هـەبوو دەیانکوشـتن، دەزگاکـانی سەرووش تووشی گەندەڵی هـاتن و خـەڵکانێك پلـەی بـەرزی ئیـدارییان وەردەگـرت کـە هەرگیز شیاویان نەبوو، ئینجا سوڵتانەکان دیوانیان پشتگوێخست، کار گەیشـتە ئـەوەی لەدادگاکاندا هیچ شتێك بەبێ بەرتیل بەڕێوە نەدەچوو.

لەلایەکی دیکەشەوە ئەستێرەی پیاوانی سیاسی و سـەرکردەکانی دیکـە لەسـەر حسـابی سوڵتانەکان گەشدەبوو. لەوکاتەدا دەوڵەت لەبواری زەوی و زار و باجـدا پـەنای بـردە بـەر سیستەمێکی نەزۆك و بێ سوودی کـۆن کەبـە سیسـتەمی پـەیڕەویی ناسـرابوو، ئینجـا خوێندن و فێرکاری پشتگوێخرا، دەزگا ئایینیەکان بەرەودوا گەڕانەوە، بـەهۆی پـەلاماری

ڕەوەندەکان بۆ سەر زەوییە کشتوکاڵیەکان ژمارەی دانیشتوانیش کـەم و زۆری تێکـەوت و دروستبوونی ناوەوەی وڵاتیش دووربـوو لەکۆمـەڵگا و هـیچ شـێوازێکی باشـیش پـەیڕەو نەدەکرا لەبەڕێوەبردنی دەسەڵات، هیچ جۆرە ژیانێکیش نـەما کـە ڕووبـەڕووی دوژمنـان ببێتەوە چ لەخۆرهەڵات بێ یا لەلای خۆراوا.

بەڵام لـەبواری پەیوەندییـەکانی دەرەوە، چـەندین کۆسـپ و تەگـەرە کەوتنـە سـەر ڕێـی عوسمانییەکان کەبووە هۆی دواکەوتنیان، لەهەمووشیان گرنگتر:

- نەیانتوانی ڤییەنا داگیربکەن و بەردەوام بـن لەپێشـڕەویی بـەرە و ئـەورووپا، چـونکە لەوێدا سوپای نەمساو ئیمپراتۆری پیرۆزی عوسمانیی ڕێگایان پێگرتن.

- گەشەکردنی بواری بازرگانی ئەورووپی شانبەشـانی بەرەوپێشچـونی چـەك و نـەرمی نواندنی بواری سیاسی کەفەرمانڕەواکانی ئەورووپای پێناسرابوو.

- دەرکردنـی کەشـتی گـەلی عوسمانییـەکان لـەزەریای هینـدی سـەرەڕای ئـەوەی کەسەرکەوتنیی ناتەواویان لەرێگرتنی گەشەسەندنی بازرگانی پورتوگالیەکان لە ئاوەکانی خۆرهەڵاتدا بەدەستهێنابوو.

- بێتوانایی لەبەشـداریکردنی ئـەو گەشەسـەندنە بازرگانییـە لەزەریاکانـدا دەبینـرا و چڕبوونەوەی چالاکیەکانیان تەنها لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست و ئەویش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گرنگیی کەمتر دەبۆوە، چونکە توانرا ڕائـس ڕەجـا سـالح بدۆزنـەوە و بەمـەش بـەدەوری ئەفریقیا و بەهۆی کەشتی چارۆکەدارەوە بسووڕێنەوە و بچن بۆ هیندستان.

- چەندین بەربەست کەوتنە سەر ڕێی عوسمانییەکان کەنەیان دەتـوانی لێـی دەربـازبن، هەرچەندە سوپا چەندین سەرکەوتنی بەدەسهێنا بـەڵام هـەر بێسـوودبوو، چـونکە سـوپا نەیدەتوانی بچێتە قوڵایی خاکی ئێران، ئەویش لەبەر بوونی هێزی سەرەکی سـەفەوییەکان و ئەو چیا و بەرزاییـە سروشـتیانە کـەرێگر بـوون لەبـەردەم پێشـڕەویی عوسمانییـەکان و هەرگیز سوپا نەیدەتوانی بەئاسانی پێیانـدا تێبپـەڕێ، ئـەم هەڵوێسـتانەی عوسمانیـەکان هەلی بۆ سەفەوییەکان ڕەخساند کەوا ڕێککەوتنامەی ساڵی ۱۵۹۰ز هەڵوەشێننەوە.

گۆڕانی هەڵسوکەوتی شا عەباسی یەکەم لەبەرانبەر عوسمانییەکان: کشانەوەی هێزی عوسمانییەکان و گەشەسەندنی هێزی دەوڵەتی سەفەویی بوو بەهۆی ئەوەی شا عەباسی یەکەم هەڵسوکەوتی خۆی لەگەڵیاندا بگۆڕێ و بەمەش هەنگاوێکی سەرەتایی هەڵێنا بەرەو قۆناغێکی دیکەی جەنگی نێوانیان دەسپێبکاتەوە و کەبووە هۆی ئەوەی شا زۆربەی شارەکانی ئازەربێجان لەدەستی عوسمانییەکان دەربازبکات، لەدواییدا شا بەئاشکرایی هەستی خۆی بەرانبەر بە عوسمانییەکان دەردەخست.

لەساڵی ١٥٩١ز ئەحمەدخانی گەیلانی حاکمی گەیلان سەربەخۆیی خۆی لە دەوڵەتی سەفەویی راگەیاند و بەمەش شا زۆر نیگەران بوو بۆیە سوپایەکی رێکخست و بۆخۆشی سەرپەرشتی کرد و بەرەو تەمێکردنی ئەحمەد خان وەرێکەوت و گەیلانی داگیرکرد و فەرمانڕەواکەشی بەرەو دەوڵەتی عوسمانی هەڵات، لەوێش سوڵتان مورادی سێیەم پێشوازی لێکرد چونکە ئەویش چاوی بڕیبووە گەیلان چونکە ئەو شارە بەحەریر ناوبانگی دەرکردبوو، بۆیە نامەیەکی بۆ شا نارد و داوای لێکرد کەوا لەئەحمەدخان خۆشببێ، بەلام شا چونکە ئاگاداری مەرامەکانی سوڵتان بوو و دەیزانی کەئەو نیازی چوونە ناو قووڵایی خاکی ئێرانی لەدڵدایەو ئەم داوایەی رەتکردەوە، ئەمش یەکەم بەرەنگاربوونەوەی بوو لەرووی عوسمانییەکان.

لەساڵی١٥٩٥-١٥٩٦ز شا عەباسی یەکەم وەفدێکی بەسەرۆکایەتی زیلفیقار خان قۆمانلوو (وەك پێشتر باسکرا) پیرۆزبایی پێشکەش بە سوڵتان محەمەدی سێیەم کرد بەبۆنەی بوونی بەفەرمانڕەوای دەوڵەتی عوسمانیی و، لەهەمان کاتیشدا هەواڵی ئەو سەرکەوتنانەی کە لەبەرانبەر ئۆزبەکەکاندا پێڕاگەیاند کەلەخۆراسان بەدەستی هێنا، ئەمەش بووە بەرەنگاربوونەوەیەکی دیکەی دەوڵەتی عوسمانیی، بۆیە سوڵتانی عوسمانی بەم هەڵوێستانە نارازایی بوو و لەبەرانبەردا لەساڵی ١٥٩٧-١٥٩٨ز نێردراوێکی بەسەرۆکایەتی محەمەد ئاغا نارده لای شا عەباس و داوای لێکرد:

- چاو بەرێکەوتنامەی ساڵی ١٥٩٠ز د بخشێنێتەوە تاکو دەسکەوتی زیاتری بەدەسبێنێ.
- خۆراسان بۆ ئۆزبەکەکان بەجێبێڵێ.

- کوڕە گەورەکەی لەجیاتی میرزا حەیـدەر بنێرێتـە ئەسـتانبوڵ وەك بارمتـە لـەلایان بێنێتەوە، چونکە حەیدەر لەساڵی ١٥٩٦ز کۆچی دوایی کرد.

کاتێك نێردراوەکەی عوسمانیی گەیشتە ئێران شا خـەریکی ئـەوەبوو هێـرش بکاتـە سـەر مەشهەد تاکو لەژێر دەستی ئۆزبەکەکانی دەریبهێنێتەوە، بەلاّم شا پێشوازی لەنێردراوەکـە کرد و کۆبوونەوەیـەکی لەگـەڵ سـازدا. شـا نامەکـەی عوسمانییـەکانی بەهەڵوێسـتێکی خۆبەزلزانی لەلایەن ئەوانەوە لەقەڵەمدا و هەرگیز نـاتوانرێ کەلەبەردەمیـدا بێـدەنگبێ، بەتایبەتیش باروگوزەرانی ئابووری و سەربازیی عوسمانییەکان ڕێگەی ئەوەی ناداتێ کـەوا تا ئەم ئەندازەیە لوتبەرزبێ، بۆیە لەبەرانبەردا شا فەرمانیدا ریشی نێردراوەکە دەربهێـنن و لەگەڵ نامەیەکی هەڕەشەئامێزیی توونـدەوە بـۆ سـوڵتانی عوسـمانیی بنێـرن کەتێیـدا نووسرابوو: (کوڕی من جێنشینی منەو پاشای دوارۆژەو لەتوانای منیشدا نییە کەوا پاشـا بکەمـە بارمتـە لـەلای هـەر سـوڵتانێك بـێ))). بـۆ ئـەوەی زیـاتر دوژمنکـاریی و بەرەنگاربوونەوەی خۆی بۆ سوڵتان نیشان بدا نێردراوێکی دیکـەی نـاردە لایـی و کلیلـی بیست و چوار شاری کە لە ویلایەتەکانی خۆراسان و تورکستان و ئەفغانستان داگیرکردبوو بۆ نارد. لەراستیشدا نامەکانی شا ڕەنگدانەوەی باری دەوڵەتی عوسمـانیی بـوو لەلایـەنی بەهێزی و لاوازی.

ئازادکردنی تەورێز: لەساڵی ١٦٠٢ز کێشەی نێوان عەلی پاشای حاکمی تـەورێز و غـازی بەگی کوردی حاکمی سەلماس لەئازەربێجان سەری هەڵداو، سوپای عوسمانیی کە ئەوکاتـە لەتەورێز کۆببوونەوە هێرشیان کـردە سـەر شـارەکەو تالاّنیـان کـردو غـازی بـەگ داوای یارمەتی لە شا عەباسی یەکەم کرد، ئەویش ئەو بـێ پارێزگـاریی تـەورێزی بەهـەلزانی و بەهۆی فێڵێکەوە هێرشی کردە سەر، فێڵەکەش بریتی بوو لـەوەی کەکۆمـەڵێك سـەربازی بەجلی دانیشتوانی شارەکەوە ناردە ناو تەورێز و هەندێکی دیکـەش بـەجلی بازرگانانـەوە ناردە ناوی و پاشان لەناوەوەو دەرەوە لەیەك کاتدا پەلاماری سـوپای عوسمانییەکانیانـدا و توانیـان لەماوەیـەکی کـەم و بەهـەوڵێکی کـەمی سـەربازی و کـەمترین زیـان شـارەکە داگیربکەن و سوپای عوسمانییـەکانیش خۆیان بەدەسـتەوەدا. ئینجـا شـا بـەبێ شـەڕێکی ئەوتۆ کەشایانی باسبێ چووە ناو شارەکەوە و دانیشتوانەکەی زۆر بەگەرمیی پێشـوازییان

لێکرد. بەمشێوەیە ئەو شارە کەنزیکەی بیست ساڵ لەژێر فەرمانڕەوایی عوسمانیەکاندا بوو ئازادیان کرد.

شا کەسێکی ناردە لای سەرکردەی سوپای عوسمانیی تا پێی رابگەیەنێ چۆتە ناو شارەکەوە، بۆیە عەلی پاشا بەپەلە ئاشتەوایی لەگەڵ غازی بەگی کوردی سازکردو پاشان گەڕایەوە بۆ تەورێز بەو هیوایەی کەبتوانێ دەریان بکات. هەندێك لەشارەکانی وەك نەخجەوان و ئەیرەوان و ئەیرەڤان و رەیان هەڵسانەوە و سەربازەکانیان لەسوپای عەلی پاشا هێنایە دەرەوەو هێندەی دیکە سوپایەکەی لاوازبوو، لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوامبوو لەچوونی بۆ تەورێز و ماوەی نزیکەی شەش فەرسەخ مابوو بگاتە ئەوێ سەربازگەیەکی سازکرد تاکو ریزەکانی سوپا رێکبخاتەوە، بەلاّم شا دەسپێشخەری کردو شکستی پێ هێناو بەدیلی گرت بەلاّم نەیکوشت، کەچی ژمارەیەکی زۆری سەربازەکانی لەناوبرد.

لەدوای ئەوە شا بەرەو قەلاّی شارەکە وەرێکەوت و دڵنیایی بەخشیە سەربازەکانی عوسمانیی و پاشان وێرانی کرد تاکو بەیەکجاری بوونی عوسمانیەکان لەئازەربێجان نەهێڵێ، ئەم رووداوەش لە٢٤تشرینی یەکەم١٦٠٣ز بەرپابوو.

ئازادکردنی شارە ئەرمینیەکان: لەدوای سەرکەوتنی لەئازادکردنی تەورێز شا خۆی ئامادەکرد بۆ ئازاد کردنی ئەو شارانەی ئازەربێجان کەلەژێر دەسەلاّتی عوسمانییەکاندابوونەوە، ئەوەبوو یەکەمجار بەشارەکانی نەخجەوان و ئەیرەوانی ئەرمینی دەستی پێکردو، زولفیقاری راسپارد کە ئەوکاتە کردی بەحاکمی تەورێز لەدوای ئازادکردنی پێشرەوی بکات بۆ نەخجەوان و گەمارۆدانی، بۆیە سەربازەکانی عوسمانیی بەهۆی لاوازی هەڵوێستییان داوای دڵنیاییان لەشا کرد، بەلاّم لەبەر ئەوەی ژمارەیان زۆر کەمبوو و توانای بەرەنگاربوونەوە و شەڕی سەفەوییەکانیان نەبوو کەژمارەیان زۆر لەوان زیاتر بوو زولفیقار دڵنیایکردن و بەبێ شەڕ چووە ناو شارەکەوە.

لەدوای ئەوە شا بەسەرکردەیەتی سوپاکەیەوە بەرەو ئەیرەوان بەڕێکەوت و ئەو شارەش لەسێ قەلاّ و دوانزەهەزار سەرباز پێکهاتبوو و بەسەرکردایەتی شەریف پاشابوو، شا دەستی کرد بەلێدانی سەنگەرەکانی شار و لەژێر شوورەی شارەکەدا لەنێوان هەردوولادا شەڕ بەرپابوو. لەکاتی ئەنجامدانیی ئەو پێکدادانە سوڵتان محەمەدی سێیەم کۆچی دوایی

کرد و ئەحمەدی یەکەمی کوڕی لەسـاڵی ١٦٠٣-١٦١٧ز بـوو بەفـەرمانڕەوای دەوڵـەتی عوسمانیی، هەروەها بەهۆی سـەرهەڵدانی پشـێوی لەپایتـەختی عوسمانییەکانـدا گیـانی شـەڕکردن لـەلای سـەربازەکانی عوسمـانیی لاوازبـوو چـونکە بێئومێـد بـوون لـەوەی کەلەئەستەمبووڵەوە یارمەتیان پێ بگات، لەهەمان کاتیشدا شا ئەم هەڵوێستەی ئـەوانی بەهەلزانی و هێزەکانی خۆی لەدەووری شارەکە توووند کردو لەپاشاندا لە٢٨ئاباری١٦٠٤ز توانی هەرسێ قەڵاکە برووخێنێ، لەم شەڕەشدا عوسمانییەکان چوار هەزار سـەربازیان لـێ کوژراو ئەوەی مایەوە هەمووی خۆی بەدەستەوەداو بەدیل گیران. شا زۆر ڕێزی لەسـەرکردە عوسمانییـەکان گـرت و بەشـێوازێکی زۆر شـیاو هەڵسـوکەوتی لەگەڵـدا کـردن و هـەم هەڵوێستەی شا بوو بەهۆی ئەوەی ئەم پیاوە بێتە ریزی شیعەمەزەبەکانەوە و داوای لەشـا کرد کەوا ڕێگای پێبدات ژیانی داهاتووی لەمەشـهەد بباتەسـەرو ئـەویش ڕەمەنـدی بـۆ نواند.

کاتێك شا لەئازەربێجان بوو داوای لەوێردی خانی حاکمی فارس کـرد کـەوا بێتـە لایـی و بەیەکەوە ئەو شارانەی دیکەی ئازەربێجان بگێڕنەوە بۆ سـەفەوییـەکان، چـونکە لـەزۆرێك لەشارەکانی دەووروبەردا شەڕە سەرەکییەکان لەنێوان سـەفەویی و هێـزە وڵاتپارێزەکـانی عوسمانیی لەئارادابوون.

کاردانەوەی عوسمانییەکان: کاردانەوەی عوسمانییەکان بەرانبەر بە هەڵمەتەکانی سەفەویی زۆر بەخێرایی وەدەرکەوت، چونکە سوڵتان ئەحمەدی یەکەم لەبەرانبەر شا عەباسی یەکـەم کەوتە خۆسازدان کەنەهاوەند و تەورێز و چەند شارێکی دیکەی ئازەربێجانی گێڕابۆوە ژێـر دەسەڵاتی خۆی، بۆیە سوپایەکی چڕ و پڕی ساز و تـەیار کـرد و سینان پاشـای سـەدری ئەعزەم کەبە جیغـال ئـۆغلی ناوبـانگی دەرکردبـوو کـردە سـەرکردەی سـوپاکەو بـەرەو ئازەربێجان ناردی بەمەبەستی ئەوەی ئـەو شـوێنانەی سـەفەوییەکان دەسـتیان بەسـەردا گرتبوو هەمووی بگێڕێتەوەو پاشان بەرەو قووڵایی خاکی ئێران هەڵمەت ببات و دەوڵـەتی سـەفەویی لەناوبەرێت. سوپای عوسمانیی بەرە و ناوچە سـنوورییەکان بەرێکـەوت و کاتێـك گەیشتە شاری قارس بـۆ ئـەوەی ریزەکـانی سـوپا ڕێکبخاتـەوە و دارشـتنی پلانێـك بـۆ دەسـەسەرداگرتنی شارەکان ماوەیەك وەستان.

هەواڵی پێشڕەوی سوپای عوسمانیی لەڕێگای سـیخوڕەکانی تایبـەت بەشـا لەپایتـەختی عوسمانییەکانەوە پێی دەگەیشت، بەگوێرەی هەواڵەکان عوسمانییەکان بەرە و نەخجـەوان و ئەیرەوان لە ئەرمینیا بەڕێکەوتووە، لێرەدا شا کەوتە نێـو هەڵوێسـتێکی زۆر ناخۆشـەوە چونکە زۆربەی سـەربازانی سوپاکەی لەپشوودابوون و هەرگیز لەتواناى ئەو ژمارە کەمـەدا نەبوو کەوا رووبەرووی ئەو سوپا لەبن نەهاتووەی عوسمانیی ببێتەوە، بۆیە بەچـاکی زانـی کەوا بەرەو تەورێز پاشەکشـەبکات تـاکو بتـوانێ لەوێـدا خـۆی قـاییم بکـات لەلایـەك، لەلایەکی دیکەوە جیغال ئۆغلی دانەخۆرە بکات تابێتە ناو خـاکی ئێـران و لەبنکـەکانی سـەربازیی خۆی لەناوچە سنووریەکان دووریبخاتەوە و لەوێشـدا زۆر بـەگرانیی یارمەتییـە سـەربازییەکانی دەگـاتێ و ئینجـا هەڵوێسـتی لاواز دەبـێ و بەدڵنیاییـەوە هێرشـی بـۆ دەکات، جگە لەمانەش چەند هەنگاوێکی ئەوتۆی هەڵهێنا کە دەبوونە هۆی بـەهێزبوونی هەڵوێستی خۆی و ئاستەنگ لەبەردەم سوپای عوسمانیی، لەوانە:

- دەست کرد بە سووتاندنی هەموو ئەو کشتوکاڵەی کەلەسەر رێگای سوپاکەیدا بوون و هەروەها بیرەئاوەکیشیی رووخاند و، کە ئەمانەش دەبنە هۆی سنووردارکردنی تواناکـانی و هەروەها بەهۆی برسێتی و تینوێیەتییەوە سوپاکەی کوشتاری زۆریان تێدەکەوێت.

- هەموو دانیشتوانی سەر ئـەو رێگایـەی راگواسـت و بردنییـە قـوولایی ئێـران تـاکو لەمەترسی قڕکردن دووریانبخاتەوە، ئەوکاتە چ لەبەر مەترسیی عوسمانییەکان و چ لەترس برسێتی و کەم ئاوی نزیکەی بیست هەزار کەس لەو ناوچانە شوێنی خۆیان بەجێهێشت کە لەناویشیاندا ژمارەیەکی زۆری ئەرمەنیەکان هەبوون.

- قەڵایەك نوێی لەجێی قەڵا رووخاوەکەی تەورێز دروستکرد و بەخەندەقـەیێکی قـوول و دەووری گرت و هێندە خـۆراك و چـەك و تەقەمـەنی و پێداویسـتییەکانی دیکـەی لـەناو قەڵاکەدان کەبەشی سێ ساڵی دەکردن، ئەویش لەبەر ئەوەبوو کەوا توانـای بـەرگریکاریی مەدەنییەکان بەهێزبکات.

سوپای عوسـمـانیی سـەرەرای سـاردی و بـەفر بـارین و ئـەو هەنگاوانـەی سـەفەوییەکان جێبەجێیان کردبوو لەسەر رێگاکاندا لەقارسەوە بەرەو نەخجەوان و ئـەیرەوان بەڕێکـەوت، بەڵام نەیتوانی بۆ قولاییـەکی زۆری خـاکی ئێرانـی لەشکرکێشـیی بکـات و بەناچـاری و

لەدوای ئەوەی ژمارەیەکی زۆری سەربازەکانی لەدەستدا و لەژێر پاڵەپەستۆی سروشتێکی سەخت گەڕایەوە بۆ وان.

بەمشێوەیە پلانەکەی شا سەریگرت و جیغال ئۆغلی ناچاربوو بەخۆیدا بچێتەوە، ئەوەبوو بەر لەوەی بتوانێ سوپاکەی ڕێکبخاتەوە و بەر لەوەی لەپایتەختەوە یارمەتی بگاتێ شا هێرشی بۆ کرد و، فەرمانی بەوێردی خان کرد کەوا بەپەلە بەرەو وان بچێ و هێرشێکی لەناکاوی بکاتە سەر. کاتێك گەیشتن و دەوری شارەکەیاندا وەك شتێکی لەناکاو بوو بۆ سوپای عوسمانیی و هیچ حسابێکی پێشینەیان بۆ ئەم هەڵوێستە نەکردبوو، بۆیە سوپای عوسمانییەکان هەڵوێستی بەرگرییان وەرگرت و لەبەر ئاماددەیی سەربازییەکانیان نەیانتوانی ڕووبەڕوویان ببنەوە، لەدواییدا داوای یارمەتی لەپایتەخت کرد. سوپای عوسمانی هەواڵی ئەوەیان پێگەیشت کە لەئەستانبوولەوە یارمەتی بەڕێوەیە بۆیە شا فەرمانیدا کەوا هێزێك بەرەو پیریی بڕوات و ڕێی لێبگرێ، ئینج توانیان ئەو یارمەتییە لەناوبەرن و بەمەش جیغال ئۆغلی دووچاری فشارێکی سەربازیی زۆر توند بوودوە و هەستی بەوەکرد کەوا بەتەواوی دەووری دراوەو لەهەموو دەووروبەریش دابڕاوە، هیچ هیوایەکی سەرکەوتنی نەما و لەبەرئەوەش کە ژمارەیەکی زۆری لەسەربازەکانی کوژرابوون ئیدی توانای شەڕکردنی نەما، بۆیە ناچار بوو خۆی و زۆرێك لەسەرکردە سەربازیەکان و ئەرکانەکانی سوپاو ڕاوێژکاردکانی بەرێگای دەریاچەی وانەوە بەرەو خاکی عوسمانیی بڕۆن، لەپاشان دەستی کردەوە بەکۆکردنەوەی هێزە سەربازییەکان لەدەووری خۆی و جارێکی دیکە سوپاکەی ڕێکخستەوەو بۆ ئەوەی خۆی ئامادەبکات بۆ شەڕێکی دیکەی سەفەوییەکان، کاتێکیش ژمارەی سەربازەکان تەواوبوو و ژمارەیەکی لەسەرەك هۆزەکانی ناوچەکەشی هاتە پاڵ و بوو بەخاوەنی نزیکەی سەد هەزار سەرباز بەرەو ئازەربێجان و عەسکەری نزیك شاری سەڵماس هێرشی کرد.

ئەوکاتە شا عەباسی یەکەم لەشاری خووی بوو، شارەکەی بەجێهێشت و بەسەرکردایەتی سوپایەکی شەست و دوو هەزار سەربازیی بەرەو مەرەند بەرێکەوت تا لەهێزەکانی عوسمانیی نزیك بکەوێتەوە و پاشان سیخوڕەکانی خۆی نارد تاکو چاو بەهەڵوێستەکانی شەڕدا بخشێنن و هەواڵی عوسمانییەکانی بۆ بهێنن. بەڵام سەرەڕای ئەوەش زۆر لەگەورەیی

و قەبەیی سوپای عوسمانییەکان ترساو بڕوای وابـوو کـەناتوانێ رووبـەرووی ببێتــەوە، وای بەچاکزانی کەوا بەرەو تەوریز بگەڕێتەوەو هەرچی شتێکیش لەو نێوانەدا پێویست بـێ بـۆ ژیان هەمووی سووتاند، تا ئەگەر هێزەکانی عوسمانیی گەیشتنە تەوریز مانــدوو و برسـی بن و توانای شەڕیان نـەمێنێ و بەمـەش بەئاسـانی دەتـوانێ بەسـەریاندا زاڵـبێ، بـەڵام سەرکردەکان ئەم بیرۆکەی پاشەکشەیان رەتکردەوە تاکو بوار بۆ عوسمانییەکان نەرەخسێنن هێرشیان بێنێتەسەر، جگە لەمەش ئەو رایەی وێـردی خانیشـیان رەتکـردەوە کـە باسـی دەسگرتن بەهەڵوێستی بەرگریی دەکرد.

لەبەردەم ئەو هەموو جەختکردنەوەیـەی سـەرکردەکان، شـا عـەباسـی یـەکـەم فەرمانیـدا هێزەکانی کە دەسپێشـخەری بکەن لەپەلاماردان و هێرشکردن، و لـەلای سـەفەوییەکانەوە وێردی خان سەرکردایەتی سوپای سـەفەوییەکانی دەکـرد. ئـەوەبوو لـەرۆژی ٢٤تشـرینی دووەم ١٦٠٥ز لەنێوان هەردوو هێزەکەدا شەڕ دەستی پێکـرد و ئەوەنـدەش لەیـەك نزیـك بوونەوە کەبەشمشێر شەڕیان دەکرد و هەردوولاش ژمارەیەکی زۆری سـەربازییان لێکـوژرا و، ئەمەو بەئاشکرایی سەرکەوتنی سـەفەوییەکان وەدەرکـەوت. لەبەرانبەریشـدا جیغـال ئۆغلی لەناو شکسـتی و دۆڕاندنەوە گەڕایەوە بۆ دیاربەکر، بەڵام لەبەر سەختی خەمەکـەی دوای دوو رۆژ گیانی لەدەسدا، یاخود لەوانەیـە لەترسـی سـوڵتان و بـەهۆی ئـەو هـەموو شکستە یەك لەدوای یەکانەی خۆی کوشتبێ.

نزیك بوونەوەی سەفەویی-عوسمانیی: رێکەوتننامەی دووەمی ئەستانبووڵ:

شا عـەباسی یەکەم ئـەم سـەرکەوتنە گەورەیـەی کـە لەبەرانبـەر سـوپای عوسمانییـەکان بەسەرۆکیایەتی جیغال ئۆغلی بەهەلزانی و تـوانی لـەحوزەیرانی١٦٠٦ز شـاری گەنجـە و تەفلیس بگێڕێتەوە بۆ ژێر دەسـەڵاتی خۆی. لەلایـەکی دیکـەوە بـەهۆی سـەرکەوتنەکانی سـەفەویی و لەدەســدانی شــار و قــەڵاکانی ئازەربێجــان داگیرکردنیــان لەلایــەن سەفەوییەکانەوە، سەدری ئەعزەم دەروێش پاشا وای پێشـنیار کـرد کـەوا لەبەرژەوەنـدی دەوڵەتی عوسمانیدایە گفتوگـۆ و دانوسـتاندن لەگـەڵ سـەفەوییەکاندا بکـەن و پرۆسـەی ئاشتی لەگەڵیانـدا سـەربخەن و چـاوەڕێی هـەلێکی دیکـە بکـەن تـاکو درێـژە بەشـەڕی سەفەوییەکان بدەنەوە، بۆ ئەم مەبەستەش نامەیەکی بۆ شا ناردو تیایدا پێشنیاری ئەوەی

کرد باشترین کـار بـۆ ئـەم قۆناغـە راگـرتنی شـەڕە لـەنێوان ئـەم دوو دەوڵەتـە بـەهۆی ماندووبوون و پێویستی حەوانەوەی سەربازەکان لەو هەموو شـەڕە یـەك لـەدوای یەکـە و هەروەها کەمیی بەروبوومەکانیش لایەنێکی دیکەی گرفتەکان بوون. شا ئەم پێشـنیارەی زۆر پێ پەسەندبوو، بۆیە غازی خـانی وەك نێـردراوی خـۆی نـاردە ئەسـتانبووڵ و لەگـەڵ خۆشیدا کۆمەڵێك دیاری و نامەیەکی پێبوو بۆ سـوڵتان، کەلەنامەکـەدا شـا پێشـنیاری کردبوو ئاشـتەوایی لەگـەڵ عوسمانییەکانـدا بەهـەمان مەرجـەکانی پەیماننامـەی سـاڵی ١٥٥٥ز بکەن کەلە نێوان شا تەهماسبی یەکەم و سوڵتان سەلیمی قانوونی مۆرکرابوو.

شا عەباسی یەکەم چاوەڕێی وەڵامی سوڵتانی عوسمانیی نەکرد، یەکسەر لـەدوای نـاردنی نامەکە هەوڵیدا ئەو شارانەی ئازەربێجان کەتاکو ئێستا لەژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکانـدا مابوونەوە ئازادبکات، پاشـان تـوانی بادکۆبـە و دەربەنـد دوای ئـەوەی دانیشـتوانەکەی لایەنگریی خۆیان بۆ راگەیاند و پشتیان لـە عوسمانییـەکان کـرد دەسـتی بەسـەرداگرتن، بەهەمان شێوەش هەڵسـوکەوتی لەگـەڵ دانیشـتوانی قـەڵای دەرگـای دەرگاکانـدا کـرد کەبەعاسێیی و قەییمی سەرنگەرەکانی ناوبانگی دەرکردبوو، بـەڵام هەنـدێك لەقـەڵاکان خۆیان بەدەستەوە نەدا وەك قـەڵای شـەماخی پایتـەخت لەهـەرێمی شـەروان، بۆیـە شـا ناچاربوو ئەمانە داگیربکات. جگە لـەوەش شـا دەسـیکرد بەتـەمێکردنی ئـەو هۆزانـەی کەهاوسۆز یـاخود یارمەتیـدەری عوسمایـەکان بـوون بەتایبـەتیش کـوردە سـوننیەکان و چەندین جار هێرشی کردنە سەر و پـەنابردنی ئـەو هـەزاران راپـەڕیوەی جەلالیەکانیشـی بەهەلزانی و هەمووی لەناوچە کـورد نشـینەکاندا نیشـتەجێکرد تـاکو بـەرەنگاری هـەر بزووتنەوەیـەکی دژ بەدەوڵـەتی سـەفەویی بنـەوە و لەهەمانکاتیشـدا دەسـت بوەشـێنن لەبزووتنەوە کوردیەکانی بەرهەڵستکاری وەك قوباد خـانی مـوکری فەرمانـداری قـەڵای گاودۆڵی و ئەمیرخانی سەرکردەی هۆزی برادۆست.

بەم سەرکەوتنانەش شا بوو بەخاوەنی تەواوی ناوچەی ئازەربێجان و هەمووی خسـتە ژێـر دەسەڵاتی خۆیـەوە، هـیچ شـازادەیەکیش نەیـدەتوانی بەئاشـکرایی دژایـەتی خـۆی بـۆ خانەوادەی سەفەویی دەربڕێ.

موراد پاشای سەدری ئەعزەم کە جێی دەروێـش پاشـای گرتـەوە دەرکـی بـەوەکرد کـەوا تـەرازووی هێـز بەشـێوەیەکی بەرچـاو بـەلای سـەفەوییەکاندا لاربۆتـەوە و بەرژەوەنـدی عوسمانییەکان لەوەدایە هەوڵبدەن رێککەوتنی ئاشتیی لەنێوان هەردوو دەوڵەتی سەفەویی و عوسمانیدا سازبکەن، ئینجا لەدوای ئەوەی هەوڵەکانی سـەدری ئـەعزەم سـەریان گـرت، نێردراوێکی بۆ لای شا عەباسی یەکەم نارد و بەشێوازێك کەزیاتر لەتکاکاریەوە نزیك بـوو داوای لێکرد دووبارە دەسبکەنەوە بەنامەگۆڕینەوە لەگـەڵ سـوڵتان ئەحمـەدی یەکـەم بـۆ ئەوەی ئاشتی لەنێوانیاندا جێگیرببێتەوە و پشت بکەنە شەڕ.

بەڵام وادیاربوو کـەوا مـەرامی عوسمانییـەکان بـۆ سـازکردنی رێککـەوتنێکی ئاشـتیی راسـتگۆیانە نەبوو، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەبوو: مـوردا پاشـا سـوپایەکی بەسـەرکردایەتی ئەکرەمی سەرکردەی سوپای خۆرەڵات ناردە ئێران بەبیانووی ئەوەی هاتوون بۆ دانوستانی ئاشتی، ئەم کارەش شای زۆر نیگەران کرد چونکە سوپاکە سەربازێکی زۆری لـەخۆگرتبوو و ئینجا لەنیازپاکی عوسمانییەکان دوودڵبوو، لەبەر ئەوەی متمانەیەش لەنێوانیاندا نـەما شا فەرمانایدا سوپایەك سازبکرێ تاکو ئامادەبێ بۆ رووبەرووبوونەوەی هەر مەترسـیەکی عوسمانیی.

هەواڵی ئامادەسازیی سـەفەوییەکان گەیشتە گوێی وەزیری عوسمانیی و ئەویش نامەیەکی بۆ شا ناردو تیایدا نیازپاکی و ئامادەیی ئاشتبوونەوە و رەزامەندی سوڵتانی عوسمانی بـۆ نارد کەجارێکی دیکە پەیماننامەی ساڵی ١٥٥٥ز نێوانیان دووبارە بکەنەوە.

لەراستیدا ئەوکاتـە سـوڵتان ئەحمـەدی یەکـەم بـەبارو گـوزەرانێکی سـەختی ئابووریـدا تێدەپەڕی و واشی دەبینی کەوا هیچ سەرکەوتنێك وەدینـاهێنێ ئەگـەر شانبەشـانی ئـەو تەنگژە دارایـیەی کەهەموو دەوڵەتی عوسمانیی گرتۆتەوە بـەردەوامی بەشـەڕەکان بـدات. لەهـەمان کاتیشـدا لـەنێوان دایکـی و پـووری شـا نامەگۆڕینـەوە ئەنجامـدرا و هـەموو لایەکیش گەیشتنە ئەو رایەی کەوا هیچ سوودێك لەشەڕدا نییە و دەبێ هەموو پەلەبکـەن بۆ ئاشتەوایی.

شا عەباسی یەکەم نێردراوەکەی خۆی کە قاسم بەگی سەرکردەی سوپای مازەندەران بوو ناردە ئەستانبوول و لە ٢٠تشرینی دووەم١٦١٢ز پەیماننامەیەکی ئاشتەواییان مۆرکرد کەلەم بەندانە پێکهاتبوو:

١- دەوڵەتی عوسمانیی دەبێ دان بەو سنوورەدا بنێ کەسەردەمی سوڵتان سولەیمانی قانوونی هەیبوو و بەڵێنیش بدات دەسدرێژی نەکاتە سەر ئەو زەویانەی لەدوای ئەو ماوەیە و لەسەردەمی سوڵتان مورادی سێیەم و محەمەدی سێیەم دەستی بەسەرداگرتبوو. لەبەرانبەریشدا شا عەباسی یەکەم بەڵێنبدا کەوا هێزەکانی خۆی لەو شوێنانەی کە دەکەونە نێوان وڵاتی نێوان دوو رووبار بکێشێتەوە و هەمووشی بگێڕێتەوە بۆ عوسمانییەکان.

٢-شا عەباسی یەکەم بەڵێن دەدا کەوا ساڵانە دووسەد باری حەریر و سەد باری دیکەی کاڵای هەمەجۆر بنێرێ بۆ سوڵتانی عوسمانیی.

٣-هەر لایەکیش نوێنەری خۆی هەڵدەبژێرێ بۆ ئەوەی سنورەکانیان دەسنیشان بکەن.

٤- دەوڵەتی سەفەویی بەڵێن دەدات کەوا هیچ کارێکی دڵشکێنیی بیروباوەڕی (عقائد) ئەنجام نەدات، هەروەك چۆن لەسەردەمی تەهماسب شا ئەمە پەیڕەوی دەکرا.

٥- دەوڵەتی عوسمانیی بەڵێن دەدات کەوا رێگری لەگەشتیارانی سەفەویی نەکات کە بەنێو خاکی ئەواندا گوزەربکەن و رێگە بەحاجیەکانی ئێرانی بدرێ کەوا بەئارەزووی خۆیان بەرێگای حەلەب — دیمەشق و بەغداد — بەسرەدا هاتووچۆی حەج بکەن.

٦- دەوڵەتی سەفەویی بەڵێن دەدات کەوا دالدە و پاسەوانی هەڵۆخانی حاکمی شارەزوور نەکا.

٧-هەردوولا بەڵێن دەدەن کەوا رێگری لەهاموشۆی سەرکردەکانی یەکتری نەکەن کاتێك لەسەر سنوورەکان بەمەبەستی دەسنیشانکردنیان بوونیان دەبێ.

## بەدواداچوونێک بۆ پەیماننامەی ئاشتەوایی ساڵی ١٦١٢ز:

- شا عەباسی یەکەم بەو هێندە خاکەی کەجێگای ناکۆکی نێوانیان بوو لەگەڵ عوسمانییەکان قایلبوو، ئەویش کەوتبووە سەر ناوچە ستراتیژیەکانی سنووریی و دەوڵەمەند بەحەریر و بازاڕگا جۆربەجۆرەکان، دوای ئەوەی دەستی بەسەردا کرت یەکسەر داوای ئاشتی کرد چونکە دەیزانی لەمە زیاتری دەستناکەوێ و سنووری دەسەلاتی لەوەتێناپەڕێ و، هەروەها هەموو بەندەکانی ئەم ئاشتەواییە بەپێچەوانەی ڕێککەوتنامەکەی ساڵی ١٥٩٠ز و سەرەتای دەسەلاتداریتیەکەی لەبەرژەوەندی ئەودایە، چونکە بەهۆیەوە توانی بەشێوەیەکی فەرمی سنورەکانی جێگیر و دەسنیشان بکات و، لەلایەکی دیکەوە پەیماننامەی ئەماسیا دانی پێداناو لەهەولی ئەوەشدا بوون کەوا بەشێوەیەکی روونتر سنورەکان دەسنیشان بکەن.

- ئەم پەیماننامەیە کێشەیەکی ئابووری تێدا بوو کە لەرێککەتنامە کۆنەکەدا بوونی نەبوو، شا پەیمانیدا کەوا ڕێژەیەك حەریر بنێرێ بەبێ ئەوەی دەسنیشانی نرخەکەی بکات نەزانرا ئایا ئەمە وەك دیارییەکە یاخود وەك سەرانە، هەرلایەکیش بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانی خۆی لێکیدایەوە، ئەوەبوو عوسمانیەکان لەلای خۆیانەوە پێیان وابوو سەرانەیەکە و دەبێ بەردەوام سەفەوییەکان بیدەن، بەڵام سەفەوییەکان وایان لێکدایەوە تەنها بۆ یەك جار و وەك دیارییەك بۆیان دەنێرن. سەفەویەکان ئەم بۆچوونەی عوسمانیەکانیان رەتکردەوە چونکە خاوەن هێزبوون، و یەکێك لەمێژوونووسەکان هەردوو بەندی یەکەم و دووەمی بەیەکەوە گرێداو گوتی: سەفەوییەکان تەورێزیان دەسدەکەوێ بەرانبەر دوو سەد بار حەریرو سەد باری کاڵای جۆربەجۆری دیکە بدرێ بەعوسمانییەکان. ئەم لێکدانەوەیەش زیاتر لەراستیەوە نزیکە چونکە تەورێز مەڵبەندی بازرگانی حەریربوو، نەشدەکرا عوسمانییەکان وەها بەئاسانیی دەسبەرداریی بن و هیچ بەرانبەرێکی تایبەت و شیاو وەرنەگرن و، لەهەمان کاتیشدا زۆر پێویستیان بەحەریر هەبوو.

- پەیماننامەکە دووپاتی ئەوەی کردەوە کەشارەزوور کە لەنێوان هەولێر و هەمەدان بوو سەر بەدەوڵەتی عوسمانییەو شا بەڵێنیدا کەوا بەهیچ شێوەیەك پارێزگاری لە هەڵۆخانی

حاكمی ئەویێ نەكات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت لەبەر گرنگی ناوچەكە لەرووی سیاسی و ئابوورییەوە دەوڵەتی عوسمانیی ویستی دەستی سەفەوییەكانی لەسەر لاببات.

- پەیماننامەكە رێگای بەحاجیەكانی ئێرانیدا كەوا رێگاكانی نێو دەوڵەتی عوسمانی بەكاربهێنن بۆ حەجكردن، لەوانەش رێگای حەلەب-دیمەشف كەزۆر هێمن و پارێزراو بوو بەپێچەوانەی رێگای بەغداد-بەسرە بەهۆی زۆری هۆزەكانەوە زۆر جێگیرنەبوو. دەوڵەتی عوسمانی پەیمانیدا كەوا ژیانی ئەو حاجیانە بپارێزێ بەبێ گوێدانە ئەو سوودە مادییەی لەرێی باج و سەرانە لێیان دەكات.

## رێكەوتنامەی سەراب:

لێژنەیەكی هاوبەش لەهەردوو دەوڵەت پێكهات و كۆبوونەوەیەكیان لەسەلّماسی ئازەربێجان سازكرد بۆ دەستنیشانكردنی سنوری دەوڵەتی سەفەویی و عوسمانیی و لەكارەكانیشیاندا سەركەوتنیان بەدەستهێنا و توانیان سنوری ئازەربێجان و ئەرمینیا دەستنیشان بكەن و لەسەر ئەوەش رێككەوتن كەوا ولاّتی كەرەج لەنێوان خۆیاندا دابەش بكەن، بەلاّم ئەو كارەی كەلەلایەن تەمهورس خانی حاكمی كاخت كە لایەنگری عوسمانییەكان بوو و رێككەوتنەكەش بریاری لەسەر ئەوەدابوو ویلایەتەكانی بخرێنە سەر ئێران و بەمەش لەسالّی ١٦١٤ز یاخی بوونی خۆی راگەیاندو سەركردەی سەفەوییەكانی تێدا دەركرد.

لەبەرانبەر ئەو كارە شا بەپەلە كەوتەخۆی بەرەو ولاّتی كەرەج كەوتەرێ بۆ ئەوەی تەهمورس خان تەمبێ بكات و لەسالّی ١٦١٦ز سوپای سەفەویی لەرووباری رەس پەرییەوە و لەشەرێكی سەخت و دەستەویەخەدا رووبەرووی یەكبوونەوە و سەربازەكانی قزلباش قەسابخانەیەكی گشتیان بۆ دانیشتوانی شارەكە سازكرد و شا عەباسیش هەموو كلێساكانی لێكرنە مزگەوت و ژمارەیەكی زۆری دانیشتوانەكەشی لێ راگواست و بردنی بۆ فەرەح ئاباد و ناوچەی شەرەف لەمازەندەران.

سوپای سەفەویی لەدوای ئەوەی بەمەبەستی لەناوبردنی یاخیبووەكان كاختی ملكەچ كرد، بەردەوام بوو لەسەر لەشكركێشی بۆ ناو ولاّتی كەرج. هەروەها كۆبوونەوەی هێزەكان

لــەو شــوێنانەدا زیــاتر بــوونی هــەبوو کــەوا ڕێکەوتننامــەی دووەمــی ئەســتانبووڵ بــۆ سەفەوییەکانی دەسنیشان کردبوو. ئەم کارە لەوکاتــەدا ڕوویــدا کەهێشــتا دانوســتان بــۆ دەسنیشان کردنی سنورەکان هەر لەئارادابوو، ئینجا عوسمانییەکان سەفەوییەکانیان بــەوە تۆمەتبارکرد بەمەبەستی لەباربردنی دانوستانەکە ئەم هێرشانە دەکــەن و بەمــەش گــرژی دروستبوو، لەو نێوەندەشدا هەوڵیانــدا دەســەلاتی خۆیــان بەســەر کاختــدا زاڵبکەنــەوە و ئامرازێك بدۆزنەوە بیانگەیەنێتە ئەو ناوچانەی حەریر بەرهــەم دەهێــنن، بــەلام شــا ئــەم هەلەشی بۆ ڕەخساندن و هەوڵیدا هەڵوێســتی خــۆی ڕوونبکاتــەوە لــەو شــەڕەی لــەوڵاتی کــەرەج ڕوویــدا و بــۆ نیشــاندانی نیازپــاکی هــەموو ئــەو دیلــە تورکانــەی ئــازادکرد کەلەشەڕەکانی دژ بەعوسمانییەکان گرتبوونی.

وادیار بوو سەدری ئەعزەمی ڕاوێژکار و ڕێنیشاندەری پاشا بەراوبۆچــوونەکانی شــا قایــل بوو دەرباری ئەم کێشەیە و لەبەرانبەردا چەند ســەرکردەیەکی تووندڕەوی عوسمانییــەکان پێی نیگەران و تورەبوون و بەهاریکاری لەگەڵ سەفەوییەکان تۆمەتباریان کــرد و ســوڵتان ئەحمەدی یەکەمیشیان گەیاندە ئەو بڕوایــەی کەلــەناوی ببــات و لەســێدارەیانداو لــەجێی ئەویش محەمەد پاشایان دانا و فــەرمانی پێکــرد لەکێشــەی کــەرەج بکۆڵێتــەوە، ئــەویش سوپایەکی چڕی ســازکرد کەلەســەد هــەزار ســەرباز پێکهــاتبوو و لــەئابی ١٦١٦ز بــەرەو ئازەربێجانی ئێرانی ڕۆیشت و گەیشتە شاری ئــەیرەوان و گەمارۆیــدا. ئــەم گەمارۆیــەش ماوەی پەنجا و چوار ڕۆژ درێژەی کێشا بــەلام لەبــەر هــاتنی وەرزی زســتان و بــەفربارین و کەمبوونەوەی ئازووقە نەیتوانی لەگەمارۆیەکەیدا بەردەوامبێ و ناچار گەڕایــەوە بــۆ وان. ئەوکاتە شا لەنەخجەوان بوو کەماوەی سەدوپانزە کیلۆمــەتر لــەوێ دووربــوو و کــەوتبووە لای باشووری خۆرەلاتیەوە و چاودێری هەڵوێستەکەی دەکرد.

لەبەر ئەم ژێرکەوتنەی سوڵتان سەدری ئەعزەم فەرمانیــدا کــەوا محەمــەد پاشــا لابــدرێ و لەجێگای ئەودا خەلیل پاشا دابندرێ. ئەمەشیان ســوپایەکی ســازکرد بــۆ ئــەوەی درێــژە بەشەڕەکە بدات، لەپێناوی ئەوەی بەتەواوی ســوپایەکەی بــۆ شــەڕ ئامادەبکــات ســوڵتان نامەی بۆ شا نارد و تیایدا پێشنیاری ڕێکەوتنی نێوانیانی دەکرد.

خەلیل پاشا بەسەرکردایەتی سوپایەکی زۆر گەورە لە١٦ئایاری١٦١٨ز بەرەو ئازەربێجـان ڕۆیشت و بـەنیازی ئـەوەش بـوو لەپاشـاندا ڕێکـەوتنێکی ئاشـتەوایی سـازبکەن، بۆیـە دەسپێشخەری کرد و هەموو بەروبوومێکی ڕێگای نێوان تەورێز و دیاربەکر کەلەسەر ڕێـی عوسمانییەکان بوو سووتاند و لەناوبرد و هەرچی هۆکارێکی ژیان هەبوو هەمووی تێکـدا و ئینجا تەورێزی چۆڵکرد و هەمووی سووتاند و لەنێوان ئەویٚ و قەزوینیشدا چەندین هێـزی پارێزگاری دانا بـۆ ئـەوەی ڕێگـای لەلەشکرکێشـی عوسمانیـەکان بگـرن و، بـۆ ئـەوەش لەمەیدانی شەڕەکە نزیك بیٚ لەئەردەبیل سەبازگەیەکی دامەزراند.

سوپای عوسمانی بەرەو تەورێز پێشڕەوی کرد و لەرێگاشدا ژمارەیـەك شـازادەی کـەرەجی هاتنـە پاڵیان کەپێشتر لەسەر دەستی سـەفەوییەکان دووچاری زیانی زۆر ببوونەوە، ئەوەبوو خان قەرەم جانی بەگی کەڕای چل هەزار سـەربازی بەسـەرکردایەتی شـاهینی جێنشـین و کوڕی گەورەی خستە خزمەتیان و ئەم سوپایەش بـەبیٚ هـیچ بەرەنگاربوونەوەیـەك تـوانی بچێتە ناو تەورێزەوە، بەڵام کاتێك چاوی بـەو وێرانکـاری و سـووتان و چـۆڵییەی کـەوت تووشی سەرسوڕمانهات کەهیچ هۆکارێکی ژیانی تێدا نەمابوو، بۆیە ناچـار بـوو لـەدوای پێنج ڕۆژدا ئەویٚ بەجێبێڵێت و لەدەوروبەری شارەکەدا سەربازگەیان سـازکرد.

لەسـەربازگەکەی خۆیـەوە خـەلیل پاشـا نامەیـەکی بـۆ شـا نـارد و تیایـدا پێشـنیاری ئاشتبوونەوەی بۆ کرد و بەم شێوەیەش مەرجەکانی دەسنیشان کردو، ئامۆژکاریشـی کـرد کەوا پێیان قایل بیٚ باشترە لەوەی کە پێشڕەویی بکات و لەدواییشدا دەوڵـەتی سـەفەویی بڕووخێنیٚ:

١- شا ساڵانە سیٚ سەد بار حەریر وەك سەرانەیەك بۆ دەوڵەتی عوسمانیی بنێریٚ.

٢- شا بەشی خـۆراوای ئازەربێجـان و ئـەرمینیا و شـەکی و شـەروان و وڵاتـی کـەرەج بگێڕێتەوە بۆ عوسمانییـەکان، کـە ئـەم ویلایەتانـە بـەهۆی پەیماننامـەی دووەمـی ئەستانبووڵ لەدەوڵەتی عوسمانی وەریگرتبوون.

٣- شا یەکێك لەکوڕەکانی وەك بارمتە بنێرێتە ئەسـتانبووڵ تـاکو نیازپـاکی خـۆی لـە جێبەجێکردنی پەیماناکە نیشانبدا.

**چەند تێبینییەك لەسەر مەرجانەکانی سەرەوە:**

- سەدری ئەعزەم خلیل پاشا وای هەڵسەنگاند کەوا شا عەباسی یەکەم توانای بەرگریی کاری سوپاکەی نییە و جگە لەقایل بوون هیچ دەرفەتێکی دیکەی نییە بۆیە ئەم مەرجە سەختانەی خستۆتە سەر.

- لەبەندی یەکەمدا خەلیل پاشا بەتەواوی چاوی خستە سەر حەریری ئێرانی چونکە خاوەن ناوبانگێکی زۆر گەورەبوو و لەئەورووپاشدا زۆر داواکاریی لەسەربوو، هەروەها داوای زیاتکردنی ئەو بڕەی پێشتری کرد تاکو بواری ئەوەیان نەمێنێ شتێکی ئەوتۆی لێ بنێرنە ئەورووپا، ئەمەش کاریگەری خراپی دەبێ لەسەر پەیوەندیەکانی سەفەویی-عوسمانیی.

- شا عەباسی یەکەم لەبەر ئەوەی خوێنێکی زۆری ڕشت لەسەر ئەو شوێنانەی لەمەرجی دووەمدا ناویان هاتووە ناتوانێ بیانگێڕێتەوە بۆ عوسمانییەکان.

- پێشتر و لەساڵی ١٥٩٧-١٥٩٨ز عوسمانیەکان مەرجی سێیەمیان داوا کردبوو بەڵام ئەوکاتە شا ڕەتیکردبۆوە.

هەروەها کارێکی ئاسایی بوو شا ئەم مەرجانەی وەك خۆبەدەستەوەدانێك بوون ڕەتبکاتەوە، لەبەرانبەریشدا تەنها بەوە ڕازیبوو کەوا یەکجار و سەد بار حەریر وەك دیارییەك بۆ عوسمانییەکان بنێرێ. هەڵوێستەکە گرژی تێکەوتوو جارێکی دیکە هەڵمەتە سەربازیەکان دەستیان پێکردەوە، بۆیە شا لەترسی ئەوەی ئەردەبیل بکەوێتە ژێردەستی عوسمانییەکان شارەکەی چۆڵکرد.

پاشان سوپای سەفەویی بەرەو سەربازگەی عوسمانییەکان لەدەوروبەری شاری تەورێز وەرێکەوت و لەناکاویش پێکیاندادا و شکستی پێهێنا و نزیکەی پانزە هەزار سەربازی لێکوشت، بەمەش سەدری ئەعزەم ژێرکەوتنی دووچارهات و دەوڵەتی عوسمانیش تووشی شکستێکی بێ وێنەکرد کەبەهێچ شێوەیەك مەزەندەی نەدەکرد، ئەمەش وایکرد کەوا تەرازووی هێز بەلای سەفەوییەکان لاربێتەوە. عوسمانییەکان توانای بەرەنگاربوونەوە و شەڕکردنیان لەگەڵ سوپای سەفەویدا نەما، ئەوکاتە سوپای شا لەئازەربێجان کۆبووەوە،

ناچاربوون بچنە ناو دانوستانەوە، بۆیە خەلیل پاشا نێردراوێکی بـۆ ئـەم مەبەسـتە نـاردە لای شا عەباس یەکەم و کاتێکیش لەسەر بنەمای ئاشتەوایی رەزامەندی نواند، رێکەوتنە ئاشتیەکە لەناوچەی سەرابی خۆرەلاتی تەوریز لەسـەر رێگـای نێـوان ئـەردەبیل و زنجـان لە٢٩ئەیلول١٦١٨ز مۆرکرا و ناویان لێنـا رێکەوتنامـەی سـەراب و تـەنها لـەدوو بەنـد پێکهاتبوو:

١- سنوری نێوانیان وەك چۆن لەپەیماننامەکەی ئەماسیا هاتبوو بمێنێتەوە.

٢- بەندەکانی ٣و ٤و ٥و ٦و ٧ی پەیماننامەی دووەمی ئەستانبوڵ کاری پێبکرێ.

جگە لەم دوو بەندەش شا بەڵێنیدا کـەوا سـالانە سـەد بـار حـەریر بنێـرێ بـۆ دەوڵـەتی عوسمانیی.

## بەدواداچوونێکی رێکەوتنامەی سەراب:

رێکەوتنامەی سەراب هەنگاوێکی زۆر گرنگ بوو لەپەیوەندیـەکانی نێـوان سـەفەویی و عوسمانیی، چونکە ئەم دانوسـانە لەسـەراب واتـە لەسـەر خـاکی سـەفەوییەکان سـازکرا کەبەپێچـەوانەی ئـەوانی پێشـووی بـوو لەسـەر خـاکی عوسمانییـەکان لەئەسـتانبوڵ بەرێوەدەچـوون، ئەمـەش نیشـانەی لاوازی عوسمانیـەکانی نیشـانددا لەبەرانبـەر سـەفەوییەکان، ئەم لاوازییە گەیشتە ئەو ئاستەی کەوا عوسمانیەکان لەجیاتی دووسەد بـار حەریر تەنها بەسەد بار رازیبێن و دەسـبەرداری دوو ناوچـەی سـتراتیژیش بـوون: دەرنـە و دەرتەنکی کوردەکان، کە لەئایندەدا سەفەوییەکان بۆ کۆبوونەوەی هەڵمەت بـردن بـەرەو بەغداد بەکاری دەهێنن.

ئەم رێکەوتنامەی ئاشتەوایی بواری رەخساند کەوا بۆ ماوەی پێنج سـاڵ ئاشـتی و ژیـانی ئاسایی باڵ بەسەر رێگا بازرگانیەکاندا بکێشـێ و، ئـەو هـەموو حـەریرەی بـۆ دەوڵـەتی عوسمانیی دەناردرا وای لەشا عەباسی یەکەم کرد ئەو رێکەوتنەی لەگەڵ ئینگلتەرا سـازی دابوو بەر لەچەند مانگێك و تایبەت بوو بەهەناردەی حەریر بۆ بەریتانیا هەڵوەشێنێتەوە، هـەروەها لـەنێوان شـا عـەباس و سـوڵتان عوسمـانی دووەم لەسـالی١٦١٨-١٦٢٣ز

نامەگۆڕینەوە بکرێ، کەئەم سوڵتانە لەساڵی ١٦١٧-١٦١٨ز جێگای سـوڵتان محەمـەدی یەکەمی گرتەوە.

## قۆناغی سێیەم: ململانێ لەپێناوی بەغدا

پەیوەندی نێوان عوسمانیی و سەفەوییەکان بـەهۆی ڕێکەوتنامـەی سـەراب بـەرەو باشـی دەچوو، بەڵام شا کە بەناچاری واژووی ئـەم ڕێکەوتنامەیـەی کردبـوو بـەدوای هەلێکـدا دەگـەڕا تـا دەوڵـەتی عوسمـانیی لـەناوببات، ئـەوەبوو لەسـاڵی ١٦٢٣ز بـەهۆی چـەند ڕووداوێکەوە کەبۆ بەرژەوەندی خۆی قۆزتنیەوە، هەلی بۆ ڕەخسا:

- شا دەستی کردەوە بەگەمارۆی ئابووری سەر دەوڵەتی عوسمـانیی کەپێشـتر پـەیڕەوی دەکـرد و لەگـەڵ بـەریتانیا لەسـەری ڕێکـەوتبوون، و بەهۆیـەوە دەبوایـە لـەهورمز لەپورتوگالیەکان بدەن و لەکەنداوی عەرەبی دەریانبکەن و ئـەم کـارەش لەهـەمان سـاڵی واژووکردنی ڕێکەوتنەکە بەئەنجام گەیشت، و دەستی بەسەر هورمزدا گرت و لەوێوە توانی حەریر هەناردەی ئەورووپا بکات و لەکەشتیەکانی کۆمپانیای هیندی خۆرەڵاتی-ئینگلیزی باربکات و بەمەش دەوڵەتی عوسمانی لەو هەموو باجی گومرگە بێبەشبوو.

- دروستبوونی کێشەو پشێوی بەهۆی تیرۆرکردنی سـوڵتان عوسمـانی دووەم لـەناوخۆی دەوڵەتی عوسمـانیی و جێنشینیی سـوڵتان مـستەفای یەکـەم جـارێکی دیکـە لەسـاڵی ١٦٢٣ز.

- سازبوونی پشێوی لەبەغدا بەهۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی یەکێك لەسەرکردە گەورەکان کەناوی بەکر سۆباشی بوو لەدژی یوسف پاشای فـەرمانڕەواو پاشـان کوشـتنی، بەمـەش بـەکر سـەربەخۆیی لـە حکومـەتی ناوەنـدی ئەسـتانبوڵ ڕاگەیانـد و دەسـتی بەسـەر بەغداشداگرت. لەبەر ئەوەی بەغدا لەسیاسـەتی دەوڵەتی عوسمـانی گرنگیـەکی تایبـەتی خۆی هەبوو فەرمان بەحافزپاشای حاکمی دیاربـەکر درا کـەوا تـەمبێی بکـات و لـەناوی ببات و ئەویش هانای بۆ شا عەباسی یەکـەم بـرد و بەڵێنیشـی پێـدا کـەوا بەغـدای بـدا بەدەستەوە.

شا سوپایەکی ئامادەکرد و بەرەو بەغدای نارد بۆ ئەوەی سەردانی شوێنە پیرۆزەکانی شیعە بکات لەعیراق و بەمەش ئامانجە راستەقینەکەی خۆی شاردەوە، کاتێکیش لێی نزیك کەوتەوە سەربازگەکەی لێ سازدا و پاشان دیاریەکی بۆ بەکر سۆباشی نارد کەبریتی بوو لەفێسێکی قزلباشی و هێما بوو بۆ پیاوە نزیکەکانی خۆی، بەڵام ئەوەی روویدا لەبۆچونەکانی ئەودا نەبوو، ئەویش ئەوەبوو کەوا حافز پاشا دەسەوەستان لەبەردەمی شارەکەدا وەستا و بەئەنقەست شێوازی فرۆفێڵی گرتە بەر بۆ ئەوەی لەشار دووریخاتەوە و دەریبکات، ئینجا رێکەوتنێکی ئاشتەوایی لەگەڵ بەر سوباشی ساز کرد و کردی بەوالی عوسمانییەکان لەبەغداو پاشان ناوچەکەی بەجێهێشت و بەرەو دیاربەکر گەڕایەوە.

بەکر سوباشی بەم دەسبەکاربوونەی قایل بوو چونکە لەسەردەمی سەفەوییەکاندا نەدەبووە خاوەنی پلەیەکی لەم شێوەیە و لەهەمان کاتیشدا بۆ هەبوو لەگەڵ عوسمانییەکاندا لێکتێگەیشتن بکات و کاتێکیش نێردراوەکانی شا بەدیارییەکەیانەوە گەیشتنە لای هەمووی کوشتن کلاوی قزلباشەکانیشی خستە ژێرپێی.

لەئەنجامی ئەو غەدرەی نێردراوەکانی سەفەویی دووچاری هاتن شا عەباسی یەکەم بڕیاریدا هێرش بکەنە سەر شارەکەو گەمارۆی بدەن و لەگەڵ هێزی وڵاتپارێزەکان رووبەرووی یەکتر بوونەوە. لەدواییدا بەکر سوباشی بەپەلە ناردی کەوا حافزپاشا یارمەتییان بۆ بنێری و ئەویش هێزێکی سەربازی بۆ رەوانە کرد، بەڵام سوپای سەفەویی رێگای چوونە ناو شارەکەی لێگرت و ئەمەش بووە هۆی زیاتری ناڵەباری گوزەرانی ناوەوەی شار. سەرەڕای ئەوەش بەکر سوباشی خۆی بەدەستەوە نەداو بەردەوامبوو لەبەرەنگاربوونەوە و شەڕکردن رووبەروو بوونەوەی گەمارۆکەی سەری، بۆیە شا ناچاربوو پەنابباتە بەر فێڵ و تەڵەکەبازی و توانی محەمەد سوباشی کوڕی بەکر سوباشی دەستەمۆبکات و لەگەڵیدا ریکبەکەوێ کەئەگەر هاتوو هاوکارییاکات و بەغدا داگیربکەن و لەدوای نەمانی باوکی ئەوا دەیکاتە حاکمی شارەکە.

ئەوەبوو محەمەد سوباشی دەرگای شارەکەی لە ٢٥کانوونی یەکەم١٦٢٣ز بۆ سەفەوییەکان کردەوە، سەربازەکانی قزلباش بەپرتاو هەڵمەتیان بردە ناوەوە. هێزە پارێزگارەکان تووشی شۆك هاتن چونکە سەفەوییەکان گەیشتنە سەریان و دەستیان کرد بەکوشتنیان و پاشان

دەستیان بەسەر شارەکەدا گرت و بەکر سوباشیان گرت و پاشان بردیان دیوانی شا عەباسی یەکەم و ئەویش بەهۆی کوشتنی نێردراوەکانی سەرزەنشتی کردو فەرمانیدا بیخەنە ناو بەلەمێك و پڕی بکەن لە زەیت و کبریت و ئینجا بەزیندووی ئاگری تێبەردەن بەبەرچاوی خەڵکەوە بەناو ئاوی دیجلەدا بیگێڕن.

بەڵام محەمەد سوباشی کوڕی وای دەزانی کەوا شا بەڵێنەکەی خۆی بەجێدەهێنێت و دەیکاتە حاکمی بەغدا، کەچی شا لەترسی ئەوەی وەك لەباوکی هەڵگەڕایەوە ئەوا لەویش هەڵگەڕێتەوە بەندی کرد و ناردیە خۆراسان و پاشان فەرمانیدا کوشتیان.

لەدوای ئەوەی دەستی بەسەر بەغدادا گرت شا عەباسی یەکەم چەند تیپێکی سەربازی نارد و کەرکوك و موسڵیان داگیرکرد و بەمەش دەستی بەسەر زۆربەی خاکی عیراقدا گرت و پاشان چووە نەجەف و ماوەیەك لەوێ مایەوە و دوایی گەڕایەوە بۆ ئەسفەهانی پایتەخت.

دەوڵەتی عوسمانی لەبەرانبەر لەدەسدانی بەغدا دەسەوەستان نەبوو، سوڵتان مورادی چوارەم (١٦٢٣-١٦٤٠ز) کە جێی سوڵتان مستەفای یەکەمی گرتەوە فەرمانی دایە حافزپاشا شارەکە بگێڕێتەوەو سەفەوییەکانیش لەعیراق دەربکات، ئەویش دەستی بەسەر کەربەلاو حللەی داگیکرد و لە ٢١تشرینی دووەم١٦٢٤ز بەرەو بەغدا بەرێکەوت لەگەڵ هێزە پارێزگارە سەفەوییەکان دەستیان لەیەك وەشاند و شا بەپەلە یارمەتی سەربازی بۆ هێزەکانی ناوەوەی شار رەوانەکرد و ئەم یارمەتییەش بوو بەهۆی ئەوەی هیچ کامیان سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا و نەیانتوانی ئەویدیکەیان بشکێنن و ماوەی حەوت مانگ بەم شێوەیە مایەوە. لەلای خۆیەوە سوڵتان مورادی چوارەم هێزێکی بۆ یارمەتی دانی سوپاکەی دەوری بەغدا نارد بەڵام هێزی قزلباشەکان رێگایان لێبڕین و توانیان گەمارۆیان بدەن. بەمەش حافزپاشا ناچاربوو لەدوو قۆڵەوە شەڕبکات، لەدواییدا و بەهۆی ئەوەی هەڵوێستەکەی زۆر شەرمەزاریی بوو ئارەزووی ئەوەی کرد لەگەڵ شا عەباس ئاشتەوایی بکات و دان بەدەسەلاتەکەیدا بنێ لەشاری بەغدا و شوێنە پیرۆزەکانی لای شیعە لەعیراق، لەبەرانبەریشدا شا عەباس بەم پێشنیارە قایل بوو و بوارێکی هێمنانەشی بۆ سەربازە عوسمانییەکان رەخساند تا بگەڕێنەوە و پاشەکشە بکەن.

وادیار بوو کەوا عوسمانییەکان مکوڕبوون لەسەر ئەوەی بەهەر نرخێکبێ بەغدا بگێڕنەوە بۆ خۆیان و ئەم پێداگریەشیان بریتی بوو لەدەرکردنیان بەنەمانی توانای شا عەباس لەدەستنی ناماجەکانی و ماندووبوونی زۆری لەشەڕەکان و خوێنڕشتنێکی زۆر و بێتوانایی لەبەرەو پێشچوون و پێشڕەویی بۆ ئەو ناوچە ستراتیژییانەی بەرژەوەندییەکانی سەربازی و بازرگانیی تێدا مسۆگەر دەبوو، ئەویش دەرکی بەمەکرد بۆیە مەیلی بەئاشتبوونەوە کرد و ئینجا نامەیەکی بە قازی بەغدا بۆ سولتان مورادی چوارەم ناردو تیایدا پێشنیاری کرد کوڕی شا ببێتە فەرمانڕەوای بەغدا و لەبەرانبەردا دراوی ولات و وتارەکانی هەینی مزگەوتەکانی بەناوی سولتانی عوسمانییەوە بێ و سالانەش سەفەوییەکان پەنجا دیناری زێڕ بداتە دەولەتی سولتان، بەلام سولتان پێشنیارەکەی رەتکردەوە و بەهاندانی دەوروبەرەکەشی قازی بەغدای کوشت.

بەمشێوەیە هەولەکانی دەولەتی عوسمانی بۆ گێڕانەوەی بەغدا بەئاکام نەگەیشت و هەر بەو جۆرە و تاکۆتایی دەسەلاتدارێتیی شا عەباسی یەکەم هەر بەدەستی ئەوان مایەوە و لەدوای ئەویش ماوەی دە سالێدیکە هەر بەم شێوەیە بوو.

## پەیوەندییەکانیان لەگەڵ دەولەتی مەگۆلی لەهیندستان:

ململانێی بۆ دەسبەسەرداگرتنی قەندەهار: پەیوەندی نێوان دەولەتی مەغۆلەکانی هیند و سەفەوییەکانی ئێران بەشێوەیەکی گشتی باشبوو، بەلام ئەمەش هۆکار نەبوو بۆ ئەوەی لەپێناو دەسبەسەرداگرتنی قەندەهاری کێشەلەسەر ململانێ لەنێوانیاندا روونەدات. لەراستیشدا ئەم کێشەی لەکۆنەوە لەبەر گرنگی لەرووی بازرگانییەوە هۆکاری سەرەکی ناکۆکی نێوان ئێران و هیندستان بوو و هەروەها بنکەیەکی گرنگی وەستانی بازرگانانی هیندستان و چین بوو، لەلایەکی دیکەشەوە ناوەندێکی سەربازی ستراتیژی بوو لەسەر سنووری باکوری خۆراوای هیندستان، بۆیە بابری پاشای هیند و کوڕەکانیشی لەدوای خۆی جەختیان لەسەر پارێزگاری کردن بەو شارە دەکردەوە. بەلام سەفەوییەکان لەبەر ئەوەی لەژێر پالەپەستۆی رۆژگارێکی پڕ لەشەڕ و کێشەو ململانێ دابوون بۆیە بەناچاری دەسبەرداری داواکردنەوەی بوون، کەچی بەهیچ شێوەیەك ئەوان ئەو شارەیان

لەبەرنامەکانی خۆیاندا پشت گوێ نەخستبوو و هەمیشە لەبیری گێڕانەوەیدابوون بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆیان چونکە پێیان وابوو ئەم شارە مافێکی سروشتی و شەرعی خۆیانە.

هەر لەسەرەتای دەسەڵاتداریێتی شا ئیسماعیلی یەکەم پەیوەندیەکانیان بەرەو باشی دەچوو و دوژمنایەتی هاوبەشی لەبەرانبەر ئۆزبەکەکاندا هێندەی دیکە ئەو پەیوەندییەی بەهێزترکردبوو، تاکو سەردەمی شا تەهماسبی یەکەم و داگیرکردنی لەساڵی ١٥٣٦ز هەر بەردەوام بوو و ئەو کاتەش حوسێن میرزای کوڕی بەهرام میرزای برای کردە حاکمی ئەوێ. کاتێك کە قەندەهار بەهۆی ئەوەی ببوە کلیلی ڕێگای سنوریی باکوریی-خۆرەلاتیی لەسیاسەتی پاشاکانی هیندستان جێگای گرنگی تایبەتی خۆیبوو، بۆیە بووە هۆی تێکچوونی پەیوەندیەکانییان لەگەڵ سەفەوییەکان و ئەم کێشەیەش لەهەموو ماوەی فەرمانڕەوایەتی تەهماسبی یەکەم بەردەوامبوو، جگە لەویش لەسەردەمی هەر یەکە لەشا ئیسماعیلی دووەم و محەمەد خودابەندەش بەو شێوەیەبوو بەلام هیچ کاتێك نەببوە هۆی شەڕی نێوانیان.

کاتێك لەساڵی ١٥٥٦-١٦٠٥ز جەلالەدین محەمەد ئەکبەری کوڕی هەمایۆن دەسەلاتی هیندستانی گرتە دەست، بەدوای هەلێکدا دەگەڕا تاکو قەندەهار بگێڕێتەوە بۆ هیندستان و بۆ ئەم مەبەستەش سەرەتا سەنەد و میللەتان و گەرەکەکانی بەتهانی نزیك شارەکەی خستە ژێر دەسەلاتی خۆی کە ئەمە پێشەکییەك بوو بۆ مەبەستە سەرەکییەکەی تا شارەکە لەژێر دەستی سەفەوییەکان بهێنێتە دەرەوە، ئەم هەلەشی لەساڵی ١٥٩٠ز بۆ ڕەخسا بەهۆی هێرش و پەلاماری دوولایەنە، ئۆزبەکەکان لەلای خۆرەلات و عوسمانییەکانیش لەخۆراوا، ئەوکاتەش شا عەباسی یەکەم سەرقاڵ و ماندووی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان بوو بۆیە یارمەتی و پشتگیریی بۆ قەندەهار و پەیوەندیەکانی بەحاکمەکانیەوە پشت گوێ خست و ئەوانیش زۆر پەلامارەکانی ئۆزبەك دەترسان و لەدواییشدا خۆیان خستە پاڵ دەوڵەتی مەگۆلیی لەهیندستان.

حاکمی قەندەهار کەسەفەویی بوو و ناوی موزەففەر میرزا و ڕۆستەم میرزای برای کوڕەکانی حوسێن میرزا داوایان لە ئەکبەر کرد کەوا یەکێك لەسەر کردەکانی بنێرێ بۆ ئەوەی شارەکەیان بداتە دەستەوە، ئەویش شاهی بەگی بۆ ئەم مەبەستە ڕەوانەکرد و

لەدواییدا موزەفەر میرزای لەپلـەی خانـەی کـارگێڕیی حـوکمڕانی دامەرزانـد و کـردیش بەفەرمانڕەوای سمبەهال.

شا عەباسی یەکەم بەهۆی سەرقاڵیی بەشەڕی ئۆزبەك و عوسمانییەکانـەوە بـواری ئـەوەی نەبوو کەوا دەست لەم کارە وەربدات، بەپێچـەوانەوە هەوڵـیدا کـەوا لێـی نزیـك ببێتـەوە بەڵکو لەشەڕی ئۆزبەك یاخود بۆ گێڕانەوەی قەندەهار یارمەتیدەری بێت، بەڵام هـیچ کـام لەم هیوایانەی شا نەهاتنەدی، بۆیە وازی لەقەندەهار هێناو خەریکی شەڕی دوژمنـەکانی بوو، لەم ماوەیـەدا جـەختی لەسـەر ئـەوە کـردەوە کـەوا لـەرێگای ئـەو نێردراونیـە بـۆ هیندستانی دەناردن زانیاری لەسەر مەگۆلەکانی هیندستان کۆبکاتەوە.

ئەکبەر لەساڵی ١٦٠٥ز کۆچی دوایی کردو نورەدین جیهانگیریی کـوڕی ١٦٠٥-١٦٢٧ز جێگای گرتەوە و لەسەردەمی ئەودا پشێوی بەنگال و میوار و دەکنی گرتـەوە، هـەروەها ململانێی خانەوادەییشی هاتە پاڵ کە کوڕەکەی شا جیهان داوای دەسەڵاتدارێتی دەکـرد، بۆیە هەل بۆ شا عەباسی یەکەم رەخساو هێرشی کردە سەر قەندەهار و داگیریکرد.

لەدوای ئەوە شا سـەرقاڵی شـەڕی ئازەربێجـان و شـەروان بـوو، هـەروەها جیهـانگیریش خەریکی هەندێك کێشەی ناوخۆیی بوو و ببووە هۆی هەڵوەشانەوەی پەیوەندییەکان، بەڵام لەساڵی ١٦٠٩ز شا نێردراوێکی ناردە دەهلی کەئەویش میرزا بەرخوردار خان بوو بـەخانی عالەم ناوبانگی دەرکردبوو و کۆمەڵێك دیاری و پرسـەنامەیەکی بەبۆنـەی باوکییـەوە بـۆ ناردبوو لەگەڵ پیرۆزبایی بەبۆنەی تـاج لەسـەرنانی جیهـانگیر، بەمـەش جـارێکی دیکـە پەیوەندییە باشەکانی نێوان دوو دەوڵەتەکە سازبۆوە، لەدواییشدا نێردراوەکانی هـەردوولا زۆر بەچڕی هاتووچۆ و سەردانی یەکتریان دەکرد تـا لەسـاڵی ١٦١٧ز هیندسـتان حـەوت سەد کەسی بەنێردراویی ناردە ئێران.

سەرەڕای هەموو ئـەم هەڵوێسـتان ئیجابییانـە کەچـی هـەرگیز شـا کێشـەی قەنـدەهاری لەبیرخۆی نەدەبردەوە و هەمیشە لەخولیای ئەوەدا بـوو قەنـدەهار بەشـەڕ یـا بەئاشـتی بگێڕێتەوە بۆ دەوڵەتی سەفەویی، بۆیە لەساڵی ١٦٢٠ز نێردراوێکی ناردە هیندسـتان بـۆ ئەوەی لەگەڵ وەزیرەکانی جیهـانگیر لەکێشـەی قەنـدەهار بکۆڵنـەوە، بـەڵام هەوڵەکـەی سەرینەگرت. ئینجا بڕیاریدا بەشـەڕ بیگێڕێتـەوە، ئەوکاتـەش مەترسـیەکانی ئۆزبـەك و

عوسمانییەکانی لەسەر ولاتەکەی لابردبوو و هەموو ئەو ناوچانەی ئۆزبەك و عوسمانییەکان هەر لەسەرەتای فەرمانڕەوایەتی خۆیەوە داگیریان کردبوو هەمووی خستەوە ژێر دەسەلاتی خۆی و دورگەی هورمزی لەپورتوگالیەکان سەندبۆوە، ئەمانە بوون بەهۆی ئەوەی متمانەی زیاتر بەخۆی بکات و هێرشی کردە سەر قەندهار و لەدوای چل و پێنج ڕۆژ لەگەمارۆدانی دەستی بەسەرداگرت، ئینجا بەناوی دوانزە ئیمامەکەوە وتارێکی تیادا خوێندەوە، لەلایەکی دیکەشەوە باروگوزەرانی خراپی پاشای مەگۆلی یارمەتیدەری بوو چونکە لەنێوان خۆی و شا جیهانی کوڕی کێشەی جێنشینی دروستبوو و باوکی دەیویست پلەکە بۆ کوڕە بچووکەکەی شەهەرەیاربێ کە سولتانە نورجیهان ویستی وابوو و کاریگەریشی هەبوو، بۆیە ئەم ڕووداوە بوو بەهۆی ئەوەی کاریگەری خراپ لەسەر پەیوەندی نێوان کوڕ و باوکدا دروسبکات، لەکۆتاییشدا گەیشتنە ئەو هەلوێستەی کەوا کوڕەکە فەرمانی باوکی لەدەرکردنی سەفەوییەکان لەشاری قەندەهار جێبەجێنەکرد لەترسیی ئەوەی ئەم دوورخستنەوەیە بۆ قەندەهار هەنگاوی یەکەمە بۆ دوورخستنەوەی یەکجاری لەجێنشینیی، لەهەمان کاتیشدا جیهانگیر لەترسی ئەوەی کوڕەکەی دەست بەسەر تەختی پاشایەتیدا نەگرێ ئەویش ئەم هەڵمەتی دەرکردنەی شا ئیسماعیلی لە قەندەهار ئەنجام نەدا.

ئینجا شا عەباسی یەکەم نامەیەکی بۆ جیهانگیر نارد و تیایدا دووپاتی مافی شەرعی و میراتگریی خۆی لەسەر ئەم شارە دەکردەوە، وادیاریشبوو جیهانگیر بەم بۆچوونە قایلبوو، یاخود لەوانەبوو رای وابێ کەناتوانێ شارەکە بگێڕێتەوە بۆیە فەرمانی بەهێزەکانی کرد پاشەکشەبکەن.



# بەشی حەوتەم

# شا عەباسی یەکەم

# ١٥٨٨ز-١٦٢٩ز

## پەیوەندییەکانی لەگەڵ جیهانی ئەورووپا

## پەیوەندی سەفەویی – ئیسپانی و پورتوگالیەکان

### بەرایی:

لەوانەیە لەهەمووی سەرنجراکێشتر ئەو کرانەوە بەرفراوانەی ئێران بێ بەرووی دەوڵەتە ئەورووپیەکان لەسەردەمی شا عەباسی یەکەم، شایانی باسە فەرمانڕەواکانی پێشخۆی بەرانبەر ئەو کرانەوەیە زۆر بەپارێزبوون، ئەگەر هەر نێردراوێکی ئەورووپیش بچوویایە پایتەختی سەفەوییەکان ئەوا زۆر بەساردی و بێ بایەخییەوە شا پێشوازی لێدەکرد، بۆ نموونە جارێکیان شاژنی ئینگلتەرا ئەلیزبێس لەساڵی ١٥٦٢ز ئەنتۆنی جانکسینی بەنوێنەریی نارده لای شا تەهماسب بۆ ئەوەی پەیاننامەیەکی دۆستانە سازبکەن، بەلام شا زۆر گرنگی پێنەداو هیچ بوارێکیشی بۆ نەرەخساند کەوا مەرامەکەی بەجێبهێنێ. هەموو مەبەستی ئینگلتەرا لەو دۆستایەتییە ئەوەبوو کەدەیویست بەهۆیەوە دەستبەسەر رێگای بازرگانییەکانی خۆرهەڵاتدا بگرن و ئیسپانیا و پورتوگالەکانیش دوورخاتەوە، چونکە ئێران شوێنێکی زۆر گرنگ و ستراتیژیی هەبوو.

بەلام لەسەردەمی شا عەباسی یەکەم و بەهۆی دوژمنایەتی عوسمانییەکانەوە هەولی کرانەوە بەرووی دەوڵەتە ئەورووپیەکان و یارمەتی وەرگرتن بۆ بەرێوەبردنی شەرەکەی، چونکە ئەویش دەرکی بەوەکرد خاکەکەی چەندە گرنگیی هەیە بۆ ئەورووپیەکان و لەهەمان کاتیشدا لەبیری ئەوەدابوو کەرێگاو چالاکییەکانی بەرەو خوارووی ببات بۆ ئەوەی لە دەوڵەتی عوسمانیی و ئەو باجەی دەدرا بەعوسمانییەکان خۆی رزگاربکات.

شا عەباس نێردراوێکی زۆری نارده ئەورووپا بۆ ئەوەی پەیوەندییەکانی نێوانیان پتەوبکەنەوه لەگەڵ دەوڵەتەکانیان و، لەهەمان کاتیشدا بانگهێشتی ئەورووپییەکانی کرد سەردانی ئێران بکەن بۆ ئەوەی چالاکی بازرگانیی بەیەکەوه ئەنجام بدەن و لەدواییشدا پێشوازی لەچەندین نێردراوی ئەورووپی کرد. لەنەسەفەهانیش کۆبوونەوەیەکی زۆری نێردراوه بازرگانییە ئەورووپییەکان و هەروەها مزگێدەبەخشە مەسیحیەکانیش بوونیان هەبوو، بۆیە شا جەختی لەسەر دابینکردنی ئاسایش و ئارامیی بۆ دەکردنەوه.

نێردراوه ئیسپانییەکان بۆ دەوڵەتەی سەفەویی:

لەناوجەرگەی ئەو کێشانەی شا عەباس لەگەڵ عوسمانییەکان هەیبوو هەوڵی نزیك بوونەوه و هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەورووپییەکان دەدا بۆ ئەوەی بەیەکەوه شەڕی عوسمانییەکان بکەن و ئەورووپییەکانیش بۆ هەندێك ئامانجی تایبەتی خۆیان ئەم نزیك بوونەوەیەیان لەلاپەسەندبوو:

- بەرەنگاربوونەوەی عوسمانییەکان لەئەورووپا، کەدوژمنی هاوبەشیان بوو.
- هەڵسوکەوتی باشی سەفەوییەکان لەگەڵ مەسیحیەکانی ئێران.
- سازدانی پەیماننامەی بازرگانی لەگەڵ سەفەوییەکان.

ئیسپانیا هەنگاوی یەکەمی هەڵهێناو لەساڵی ١٥٩٨ز شا فیلیپی دووەم (١٥٥٥-١٥٩٨ز) وەك نێردراوی پورتوگالەکان و بەسەرکردایەتی راهیبەکانی وەك ئەلفۆنسۆ کردرۆی فرنسیسکی و نیکۆلا دی ملۆ دۆمینیکی نارده ئێران، کە نێردراوی تایبەتی هێزەکانی پورتوگالی بوو لەدوورگەی هورمز، چەندین دیارییان بۆ شا هێنا و هەروەها پیرۆزبایی پاشای ئیسپانیایان بەشا عەباس راگەیاند بەبۆنەی سەرکەوتنەکانی بەسەر ئۆزبەکان لەخۆراسان، پاشان داوایان لێکرد رێگە بە گاورەکانی ئێران بدات کەوا بۆخۆیان کڵێسا سازبکەن و مەراسیمە ئایینیەکانیشیان بەئازادی سازبدەن، لەبەرانبەریشدا شا سوپاسی ئەو پیرۆزباییەی کردن و بەڵێنیشی پێدان کەوا بەشێوازێکی شایەستە هەڵسوکەوت لەگەڵ مەسیحیەکانی ئێراندا بکات.

نێردراوەکانی ئیسپانیا ماوەیەکی کەم مانەوە و زۆر بەخێرایی شا عەباس نوێنــەری خـۆی ئامادەکرد و لەگەڵ نێـردراوە ئەورووپیـــەکان بـەرێگای روسـیا و ئـەلمانیا بـەرە ئـەرووپا بەرێکەوتن.

لەدوای ئەویش پاشای ئیسپانیا فیلیپی سێیەم (١٥٩٨-١٦٢١ز) ئـەنتۆنیۆ دی جۆڤیـای وەك نوێنــەری خـۆی لەســالّی ١٦٠٢ز نـاردە لای شــاعەباس و ژمارەیــەکی زۆریشــی مژدەبەخشــەکان لەگەڵــدابوو و شــا لەشــاری مەشــهەد پێشــوازی لێکــرد و، ئینجــا گفتووگۆکانیان لەبارەی داواکارییەکانی پاشای ئیسـپانی دەستی پێکرد:

- بەحرەین بگەڕێتەوە بۆ ژێر دەسەلاّتی خـۆی، چـونکە ئاشـکرایە کـەوا شـا عــەباس لەسالّی ١٦٠١ز دەستی بەسەردا گرت.

- لابردنی گەمارۆی سەر دەربەندی کەمبرۆن کەبەمەبەستی کەمکردنەوەی فشاری سەر بەحرەین سەفەوییەکان سازییانکردبوو.

- رێگە بەموژدەبەخشەکان بدرێ کەوا لەئێراندا کاری خۆیان ئـەنجام بـدەن و کڵێســاش دروستبکەن بۆ ئەوەی مەسیحیەکان مەراسیمە ئایینیەکانی خۆیانی تیادا بەرێوەببەن.

شا بابەتی گێڕانەوەی بەحرەینی بۆ ئیسپانیا رەتکردەوە و هیچ بوارێکیشی بـۆ دانوسـتان نەهێشــتەوە، بــەلاّم قایـل بـوو بــەوەی گــەمارۆی ســەر کــەمبرۆن لاببــات. کەچــی بـۆ دروستکردنی کڵێســاکانی مەسـیحیش مــەرجی ئــەوەی دانـا ئیسـپانیا دەبـێ لەشـەڕی عوسمانییەکان یارمەتی دەوڵەتی سەفەویی بدات.

ئەوەبوو فیلیپی سێیەمی پاشای ئیسـپانیا بـۆ جـاری دووەم لەســالّی ١٦٠٨ز نێـردراوی ناردەوە بۆ بەسەرۆکایەتی ئەنتۆنیۆ دی جۆڤیــا و دیســانەوەی داواکارییــەکانی پێشــوویان خستەوە بەردەمی:

- گێڕانەوەی بەحرەین بۆ ئیسپانیا.

- ئاسـانکاری بۆ مەسـیحییەکانی ئێران.

- ڕێگەدان بەبازرگانەکانی ئیسپانیا و پورتوگال کەوا ڕێگا بازرگانییەکانی ناوچەی کەنداوی عەرەبی بەئارەزووی خۆیان بەکاربهێنن. ئەویش لەبەرانبەر زۆرێك بەڵێنی ئیسپانی بۆ یارمەتی دانی دەوڵەتی سەفەویی لەشەڕی عوسمانییەکان.

وادیاربوو شا دڵی بەم بەڵێنانەی پاشای ئیسپانیا خۆشنەبوو چونکە ئەو وای بەباش دەزانی کەوا یارمەتییەکان لەبەرچاوی خۆیدا ببینێ و ئەم هەموو گفتوگۆیەش هیچ سوودێکی نییە ئەگەر پاشا بەڵێنەکانی خۆی جێبەجێ نەکات، بۆیە شا فەرمانیدا نێردراوەکەی ئیسپانی بگەڕێتەوەو لەگەڵ خۆشیاندا دەنگیزبەگ وەك نوێنەری دەوڵەتی سەفەویی لەگەڵ خۆیاندا بەرن بۆ لای پاشا و لەگەڵیدا گفتوگۆبکات.

دەنگیزبەك لەگەشتەکەی بۆ ئیسپانیا هەندێك کاری ئەوتۆی ئەنجامدا بووە هۆی ئەوەی شا لێی هەڵگەڕێتەوە:

- پشت گوێ خستنی ئەو نامەیەی شا بۆ فیلیپی سێیەمی ناردبوو، ئەویش لەسەر داوای بەرپرسە ئیسپانیەکەی دەربەندی جوا ئەم کارەی کرد.

- ئەو سیستەمەی تایبەت بوو بەسەفیرەکان بۆ لەبەرکردنی جلوبەرگی فەرمیی ئێران بوو دەنگیزبەگ گوێی پێنەداو لەکاتی پرسەی شاژنی ئیسپانیا بەرگی ڕەشی پۆشی.

- ئەو نامەیەی شا بۆ پاپای ناردبوو، دەنگیزبەگ فرۆشتییە یەکێك لەبازرگانەکان تاکو بۆ خۆی بەکاری بهێنێت و بەهۆیەوە قازانجی زۆری دەسکەوێ و لەکۆشکی فەرمانڕەوایەتی کاری پێبکات.

- دەنگیزبەگ لەبەرئەوەی هەڵسوکەوتی زۆر ناشایەستەی لەگەڵ یاوەرەکانیدا دەکرد زۆرێکیان لەبەر بێزاریی و دڵشکانیان لەئیسپانیا مانەوەو چوونە سەر ئایینی مەسیحیی.

دەنگیزبەگ تا ساڵی ١٦١٢ز لەئیسپانیا مایەوە و پاشان گەڕایەوە بۆ ئێران و، ئەوکاتە شا زۆر بەساردی و بێڕێزییەوە پێشوازی لە ئەنتۆنیۆ دی جۆڤای نێردراوی پاشای ئیسپانیا کرد، لەدواییدا سەرزەنشتی دەنگیزبەگی کرد بەهۆی ئەو هەڵسوکەوتانەی لەو سەفەرەدا ئەنجامیدان و پاشان کوشتی، نێردراوەکانی ئیسپانی ترسیان کەوتە دڵ و دەرباری شای

سەفەوییان بەجێهێشت و بەپەلە خۆیان گەیاندەوە دوورگەی هورمز کە ناوەندی سەرکردایەتی هێزەکانی پولوگالیبوو لە ناوچەی کەنداوی عەرەبی.

ئینجا پاشای ئیسپانیا دوایین نێردراوی خۆی بەسەرۆکایەتی دۆن گارسیا دی سیلڤا ڤیجۆرا ناردو لەئایاری١٦١٨ز گەیشتە ئەسفەهان و نامەیەکیان پێبوو کە ئەم داواکاریانەی تێدابوو:

- گێڕانەوەی بەحرەین و کەمبرۆن، ئاشکرایە کەلەساڵی ١٦١٤ز دەوڵەتی سەفەویی کەمبرۆنی داگیر کردبوو.

- رێگەدان بە مەسیحیەکان کەوا لەسەر خاکی سەفەویی رێورەسمە ئایینیەکانیان پەیڕەوبکەن.

- بەچاوێکی پڕ لەسۆزەوە تەماشی ئەو هاوڵاتییە ئیسپانیانە بکرێ کەوا سەردانی ئێران دەکەن.

- سازدانی رێکەوتنی بازرگانی کەوا باڵادەستی زیاتر بداتە ئیسپانی و پورتوگالیەکان لەبەڕێوەبردن و سەرپەرشتی کردنی بازرگانی لەناوچەی کەنداوی عەرەبی.

- رێگە نەدرێتە بازرگانە ئینگلیزەکان کەوا کێبڕکێی بازرگانەکانی ئیسپانی و پورتوگالیەکان بکەن.

هەموو ئەمانەش لەپێناوی ئەوەدابێ کە یارمەتی ئێران بدرێ لەدژی عوسمانییەکان و ئیسپانیا کەشتیەکانی خۆی دەنێرێ بۆ ئەوەی شەڕی هێزە دەریاییەکانی عوسمانیی لە دەریای سووردا بکات و بەرووی بازرگانە عوسمانییەکانیشی دابخات.

لەراستیشدا گەیشتنی ئەو نێردراوەی ئیسپانی هاوکاتبوو لەگەڵ:

- مۆرکردنی رێکەوتنامەی ئاشتی نێوان سەفەویی و عوسمانییەکان.

- هاریکاری شا عەباس و کۆمپانیای هیندستانی خۆرەڵات- ئینگلیزی لەپێناوی بەرەنگاربوونەوەی هێزەکانی پورتوگالی و دەستدرێژیەکانی بۆ سەر ناوچەی کەنداوی عەرەبی.

بۆ ئەم مەبەستە نێردراوەکـەی ئیـــسپانیا هیچـیان بەدەســـنەکەوت و شـا زۆر بەتوونـدی وەڵامی ئیسپانیای دایەوە:

- گێڕانەوەی بەحرەین و بەندەری کەمیرۆنی رەتکردەوە.

- شکاندنی قۆرخکردنەکانی بازرگانەکانی ئیسپانی پورتوگـالی لـەبازرگانی حـەریری ئێرانی و بڕیاریدا هەرکەسێك نرخی زیاتری پێبدا ئەوا بەوی دەفرۆشێ.

- رێگە بەوەش نادات کەوا دەربارەی ئینگلیزی دۆستی نوێی گفتوگۆی لەگەڵدا بکەن.

- چیدیکە رێگە بەناردنی کەشتییەکانی ئیسپانی پورتوگالی نادرێ بێنە ئاوی دەریـای سوورەوە چونکە ئەو دەریایە بـەرووی ئەوانـدا دادەخـرێ و بـۆ بازرگانـەکانی عوسمـانیی ئاوەڵادەکرێ چـونکە ئێـران و دەوڵـەتی عوسمـانیی رێککەوتنامـەی ئاشـتیان لەنێوانـدا مۆرکراوە و شەڕیشیان راگرتووە.

کاتێك دۆن غارسیا دەرکی بەوەکرد کەوا کارەکەی سەری نەگرت و هەرچـی بـۆی هـاتبوو لەدەستی چوو بەبێ ئـەوەی پـرس بەشـا بکـات گەڕایـەوە بـۆ دوورگـەی هـورمز و ئـەم هەڵـسوکەوتەشی بەران شا وەك ئەوەبوو کەوا بڕیاری پچڕانی یەکجارەکی پەیوەندییەکانیان بێ.

## نێردراوەکانی سەفەویی بۆ ئیسپانیا:

شا دەستی کردەوە بە پەیوەندییە سیاسییە ئەوروپییەکانی لەگەڵ پاشای ئیسپانیا، چـونکە بوونی ئەوان لەناوچەی کەنداوی عەرەبی گرنگی خۆی هەبوو و هەمیشـە دەیتـوانی کـەوا ئاستەنگ بۆ بازرگانەکانی عوسمـانیی لـەدەریای سـووریش دروسـتبکات، کـە ئەمـەش یەکێك بوو لەئامانجەکانی دەوڵەتی سـەفەویی، ئـەوەبوو بەسـەرۆکایەتی حوسـێن بـەگی بەیات وەفدێکی سازکرد کەیەکێك لەئەندامە بەرزەکانی ئەو نێردراوە ئەنتۆنی چێرلی بوو و ژمارەیەکی زۆریشیان یاوەر لەگەڵدابوو، لەوانەش چەند پیاوێکی ئاییـنی شـیعە هـەبوو کە سەرپەرشتی بۆچوونە ئایینیەکانی نێردراوەکەیان دەکرد، جگە لەوانـەش دوو راهـیبی پورتوگالی بەناوی ئەفۆنسۆ کەردرۆ و نیکۆلا دی مـەلۆ یاوەریـان بـوون و، ئامـانجی ئـەم نێردراوەش دوو تـەوەربوو، سیاسی و بازرگانیی:

یەکەم: مۆرکردنی پەیماننامە لەگەڵ سەرجەم ئەو دەوڵەتە ئەوروپیانەی کەوا وەفدەکە سەردانیان دەکەن بۆ ئەوەی بەهاوبەشی لەدژی عوسمانییەکان بجەنگن.

دووەم: ساغکردنەوەی حەریری ئێرانیی.

ئەم نێردراوە لە٩تەموزی١٥٩٩ز ئێرانیان بەجێهێشت و بەرێی مازەندەران چوونە روسیا و لەوێوە بۆ ئەوروپای ناوەڕاست و ئینجا بۆ رۆما چوون. وادیاربوو لەنێوان حوسێن بەگی بەیات و ئەنتۆنی چێرلی کێشە پەیدابوو و، ئەمەش هانی ئەنتۆنیدا کەوا لەم وەفدە دابڕێ و پەیوەندییەکانی خۆیشی لەگەڵ ئێران بپچڕێنێ.

دەربارەی ئەم کێشەیەش چەندین راوبۆچوون سەریان هەڵدا، لەوانە گوایە هۆی دابڕانی ئەنتۆنی ئەوەبوو یەکێك لەبرادەرەکانی چەند نامەیەکی شای دزی کەبۆ پاشاکانی ئەورووپای ناردبوو و دایەدەست عوسمانییەکان، لەئەنجامی ئەم ناپاکییەش هەستی بەمەترسی کرد و لەوەش ترسا کەجارێکی دیکە بگەڕێتەوە بۆ ئەسفەهان و، ناچار رۆمای بەجێهێشت و چووە پاڵ پاشای ئیسپانی لەڤینیسیا. رای دیکەش هەبوون کەدەیانگوت ئەنتۆنی هەندێك لەو دیاریانەی کەوا شا بۆ پاشاکانی ئەورووپای ناردبوون فرۆشتبووە بازرگانە ئینگلیزەکان کە ئەم کارەش یەکێك بووە لەو هۆکارانەی کێشە بکەوێتە نێوان ئەنتۆنی و حوسێن بەگی بەیاتەوە.

لەناوەڕاستی ساڵی ١٦١٠ز ئەندامانی نێردراوەکەی شا گەیشتنە ئیسپانیا و ماوەی دوو مانگ لەوێ مانەوە و پاشان بەبێ ئەوەی بتوانن ئەرکەکانی سەرشانیان لەدەوڵەتەکانی دیکەی ئەورووپا تەواوبکەن بەتایبەتیش فەرەنسا و ئینگلتەرا گەڕانەوە بۆ ئێران، لەراستیشدا حوسێن بەگ دوو نامەی تایبەتی بۆ هەریەك لەپاشاکانیان پێبوو. لەوانەشە هۆی سەرەکی گەڕانەوەی سەرۆکی نێردراوەکە ئەوەبێ کە سێ لەئەندامانی چوونە سەر ئایینی مەسیحی و بەئامادەبوونی شا و شاژنی ئیسپانیا عەلی بەگی کوڕی حوسێن عەلی بەگی بەیات و ئەروج بەگی سکرتێری یەکەمی نێردراوەکە بونیادبەگ ئەم هەڵگەڕانەوەیەی خۆیانیان بۆ ئایینی مەسیحی راگەیاند. ئینجا پاشای ئیسپانیا ئەو کەشتییەی کەئەندامەکانی وەفدەکەی دەگواستەوە بۆ ئێران بەرێکرد کە ئەم سەفەرە چوار ساڵی خایاند.

بەمەش شا عەباسی یەکەم تاکوساڵی ١٦٠٨ز هیچی دیکە نێردراوی نەناردە ئیسپانیا، کاتێکیش کێشەکەیان لەگەڵ عوسمانییەکان قووڵتر بووەوە و بەهۆی پێویستیی بۆ یارمەتی جەنگ نێردراوێکی دیکەی ناردە ئیسپانیا.

ئەم نێردراوەش بەسەرکردایەتی رۆبێرت چێرلی برای ئەنتۆنی لەهەمان ساڵدا ئەسفەهانی بەرەو بەجێهێشت کەگەشتەکەیان دوو ساڵ دەخایەنێ، کاتێک گەیشتنە ئەوێ لەگەڵ فیلیپی سێیەم کۆبوونەوە و ئینجا رۆبێرت دوو نامەی شا عەباسی پێشکەشکرد و لەهەردووکیاندا شا باسی هاریکاریی دەکرد بۆ لەناوبردنی دوژمنی هاوبەشیان کە عوسمانییەکانن، بەرانبەر ئەم کارەش شا ئاسانکاری بۆ بازرگانەکانی ئیسپانیا و پورتوگال پێشکەش دەکات.

وادیاربوو کەوا ئەم بەیەك گەیشتنە زۆر ساردبوو، بەڵگەش ئەوەیە کەپاشای ئیسپانی وەڵامەکەی زۆر کورت بوو وتی داوا لەپاپا و پاشاکانی ئەورووپا دەکات کەوا شەڕی عوسمانییەکان بکات و کەشتی دەریایی بنێرێ بۆ داخستنی ئەو دەروازانەی دەریای سوور لەبەردەم بازرگانی عوسمانییەکان لەگەڵ هیندستان، لەوانەش ئەم ساردیە پەیوەندی بەو رەتکردنەوەیەی شا هەبووبێ کاتێك بڕیاریدا بەحرەین نەخاتەوە دەست پورتوگالییەکان. بۆیە رۆبێرت چێرلی بەناچاری ئیسپانیای بەرەو ئینگلتەرا بەجێهێشت و پاشان لەساڵی ١٦١٥ز گەیشتەوە ئێران.

بەڵام سەرەڕای ئەم سەرنەکەوتنەش شا عەباسی یەکەم نێردراوێکی دیکەشی ناردە ئیسپانیا دیسانەوە بەسەرۆکایەتی رۆبێرت چێرلی و ناوبراو لەهەمان ساڵدا ئێرانی بەجێهێشت و ماوەی پێنج ساڵ لەئیسپانیا مایەوە و لەو ماوەیەشدا پەیوەندییەکانی سەفەوی و ئیسپانی گرژی تێکەوت بەهۆی ئەو ململانێیەی سەر ناوچەی کەنداوی عەرەبی، بۆیە رۆبێرت چێرلی ناچاربوو دیسانەوە ئیسپانیا بەجێبهێڵێت و بڕواتە ئینگلتەراو پاشان لەساڵی ١٦٢٧ز بەدەستی بەتاڵەوە گەڕایەوە بۆ ئێران.

بەم شێوەیە هەموو هەوڵەکانی شا عەباسی یەکەم بۆ سازکردنی هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئیسپانیا سەرینەگرت و نەیتوانی سۆزی ئیسپانیا بۆ خۆی راکێشێ و بەجووتە شەڕی عوسمانییەکان بکەن، گومانیشی تێدا نییە کەسەرنەکەوتنی هەوڵەکان هۆکارەکەی

دەگەڕێتەوە بۆ دەسبەسەرداگرتنی ناوچەی کەنداوی عەرەبی و هەر ئەویش بوو لەکۆتاییدا بووە هۆی دابڕانی یەکجارەکی و هەڵگیرسانی شەڕ.

## ناکۆکی نێوان سەفەویی و پورتوگال بۆ کەنداوی عەرەبی:

## دەسەلاّتی سەفەوییەکان بەسەر بەحرێنەوە:

فەرمانڕەوایەتی ناوچەکانی کەنداو بەدەست حاکمەکانی خۆیانەوەبوو و بەردەوامیش سەرانەیان دەدایە دەوڵەتی ئێران و ئەم هەڵوێستەش تاکو هاتنی هێزەکانی پورتوگالی بۆ ناوچەی کەنداوی عەرەبی بەم شێوەیە مایەوە (کۆتاییەکانی سەدەی پانزەهەمی زایینی) و توانیان لەساڵی ی١٥٠٦زا دوورگەی هورمز داگیربکەن و هەموو فەرمانڕەواکانیشیان خستە ژێر فەرمانی خۆیانەوە و هەروەها لەساڵی ١٥٢٠ز توانیان بەحرەینیش داگیربکەن و سەفەوییەکانیش لەبەرنەوەی هێزی دەریایی و کەشتی جەنگیان نەبوو نەیانتوانی رووبەروویان ببنەوە، ئەمەو سەرداری ئەو هەموو کێشە ناوخۆییەی کەهەیانبوو. لەبەر گرنگی بەحرەین لەناوچەکەدا هێزەکانی پورتوگالی بنکەیەکی سەربازیی و ناوەندێکی بازرگانییان تێدا دامەزراند.

لەساڵی ١٦٠١-١٦٠٢ز فروخشای حاکمی دوورگەی هورمز کۆچی دوایی کرد و فەیروزشای کوڕی جێگای گرتەوەو ئەویش شەرەفەدین لوتفوڵلاّی کردە وەزیری خۆی و روکنەدین مەسعودی براشی کردە فەرمانڕەوای بەحرەین و، ئینجا ئەم فەرمانڕەوایە هەستی بەوەکرد کەوا پورتوگالییەکان دەست بەسەر توانا و ستراتیژیەتی حوکمەکەی دادەگرن، بۆیە بڕیاریدا کەوا خۆی لێیان رزگاربکات و سەربەخۆیی ئیمارەتەکەی بپارێزێ و ئەم بیرۆکەیەشی لەلای موعینەدینی فالی باسکرد کەیەکێك بوو لەپیاوماقوولانی فارس و گواستیەوە بۆ وێردخانی حاکمی فارس و ئەویش ئەم بیرۆکەیەی زۆر بەلاوە پەسەندبوو بۆیە بڕیاریدا کەوا دەسبەسەر بەحرەیندا بگرێت و بیخاتە پاڵ موڵکەکانی سەفەویی و بۆ ئەم مەبەستەش سوپایەکی بەسەرکردایەتی موعینەدین فالی سازکرد و بۆ بەحرەینی ناردو دەستی بەسەرداگرت. ئینجا سەربازە سەفەوییەکان لەئازاری١٦٠٢ز هێرشییان کردە سەر ماڵی روکنەدین مەسعود و کوشتیان.

کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە بەر گوێی فەرمانڕەوای دورگەی هورمزی پورتوگالی دوو سوپای ئامادەکرد، ئەکەمیان لەرێگای وشکانیەوە هێرشی کرد بەسەرکردەیی شەرەفەدین لوتفوڵلای وەزیر و ئەویدکەشیان دەریایی بوو و بەهەر دوولا گەمارۆی بەحرەینیاندا و، بۆیە وێردی خان هەوڵیدا بۆ سووککردنی فشاری سەر بەحرەین تەکتیکێك بدۆزێتەوە بۆیە تیپێکی سەربازی ناردە سەر کەمبیرۆن و گەمارۆیانداو پورتوگالیەکان ناچاربوون کەوا چەند کەشتیەك لەگەمارۆکە بهێننە دەردوەو بینێرن بۆ بەندەری کەمبیرۆن، بەمەش هەل بۆ سەفەوییەکان رەخساو توانیان زاڵبن بەسەر هێزەکانی پورتوگالی و پاشان جێپێی خۆیان لەبەحرەیندا جێگیربکەن.

بەحرەین یەکەم ئیمارەت بوو لەوانەی ماوەی یەك سەدەبوو لەژێر دەسەلاتی پورتوگالیەکان بوو هاتە دەرەوە. بۆیە فیلیپی سێیەمی پاشای ئیسپانیا هەوڵیدا بەرێگای گفتوگۆ و دانوستانەوە بیگێڕێتەوە ژێردەسەلاتی خۆی، بەلام هەموو جارێك سەفەوییەکان ئەم داواکاریەیان رەتدەکردەوە. بەم دەسبەسەرداگرتنەی بەحرەین لەلایەنە سەفەوییەکانەوە توانیان بەتەواوی زاڵبن بەسەر خوارووی خۆرەلاتی کەنارەکانی کەنداوی عەرەبی.

## دەسبەسەرداگرتنی کەمبیرۆن لەلایەن سەفەوییەکانەوە:

دەربەندی کەمبیرۆن ماوەی دوو فەرسەخ لەدوورگەی هورمزەوە دوورە، هەرکە هێزەکانی بەریتانی گەیشتنە کەنداوی عەرەبی یەکسەر دەستیان بەسەرداگرت و بۆ راگرتنی کەشتییە زەبەلاحەکانی بەکاریدەهێنا، چونکە بەندەرەکانی هورمز بەکەلکی ئەوە نەدەهاتن کەوا کەشتییەکانیانی لێرابگرن، پاشان قەلایەکی سەخت و گەورەی تێدا سازکرد و لەوێوە پارێزگاری لەکەشتیەکانی دەکرد و لەدواییشدا کردی بەبنکەیەکی دەریای تایبەت بەخۆیان و ناوەندێکی بازرگانی بۆ وەرگرتنی باجی گومرگ لەو کەشتیانەی کەوا بەناو کەنداوی عەرەبیدا تێدەپەڕین.

لەدوای ئەوەی شا عەباس چنگی خۆی لەکەنارەکانی خوارووی خۆراوای کەنداوی عەرەبی گیرکرد بڕیاریدا دەسەلاتی خۆی بەسەر درێژایی کەرنارەکانی خوارووی خۆراوادا بگرێ بۆ ئەوەی زاڵبێ بەسەر دەروازەکەیدا، بۆ بەدەسهێنانی ئەمەش دەبوایە روبەرووی هێزەکانی

پورتوگالی ببێتەوەو لەساڵی ۱٦۰۲ز بەبەندەری کەمبیرۆن دەستی پێکرد و گەمارۆیدا، بەڵام وادیاربوو وەك کارتێکی فشار بەکاری دەهێنا بۆ پاشای ئیسپانیا تاکو وشیاری بکاتەوە و یارمەتی بۆ رەوانەبکات، بەڵگەش بۆ ئەم رایە ئەوەبوو گەمارۆکەی لانەبرد تا ئەوکاتەی سەفیری ئیسپانیا ئەنتۆنیۆ دی جۆڤیا داوای لێکرد. بەلام کاتێك پەیوەندیەکانیان بەهۆی نەناردی یارمەتی لەلایەن ئیسپانیاوە گرژی تێکەوت و ئەوکاتەش کۆتایی بەیەکێك لەرووبەروو بوونەوەکانی لەگەڵ عوسمانیەکاندا هێنابوو، ئینجا وێردی خانی حاکمی فارسی راسپارد کەوا سوپایەك رێکبخات و ئەم بەندەرە داگیربکات، ئەویش لەساڵی ۱٦۱۳ز سوپایەکەی ئامادەکرد و ئیمام قوولی خانی کوری کردە سەرکردەی سوپاکەو هێرشیانە کردە سەر شوێنی مەبەست بەلام هێرشەکە سەرینەگرت، ئینجا وێردی خان کۆچی دوایی کرد و لەدوای ئەویش کورەکەی بوو بەفەرمانرەوای فارس، لەساڵی دواتردا دووبارە هەوڵیدایەوە کەوا بەندەرەکە لەژێر دەستی پورتوگالیەکان دەربهێنێ و، ئەمجارەیان سەرکەوتنی بەدەسهێناو پاشان لەنزیك ئەویشدا بەندەرێکی دیکەی دروسکرد کەبەبەندەر عەباس ناوی دەرکرد و ئەویش بەبۆنەی ئەوەبوو کەوا پوروتوگالیەکانیان لەبەندەرە کۆنەکە دەرکرد و لەسەردەمی شا عەباسیش بەندەرە نوێیەکەیان دروسکرد.

بەمشێوەیە دەربەندی کەمبیرۆن بوو بەدووەم دەربەند کەلەلایەن سەفەوییەکانەوە دەستی بەسەردادەگیرێ و پورتوگالیەکایشیان لێ دەردەکەن، لەمەش هێندەی دیکە پەیوەندیەکانی نێوان ئێران و هێزەکانی پورتوگالی ناوچەی کەنداوی عەرەبی گرژی تێکەوت، ئەم بارەش بەردەوام گرژتر دەبوو تا ئەوکاتەی سەفەوییەکان دەستیان بەسەر دوورگەی هورمزداگرت.

## داگیرکردنی دوورگەی هورمز لەلایەنە سەفەوییەکان:

لەدوای ئەوەی سەفەوییەکان بەحرەین و کەمبیرۆنی داگیرکرد هێندەی دیکە پەیوەندییەکانی نێوانیان گرژی تێکەوت و گەیشتە پلەی دابران و نەمانی یەکجارەکی پەیوەندی، ئینجا پاشای ئیسپانی لەدوای سەرنەکەوتنی هەوڵەکانی دۆن گارسیا

نامەیەکی بۆ شا عەباسی یەکەم نارد و تیایدا پێشنیاری پێویستیی گێڕانەوەی بەحرەین و کەمبیرۆنی کرد و هۆشداری ئەوەشی دایێ کەوا هێرش دەکەنە سەر دورگەی هورمز.

بەمجۆرە لەنێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا هەڵوێستەکە گەیشتە ئەوپەڕی گرژی و هەردوولاش خۆیان بۆ شەڕ ئامادەکرد. فیلیپی سێیەم لەلای خۆیەوە فەرمانی دایە هێزەکانی نێو هورمز وشیار و ئاگاداربن و ئامادەبن بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێزەکانی سەفەویی ئەگەر ئەو شوێنانەی ئەوان داگیریان کردبوون لێی نەکشێنەوە. ئینجا هێزەکانی پورتوگالی دەسیاکرد بەبلاوکردنەوەی پروپاگەندە گوایە کەشتی گەلیەکانی پورتوگالی لەبەندەری جوای هیندستانەوە دەستیان کردوە بەجووڵە و بەرەو کەنداوی عەرەبی بەرێوەن بۆ ئەوەی ئامادەکاریی بکەن لەبەرانبەر هەموو ئەوانەی کەبیانەوێ هێرشبکەنە سەر هورمز، جگە لەمەش کەشتیە ئینگلیزیەکان کە بەڵێنیان بەکۆمپانیای هیندستانی خۆرەلاتی دابوو بێنە دوورگەکە بەهیچ شێوەیەك ناگاتە بەندەری جاسکی نزیك دەریای عومان.

لەبەرانبەریشدا شا عەباسی یەکەم سوپایەکەی خۆی ئامادەکرد بۆ ئەوەی لەژێ پورتوگالیەکان و لەدورگەی هورمز بجەنگێ، بەلام هەستی کرد پێویستی بە کەشتی گەل هەیە بۆ قاییم کردنی گەمارۆی سەر دوورگەکە؛ بۆ ئەم مەبەستەش ئیمام قولی خانی حاکمی فارسی راسپارد کەوا لەگەڵ کۆمپانیای خۆرەلاتی ئینگلیزیی دانوستان بکات، کەدەبوایە جێگای هێزەکانی پورتوگالی لەکەنداوی عەرەبی بگرێتەوە، بێن و یارمەتییان بدەن بۆ لێدانی کەشتی گەلی پورتوگالییەکان.

## ماوەی یەک ساڵی تەواو ئەم دانوستانە بەردەوامبوو:

- کۆمپانیا ئینگلیزیەکە دوو دڵ بوو لەم کارە چونکە پەیوەندیەکی گونجاوی هەبوو لەگەڵ ئیسپانیا و ناشبێ کۆمپانیا بەبێ پرسی پاشا بەریتانیا ئەم کارەبکات و دڵنیاش بوون لەوەی پاشا ئەم کارە رەتدەکاتەوە.

- کۆمپانیا ئینگلیزیەکە دەترسا کە ئەگەر لەم هەڵمەتەیدا سەرنەکەوت ئەوا کاریگەری دەبێ لەسەر بوون و تواناکانی لەزەریای هیند.

ئەم دوو دڵیەش جگە لەو هەڕەشەی کەوا ئیمام قولیخـان بـەناوی شـا عەباسـەوە کـردی هەموو ئەو دەسکەوتە بازرگانی و قازانجانەی ئەوان دەیبەخشـنە کۆمپانیـا ئینگلیزیەکـە وەك چیدیکە حەریر نانێرن بۆ ئینگلتەرا و بەمەش زیـانێکی مـاڵی زۆریـان بەردەکـەویّ، هیچ شتێکی دیکەی بەدواوە نەبوو. بۆیە کۆمپانیا ئینگلیزیەکە وای دەبـینی کـە ئەگـەر بێتوو هاوکاری سەفەوییەکان بکات لـەدژی پورتوگالیـەکان و سـەفەوییەکان سـەرکەوتن ئەوان تێیدا سوودمەند دەبن.

لە٨کانوونی دووەم١٦٢٢ز ئیمام قولی خان لەگەڵ نوێنەرانی کۆمپانیاکە کۆبۆوەو لەسـەر ئەم خالاّنە رێکەوتن:

- هـەردوولا بەیەکسـانی خەرجییـەکانی شـەڕەکەو دەسـکەوت و باجـەکانی گـومرگ لەنێوان خۆیاندا دابەشبکەن.

- دوورگەی هورمز لەدوای ئازادکردنی لەدەستی پورتوگالیەکان بەیەکەوە سەرپەرشـتی دەکەن.

- ئێران هەموو دیلە موسوڵمانەکان و کۆمپانیـا ئینگلیزییەکـەش هـەموو مەسـیحیە بەدیل گیراوەکانی بەرکەویّ.

لەدوای ئەوەی رێکـەوتن هـەردوولا خۆیـان بـۆ شەڕوکوشـتار ئامـادەکرد، شـا عـەباس سوپایەکی پانزەهەزار سەربازی ئامادەکرد و بەرەو دوورگەی هورمز وەرێیخست، هەروەها بۆ ئەوەی یارمەتییەکان لەپورتوگالیەکان ببڕیّ هۆزە عەرەبـەکانی رەئـس ئەلخەیـمەی لـیّ هەڵگێرانەوە و ئەوانیش لەم ئیمارەتە دەریانکردن و لەهەمان کاتیشدا لەگەڵ عەرەبەکانی شاریقە و عومان رێکەوتن کە لـەدژی بـوونی پورتوگالیـەکان شـۆڕش بکـەن و راپـەڕن و چیدیکەی خواردن و یارمەتی بۆ پورتوگالیەکانی دوورگەی هـورمز نـەنێردریّ و ئەمـەش کاریگەریی خستە سەر تواناکانی شـەڕیان، ئەمـەش نیشـانەی ئەوەیـە کـەوا عـەرەب و ئێرانییەکان رقیان لەو دەسەلاّتەی پورتوگالیەکان هەڵسابوو کەبەسەر کەنداوی عەرەبیەوە هەیبوو.

ئینجا کۆمپانیا ئینگلیزیەکە چەند کەشتیەکی نارده بەندەری جاسـك لـەخوارووی ئێـران کەشوێنەکەی زاڵبوو لەسەر دەریای عومان بۆ ئەوی لەجێگای رووبەروو بوونەوەکەوە نزیك بێت.

ئینجا هەردوولا بەرەو داگیرکردنی دورگەی قەشم هەڵمەتیان بـرد و کەلـەنزیك دوورگـەی هورمزبوو و خاوەن ئاوێکی سازگاربوو و داگیرییان کردو، بەڵام هێزە پارێزگارەکان خۆیـان بەدەستەوەدا لەبەرانبەر:

- دڵنیایی بدرێتە پورتوگالیەکانی دانیشتووی دوورگەکە و نەیان کوژن.

- کەشتیە ئینگلیزیەکان ئـەم پورتوگالیانـە بـەخۆیان و چـەك و پێداویسـتیەکانیانەوە بگوازنەوە بۆ دوورگەی هورمز.

- دەسدرێژیی نەکردنە سەر ئەو ئێرانیانەی کە شانبەشانی ئەوان دەجەنگان.

بەڵام ئەوان هەموو ئەو خاڵانـەیان پێشـێلکرد، ئـەوەبوو هێزەکـانی ئێـران هـەموو ئـەو ئێرانیانـەیان کوشـت کـەوا هاریکـاری پورتوگالیـەکانیان کردبـوو، لـەلای خۆشـیانەوە هێزەکانی ئینگلیز سەرکردەی قەلاکەیان گرت و ناردیانەوەی بۆ مەڵبەنـدی سـەرەکی لـە بەندەری سوراتی هیندی و هەردوو هێزەکەش دەستیان بەسـەر چـەك و پێداویسـتییەکانی هێزی پورتوگالیدا گرت.

لەدوای ئەم هەنگاوانە هەردوولای ئێرانی و ئینگلیزیـی دەسـتیانکرد بـە خۆسـازدان بـۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر ئەو دوورگەیەی کەلە٩شوبات١٦٢٢ز وە گەمارۆدرابوو.

ئینجا لەلای خۆیانەوە هێزەکانی پورتوگالی ئامادەباشی تەوایان پەیـداکرد بـۆ رێگـرتنی هەر هێرش و پەلامارێك و تۆپەکانی نێو قەلاکەشی بۆ ئەم مەبەستە ئامادەکرد.

لەماوەی چەند رۆژێکی کەمی گەمارۆکە هێزی دەریاوانی ئینگلیـزی لەدابەزانـدنی سـێ هەزار سەربازی سەفەویی لەسـەر خاکی دوورگەکە سـەرکەوتنیان بەدەسهێناو پاشـان بـەبێ هیچ بەرەنگاربوونەوەیەکی کەشایانی باسـبێ توانیـان دەسـتی بەسـەردا بگـرن، چـونکە هێزەکانی پورتوگالی لێی کشابوونەوەو لەقەلاکەیدا خۆیـان قـاییم کردبـوو و لـەدەووری

ئەوێشدا شەڕ هەر بەردەوامبوو. هەموو هەوڵەکانی هێزی پورتوگالی سەرینەگرت بۆ شکاندنی سەفەوییەکان و دەرکردنیان و هەروەها لەگەڵ ئینگلیزەکانیشدا هەمان شتیان بەسەرهات.

لەهەردوو لاوە ئینگلیز و سەفەوییەکان زۆر بەتووندی گەمارۆی قەلاکەیاندا و زۆربەی دیوارەکانیشیان شکاند و دەستیشیان بەسەر چەند تاوەرێکیدا گرت و رێگای چوونە ژوورەوەی خواردن و پێداویستیەکانیان لێگرت و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بێ ئومێدی باڵ بەسەر بەرگریکاراندا بکێشێ و لەکۆتاییدا و لەیەکی ئایاری ١٦٢٢ز داوای خۆبەدەستەوە دانیان کرد.

لەدوای ئەوەی بەتەواوی زاڵبوون بەسەر دوورگەکەو قەلاکەیدا هێزی دەریاوانی سێ هەزار پورتوگالی گواستەوە بۆ مەسقەت و بەندەرەکانی کەناری عومان.

بەمشێوەیە بوونی پورتوگالیەکان کەماوەی یەك سەدەی خایاند لەدوورگەی هورمز کۆتایی هات.

## بەدواداچوونێک دەربارەی رووخانی هورمز:

- رووخانی هورمز وەك گورزێکی کوشندە وابوو بەر پورتوگالیەکان کەوت لەکەنداوی عەرەبیدا، چونکە لە دوای لەدەستدانی بەحرەین و کەمبیرۆن قەشم، ئەم دوورگەیە گەورەترین کۆبوونەوەی پورتوگالیەکانی لێبوو لەناوچەکەدا.

- ئەم رووخانەی کۆتایی بەدەسەلاتی فەرمانڕەوا ناوخۆییەکانیش هێنا کەچەندین سەدەبوو حوکمڕانیان دەکردو دوایین فەرمانڕواشیان کەناوی مەحمودشا بوو بەدیلی رەوانەی ئەسفەهان کراو، لەدواییشدا سەفەوییەکان و ئینگلیز بەهاوبەشی سەرپەرشتییان دەکرد.

- ئەم رووخانە بووە هۆکاری باشتربوونی باری ئینگلیز لەناوچەکەدا چوونکە سەرەتا وەك کۆمپانیایەکی بازرگانی تێیدا ناسرابوو، پاشان بوو بە قەوارەیەکی سەربازیی و دەسەلاتی خۆی دەسەپاندە سەر سەرجەم دەوڵەتەکانی کەنداو و هەرچی خێروبێری ئەو

ناوچەیەش هەبوو هەمووی تالآن دەکرد و سالآنێکی دووروودرێژیش تەنگی بەنەتەوەکانیان هەڵچنیبوو.

- بوونی ئینگلیز لەکەنداوی عەرەبیدا هانی هۆڵەندییەکانیدا کەوا بەکەشتی گەلیەکانیانەوە بێنە ناوچەکە، بەمەش ماوەیەکی زۆر کێشەو ناکۆکی کەوتە نێوان پورتوگالی و ئینگلیز و هۆڵەندییەکان و کە زیاتر لەکۆتاییەکانی فەرمانڕەوایەتی شا عەباسی یەکەم سەری هەڵدا.

- شا عەباسی یەکەم هەموو چالاکیە بازرگانییەکانی گواستەوە بۆ بەندەری عەباس و بۆیەش ئەم هەنگاوەی هەڵهێنا چونکە هەستی بەوە دەکرد کە پورتوگالیەکان لەوانەیە هەوڵی گێڕانەوەی دوورگەکە بدەنەوە، لەبەردەم ئەم پشتگوێخستنە بەئەنقەستە دورگەکە وردەوردە گرنگیەکەی وەك ناوەندێکی بازرگانی لەدەسدا و لەجیاتی ئەویش بەندەر عەباس بوو بەگەورەترین بەندەری ناوچەکە کەزاڵ بوو بەسەر چالاکیە بازرگانیەکانی کەنداوی عەرەبی و تاکو ئێستا هەمان پلەی هەیە.

- پورتوگالیەکان پاڵپشتیان لەناوەندەکانی بازرگانیی خۆیان لەمەسقەت و عومان کرد بەڵام ئەوان هەمیشە لەلایەن عەرەبەوە هەڕەشەیان لێدەکرا چونکە عەرەبەکان زۆر بەبێزاریەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردن. بۆیە زیاد لەجارێك هەوڵی گێڕانەوەی هورمزیاندا بەڵام بێ سوود بوو، چونکە هەموو جارێك بەرەنگاریان دەبوونەوە.

- لەدوای سەرنەکەوتنیان لەهەوڵەکانی گێڕانەوەی دوورگەکە و لەبەردەم نەشونماکردنی زیاتری بازرگانی ئینگلیز و هۆڵەندیەکان لەناوچەی کەنداوی عەرەبی پورتوگالیەکان هەوڵیاندا کەوا جێپێی خۆیان لەناوچەکەدا بکەنەوەو سەرەتا ویستیان خۆیان لەشا عەباسی یەکەم نزیك بخەنەوە، بۆیە پێشنیاری رێککەوتنێکی ئاشتیان بۆ کرد و کەبەهۆیەوە پەیمان دەدەن هیچ هەڵمەت و هێرشێك نەبەنە سەر خاکی ئێران و لەبەرانبەریشدا:

- رێگایان پێبدرێ کەوا قەڵایەك و ناوەندێکی بازرگانی لەباکوری خۆرەڵاتی بەندەری لینکە لەسەر کەنارەکانی لورستان لە لنك دروستبکەن.

- ڕێگایان پێبدرێ کەوا ڕاوی مرواری لەکەنارەکانی بەحرەیندا بکەن.
- باج نەخرێتە سەر کاڵا بازرگانیەکانی پورتوگالی کە بۆ بەندەری لینك دێ.
- بەشێوەیەکی یەکسان داهاتی بەندەرەکە لەنێوان ئێران پورتوگال دابەشبکەن.

شا عەباسی یەکەم لەسەر ئەم داخوازیانە ڕەزامەندی نواند و هەرخۆشی ئارەزووی لەوەبوو کەوا پەیوەندیەکانی لەگەڵ پورتوگالەکاندا نەپچڕێنێ و لەکاتی تەنگژەی لەگەڵ ئینگلیز و هۆڵەندییەکان هانایان بۆ ببات.

## پەیوەندیەکانی سەفەویی و ئینگیلز:

گەشتی ئەنتۆنی چێرلی: لەدوای ئەوەی شا عەباس کێشـەکانی نـاوخۆیی یـەکلاکردەوە و بارەکەی سەقامگیرکرد و لەبەرانبەر سـوننیەکانی ئۆزبـەکی لەخۆراسـان و وڵاتــی پشت ڕووباریـیشـدا سەرکەوتنی گەورە و یەکلاییکەرەوەی وەدەسهێنا و کەشتیگەلی ئینگلیزیش کەشتیگەلی ئیسپانیەکانی ناسراو بەئەرمادا لە١٥٨٨ز ڕاونا و، کە ئەمـەش بـووە هـۆی ڕوونبوونەوەی ئاسۆی دەریاوانیی لەبەردەم ئینگلیـز چ لـەدەریای سـپی ناوەڕاسـت چ لـە سووڕانەوە بەدەوری ئەفریقیا لەڕێگای ڕەئس ڕەجا سـالّح و گەیشتن بە ئاوەکـانی خـوارووی وڵاتی ئیسلامی و پاشان بۆ ئەوپـەڕی خـۆرهەڵات. لـەدوای ئەمانـەش و لەسـاڵی ١٦٠٠ز بناغەی گەورەترین ئیمپراتۆری ئینگیزی داگیرکار لەهەردوو خۆرهەڵاتی نـاوین و ئەوپـەڕی خۆرهەڵات داندرا.

هەر لەو ساتانەشدا بوو کەوا گەشتی گیانبازەکان و بازرگانـەکان و خـاوەن پیشـەو کـارە تایبەتییەکان لەسـەرانسـەری خۆرهەڵاتەوە دەستی پێکرد و هەموو بەدوای کـاری بازرگـانی سوودمەندا دەگەڕان، لەناو ئەوانیشدا ئەنتۆنی و ڕۆبێـرت چـێرلی کـەبرابوون و لەسـاڵی ١٥٩٩ز چوونە کۆشکی پاشایەتی شا عەباسـی یەکەم و لەو کاتەش گەیشتن کـەوا لەگـەڵ ئۆزبەکەکانـدا خـەریکی شـەڕبوون و هەرکـە گەڕایـەوە بـۆ قـەزوین لەگـەڵیان کۆبـووەو گفتوگۆی هەڵی سازکردنی پەیماننامەیەکیان دەکرد کەلەسەر دوو بنچینە دروستبێ:

یەکەم: هاوپەمانیەتی سـازکردنی لـەنێوان ئـەو و پاشـاکانی ئـەورووپا لـەدژی دەوڵـەتی عوسمانی کە دوژمنی هاوبەشیانە.

دووەم: دەسکەوت و ئاسانکاری بۆ ئـەو بازرگانـە بەریتانیانـە دابینبکرێـت کـەئارەزووی چالاکی هاوبەشی بازرگانیان هەیە لەگەڵ سەفەوییەکاندا.

شا عـەباسی یەکەم زۆر زیرەك بوو بۆیە دەرکی بەوەدەکرد کەوا ئەوروپییەکان لەمەیـدانی شەڕدا باڵادەستن بەتایبەتیش لەبواری کەشتیگەلی دەریایی و سوپای خاوەن چەکی تۆپ و تفەنگ و کۆمەڵێك بەڵگەشی لەبەردەم بوو کەئەوەیان دەردەخست ئەوەی خاوەنی تفـەنگ و تۆپ بێ هەمیشە لەشەڕەکاندا سـەرکەوتوو دەبێ ئەگەر ژمارەی سـەربازەکانیشی کـەمبن وەك ئەوەی لەچاڵدێران روویـداو، شکـستی ئۆزبەکـەکان بـەهۆی تۆپبارانـەوە، هـەروەها باڵادەستی پورتوگاڵ لەبواری کەشتیگەلی خاوەن تۆپەکان و سەکەوتنی ئەکبەری حـاکمی هیندستانی مەگۆل بەهۆی تۆپەکانیەوە. کاتێکیش پێویستی بەخەڵکی شارەزا هەبوایە بۆ ئەوەی سوپاکەی رێکبخەنەوە بەتۆپ و تفەنگ پرچەکی بکەن و تفـەنگ بەدەسـتەکانیش رابهێـنن، لەبەرئـەوی زۆریـەی ئەنـدامانی نێردراوەکـان کـەیاوەری ئەوانیدیکـەبوون و ژمارەیان تەنها بیست و پێنج کەسبوون هەمووی شارازەی بواری سـەربازیبوون و ویسـتی سوود لەشارەزاییان وەربگرێ بەتایبەتی دووبراکە، داوای لێکـردن چـەك و سوارچـاکەکان وەك ئەو سیستەمەی لەئەوروپادا هەیە و پەیڕەو دەکـرێ رێکیـان بخـەن و هەندێکیشـانی کردە سـەرپەرشتیاری کارگەکانی دروستکردنی چەکی ئاگرین لەئەسفەهان و هەر ئەوانەش بـوون یارمـەتی سـوپای سـەفەوییەکانیاندا لـەرووی تـۆپ و تفـەنگ و بەمـەش تـوانی لەئازەربێجان رووبەرووی سوپای دەوڵەتی عوسمانیی ببێتەوە.

سەرکەوتنی ئەنتۆنی چێرلی لەکارە سەربازییەکانیدا بووە هۆی ئەوەی شا زیاتر پشتی پـێ ببەستێت و لەبواری سیاسەتیشدا کاری پێرپسپێرێ، ئەوەبوو یەکەم کاری کەپێی راسـپارد پەیوەندی کردن بوو بەپاشاکانی ئەورووپا و وشیارکردنەوەیان بۆ سـازکردنی هاوپـەیمانێتی لەگەڵ دەوڵەتی سەفەویی لەدژی دەوڵـەتی عوسمـانیی و لەگـەڵ حوسـێن بـەگیش ناردیـە ئەورووپا، هەروەك پێشتر باسمانکرد.

لەراستیدا پلانە بازرگانیەکەی ئەنتۆنی چێرلی دووچاری کۆمەڵێك نـارەزاییبوون هاتـەوە لەلایەن کۆمپانیای خۆرەڵاتی ئینگلیزی، چونکە ئەوان پێیان وابوو کەئەم هەوڵە سیاسـی و بازرگانیانە دەبنە هۆی ئەوەی دەروازەیـەکی راسـتەوخۆ لـەنێوان ئینگلتـەرا و ئێرانـدا

بکاتەوە و بەمەش زیان بەبەرژەوەندییەکانی کۆمپانیاکـە دەکـەوێ لـەخۆرەلاتی دەریـای سپی ناوەراست. لەراستیشدا پلانە بازرگانیەکانی ئەنتۆنی هەرەشەی لەبەرژەوەندیـەکانی کۆمپانیای ناوبراو دەکرد، چـونکە ئـەو پلانـە بازرگانییـە خۆرەلاتیەکـەی لـەباکوورەوە دەگواستەوە بۆ باشوور و بەنێو خاکی سـەفەوییـەکاندا تێدەپەری و لەوێشەوە بـۆ کەنـداوی عەرەبی.

بەکردەنیش لەنێوان ئەنتۆنی و سەرۆکی وەفدەکە حوسـێن عـەلی بـەگی بـەیات نـاکۆکی دروست بوو و بەمەش ئەنتۆنی پەیوەندییـەکانی خـۆی لەگـەڵ ئێـران پچـراند و چـیدیکە نەگەرایەوە بۆ ئێران، ئەمەش کاریگەری کردە سەر هەڵوێـستی شـا لەبەرانبـەر رۆبێرتـی برای و شا ئەو متمانەیەی جارانی پێنەما و زۆر بەوشکی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد، بۆیـە رۆبێرت هەولێدا کەوا ئەو متمانەیە بگێرێتـەوە، بۆیـە لەشـەرەکانی دژ بەعوسمانییـەکان بەشـداری دەکـردو پاشـان سـەرکردایەتی یـەکێك لەتیپـەکانی سـوپای سـەفەویی بەدەستەوەگرت و زۆر بەگەرمی و گوریەوە شەری دەکرد و سێ جاریش بریندداربوو و ئـەم هەڵوێستانەش کاریگەرییان لەسەر بۆچوونەکانی شا هەبوو و جارێکی دیکە متمانەکـەی گێرایەوە و کارێکی نوێ پێراسپارد و ناردیە ئەورووپا.

ناردنی رۆبێرت چێرلی بۆ بەریتانیا: لەساڵی ١٦٠٧ ز رۆبێرت چێرلی ئێرانی بەجێهێشـت و بەرەو ئینگلتەرا کەوتەرێ و لەساڵی ١٦١١ز گەیشتە ئیسپانیاو پاشان گەیشتە شـوێنی مەبەست و لەگەڵ جەیمسی یەکـەمی پاشـای ئینگلتـەرا (١٦٠٣-١٦٢٥ز) کۆبـووەوە و نامەیەکی شا عەباسی یەکەمی پێشکەش کـرد کەتیایـدا بریـاری ئـەوە هـەبوو رۆبێـرت چێرلی وەك نوێنەری ئەو و رێکخەری کاروبارەکانی دانوستانی سیاسی و بازرگانی لەگـەڵ پاشا گفتوگۆبکات.

رۆبێرت چێرلی پێشنیاری پەیماننامەیەکی دۆستانەی کرد کەلەنێوان ئـەو و شـا عەباسـی یەکەمدا مۆربکرێ و ئەم بەندانەش لەخۆبگرێ:

- ئاسانکاری بکرێت بۆ نێردراوە بەریتانیەکان.

- ڕێگەدان بەدروسـکردنی دوو ناوەنـدی بازرگـانی بـەریتانی لـەدوو بەنـدەری ئێرانـی کەدەڕواننە سەر کەنداوی عەرەبی.

- ڕەزامەندی نواندن لەسەر دانانی دوو نێردراوی هەمیشەیی لەم دوو بەندەرەدا.

- ویـستەکانی شا لەکڕینی کەشتییە ئینگلیزیەکان، بەمەرجێك بەپارچەپارچەیی بگەنە ئەوێ و بۆخۆیان لەوێدا کۆیانبکەنەوە.

- ڕێگەدان بە بازرگانە بەریتانیەکان تا دەست بەسەر فرۆشتنی حەریری ئێرانیدا بگرن و لەکەشتیەکانی ئینگلیز باریبکەن و بیگوازنەوە بۆ ئەوروپا، بەمەرجێك لـەڕێگای ڕەئس ڕەجا سالحەوە بێت و بەخاکی عوسمانییەکاندا گوزەر نەکات.

- ئارەزووی شا لەسازدانی ڕێککەوتنێکی سەربازیی.

پاشای بەریتانیا گرنگیەکی زۆری نواند لەبەردەم پێشـنیارەکانی شـا عـەباس و بـۆ ئـەم مەبەستەش لیژنەیـەکی چـوارقۆڵی لەفەرمانبـەرە گـەورەکانی کۆمپانیـای هیندسـتانی خۆرەلاتی پێکهێنا بۆ ئەوەی لەم پرۆژەیە بکۆڵنەوەو ڕاپۆرتێکیشـی لـەبارەوە پێشـکەش بکەن، بەلاّم بازرگانە ئینگلیزەکان بەم بیانووانە پرۆژەکەیان ڕەتکردەوە:

- ڕێگای ئێران و ڕەئس ڕەجا سالح زۆر دوورو درێژە.

- سوودە بازرگانیەکان لەگەڵ ئێرانیەکاندا زۆر گەرەنتی نییە.

- ئینگلیزەکان خاوەنی بازرگانییەکی چالاکبوون لەگەڵ بەندەرەکانی وڵاتی شام و قایـل بوون لەسەر ئەم جۆرە پێشنیارانە کاریگەری خراپ دەکاتە سـەر مامەڵـە بازرگانیـەکیان لەگەڵ ویلایەتەکانی دەولەتی عوسمانیی.

لەبەر ئەم ڕەتکردنەوەیە ڕۆبێرت چێرلی بەدەستی بەتاڵەوە و بـەبێ ئـەوەی هـیچ شـتێکی دەسکەوێ بۆ شا عەباسی یەکەم لەسالی ١٦١٥ز گەیشتەوە ئەسفەهان.

گەشتی دووەمی ڕۆبێرت چێرلی بۆ ئینگلتەرا: لـەدوای چـەند مانگێـك ڕۆبێـرت چـێرلی جارێکی دیکـە لەلایـەن شـا عەباسـەوە فـەرمانی بـۆ دەرچـوو بچێتەوە بـۆ ئـەوروپا و ئەوکاتەش خـەریکبوو بەیـەکجاری شـا پورتوگالیـەکان لەکەنـداوی عـەرەبی وەدەرنـێ،

لەهەمان ساڵیشدا ئێرانی بەجێهێشت و گەیشتە ئیسپانیا و تا ساڵی ١٦٢٢ز لەوێدا مایەوەو پاشان بەرەو ئینگلتەرا کەوتەرێ و دیسانەوەی لەگەڵ پاشا جەیمسی یەکەم کۆبۆوە و پێشنیاری پەیماننامەیەکی بۆ کرد کەوا لەدوو بەند پێکهاتبوو:

- ئینگلتەرا پەیمانبدات کەهەمیشە کەشتیەکانی ناوچەی کەنداوی عەرەبی ئامادەبن بۆ یارمەتیدانی ئێرانییەکان لەدژی پورتوگالیەکان ئەوانەی لەبەندەرەکانی ئەوێدا ماونەوەو، گەنجینەی ئێرانیش هەموو خەرجیەکانی ئەو کەشتانە بخاتە ئەستۆی خۆیەوە.

- ئێران پەیمان دەدات کەوا بیست و پێنج هەزار سەربازی خۆی پێشکەشبکات بۆ ئەوەی لەسەر کەشتیەکان کاربکەن و بخرێنە بەر فەرمانی حکومەتی ئینگلیزی.

وادیار بوو پاشای ئینگلتەرا بەم دوو پێشنیارە رازیبوو بەڵام لەبەر ئەوەی کۆچیی دواییکرد پەیماننامەکە مۆر نەکراو لەدوای ئەویش چارڵی یەکەم ١٦٢٩-١٦٤٠ز جێی گرتەوەو زۆر خاوەخاوی کرد لەواژووکردنەکە. ئەو کاتەش نێردراوێکی دیکەی ئێرانی گەیشتە لەندەن بۆ ئەوەی هاریکاری نێردراوەکەی پێشووبکات لەدانوستانەکاندا ئەویش نەقد عەلی بەگبوو. بەڵام وادیاربوو ئەو بازرگانە ئینگلیزانەی بەرهەڵستکاری ئەم رێکەوتنە بوون بەرەنگاری بوونەوەو رەخنەی زۆریان لێیگرت و ئەو نامانەی لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان بۆ پاشا چارڵ هەموویان بەدرۆخستەوە، بۆیە پاشا ناچار بوو بۆ ساغکردنەوەی هەڵوێستەکە نێردراوێکی خۆی لەگەڵ رۆبێرت چێرلی کەناوی دەدمۆنـد کۆتۆن بوو بنێرێتە ئێران بۆ ئەوەی لەراستی ناوەڕۆکی نامەکە بکۆڵێتەوەو بگاتە راستیەکی کۆتایی لەنێوان ئەوانەی دەیانگوت راستەو ئەوانەی دەیانگوت پەیوەندیان بە شا عەباسەوە نییە، فەرمانی پێکرد کەوا پیرۆزبایی لەشا عەباس بکات بەبۆنەی ئەو سەرکەوتنانەی بەسەر پورتوگالیەکان هێنای و توانی لەدوورگەی هورمز وەدەریانبنێ و دەستیش بەسەر عیراقدا بگرێ، هەروەها پلانی دیکەی بازرگانی پێشکەش بکات بۆ ئەوەی بواری زیاتری بازرگانی ئینگلیز لەگەڵ ئێران برەخسێنێ.

نێردراوەکە لەرێگای رەئس رەجا ساڵحەوە گەڕانەوە بۆ ئێران و وادیاربوو کەوا نەقد عەلی بەگ لەپاشەڕۆژ دەترسا و ژەهری خوارد و خۆی کوشت. لەکانوونی دووەم١٦٢٧ز نێردراوەکە گەیشتە ئێران.

شا عەباسی یەکەم رازەمەندی بۆ ویستەکانی ئینگلیز دەربڕی لەزیادکردنی قەبارەی بازرگانییەکانیان بەتایبەتیش حەریر و بەڵێنی دا بە دیدمۆند کەوا ساڵانە دە هەزار باڵەی حەریر بداتە ئینگلیز، لەدوای ماوەیەکی کورتی هاتنەوەی رۆبێرت چێرلی چەند کەسێکی دەوروبەری شا کۆمەڵێك قسەیان بۆ دروستکردو لەبەرچاوی شا نرخیان دابەزاند کەئەوانەش دۆستەکانی نەقد عەلی بەگ بوون و بۆیە شا لێی توورەبوو و فەرمانیدا کەوا لەئێران بچێتە دەرێ، ئەویش زۆر هەستی بەخەم و پەژارە کردو لەقەزوین نەخۆش کەوت و لەحوزەیرانی ١٦٢٧ز کۆچی دوایی کردو لەدوای چەند مانگێکیش دیدمۆندیش مرد و هەردووکیان لەقەزوین و بەتەنیشت یەکەوە نێژران.

سەرەڕای ئەوەی تۆمەتیان بۆ رۆبێرت چێرلی دروستکردبوو، کەچی شا پلانەکەی راگرت و چیدیکە نێردراوی تایبەتی خۆی نەنارده ئەورووپا، چونکە ئەو لەهاندانی ئەورووپیەکان لەدژی دەوڵەتی عوسمانی سەکەوتنی بەدەسنەهێنا و بەتایبەتیش ئێستا خەریکی سازدانی رێکەوتنێکی ئاشتیانەیە لەگەڵ عوسمانییەکان و چیدیکە پێویستی پێی نەماوە، پاشانیش باشبوونی پەیوەندیەکانی لەگەڵ کۆمپانیای هیندستانی خورەلات-ئینگلیز لەرووی سیاسی و بازرگانییەوە لەلایەن سەرۆك و نێردراوەکانیانەوە بەرهەڵستی لێدەکرێت و لەگەڵ بۆچوونەکانی رۆبێرت یەکناگرنەوە، ئەمەش بوو بەهۆکارێکی دیکە بۆ ئەوەی شا دەسبەرداری خزمەتەکانی بێ.

لەوانەیە ئەو خزمەتە زۆر و پڕبەهایەی رۆبێرت چێرلی و ئەنتۆنیۆی برای پێشکەشی دەوڵەتی سەفەوییان کرد بووە هۆی ئەوەی توانا سەربازیەکانی بەرەوپێشبچێ و بتوانێ بەهۆیەوە لەدژی عوسمانییەکان بوەستێتەوە.

## بەدواداچوونێکی پەیوەندیەکانی سەفەویی-ئینگلیز:

لەراستیدا ئەو پێشنیارە بازرگانییە دەسکراوەییەی شا عەباسی یەکەم پێشکەشی ئینگلیزی کرد هەموو بۆ ئەوەبوو ئامانجە سیاسی و سەربازییە لەمێژینەکانی خۆی پێ مسۆگەربکات، کە ئەویش پێکهاتبوو لەسازدانی هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەورووپیەکان لەدژی دەوڵەتی عوسمانیی. لەدواییشدا دەرکی بەوەکردبوو کە کێشەو ململانێیەکانی لەگەڵ عوسمانیەکان کۆتایی پێنەهاتووەو بۆ ئەوەش لەبەرەی عێراقدا لاوازیان بکات دەبوایە

بەرەیەکی دیکەی شەڕیان بۆ بکاتەوە، بەڵام دەوڵەتە ئەوروپییەکان ئامادەکارییان بۆ ئەم کارە نەبوو، تەنها چەند ئیمارەتێکی بچووکی ئیتاڵی نەبێ کەسی دیکە ئەم ئامادەییەی نەبوو بەتایبەتیش ئیمارەتی تۆسکانا و پاپا کەئەوانە هەردووکیان ئومێدیان خستبووە سەر ئەو هاوپەیمانێتییەی کەلەنێوان ئەوان و فەخرەدینی مەعنی میری لوبنان و شا عەباسی یەکەمی سەفەوی بەرپابکرێ و لەدواییدا هەموو بەیەکەوە پەلاماری عوسمانییەکان بدەن، بەلام ئەم هیواو ئومێدانە تەنها لەچوارچێوەی خۆزگە و نامەگۆڕینەوەدا مانەوە و نەچوونە بواری جێبەجێکردنەوە.

لەلایەکی دیکەشەوە شای ئینگلیز ئامادە نەبوو بەشێوەیەکی گشتی هاوپەیمانێتی لەگەڵ سەفەوییەکان بکات و لەدژی سەرجەم دوژمنەکانیان بوەستێ، بەتایبەتیش ئینگلیز خاوەنی بەرژەوەندی زۆری بازرگانی بوون لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیی و ئەم بەرژەوەندییەش پەیوەندی بەچالاکیەکانی کۆمپانیای خۆرەلاتی ئینگلیزەوە هەبوو، بۆیە شا لەسازکردنی هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئینگلیزەکان لەدژی دەوڵەتی عوسمانیی نەك هەر سەکەوتنی بەدەستنەهێنا، بەڵکو بەهۆی دەرکردنی پورتوگالیەکان لەدورگەی هورمز، بیریان لەوەکردەوە کەوا ئارامیی بگێڕنەوە بۆ ناوچەکە چونکە گەشەسەندنی بازرگانی لەناوچەکەدا بەبێ ئاشتی پەیدانابێ و بەردەوامبوونیش لەشەڕکردن و چالاکییە سەربازییەکان هەلەکانی بواری بازرگانی لەگەڵ ئێران لەناودەبات، لەبەر ئەم هۆکارەش بوو کەوا ئینگلیزەکان لەدژی پورتوگالەکان شەڕیان کرد.

## پەیوەندی سەفەوییەکان لەگەڵ کۆمپانیای هیندستانی خۆرەلاتی-ئینگلیزی:

ریتچارد ئەستیل: لەوکاتە شا نێردراوەکانی خۆی بەمەبەستی مۆرکردنی رێکەوتنی بازرگانی و سیاسی دەنارده لای پاشاکانی ئەورووپا، لەرێگای بەشی باڵی هیندستانەوە لەهەوڵی پەیوەندی کردن بوو بەبەریتانیاوە. یەکەم کاروانی بازرگانی ئەم کۆمپانیایە کە گەیشتە ناوچەکە ئەوەی سەلماند ناوچەکە توانای وەرگرتن و ساغکردنەوەی بەرهەمێکی زۆری بەریتانی هەیە، بەلام هەڵسەنگاندنە سەرەتاییەکانیان بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمە خورییەکانیان لەبازارەکانی هیندستان زیادەرەوی زۆری تێداکرابوو،و زۆرێك لەکالاکانیان

لەکۆگای بەندەرەکانی هیندستان کەڵەکە ببوون و نەدەفرۆشران، بۆیە دەبوو پیاوەکانی کۆمپانیاکە بیر لەشوێن و بازاڕی دیکە بکەنەوە بۆ ساغکردنەوەیان. یەکێك لەهۆکارە سەرەکییەکانی ئەوەی هاوڵاتیانی هیندستان کاڵاکانیان نەدەکڕی گەرمی کەش و هەوای وڵاتەکەیان بوو هەرچەندە بەرهەمەکان زۆر باش و نایاب بوون، بەڵام لەوڵاتی ئەواندا بەهۆی کەش و هەوای تایبەتی خۆیانەوە زیاتر قوماشی سپی لەلۆکە دروستکراو رەواجی هەیە.

لەوکاتەی کۆمپانیا ئینگلیزیەکە بەدوای بازاڕێکدا دەگەڕا تاکو بەرهەمەکانی خۆی تێدا بفرۆشێ، لەئێرانەوە ریتچارد ئەستیل کەکوڕەگەنجێکی بەریتانبوو گەیشتە شاری سوراتی هیندستان و دەرکی بەوەدەکرد هاوڵاتیی ئێرانی بەهۆی کەشوهەوای ساردی وڵاتەکەیان چەند پێویستیان بەم بەرهەمانە هەیە، بۆیە پێشنیاری خستە بەردەمی ئەنجومەنی کارگێڕی کۆمپانیان ئینگلیزیەکە ئەو خوورییە کەڵەکەبووەی خۆیان لەئێران بفرۆشن و ئەنجومەنەکەش بەم پرۆژەیە قایل بوون و جۆن کرۆکەریان نارده ئەسفەهان بۆ ئەوەی چاوێك بەبارودۆخی بازاڕی ئەسفەهاندا بخشێنێ و لێکۆڵینەوەی خۆی دەربارەی ئەندازەی پێویستی ئەوان بەکاڵاکانی ئینگلیزی بکات و هەوڵیش بدات کەوا شا عەباسی یەکەم ببینێ و بۆ ئەوەی قایلی بکەن کەوا کارئاسانی بازرگانیی بۆ کۆمپانیا ئینگلیزیەکە بکات.

لەساڵی ١٦١٦ز نێردراوەکە گەیشتە ئەسفەهان و شا عەباس زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردن و زیادیش لەپێویست رێزی لێگرتن و دەربارەی گۆڕینەوەی بازرگانیی لەنێوان ئێران و کۆمپانیا ئینگلیزیی دانوستانی لەگەڵ کردن و فەرمانیدایە هاوڵاتیانی خۆشی کەوا بەشێوازێکی زۆر رێکوپێك هەڵسوکەوت لەگەڵ بازرگانە ئینگلیزەکاندا بکەن، هەروەها رێگای بەکەشتیەکانی ئینگلیزیشدا لەبەندرەکانی ئێرانیدا لەنگەربگرن بۆ ئەوەی حەریری ئێرانی بکڕن و خووری ئینگلیزیشی تێدا بفرۆشن و هەلی بۆ نێردراوەکانییشیان رەخساند کەوا بەئارەزووی خۆیان بەندەرێك هەڵبژێرن بۆ لەنگەرگرتنی کەشتیەکانیان و ئەوانیش بەندەری جاسك کەلەدووی نەوەد کیلۆمەتری دوورگەی

هورمزبوو هەڵبژارد بەو مەبەستەی دووربن لەهێزەکانی پورتوگالی، و ئەوکاتەش دوورگەکە لەژێر دەسەلاتی ئەواندابوو.

ئێدوارد کینۆك: لەدوای ئەوەی ڕێگایان بۆ داگیرکردنی بازاڕەکانی ئێران بۆ بازرگانی ئینگلیز خۆشکرد ریتچارد ئەستیل و جۆن کرۆکەر گەڕانەوە بۆ سورات و ڕاپۆرتێکیان پێشکەش بە ئەنجوومەنی کارگێڕی کرد کەتیایدا باسی پێشوازی شا عەباسی یەکەم دەکرد بۆ مامەڵەی بازرگانی لەگەڵ ئینگلیز و بەمەش بەپەلە کۆمپانیاکە کەوتە خۆی بۆ ئەوەی کاڵاکانی بۆ ئێران بنێرێ. ئەم کاروانە بازرگانییەش بەسەرۆکایەتی ئێدوارد کەنوك بوو. کەشتیەکانی ئینگلیزی لەساڵی ١٦١٧ز لەبەندەری جاسك لەنگەریان گرت و ئەندامانی وەفدەکەش لەدوای تەواوبوونی کارەکانیان چوونە ئەسفەهان و لەوێشەوەی بەرەو کەرەج ڕۆیشتن و شا عەباسی یەکەم پێشوازی گەرمی لیێ کردن و ڕێگاشی پێدان کەوا گەرەکی ئینگلیزی لەئەسفەهان و شیراز بۆ خۆیان دروستبکەن. ئێدوارد کەنوك لەگەڵ شا عەباس ڕێکەوتن لەسەر کڕینی بەشێکی لەبەرهەمەکانی حەریری ئێرانی بەلاّم لەپێشدا تەنها سێ یەکی پارەکەی پێبدەن و ئەویدیکەش بەکاڵاکانی ئینگلیزی پڕبکرێتەوە و، جگە لەمانەش بازرگانە ئینگلیزەکان بۆیان هەبێ لەسەرجەم شارەکانیدیکەی ئێراندا بازرگانی بکەن و کاڵاکانیان ساغبکەنەوە و بەچەکی خۆشیانەوە بسووڕێنەوە بۆ ئەوەی بتوانن لەکاتی پێویستدا بەرگری لەخۆیان بکەن.

لەدوای ئەوەی ئێدوارد کەنوك دڵنیابوو لەبازرگانیەکانی لەناو خاکی ئێراندا ئەوێی بەجێهێشت و بەرە دوورگەی هورمز گەڕایەوە بۆ ئەوەی دانوستان لەگەڵ پورتوگالیەکاندا بکات دەربارەی هەندێك ئاسانکاری بۆ کەشتیەکانی ئینگلیز و ڕێگایان پێبدرێت کەوا بێنە ناو کەنداوەوە، بەلاّم لەوێدا کۆچیی دوایی کرد. زۆر بەخێراییش پڕوپاگەندەی ئەوە بلاّوبووەوە کەوا پورتوگالیەکان ژەهرخواردیان کردووەو کوشتیانە تاکو خۆیان لەهەموو تەنگژەیە ڕزگاربکەن کەبەهۆی نزیکبوونەوەی ئێران ئینگلیز دووچاریان بۆتەوە.

تۆماس پارکەر: لەدوای مردنی ئێدوارد کەنوك کۆمپانیای هیندستانی-ئینگلیزی تۆماس پارکەری هەڵبژارد بۆ نوێنەرایەتی و ناردرایە ئەوێ و لەگەڵ شا عەباس کۆبۆوە و پێشنیاریی ئەوەی بۆ کرد حەریری زیاتر لەئێران بکڕن و لەبەرانبەریشدا ئەوان جلوبەرگی

لەخوری دروستکراوی ئینگلیزی لەبازاڕەکانی ئێرانیدا بفرۆشن و شـا ڕەزامەنـدی لەسـەر ئەم پێشنیارە نیشاندا بەمەرجی ئـەوی ئینگلیزەکـان شـەش سـەد بالـە لەحـەریر بکـڕن بەهەمان مەرجەکانی پێشوو کەلەگەڵ ئێدواردا لەسەری ڕێکەوتبوون.

لەدوای ئەوە کۆمپانیا ئینگلیزەکە گیلـز هۆبزیشـی نـاردە لای شـا عـەباس و لەگەڵیـدا کۆبوونەوەی ئەنجامدا و هەردوو نێردراوەکە داوایان لەشا کرد کەوا ڕێگـە بـەئینگلیزەکان بدات هەموو بازرگانیەکانی حەریر قۆرخ بکەن و بەمەش بازرگانـە ئەرمەنـەکانی جولفـا لەئەسفەهان بێزار و نیگەرانبوون چونکە بەرژەوەندیەکانی ئەوان زیـانی پێـدەگات ئەگـەر شا بەم پێشینارە قایل ببێ چونکە ئەوان بەشداربوون لەچالاکیەکانی بازرگـانی حـەریری ئێرانی، لەبەر ئەم هۆیە شا ناچار بـوو لەڕێگـەی زیـادکردنی ئاشـکراوە کالاًکـانی خـۆی بفرۆشێ و لەبەرانبەریشدا نوێنەرانی ئینگلیز و ئیسـپانیا بەشـدارییان لـەم زیادکردنـەدا نەکرد و ئەمەش مانای وایە ئەوان بەم کارە قایـل نـین. لەدواییـدا ئەرمەنـەکان نرخێکـی زیاتریان لەهی پار خستە بەردەمی شـا و هـەموو بەرووبوومـەکانی سـاڵی ١٦١٩ز یـان بەدەسکەوت، بەلاًم شا پاشگەزبووەو بڕیاریدا کـەوا لـەو نرخـە کـەمتر کالاًکـانی بداتـە ئینگلیزەکان بۆ ئەوەی پەیوەندیەکانی نێوانیان لەناونەچێ و بـەو ئومێـدەش لـەدەرکردنی هێزەکانی پورتوگالی یارمەتیان بدات و لەدوورگەی هورمز دەریان بکات.

بەردەوامی نزیکبوونەوەی سـەفەویی و کۆمپانیـای هیندسـتانی خـۆرەلاًتی-ئینگلیـزی: بەهۆی ئەو نزیـك بوونەوەیـەی نێـوان سـەفەویی و کۆمپانیـای هیندسـتانی خـۆرەلاًتی-ئینگلیزی پەیوەندی نێوان سەفەویی و ئیسپان و پورتوگالەکان شلەژانی تێکەوت و تەنانە گەیشتە ئەندازەی دوژمنایەتی و بەمەش لایەنی سەفەوی و ئینگلیز هاوکارییان کـرد بـۆ دەرکردنی پورتوگالەکان لەدوورگەی هورمز و هەروەك باسیشـمان کـرد لەئەنجامـدا شـەڕ لەنێوانیاندا هەڵگیرسا. ئاشکرایە کەوا کۆمپانیا بەبێ ئەوەی پرس بەحکومەتی ناوەنـدی لەنـدەن بکـات ئـەم شـەڕەی هەڵگیرسـاندو، لەبەرئـەوەش ئینگلیـز لەگـەڵ ئیسـپانیا و پورتوگالەکان پەیوەندیەکی دۆستانەی باشی هەبوو بۆیە سەرۆکی کۆمپانیاکەی دادگـایی کرد، ئەویش بەرگری لەخۆی کرد و گوایە بۆیە ئەم کارەی کردووە تـاکو پـەرە بـەبازرگانی ئینگیزیی بدات و لەبەرانبەر رکابەرەکانی وەك ئیسپانیاو پورتوگال بالاًدەسبێ و لەهەمان

کاتیشدا لەبەردەم هەڕەشەکانی ئیمام قوولی خان ناچار بــوو کــەوا بەریتانیــەکان بێبــەش بکــات لــەبازرگانی لەگــەڵ ئێرانیــەکان و لەکۆتاییشــدا دادگــا بڕیــاری ســەرکۆنەکردنی کۆمپانیاکەی راگەیاند و بەبیــست هەزار جونەیهی ئستەرلینیش سـزای کۆمپانیاکەیــدا و ڕێگاشی پێنەدری کەوا جارێکی دیکە کاری لەم جۆرە ئەنجامبدات.

لەوانەشە حکومەتی بەریتانیا بۆیە پەنای بردۆتە ئەم دادگایی کردنە بۆ ئەوەی دڵی پاشای ئیســپانیا راگــرێ و وای خــۆی نیشــانبدا بــەهیچ شــێوەیەکی هــاوڕا نییــە لەگــەڵ هەڵسوکەوتەکانی کۆمپانیــای هیندســتانی خــۆرەڵاتی، (هەرچــەندە بــەهۆی دەرکردنــی پورتوگالیەکان لەدوورگەی هورمز سالآنێکی دوورودرێژ سوودمەند بوو) لەوانە:

- بەر لــەوە ئینگلیــز زاتــی ئــەوەیان نــەدەکرد کــەوا لەکەنــداوی عەرەبیــدا دژایــەتی پورتوگالیەکان بکەن.

- هەمیشە بەرژەوەندیەکانی ئینگلیز لەکەنداو لەژێر مەترسی و هەڕەشــەی هێزەکــانی پورتوگالیدابوون.

- کۆمپانیای هیندستانی خۆرەڵاتی توانای ئەوەی نەبوو لەدوورگەی هــورمزدا کێبڕکــێ لەگەڵ ناوەندە نایاب و چالاکەکەی ئیسپانیا و پورتوگال بکات.

- دەسکەوتی زۆر و کارئاســانی بازرگانی لەلایەنی شا عەباسی یەکەمەوە.

- ڕێکخستنی بوونی بەریتانیا لەکەنداوی عەرەبیدا.

لەدوای ئەوەش کۆمپانیای هیندستانی خۆرەڵاتی حکومەتی بــەریتانیا جــەختی کــردەوە لەســەر بوونی بەردەوامی خــۆی لــەناوی کەنــداوی عەرەبیــداو بــەهێزە سەربازیەکانیشــی پاڵپشــــتی لەچــــالاکییە بازرگانیــــەکانی دەکــــرد بــــەبیانووی پارێزگــــاری کردنــــی بەرژەوەندییەکانی، بەمەش توانیــان بەســەر زۆرێــك لەبەنــدەرەکان و ئیمارەتــەکانی ئــەم ناوچەیە زاڵبن و بەهۆیەوە نەتەوەکانی ناوچــەکە دووچــاری زۆرێــك لەنەهامــەتی برســێتی داگیرکاری بەریتانی بونەوە کە بەهاندان و پاڵپشتی شا عەباسی یەکەم هاتنە ناوچەکە.

## پەیوەندی سەفەویی و هۆڵەندیەکان:

لەدوای ئینگلیزەکان هۆڵەندیەکان بەبیانووی یارمەتیدانی پورتوگالییەکانی دوورگەی هورمز هاتنە ناوچەی کەنداوی عەرەبی. لەدوای شکستی ئەوان کەشتیەکانی هۆڵەندی بوونیان پەیداکرد، بەلام ئەم هاوپەیمانێتییە تەمەنی زۆر کورتبوو و گرێدراربوو بە مەترسیەکانی پورتوگالی بۆ سەر هەردوولایان، کاتێکیش پورتوگالیەکان بێهێز بوون لەناوچەکەدا و بازرگانی هۆڵەندییەکانیش گەشەسەندنی زۆری بەخۆیەوە بینی، کێشەیەك لەنێوانیاندا دروستبوو کەوا خۆ لێ دەربازکردنی ئەستەمبوو.

چالاکیەکانی بازرگانیی هۆڵەندی لەسەرەتادا لەسەربەرژەوەندییەکانی پورتوگال دەستی پێکرد و بۆ ئەوەی ئەوانە بوونی خۆیان لەناوچەکەدا مسۆگەربکەن کۆمپانیای هیندستانی خۆرهەڵاتی هۆڵەندی کەلەساڵی ١٦٢١ز دامەزرا نوێنەرێکی خۆی بەناوی هیوپۆرت ڤینش نارده لای شا عەباس و داوای لێکرد کەوا رێگە بەهۆڵەندییەکان بدرێ لەبەندەر عەباسدا خانوو بۆ بازرگانەکانیان دروسبکەن و ئەویش رەزامەندی لەسەر نواند و لەساڵی ١٦٢٣ز واتە لەساڵی دوای دەرکردنی پورتوگالیەکان خانووەکە دروسکرا.

لەدوای ئەوەی هۆڵەندیەکان لەئێراندا جێگیربوون، حەزیان کرد کەوا رۆڵێکی سەربەخۆ بگێڕن بەبازرگانی کردن لەگەڵ ئەم دەوڵەتە و شا قایل بوو لەسەر:

- رێژەیەك لەحەریری ئێرانیان پێ بفرۆشن.
- لەباجی گورمرگ بیان بەخشن.
- رێگەیان پێبدرێ کەوا گەرەکی بازرگانی لەئەسفەهان و لار دروسبکەن.

لەهەمان کاتیشدا شا مکوڕبوو لەسەر دابین کردنی رکابەریی لەنێوان گەورەترین کڕیارەکانی حەریر کەبەمەش ئێران سوودێکی زۆری دەسدەکەوێ.

هۆڵەندا لەساڵی ١٦٢٤ز نێردراوێکی نارده ئێران بۆ ئەوەی رێکەوتنێکی بازرگانی لەگەڵ شا عەباسی یەکەم گرێبدەن کەپشتگیریی لەباری ئێستای بواری بازرگانییان دەکات. ئەوەبوو وەفدەکە لەکارەکەیدا سەرکەوتنی وەدەسهێنا و شا کارئاسانی زۆری بۆ بازرگانە

هۆڵەندییەکان کرد و ڕێگـای پێـدان کلێسـاو پەرسـتگای تایبـەت بـەخۆیان سـازبکەن و دادگایی کردنی هەر هۆڵەندییەکیش کەبێتە سەر ئایینی ئیسـلام.

بەمشێوەیە و بەخێرایی هۆڵەندیەکان لەبواری بازرگانی لەگەڵ ئێرانـدا بالآدەسـت بـوون و توانیشیان بە نیمچە قۆرخکردنێکیش دەوری بازرگـانی حەریریانـدا و ئەمـەش وای کـرد ئینگیزەکان پەلەبکەن بۆ ئەوەی تواناکانی خۆیـان لـەبواری بازرگـانی لـەناوی کەنـداوی عەرەبی و ئێران بگێڕنەوە کەبەهۆی باری ناوخۆییەوە لاوازببوو.

لەوانەبوو شا چاوی لەوەبووبێ کەو هۆڵەندییەکان لەدژی پورتوگالیەکان یارمـەتیان بـدەن کەلە مەسقەت کۆبببوونەوەو هەمیشە لەهەوڵی دەسبەسەرداگرتنی دوورگەی هورمزبوون، بۆیە نێردراوێکی ناردە هۆڵەندا بۆ ئەوەی گفتوگۆیـان لەگـەڵ بکـات لەسـەر دوو خـاڵی سەرەکی ستراتیژیی لەسیاسەتی خۆیدا:

یەکەم: نەهێشتنی پەیوەندیەکانی بازرگانی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیی.

دووەم: بەشداریکردنی هێزەکانی کۆمپانیای هیندستانی خۆرەلآتی هۆڵەندی شانبەشـانی سەفەوییەکان بۆ دەرکردنی پورتوگالیەکان لەمەسقەت و عەمان.

وادیاربوو هۆڵەندا لەو ئاستەدا نەبوو کە شا عەباسی یەکەم هیواکانی پێـوە بەنـدکردبوو، چونکە پاشای هۆڵەندا داوای لێبووردنیکرد لەجێبەجێکردنی هـەردوو داواکاریەکـە و بـۆ ئەوەی بازرگانیەکەی خۆی لەئێران و کەنداوی عەرەبی بپارێزێ و پەرەی پێبدا دەسـتیکرد بە سستی و خاوەخاوی لەجێبەجێکردنی بەڵێنەکانی و نامەیەکی بۆ شا نارد و تیایدا پێـی ڕاگەیاند کەوا خۆشحاڵە بەوەی هاوکاری ئێـران بکـات لەدژایـەتیکردنی پورتوگالیـەکان لەناوچەی کەنداو، هەروەها نێردراوێکی خۆشی دەنێرێ بۆ ئێران تاکو لەبارەی مەرجەکانی هاریکاریـیان دانوستان بکات و، ئەم بەڵێنەش سوودی بەکۆمپانیای هیندستانی خۆرەلآتی هۆڵەندی گەیاند و بوو بەپاڵپشتێك بۆ بازرگانیەکەی لەئێران و لـەجارانیش پـتر ڕکابـەری کۆمپانیا ئینگلیزیەکەی دەکرد، هـەروەها چـالاکییە بازرگانیەکانیشـی پـێ زیـادکرد و لەدوایـیشدا بوو بەخاوەنی بەشێکی گەورەی بازرگانی دەرەوەی ئێران.

بەلآم پاشای هۆڵەندا کە سیاسەتی بەدەسهێنانی کـات و خاوەخـاوی پـەیڕەودەکرد هـیچ نێردراوێکی خۆی نەنارده ئێران، بۆیە شا نێردراوێکـی خـۆی نـارده هۆڵەنـدا بـۆ ئـەوەی لەهۆی دواکەوتنی نێردراوەکەیان بکۆڵێتـەوە، هـەروەها لەنامەکـەدا ئامـاژە بەپچـڕانی پەیوەندیەکان نێوان هەردوو وڵات و گللەیی لەخۆگرتبوو، ئەمـەش پاڵی بەپاشای هۆڵەنـدا نا بەپەلە نێردراوێك بنێرێتە ئێران و یەکسەر ئامـادەیی خۆشـی دەربـڕی بـۆ هاوکـاری و دەرپەڕاندنی پورتوگال لەناوچەی کەنداوی عەرەبی، بەلآم ئەو نێردراوە لەدوای دوو مـانگ و نیو لەمردنی شا عەباسی یەکەم گەیشتە ئەسفەهان.

## پەیوەندی سەفەوییەکان لەگەڵ روسیا:

لەسەردەمی شا عەباسی یەکەم پەیوەندی نێوان سەفەوییەکان و روسـیا جێگیربـوو بـەلآم لەکۆتاییـدا رووی لەسـاردی کـرد و گرێیانـدا بـەو گرژییـەی کەلـەنێوان سـەفەویی و عوسمانییەکاندا هەبوو، سەرەڕای چالاکیە بازرگانییە هاوبەشەکانیان.

شا لەساڵی دووەمی فەرمانڕەوایەتی خۆیدا وەفدێکی بەسەرۆکایەتی هادی بـەگ و بـوداق بەگ نـارده مۆسـکۆ و داوای یارمـەتی لێکـرد لـەو شـەڕانەی کەلـەدژی عوسمانییـەکان دەیکات، و لەبەرانبەریشدا پێشوازی لەهاتنی روسەکان دەکات بۆ ناوچەی باکۆ و دەربەند و ئومێدیشی ئەوەبوو کەهێرش بکەنە سـەر ئازەربێجـان و شـەروان و وڵاتـی کـەرەج بـۆ دەرکردنی عوسمانییەکان لەو ناوچانەدا.

لەو رۆژەوە پەیوەندی و نامەگۆڕینەوە لەنێوانیاندا بەردەوامبوو، لەلایەکی دیکەشەوە ئەو نێردراوانەی کەبەخاکی روسیادا دەڕۆیشتن بۆ ئەورووپا سوودی زۆریـان بـۆ گەشـەسـەندنی بازرگانییان هەبوو، چونکە یەکەجار نێردراوەکان دەچوونە مۆسکۆ ئینجـا بـەردەوامییان بەگەشتەکەیان بەرەو پایتەختە جۆربەجۆرەکانی ئەورووپا دەدا.

لەپاڵ ئامانجە سیاسیەکانیان هەردوو وڵات چالاکی بازرگانیشیان بەیەکـەوە ئەنجامـدەدا، بۆیە شا هانی بازرگانە روسـەکانی دەدا کەوا بێنـە ئێـران و بەشـداری لـەکڕینی حـەریردا بکـەن. بـەهۆی ئـەوەی رێگـا بازرگانیـەکانی عـێراق و وڵاتـی شـام لەلایـەن دەوڵـەتی

عوسمانییەوە داخرابوون، ئاستەنگ لەبەردەم کاروانی بازرگانەکان لەرێی چوونیان بۆ ئەوروپا بەنێو خاکی روسیادا هێندەی دیکە پتربوو.

کاتێکیش شا عەباسی یەکەم ئازەربێجان و شەروان و ولاتی کەرەجی داگیرکبرد سنوورەکەی لەگەڵ سنوری روسەکان یەکیان گرت، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی پەیوەندیی دۆستانەی نێوانیان پەرەپێبدەن و قەبارەی بازرگانیش لەنێوانیاندا گەورەتربوو، هەروەها پەیوەندی سیاسییشیان هێندەی دیکە گەشەی سەند و بەهێزبوو و بەردەوامیش لەنێوانیاندا سەفیرەکان هاتووچۆیان دەکرد.

بەلام لەساڵی ١٦١٨ز بەهۆی پشێویەکانی نێوخۆیی رووسی و تەنگژە داراییەکانیانەوە ئەم پەیوەندیانە سستی و ساردییان تێکەوت، بۆ دەربازبوون لەتەنگژەکە میخائیل رۆمانۆڤی قەیسەری روسیا داوای یارمەتی دارای لە شاعەباس کرد بەلام ئەوا سەرسام بوون بەو خۆدزینەوەیەی شا لەم داواکاریەیان و بەدەستی بەتاڵەوە گەرانەوە بۆ ولاتەکیان، لەبەر ئەم هۆیە پەیوەندیی دۆستانەی نێوانیان کۆتایی پێهات.

## پەیوەندی سەفەوییەکان لەگەڵ دەوڵەتانی دیکەدا:

شا عەباسی یەکەم پەیوەندی لەگەڵ چەندین دەوڵەتی دیکەی ئەوروپا هەبوو وەك پۆڵەنداو روسیا کۆشکی پاپایەتی و ڤینیسیا و لەگەڵ هەمووشیاندا پەیوەندیەکانیان لەدەوری باس و خواسی دژایەتی کردنی عوسمانییەکان دەخوولایەوە و هەروەها چالاکیە بازرگانیەکانیشیان لایەنێکی دیکەی پەیوەندیەکانیان بوو، بەلام شا خۆی لەهاوپەیمانێتیی فەرەنسا نەدەداو هیچ ئاماژەیەکیش نییە بۆ پەیوەندی سەفەوییەکان لەگەڵ پاشا فەرەنسیەکان، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەو نزیکییەی فەرەنسیەکان لەگەڵ لەسەدەی شانزەهەم دەوڵەتی عوسماییدا هەیانبوو و گەیشتە ئاستی هاوپەیمانێتیی نێوانیان.

## مردنی شا عەباسی یەکەم:

شا عەباسی یەکەم هەموو تەمەنی حوکومڕانی خۆی کە نزیکەی چل و دوو ساڵی خایاند لەکێشە ناوخۆییەکاندا بەسەربرد و مەبەستیشی چەسپاندنی دەسەلاتەکەی بوو لەلایەك و

لەلایەکی دیکەشەوە دوو دووژمنی دەرەکی هەبوو: ئۆزبەك لـەخۆرەلاَت و عوسمانییـەکان لەخۆراوا و ئەم دوو جۆرە کێشـەیەش هـیچ بوارێکیـان نـەدا کـەوا پشـوویدات بـەردەوام لەبەرەیەکی شەڕەوەی بۆ یـەکی دیکـە هاتووچـۆی دەکـرد و لەکۆتاییشـدا ئـەم هـەموو ماندووبوونە بووە هۆی نەخۆشکەوتنی و بەئاشکراش بێهێزی بەجەسـتەیەوە دیارکـەوت و تووشی زەردوویش هات و وردە وردە باری تەندروسـتی رووی لەخراپی کرد، بۆ چارەسەریی نەخۆشیەکەشی چووە مازەندەران و بەر لەوەی بەرێبکەویٚ نەوەکـەی خـۆی کـەناوی سـام میرزای کوڕی سەفی میرزا بوو لەدوای خۆی وەك جێنشینێك دەسنیشانکرد و بەیعەتی لـە سەرجەم خانەوادەکانی سەفەوییەوە بۆ وەرگرت، ئەویش بۆ ئەوەبوو ئەگەر لەناکاو کۆچـی دوایی کرد ئەوا وارسێکی شەرعی هەبیٚ بۆ جێگرتنەوە و رزگارکردنی ولاَت لەدووبـەرەکی و پیلانی پیلانگێڕان.

شا ماوەیەك لەمازەندەران مایەوە و رۆژ لەدوای رۆژ تەندروستی بـەرەو خراپـی دەچـوو و لەبەرەبـەیانی رۆژی پێـنج شـەممەی ٢٠کـانونی دووەم١٦٢٩(ز) لەشارۆچـکەیەکی نزیـك مازەندەران و لەتەمەنی پەنجا و نۆ ساڵیدا کۆچی دوایی کردو تەرمەکەشیان گواسـتەوە بـۆ مەشهەد و بەشێوەیەکی کاتی لەویٚ ناشتیان، بەمەبەستی ئەوەی کەوا جێگایـەکی پـیرۆز بدۆزنەوە و لەویٚ بینێژن، بـەلاَم تـاکو ئێسـتاش نـەزانراوە کـە تەرمەکـەی لەبەهەشـتی مەشهەد ماوەتەوە یا گواستراوەتەوە بۆ شوێنێکی دیکە. چونکە لەلایـەکی دیکـە باسـی ئەوە دەکریٚ گوایە هەموو پێداویستیەکانی گواستنەوەیان سازکردووە لە قـوم بـەلاَم هـەر لەبەهەشتی مەشهەدی باقشان ماوەتەوە و دەسـکاری نـەکراوە. بـەلاَم هەنـدێکی دیکـە وایدەگێڕنەوە کـە عـەباس مکوڕبـوو لەسـەر ئـەوەی گۆڕەکـەی لەکەسـنەزان بـیٚ بۆیـە دەووروبەرەکەی فەرمانیان داوە کەوا سیٚ دارەبازە سـازبکریٚ و بۆ هەر سیٚ شاری مەشـهەد و ئەردەبیل و نەجەف بنێردریٚ و بەمەش کەسـنەزانیٚ تەرمەکـەی بـۆ کـام شـار لەمانـە نێردراوە.

## کەسایەتی شا عەباسی یەکەم:

شا عەباسی یەکەم فەرمانڕەوایەکبوو زیرەك بوو دەسـکراوەبوو خـاوەنی بـیر و بۆچـوون و سیاسەت و لێکدانەوەبوو، تیشکەربوو، زۆرێك لەکار گرنگ و پڕ شکۆی ئەنجامدا، لەدوای

خۆشیدا ناوێکی پڕشنگداری لەبواری سیاسەت و کارگێڕی و هێزی سەربازی بەجێهێشت. بەشێوەیەك مەزەبی شیعەی بلاّودەکردەوە کەهیچ کەس بەر لەخۆی ئەنجامی نەداوە و کەسیش ناتوانێ لەدوای خۆی ئەنجامی بدات، دڵنەرم بوو لەبەرانبەر خەڵکی کەساس و هەژار و دەسکورتدا.

ناوبانگی شا تەنها لەبواری سەربازیدا نەبوو، بەڵکو خاوەن توانایەکی لەرادەبەدەربوو لەبواری کارگێڕی و فەرمانڕەوایەتیدا. مێژوونووسەکان لەسەر ئەوە کۆکن کەلەسەردەمی ئەودا دەوڵەتی سەفەویی گەیشتە پلەی تەواو پێگەیشتن لەبواری ئاوەدانی و هێزی سەربازیی و سیاسەت. کاتێکیش مێژووی ئێرانی سەردەمی شا عەباس دەخوێنینەوە بۆمان روون دەبێتەوە کەوا تا چ ئاستێك بەهەوڵ و خەبات و زیرەکیی خۆییەوە چۆن دەوڵەتەکەی لەهەڵدێران و لەناوچوون رزگارکردووە و، چۆن توانیویەتی بەرزی بکاتەوە بۆ ئاستی دەوڵەتە زلهێزەکان و لەنیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەهەمی زاییینی ببێتە مەترسییەکی راستەقینە بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانیی.

لەسەردەمی شا سەربەخۆیی سیاسی لەئێراندا بەرقەرابوو و لەدوای رووخانی دەوڵەتی ساسانی یەکێتی ولاّتەکەی گێڕایەوە. ئینجا بەهۆی زیرەکی و بیرتیژیی عەباسەوە ئێران رێگای نوێی گرتەبەر و کاروبارەکانی لەناوخۆ و دەرەوە رێکخستەوە و، سەربەرزی و ناوبانگ و توانای بۆ دەوڵەتەکە لەسەرانسەری جیهاندا پەیداکرد، گومانی تێدا نییە ئەگەر ئامادەیی خودی خۆی و رەوانی سیاسەتی و زانیاری زۆر و تەکتیك و ئازایەتی خۆی نەبوایە ئەوا ئەو هەموو دەسکەوتانە وەدینەدەهاتن.

لەبواری سیاسەتی ناوخۆیی، توانی هەموو فەرمانڕەوایەتییەکە بخاتە ژێر دەستی خۆی و بیپارێزێ لەهەڵدێران بەدەستی قزلباش و سەرکردەی هەرێمەکان و هەوڵی هەریەك لەوانە بۆ دەرچوون لەحوکمی دەوڵەتی ناوەندی و سەربەخۆیی هەرێمایەتی خۆیان و، توانی دەسەلاّتی هەموویان لەناوبەرێت و حکومەتێکی مەرکەزی خاوەن شکۆ و بەرێز دروستبکات و بەتەنهاش حوکومڕانی بکات.

هەروەها لەبواری سیاسەتی دەرەوەدا، شا جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کەوا بەرەی ناوخۆییە بەهێزەکەی رووبەرووی دوژمنانی دەوڵەت بکاتەوە، لەپێناوی ئەمەشدا رێگای

زۆری گرتەبەر لەوانە نوێکردنەوەی هێزی سەربازیی و هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەورووپا. سوپایەکی راهێنراوی بە چەك و شێوازی سەربازیی نوێی ئەو سەردەمە ساز و ئامادەکرد و پرچەکیشی کرد بەتەفەنگ و تۆپی نوێ و هەموو فەرمانێکیشی لەخودی خۆیەوە بۆ دەردەچوو و بەڵام جاران لەژێر دەسەڵاتی سەرکردەی هۆزەکانی قزلباش بوو، ئینجا یەکێتی سوپا و یەکێتی سەرکردایەتی دروسکرد. شا جگە لەمانەش خاوەنی زیرەکیەکی ئەوتۆ بوو لەبواری سەربازی پلانی شەڕدا کەدەیتوانی لەیەك کاتدا شەڕ لەگەڵ دووبەرەی دوژمندا بکات و نەشهێڵێ سوپاکەی لێکبترازێ. کاتێك لەهەردوو لاوە عوسمانیەکان و ئۆزبەکەکان لەسەرەتای دەسەڵاتداریتییەوە هێرشیان بۆ هێنا و پەلاماریاندا هەوڵیدا بەرەی عوسمانییەکان سارد بکاتەوەو بەمەش ویستی رێکەوتنێکی ئاشتیانە لەگەڵیاندا سازبکات و ئاگربەست رابگەیەنێ و تەنها سەرقاڵی شەڕی ئۆزبەك بێ. جگە لەمانەش زیرەکیەکی لەبواری پاشەکشەکردن بۆ قووڵای وڵاتی خۆی بەپەیرەوکردنی تەکتیکی جەنگ ئەگەر هەستی بکردبایە کەوا دوژمنەکەی لەرووی ژمارەی سەرباز و چەکەوە لەو بەهێزترە و بەچ شێویەکیش هەموو پێداویستیەکانی ژیان لەشاروشارۆچکەکانی سەر رێگای دوژمنەکەی لەناودەبات و لێی دەگەڕێ کەوا سروشتی وشك و رەق لەجیاتی ئەو شەڕیان لەگەڵدا بکات، کاتێکیش سروشت ماندوویان دەکەن ئاسان دەبێ بۆ سوپای سەفەویی بەبێ گوێدانە تواناو ژمارەی سەربازەکانی دوژمن هێرشیان بۆ بکەن و شکستیان پێبهێنن و، شایانی باسە کە ئەم شێواز و تەکتیکەی زیاد لەیەکجار لەدژی عوسمانییەکان بەکارهێناوە. هەروەها شا بۆ بەهێزکردنی هەڵوێستی خۆی لەبەرانبەر عوسمانییەکاندا هەوڵی سازکردنی پەیوەندی و هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەورووپیەکان دەدا و بۆ ئەم مەبەستەش چەندین نامە و نێردراوی بۆ ئەورووپا ناردووە، بەڵام جگە لەخاوەخاوی و بەرژەوەندپارێزیی خۆیان هیچی دیکەی لەوانەوە پێنەگەیشت، تەنها ئەوە نەبێ کە لەگەڵ کۆمپانیای هیندستانی خۆرەڵاتی ئینگلیزی هاوپەیمانێتی سازکرد بۆ دەرکردنی پورتوگالیەکان لەدوورگەی هورمزدا.

شا توانی رکابەریی بازرگانی لەنێوان دەوڵەتە ئەورووپیەکاندا دروسبکات بۆ وەدەسهێنانی سوودو قازانجی دارایی و بەرزکردنەوەی نرخی حەریری ئێرانی کە هەموو ئەو دەوڵەتانە بەهەڵەداوان دەهاتن بۆ کڕینی و توانی دەسبەسەر بازرگانی ئەم بەرهەمە گرنگەدا بگرێ

و بەهۆیەوە سوود و قــازانجێکی زۆری کــرد و بــەم قازانجــەش تــوانی وڵاتەکــەی ئــاوەدان بکاتەوە و سوپاکەشی نوێبکاتەوە.

شا لەرووی بیناکاری و ئاوەدانکاریەوە دەستێکی باڵای هەبوو و توانی چەندین باڵەخانەو کارگەی گەورە و زەبەلاح دروسبکات کەتاکو ئێستاش ئێرانیەکان شانازییان پێوەدەکەن و زۆربەشیان تائەمڕۆش ماونەتەوە.

لەبەرانبەر ئەو وێنە ئیجابیانە و ئەو هەموو کارو چالاکیانەی کەبەناوی ئــەوەوە ناســران، کەچی شا عەباسی یەکــەم هەنــدێك هەڵــەی ئــەوتۆی کــرد کــەوا ســەفەوییەکانی بــەرەو هەڵدێربرد:

- هەموو کات پشتی بەخۆی دەبەست و لەجیاتی ئەوەی کوڕ و ئەندامانی خانەوادەکەی لەدەووری خۆی کۆبکاتەوە و پلە و پایەی ئیــدارییان پێببەخشــێ و بەشــدارییان پێبکــات لەشەڕەکان، کەچی دەیکوشتن یا کوێری دەکردن و بەندی دەکــردن، ئــەویش بــەهۆی ئــەو ترسەی هەمیشە هەیبوو لەلەدەســـدانی دەســەڵاتەکەی، بــەهیچ شــێوەیەك بــواری ئــەوەی نەدەدان کەوا لەفەرمانڕەوایەتی نزیك ببنەوە و وای لێــدەکردن لــەناو تەنــژە و نــەبوونی و بێبەریی بوون لەهەموو شــتە چــاکەکاندا بــژین، کەئەمــەش بــووە هۆکــارێکی ســەرەکی لەلەناوچوونی خانەوادەکەی و رووخانی دەوڵەتی سەفەویی.

- لەگەڵ دەوڵەتە ئەوروپیەکاندا رێکەوتنامەی بازرگانی سازدەکرد و هەموو جارێکیش دەوڵەتی ئێران تێیانــدا زیــان لێکــەوتووبوو، لەلایــەکی دیکــەش هەمیشــە ئاگــاداری و چاودێری بەرژەوەندیی مەسیحیەکانی دەکرد وەك ئەوەی کەوا ئــەم هەڵســوکەوتە لــەنێوان دوو دەوڵەتیێ یەکیان بەهێز و ئەویدیکەیان بێهێز.

- لەمامەڵەکردنی ئەوروپیەکانیشدا زۆر کورتبین بوو، چــونکە بازنەیــەکی ململانــێ و کێشــە نێودەوڵەتییــەکانی هێنایــە ناوچــەی کەنــداوی عەرەبییــەوە لەدوایشــدا ئــەم داگیرکەرانە بەهۆی ئەو تەماعکارییەی هەیان بوو بۆ داگیرکردنی هەموو جیهان مەترسی گەورەیان لەسەر ناوچەکەو لەسەر خودی ئێرانیشدا پەیداکرد.

- سەرەڕای گرنگیدانی بەهێزی سەربازیی کەچی دروسکردنی کەشتیگەلی سەربازیی پشگوێخست، هەرچەندە ئەم کەشتیگەلانە زۆر گرنگییان هەبوو لەئاوی دەریای قەزوین و کەنداوی عەرەبی، لەبەر ئەمەش بوو کەوا هانای بردە بەر هێزی دەریاوانی هۆڵەندی و ئینگلیزی تاکو خۆی لەهێزەکانی پورتوگال کەلەدوورگەی هورمزدا کۆببوونەوە رزگاربکات.

- جاری واش هەبوو تەنها لەبەر ئەوەی حەزی لە خوێنرشتنبوو خەڵی دەچەوساندەوە و غەدریی زۆری لێدەکردن و تەنانەش کەسە نزیك و ئەندامانی خانەوادەکەشی لێی دڵنیا نەبوون، هەرکەسێکی بکوشتبایە ئەوا لەپاشاندا کوڕ و کەسە نزیکەکانیشی دەکوشت بۆ ئەوەی کەس نەمێنێ لەدوارۆژدا تۆڵەی لێبکاتەوە، نموونەش ئەوەبوو لەبەرانبەر مورشید قوولی خاندا ئەنجامیدا. لەشێوازەکانی دیکەی دڵرەقی و بێبەزەیی ئەو فەرمانانەبوو کە بەسەر هەندێك کەسیدا دەسەپاند کوڕەکانی خۆیان بکوژن و هەروەها بەپێچەوانەوە، ئەو هەڵسوکەوتەی لەگەڵ کوردەکانی کوردستان کردی نموونەیەکی دیکەی بێبەزەیی و دڵرەقی بوو کاتێك لەکوردستان هەڵیکەندن و لەزێدی خۆیان دووری خستنەوە و بردنی بۆ خۆراسان.

- هەموو کاتێك بەقسەی جەلالەدینی یەزدی ئەستێرەناسەکەی خۆی هەڵسوکەوتی دەکرد و لەهەموو کارێکی بچووك و گەورەدا راوێژی پێدەکرد و هیچ کارێکی پێچەوانەی ئامۆژگارییەکانی ئەو ئەستێرەناسە نەدەکرد، نموونە: جارێکییان جەلالەدین بەگوێرەی ئەو خەوەی دیتبووی پێی گووت کەدەبێ شا بۆ ماوەی سێ رۆژ لەسەر تەختی پاشایەتی دابەزێ و بیداتە دەست یەکێك لەشوێنکەوتووانی مەزەبی خالّبەندیی کەلە دەسوپێوەندەکانی خۆییبوو.

بەجۆرە شا تێکەڵەیەك بوو لەدڵرەقی و بێبەزەیی و سەرکەوتن و دوودڵی و هەندێ هەڵە، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە ئێرانیەکان وەك پاڵەوانێکی نەتەوایەتی تەماشای دەکەن بەشێوەیەك توانیوویەتی وڵاتەکەی بەرز رابگرێ و هیوا و ئاواتی ئێرانییەکان بهێنێتەدی.



## بەشی هەشتەم
## هەڵوەشانەوە و رووخانی دەوڵەتی سەفەویی

## شا سەفیی
## ١٦٢٩-١٦٤٢زاییینی

### فەرمانڕەوایەتی شا سەفەیی:

کاتێك شا عەباسی یەکەم کۆچی دوایی کرد هیچ کـام لـەکوڕ و براکـانی بەکـەڵکی ئـەوە نەدەهاتن ببن بەجێنشـینیی، چـونکە لـەژیانی خۆیـدا هەمیشـە لـەوە دەترسـا کەسـێك لەخانەوادەی خۆی پەیدابێ و تاجەکەی لێبسێنێت و خۆی بەسەردا زاڵبکا، بۆیە هەمووی دوورخستنەوە. ئەم سیاسەتەی هێندە بەتووندی گرتبـوو تەنانـەت هـەرگیز بـیری لـەوە نەدەکردەوە کەوا رۆژێك لـە رۆژان ئەگـەر مـرد لـەدوای خـۆی چ کارەسـاتێك دووچـاری خانەوادە و دەوڵەتەکەی دەبێتەوە، بەکردەنیش ئەم بارە لەئێراندا دروسبوو و ناچـار بـوون لەدوای ئەو میرزاسامی کوڕی میرزا سەفی کەنەوەی خۆی بوو هەڵبژێرن بۆ دەسەڵاتدارێتی دەوڵەتی سەفەویی، بۆ ئەم مەبەستەش کەسە پایەبـەرزەکانی نێـو دەوڵـەت رەزامـەنییان نواند، وێنەی: خەلیفە سـوڵتانی وەزیـری گـەورەو سـەرکردەی پاسـەوانان عیسـا خـان و ئەمانەش مردنی شا عەباسیان تـا بەئـەنجام گەیانـدنی کاروبـاری وەرگـرتنی دەسـەڵات رانەگیاند. کاتێکیش مردنەکەیان راگەیاند میرزا سامی بوو بەخاوەنی تەختی پاشـایەتی دەوڵەتی سەفەویی لەرۆژی دووشەمە ١٤شوبات١٦٢٩ز لەتەمەنی هەژدە ساڵی و، پاشان نازناوی شاسەفی بۆ خۆی هەڵبژارد و دەستەواژەی (بەندە شاە ولایت صفی) لەسـەر دراوی دەوڵەت هەڵکەندرا.

شا سەفی لاسایی شا عەباسی یەکەمی باپیری دەکردەوە، چونکە زۆر دڵڕەقبـوو و لـەدوای ئەوەش جێپێی خـۆی لەدەسـەڵاتەکەدا قـاییم کـرد دەسـتی کـردە شمشـێر و کەوتـە نـاو

ئەندامانی خانەوادەکەی و زۆربەی راوێژکارەکانی باپیری کوشت و هیچ ساڵێك نەبوو کەوا کۆمەڵێك کەس نەکوژێ و چاوی هەندێکی دیکە کوێر نەکات، تەنانەت ژن و منداڵیشی نەدەبوارد، لەو کارە بێزەوەرەیدا بەردەوام بوو کارگەیشتە ئەوەی زۆربەی پیاوماقوولانی دەوڵەت و شازادەکانی خانەوادەی دەسەڵاتدار بەدەستی خۆی کوژران.

لەساڵی یەکەمی فەرمانڕەوایەتی مامە کوێرەکەی خۆی کوشت کەناوی ئیمام قوولی میرزابوو بەبیانووی ئەوەی هەندێك لەشازادەکان پیلان بۆ ئەوە دادەرێژن بیکەنە حاکمی دەوڵەت. لەساڵی ١٦٢٠ز سەرکردەی سوپا زەینەل خان شاملووی بەهۆی کەموکوڕی لەشەری عوسمانییەکان کوشت و هەروەها عیسا خانی قورجی باشی و کوڕەکانی و چراغ خانی زاهیدی کوشت و لەساڵی ١٦٣٤ز وەزیری ئەعزەم ئەردوباری زاهیدی و ئۆغورلوو خان شاملووی کوشت و لەدوای ئەوانیش ئیمام قوولی خانی حاکمی فارسی کوشت کە خاوەنی پیلانی دەرکردنی هێزەکانی پورتوگالی بوو لەدوورگەی هورمز و ئینجا هەموو ئەندامانی خانەوادەکەی لەناوبرد بۆ ئەوەی کەس نەمێنێتەوە لەدوارۆژدا تۆڵەی لێبکاتەوە.

## پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئۆزبەک:

سەرەڕای ئەوەی چەند سەرکردەیەکی ئۆزبەك نەرمیان بەرانبەر دەنواند کەچی ئەو هەر بەردەوام بوو لەسەر دوژمنایەتی سەفەویی و ئۆزبەکەکان. ئەوەبوو ناوچەکانی باکوری خۆرەڵات کەوتنە بەر هێرشی تورکمانەکانی ناوچەی خوارزم و بەتایبەتیش شاری نەسا و ئەبێوەرد و دەرون و هەرات. یادگارید ئەسفەندیارخان شا داوای لێبووردنی لێکردن و بەرپرسیارێتی ئەم پەلامارانەی خستە ئەستۆی ئەبولغازی خانی برای و بۆ نیشاندانی نیازپاکی ناردییە پایتەختی سەفەوییەکان و ماوەی دە ساڵ لەوێ مایەوە، پاشان لەساڵی ١٦٤٢ز و لەدوای مردنی برای بوو بەفەرمانڕەوا.

لەلای خۆشیانەوە ئۆزبەکەکان بەسەرکردایەتی نەدرخانی حاکمی بەلەخ و ئیمام قوولی خانی برای کەحاکمی بوخارا بوو هێرشیان کردە سەر قەڵای ماوچاق بەڵام بەهۆی بەرەنگاربوونەوەی قزلباشەکان نەیانتوانی دەستی بەسەردا بگرن و کۆمەڵێکیش لە قەبجاقەکانی خوارزم هێرشیانکردە سەر شاری هەرات. لەساڵی ١٦٤١ز ئیمام قوولی خان

هەردوو چاوی لەدەسدا و لەبەر ئەوەی حەزی لەخۆشی و لەشـاغی دەکـرد بۆیـە دەسـتی لەکارکێشایەوە و تاجەکەی خـستە سـەر ئەدرخانی برایەوە. وادیاربوو لەلایەن براکەیـەوە و بەهۆی ئەو هەڵوێستە سیاسیەی بەرانبەر بە سەفەوییەکان هەیبوو تەنگی پێهەڵچـنرابوو، بۆیە ناچار هەلأت و رووی کردە دەوڵەتی سـەفەویی و هانای بردە بەر شاسەفی، بـەلأم بـەر لەرۆیشـتنی و بـۆ ئـەوەی برایەکـەی وەدووی نەکـەوێ و بیکـوژێ لـەناو خەڵکیـدا وای بلأوکردەوە کەوا دەچێتە حەج، لەوێشدا شاسـەفی زۆر بەگەرمییـەوە پێشـوازیی لێکـرد و بەسەرکردەیەکی پایەبەرز ناویهێنا.

لەراستیدا بەهەڵەدادەچین کاتێك بەهۆی پێشوازی کردنـی دەوڵـەتی سـەفەویی لەیـەکێك لەشازادەکانی ئۆزبەك واتێبگەین کەوا پەیوەندیی ئۆزبەك و سەفەوییـەکان جێگیرە، بەڵکو بەپێچەوانەیەوەیە. لەسەردەمی شاسەفی پـەلامارەکانی ئۆزبـەك بـۆ سـەر خـاکی ئێـران گەیشتە ئەوپەڕی و بەلایەنی کەمەوە پانزە جار هێرشیان کردە سەر دەوڵـەتی سـەفەویی و زۆربەی پەلامارەکانیش تەنها لەپێناو دزی و راوەرووت بوو و، لەمانەشدا نزیکە بیست تا سی هەزار چەکدار بەشداریان دەکرد.

## پەیوەندیەکان لەگەڵ عوسمانییەکان:

هێرشی یەکەمی عوسمانییەکان بۆ سەر بەغداد: جارێکی دیکە دوژمنایـەتی سـەفەویی و عوسمانییەکان لەسەردەمی شاسـەفی سـەری هەڵدایـەوە و ئەمجارەشـیان ململانێیـەکانیان کەوتە سەر بەغدا و ئەرمینیا. ئەوەبوو سوڵتان موراد‌ی چوارەم (١٦٢٣-١٦٤٠ز) هـەلی مردنی شا عەباسـی یەکەمی بەهێز و کەم تەمەنیی جێنشینەکەی قۆزتەوە و هێرشی کردە سـەر سەفەوییەکان لەشاری بەغدا بۆ ئەوەی بیگێڕێتـەوە بـۆ خـۆی، بـۆ ئـەم هەڵمەتـەش سوپایەکی بەسـەرکردایەتی سەدری ئەعزەم خەسرۆپاشا رێکخسـت و لـە ١٠ تمـووز ١٦٢٩ز ئەستانبوڵی بەجێهێشت و بەرەو تەوەری خواروو کەوتەرێ: قونییـە، ئەدەنـە، ئـەنتاکیا، حەلەب، موسڵ و شـارەزوور و، لەشارەزوووریشـدا قـەلأی گـوڵ عەنبـەری دروسـتکرد. وایدەبینی کەوا ناتوانرێ دەسبەسەر بەغدادا بگیرێ ئەگـەر سـەرەتا لـەئێرانی دانـەبڕن، ئەمەش بەئەنجام ناگات تا ئازەربێجان داگیرنەکرێ، بۆیە چووە کەرکووك و زسـتانەکەی لەوێ بەسەربرد، لەوێشدا نزیکەی بیست هۆزی کوردەکانی هاتە پاڵ، ئەوانەی کە پێشتر

سەر بە دەوڵەتی عوسمانیی بوون و بەزۆرداریی خرابوونە سەر دەوڵەتی سەفەویی، پاشان خاکی کوردستانی بڕی و لەدواییدا لەخاکی ئازەربێجانەوە چووە ناو سنوری ئێران.

کاتێك شاسەفی هەوڵی لەشکرکێشی عوسمانییەکانی بۆ ناو خاکی ئێران پێگەیشت هێزێکی سەربازی کە لەچل هەزار کەس پێکهاتبوو و بەسەرکردایەتی زەینەل خان نارد بۆ رێگە لێگرتن و رووبەروو بوونەوەیان و خودی خۆشی بەسەرکردایەتی هێزی سەربازیی بەرەو بەغدا کەوتەرێ. لە ٥ئایار١٦٣٠ز زەینەلخان لەنزیك مەریوان رووبەرووی هێزەکانی عوسمانی بووەوە بەلاّم شکستی خوارد و ئەم شکستە پالّی بەشاسەفییەوەنا کەوا بیکوژێ.

ئەم شەڕە رێگای هەمەدانی بۆ عوسمانییەکان کردەوە و خەسرۆپاشا لە٩حوزەیران هێرشی کردە سەر هەمەدان و دەستی بەسەرداگرت و بەردەوام بوو لەپێشڕەویی بەرەو قەزوین و حوسێن خانی حاکمی لورستان لەنزیك دەگەزین لەسەر رێگای هەمەدان-قەزوین پێشی لێگرت بەلاّم نەیتوانی رایبگرێ و شکستی خوارد، کاتێکیش شاسەفیی نەنجامی شەڕەکانی پێگەیشت یەکسەر بەرەو ناوەوەی ئێران پاشەکشەی کرد.

بەهۆی ئەم پێشڕەوی و هەلّمەت بردنەی عوسمانیی، عوسمانییەکان توانیان ئێرانی خۆراوا بگێڕنەوە بۆ خۆیان واتە: ئیلام و کرمانشا و کوردستان و لورستان و خوزستان و لەهەمان کاتیشدا مستەفا پاشا هێرشی کردە سەر تەرابلسی شام و خوارووی عیراقیشیان گێڕایەوە بۆ ژێر دەسەلاّتی خۆیان و، لەدواییدا حللە و کەربەلا و نەجەف و کوفەیان لەژێر دەستی سەفەوییەکان هێنایە دەرەوە.

نووسراوێکی سولّتان موڕادی چوارەم گەیشتە دەست خەسرۆپاشا کاتێك لەدەرگەزین بوو و فەرمانی پێدا کەوا بەرەو بەغداد بسوڕێتەوە، کاتێك لەبەرەی خوارووی خۆراوا گەڕایەوە لەرێگا رووبەرووی پەلامارێکی سەفەوییەکان هاتەوە کەهێزەکەیان بەسەرکردایەتی موراوی خان بوو و شکستی پێهێنان و ئینجا شاری نەهاوەندیان سووتاندو پاشان لە ٥تشرینی یەکەم١٦٣٠ز بەرەو بەغدا کەوتنەرێ و گەمارۆیانداو، سەرەتا تۆپبارانی کرد بەلاّم نەیتوانی بچێتە ناویەوە، لەهەمان کاتیشدا پێدەچوو

ماندوو شەکەت بوویێ لەئەنجامی ئـەو هـەموو شـەڕەی کەلـەکاتی دەسبەسـەرداگرتنی خۆراوای ئێران ئەنجامیدا.

شاسەفی لەپایتەختەوە بەرەو بەغـدا بەرێکـەوت بـۆ ئـەوەی بەشـداری شـەڕەکەبکات و کـاتێکیش خەسرۆپاشـا ئەمـەی بیسـت وای بەچـاکزانی گـەمارۆی سـەر بەغـدا هەڵوەشێنێتەوە و پاشەکشەبکات، ئـەوەبوو لـەدوای چـل رۆژ و لـە١٤تشـرینی دووەم بەغدای بەجێهێشت و رێگای خواروی بەرەو ئەستانبوڵ گرتەبەر و بەحەلەبدا تێپەڕی، چـونکە هێزەکـانی سـەفەویی بەسـەرکردایەتی توختـەخان دەسـتیان بەسـەر دەرنـە و دەرتەنگ و شارەزووردا گرت. لەپاشان شـا گەیشـتە بەغـداو تـوانی خـواروی عـێراق داگیربکاتەوە و سەردانی نەجەفی کرد و ئینجا گەڕایەوە بۆ ئەسفەهان.

هێرشی عوسمانیی بۆ سەر ئەیرەوان: جارێکیدیکە لەنێوان سەفەویی و عوسمانییەکاندا و لەساڵی ١٦٣٣ز شەڕ و پەلامارەکان دەستی پێکردەوە، ئەوەبوو سوڵتان موڕادی چوارەم بۆخۆی بەرەو ئێران رۆیشت ولەبەرانبەریشـدا شاسـەفی پایتـەختی بەجێهێشـت و بـەرەو کوردستان وەرێکەوت بۆ ئەوەی لەوێ بە موراد بگـات، بـەڵام لەبـەر ئـەو پشـێوییەی کەشازادە فەخرەدینی دووەمی مەعنی لەدژی دەوڵەتی عوسمانیی سازی کردبوو سـوڵتان ناچار بوو بەرەو ئەوێ بـڕوات، کـە راپەڕینەکـەی دامرکانـدەوە و لـە١٣نیسـان١٦٣٥ز شازادە مـەعنیشی لەسێدارەدا جارێکی دیکـە گەڕایـەوە بـۆ بـەرەی ئێـران و گەیشـتە ئەرزەرووم و لەوێش ئەو هێزانەی کەبەسەرکردایەتی سەدری ئـەعزەم خەسرۆپاشـا بـوون خستە پاڵ سوپاکەی خۆی.

ئامانجی ئەم پەلامارە ئەیرەوانبوو، بۆیە سوپای عوسمـانیی کـە ژمـارەی سـەربازەکانی نزیکـەی دوو سـەد هـەزار دەبـوو و هـەروەها سـێ سـەد تـۆپی قورسیشـیان پێبـوو بەسەرکردایەتی خودی سـوڵتان بەرەو شاری وەرێکـەوت و، کاتێـك لـە٢٧تـەمووز١٦٣٥ز گەیشتە ئەوێ یەکسەر گەمارۆیدا، بەڵام هێـزی وڵاتپـارێز بەسـەرکردایەتی تەهماسـب قوولی خان زۆر ئازایانە بەرگریان لێیکردو پاشان شاسەفی دوانزەهەزار سەربازی تفەنگ بەدەستی بۆ یارمەتیدانی نارده لای و هەروەها بەسەرکردایەتی رۆستەم خانی عەسـکەر

وسوپایەکی نزیکی ئەوێی نارد بۆ بەرگریلێکردنی بـەڵام لەگـەڵ هێـزە عوسمانییـەکانی دەووری شارەکە تووشی شەڕ و کوشتاربوون.

وادیـاربوو هێـزە وڵاتپارێزەکـە سـەرەڕای یارمەتیـدانییان کەچـی لـەوە پـتر توانـای بەرگریکردنیان نەبوو، بۆیە لە٨ئاب و دوای دوانزە رۆژ لەبـەرگری و گـەمارۆدان خۆیـان بەدەستەوەداو سوپای عوسمانییش چووە ناو شارەکە و دەستی بەسەرداگرت.

سوڵتان مـورادی چـوارەم سـوپای سـەفەویی بەدرێـژایی رووبـاری رەس دەرکـرد بـەڵام نەیتوانی بیگاتێ و شەڕی لەگەڵدا بکات، کەچی دەستی بەسەر خووی و تەورێزداگرت و ئەمەش بەشەشەمین دەسبەسەرداگرتنی ئەم شارە لەلایەن عوسمانییەکانەوە دادەنرێـت و ئامانجیشی ئەوەبوو کەبەرەو ئەسفەهان پێشڕەوی بکات، بـەڵام سـوڵتان لەبـەر ئـەوەی نەخۆش کەوت گەڕایەوە دیاربەکر و لەوێشەوە بۆ ئەستانبووڵ، و هەڵمەتەکـەش مـاوەی نۆ مانگی خایاند.

شایانی باسە لەدوای کشانەوەی عوسمانییەکان سەفەوییەکان لەدوای ئەوەی ماوەی شـەش مانگ و نۆ رۆژ گەمارۆیاندا توانیان شاری ئەیرەوان داگیربکەنەوەو لەکاتی گەمارۆکەشدا مورتەزاپاشای وەزیریش کوژرا و لەدوای ئەویش تەورێز و بەشێکی گەورەی ئازەربێجانیان خستەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، ئینجا شاسەفی بەرەو خواروو هەنگاوی هەڵهێنا و لـەنزیک مەهران لە٢ئـەیلوول١٦٣٦ز رووبـەرووی ئەحمـەد پاشـای حـاکمی وڵاتـی شـام بـووەوە، لەبەرانبەریشدا ئەو تیپە سـەربازانەی کەلە قارس کۆببوونەوە و لەژێر فەرماندەیی سـەدری ئەعزەم محەمەدپاشا بوو نەیانتوانی یارمەتیان بدەن و بەمەش سوڵتان تووڕە بـوو و محەمـەد پاشای دەرکرد.

هێرشی دووەمی عوسمانییەکان بۆ سەر بەغدا: لەوکاتـەی کـە سـوڵتان مـورادی چـوارەم توانی دەسەڵاتی خۆی بەسـەر وڵاتـدا بسـەپێنێت و هـەموو کاروبارەکـانیش بخاتـە ژێـر فەرمانی خۆیەوە و هێزەکانی زیاتر گەشەیان سەند، شاسـەفی بەپێچەوانەی ئـەو خـەریکی لەناوبردنی سەرکردە سەربازییەکانی خۆیبوو و لەلایەکی دیکەوە باری ناوخۆی وڵاتەکـەی رووی لەخراپی و نالەباری کرد و لەدواییشدا بەرە و لاوازی و پاشەکشە رۆیشـت، ئەمـەش بووە هۆکارێکی سەرەکی کە سوڵتانی عوسمانیی قۆزتیانەوە و هەوڵیاندا ئەو ئامانجەی کە

ماوەی پانزەساڵ بوو چاوەڕێیان دەکرد بەدەستی بهێنن ئـەویش ئـازادکردنی بەغـدادبوو و لەهەمان کاتیشدا رێگا بازرگانییەکان بخەنە ژێر دەسـەڵاتی خۆیانـەوە چـونکە دەوڵـەتی عوسمانیی کورتیی زۆری هەبوو لەبواری داراییدا.

لەسـاڵی ١٦٣٨ز سوڵتان موورادی چوارەم سوپایەکی گەورەی ئامادەکرد بۆ ئـەوەی بەغـدا بگێڕنەوە ژێر رکێفی خۆیان و شێخولئیسلام یەحیا ئەفەندیشی لەگەڵ خۆیدا برد و سەرەتا لەئەسـتەمبووڵەوە رێگـای حەلـەب و دیاربـەکر و موسـڵی بـەرەو بەغـدا گرتەبـەر و لــە ١٥تشــرینی دووەم گەیشــتەجێ و گەمارۆیــدا، ئــەوەبوو هێــزی پارێزگــاریی کەبەسەرکردایەتی بەکتاش خانی تورکمان بوو و ژمارەی سەربازەکانی نزیکەی چل هـەزار کەس بوو توانیان زۆر بوێرانە رووبەروویان بوەستنەوە. لەلای خۆشیەوە شاسەفی لەقەسـری شیرینەوە خۆی و سوپاکەی رۆژ بەرۆژ چاودێری گەمارۆکەی دەکرد و بـەبێ ئـەوەی بـوێرێ رووبەرووی هێزی عوسمانیی ببێتەوە، بەڵام هیواشی دەخواست کەوا هێـزە وڵاتپارێزەکـە و سـەنگەرە بەهێزەکانی بەغدا لەبەردەم پەلاماری عوسمانییەکاندا خۆڕگری بکەن و بەمـەش بێئومێـدی بـاڵ بەسـەر سـەربازەکانی عوسمانییـدا دەکێشـێ و پاشـان گەمارۆکـە هەڵدەوەشێننەوە و دەگەڕێنەوە. سوڵتان مکوڕبوو لەسەر چوونە ناو بەغدا، ئەوەبوو لەگەڵ هێزە وڵاتپارێزە زۆر و زەبەلاحەکەیدا بەیەکیانداداو لەئەنجامدا دەسـتیان بەسـەر چـەندین تاوەری شارەکەدا گرت و توانیان بەئاسانی بەسەریدا زاڵـبن و لـەو ماوەیەشـدا ئازووقـەی شارەکە کۆتایی پێهات و هێزەکەش بەناچاری لە٢٤کانوونی یەکەم و لەدوای سی و نۆ رۆژ خۆیان بەدەسـتەوەداو لەهـەردوولاش کـوژراوێکی زۆر هـەبوو و بریتیـبوو لەپانزەهـەزار سەربازی عوسمانییەکان و دە هەزاری سـەفەوییەکان و جگـە لەبریـندارەکانیش، لـەدوای دەسبەسەرداگرتنی بەغدا سوڵتان دوو مەرجی خستە سەرخەڵکەکە:

- بەپەلە بەغدا لەئێرانییەکان چۆڵبکرێ.

- گەمارۆدراوەکان ئازادبن لەوەی دەچنە پاڵ عوسمانییەکان یـاخود سـەفەوییەکان. بـۆ ئەم مەبەستەش ئـەوەی دەیـەوێ پەیوەنـدی بەسـوپای سـەفەوییەوە بکـات بـا لـەدەرگا رەشەکەوە بچـێتە دەرەوە ئەوەشـی دەیـەوێ پەیوەنـدی بـە عوسمانییەکانـەوە بکـات بـا لـەدەرگای ئـەبی حەنیفـەی نوعمانیـەوە بێتـە دەرەوە، وادیـاربوو ئـەم شـێوازە بـەدڵی

توندرەوەکانی هەردوولا نەبوو بۆیە لەناو بەغدا کوشتارێکی زۆر گەورە بەرپابوو و لەئەنجامدا ژمارەیەکی زۆری ئێرانییەکان کوژران.

سوڵتان موڕادی چوارەم کەدوای ئەو شەڕە بە فاتح بەغداد ناوبانگی دەرکرد ماوەی بیست و یەك ڕۆژ لەشارەکەدا مایەوە و لەو ماوەیەشدا توانی کاروباری وڵات ڕێکبخاتەوەو حوسێن پاشای کردە والی و نزیکەی دوانزە هەزار سەربازی خستە ژێر فەرمانی کە هەشت هەزاریان لەئینکیشارییەکان بوون و، ئینجا شورەکەی چاککردەوەو قەڵاکەشی ناوەدانکردەوە و لەدواییشدا گۆڕی ئەبی حەنیفەی نوعمانی دارشتەوە و، کاتێکیش هەستی بەدڵنیایی کردو زانی کەوا هێرشی سەفەوییەکان بوونی نییە بەغدای بەجێهێشت و بەرەو ئەستانبووڵ کەوتەرێ، ئینجا سەدری ئەعزەم مستەفاپاشا تیایدا مایەوە و دەستی کرد بەدانوستانی ئاشتەوایی کەهەر لەسەرەتاوە هەستی پێدەکرا.

گرێدانی پەیماننامەی زەهاب: دەوڵەتی سەفەویی لەدوای ڕووخانی بەغدا پاشەکشە و دواکەوتنی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی چونکە شاسەفەوی سیاسەتی پاکتاوی ناوەندەکانی هێزی لەوڵاتدا پەیڕەو دەکرد و ئەم بێهێزییەشی بووە هۆی ئەوەی بە ئاشتی قایل ببێ، لەلای خۆشیانەوە گێڕانەوەی بەغدا کارێکی ستراتیژیی بوو و ئەم هەنگاوەش وەرچەرخانێکی سیاسی گرنگ بوو بۆیان و ئەوانیش لەروانگەی بەهێزیی و نەمانی مەترسی داخستنی دەروازەکانی سەر کەنداوی عەرەبی بەرووی عوسمانیەکان بێبەریی کردنیان لەناوچە ستراتیژیەکانی عیراق بەئاشتەواییەکە قایلبوون.

لەماوەی مانەوەی سەدری ئەعزەم مستەفاپاشا لەعیراق نێردراوی شاسەفی کەمحەمەد قوولی خانبوو پێشنیاری ئاشتبوونەوەی بۆ کرد، سەدری ئەعزەمی مەرجی ئەوەی دانا بۆ چوونە ناو ئاشتبوونەوەکە، سەرەتا دەبێ هێزی سەفەوییەکان لەدەرنەو دەرتەنگ بکشێنەوە کە ئەو دوو شارە ناوەندێکی گرنگی کۆبوونەوەی هێزەکانی سەفەویی بوو بۆ هێرش کردنە سەر بەغدا. ئینجا نێردراوەکە گەڕایەوە بۆ ئەسفەهان و مەرجەکانی سەدری ئەعزەمی بە شاسەفەویی ڕاگەیاند و ئەویش پێیان ڕازی بوو و فەرمانیدا هێزەکانیان لەهەردوو ناوچەکەدا بکشێنەوە. کاتێکیش پاشا هەواڵی کشانەوەی هێزەکانی سەفەویی پێگەیشت کە هاوکاتبوو لەگەڵ هاتنی وەفدی شا ساروخان کەبەمەبەستی ڕێکەوتنی

ئاشتی هاتبوونە لای، هـەردوولا لەیاداشـتنامەکانیاندا تـاوتوێی ئاشـتیی لەناوچـەکانی زەهاب و قەسرشیرین لەسەر سنووری عیراق و ئێران تۆمارکردو لەکۆتاییدا بڕیاردرا:

- فەرمانڕەوایەتی بەغـدا و جەسـسـان و بـەدرەو مەنـدەلی و دەرنـە و ئـەو شـوێنانەی کەوتبوونە خۆراوای قەڵای زنجیری سـەر ڕێگای شارەزوور و قـەڵای قزلجـە و دەووروبـەری و سـەرجەم قەڵاکانی ئاخەجە و قارس و وان و شارەزوور و بەسرە بدرێتە دەوڵەتی عوسمانیی و هەروەها فەرمانداریێتی هەردوو هۆزی کورد زیائەدین و هـارونیش بخرێتـە پـاڵ دەوڵـەتی عوسمانییەوە.

- ئـەو قەڵایانـەی کەوتبوونـە خـۆرەڵاتی مەنـدەلی و دەرتـەنگ و پـیرە و زەردوکـە و زومروداوا و دارستانەکانی خۆرەڵاتی قەڵای زنجیر و مـەهران و هـەردوو قـەڵای کـاکوڕ و ماکوری سەرووی چیای وان و قەڵای مەگازیرد لەناوچەی قـارس هـەمووی بکەوێتـە ژێـر دەسەڵاتی سەفەوییەکان.

بەواتایەکی دیکە بەغداو بەسرە و موسڵ و کوردسـتانی خـۆراوا و شـارەزوور ببێتـە هـی دەوڵەتی عوسمانیی و ئازەربێجانی خۆرەڵات و ڕەواندز و ئـەرمینیای خـۆرەڵاتی و وڵاتـی کەرەج بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی سەفەوییەکان.

لەدوای ئەوەی بەڵگەنامەی ئاشتەواییەکە لەسـەر ئەم شـێوازە دەسنیشـان کـرا لەهـەردوو پایتەخت و لەهەمان ساڵدا ئیمزای لەسەر کرا و لەمێژووی واژووکردنەکەشدا کاری پێکرا.

خوێندنەوەیـەکی پەیماننامـەی زەهـاب: ئـەم پەیماننامەیـە بەبناغـەی دەسنیشـانکردنی سنورەکانی دەوڵەتی سەفەویی و عوسمانیی دادەنرێت، چونکە ئەوە یەکەمین ڕێکـەوتنبوو کەوا بەئاشـکرایی سنوری نێوانیـانی نیشـان دەدا لەسـەر بنچـینەی سروشـتی وڵاتـەکان نەوەکو دابەشبوونییان لەسەر بنچینەی دانیشتوانەکانیان، زانراویشە کەوا هەندێك هـۆزی کوردەکانی سـەر سنوور بوون بەدوو لەتەوە، وەك ئەوەی هـۆزی جـاف بەسـەری هـات کـە بەشێکیان پێك هاتبوو لەخانەوادەی زیائەدین و هارۆنی کەوتنە ژێر دەسـەڵاتی سـەفەویی و کەچی خانەوادەی پیرەو زوودی کەوتنە ژێـر فەرمانڕەوایـەتی عوسمانییـەکان و ئەمـەش بووە هۆی ئەوەی عەشیرەتی جاف هەمیشـە بێـزاری و ناسـەقامگیریی لـەنێوان ئـەو دوو

دەوڵەتەدا سازبکەن و لەدوای ئەوەش کاتێك عوسمانییەکان دەستبەرداری ناوچەی میهرەبان بوون بۆ سەفەوییەکان، بەبێ هیچ سوودێك لێی هاتنە دەرەوە هەرچەندە هەر لەبنیچینەوە ئەو ناوچەیە سەر بەویلایەتی شارەزووربوو. کەچی سەرەڕای ئەمانەش ئەم پەیماننامەیە سنوورەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتەکەی نیشانکرد، بەلاّم نەیتوانی بەتەواوی هێڵ لەسەر سنورەکاندا بکێشێ و بەمەش زۆرێك لەناوچەکان بەپانایی خۆیانەوە کەوتنە نێوانیان و سەر بەهیچ لایەکیان نەبوون و لەدواییشدا ئەم پرسە بوو بەهۆکار سازبوونی کێشە و دووبەرەکی نێوانیان. پەیوەندییەکانی نێوان سەفەویی و عوسمانییەکان لەسەردەمی شاسەفی لەبارێکی ئیجابی دابوو و هێمنی و ئارامی باڵی بەسەر بەرەکانی شەڕدا کێشا و ئەم پەیوەندییە سیاسیەش بوو بەهۆی ئەوەی کۆمەڵێك کێشەی لابەلا و لەناکاوی نوێ لەناوببات و لەراستیشدا سەفەوییەکان دەسپێشخەریان دەکرد لەبەکارهێنانی شێوازی سیاسەتی دۆستانە و کاتێکیش سولّتان موورادی چوارەم کۆچی دوایی کرد، شاسەفەی نێردراوێکی نارده لای سولّتان ئیبراهیمی یەکەم (١٦٤٠-١٦٤٨ز) کەبوو بەجێنشینی سولّتان و سەرەتا پرسە و سەرەخۆشی بەهۆی مردنی سولّتانەوە ئاراستە کرد و ئینجا پیرۆزبایی لێکرد بەبۆنەی بوونی بەسولّتانی دەوڵەتی عوسمانیی. ئامانجی شا لەم هەنگاوەی ئەوەبوو کەوا بتوانێ لەگەڵ سولّتانی نوێدا پەیوەندییەکی دۆستانە گرێبدات. بۆ دەربڕینی نیازپاکی لەبەرانبەر شاسەفەوی، سولّتان سەرجەم دیلەکانی دەوڵەتی سەفەویی کەلەسەردەمی سولّتان موورادی چوارەم گیرابوون ئازادکردن و هەمووی دایەوە دەست سەفیری ئێرانی لەئەستانبووڵ.

## پەیوەندییەکانی لەگەڵ کەرەج:

ولاّتی کەرەج دابەش بوو لەنێوان دەوڵەتی سەفەویی و عوسمانیی و پەیوەندی سەفەوییەکانیش لەگەڵ ئەو بەشەی کەسەر بەدەوڵەتی عوسمانیی بوو زۆر رێك و شیاوبوو، جگە لەمەش زۆرێك لەو کەرەجیانە لەسەردەمی شا عەباسی یەکەم پلەو پایەی گرنگیان لەدەوڵەتی سەفەوییدا هەبوو لەناویشیاندا جۆرجی سەکزای هەبوو کەبەموراوی ناوبانگی دەرکردبوو. کاتێکیش شا عەباسی یەکەم کۆچی دواییکرد و لەبەر کەمی تەمەنی شاسەفەوی و سازبوونی پشێویی ناوخۆیی دەوڵەتی سەفەویی بەهۆی خراپی میراتگریی و

جێنشینی و سیاسەتی لەناوبردنی شازادە گەورەکانەوە جۆرجی شۆڕشی لەدژی دەوڵەتی سەفەویی ڕاگەیاند و داوای سەربەخۆیی وڵاتەکەشی دەکرد و لەبەرانبەردا شا سەرکردەکانی ڕاسپارد کەوا شۆڕشەکە دابمرکێنێتەوە. لەدوای چەندین پێکدادانی نێوانیان توانیان شۆڕشەکەیان لەناوبەرن و موراوی بەرەو دەوڵەتی عوسمانیی ڕایکرد و لەوێش دەستی کرد بەهاندانی سوڵتان مورادی چوارەم بۆ داگیرکردنی ئێران.

لەساڵی ١٦٣١-١٦٣٢ز تەهمورس خانی حاکمی کەرەج لەدژی شاسەفی شۆڕشی بەرپاکرد و توانی سەربەخۆیی بۆ وڵاتەکەی دابین بکات، ئەویش خەسرۆ میرزای کەرەجی کەبە ڕۆستەم خان ناوبانگی دەرکردبوو ڕاسپارد تاکو شۆڕشەکە لەناوببات و لەرووبەروو بوونەوەیەکدا توانی شکستی پێبهێنێت، لەبەرانبەر ئەم سەرکەوتنەشدا شاسەفی خەڵاتی کرد و کردی بەحاکمی وڵاتی کەرەج.

## کۆچی دوایی شاسەفی:

شاسەفی لەقاشان و لەکاتی گەڕانەوەی لەمەشهەد و لە١٢ئایار١٦٤٢ز بەهۆی زیادەڕۆیی لەمەی خواردنەوە کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەشی بردرایە قوم و لەوێ ناشتیان.



## شاعەباسی دووەم

## ١٦٤٢-١٦٦٦زایینی

### فەرمانڕەوایەتی شاعەباسی دووەم:

لەدوای مردنی شاسەفی، شازادەکان عەباسی کوڕی کەوا تەمەنی تەنها نۆساڵبوو بەرزیان کردەوە و خستیانە سەر تەختی پاشایەتی و لەدوایی ئەوەش بوو بە کێبڕکێ لەسەر وەسیی سەر شاعەباسی دووەم و لەپاشاندا لەسەر سەدری ئەعزەم میرزا تەقی گیرسایەوە و بوو بەبریکاری شا و، بەر لەوەش تەقی وەزیر بوو لەمازەندەران، بەلاّم زۆری نەبرد کەوا شازادەکانی دەوڵەت کەوتنە پیلان لەدژی و ئینجا شاعەباسیان هاندا و دواتر کوشتی.

شاعەباسی دووەم بەچاکترین پاشاکانی سەفەویی دادەنرێت، چونکە تا ئاستێکی زۆر باش دادپەروەربوو و لەگەڵ دەسوپەیوەندەکانی، چاکەخوازبوو و بەزەیی پێیاندا دەهاتەوە و باجەکانی سەریشی سووك کردن و گەیاندییە سەد هەزار، وەك ئەوە مەبەستی بێ تۆڵەی زۆردارییەکانی باوکی بۆ خەڵکەکە بکاتەوە، هەروەها مەی خواردنەوەشی قەدەغەکرد و زۆریش توندبوو لەسەری، بەلاّم ئەم بڕیارە ماوەیەکی زۆری نەخایاند و پاشان هەر خۆشی نوقمی ناو مەیخواردنەوەبوو، هەمیشە لەگەڵ سەرخۆش و مەیخۆرە هەمیشەییەکان دادەنیشت و زۆر کەم بەوشیاری دەبینرا و ئەمەش دووری خستەوە لەکاروبارە گشتییەکانی دەوڵەت.

### ململانێی مەگۆل لەسەر قەندەهار:

لەوانەیە بەناوبانگترین رووداوی سەردەمی شاعەباسی دووەم ململانێی سەفەویی و مەگۆلەکان بووبێ لەسەر دەسبەرسەرداگرتنی ویلایەتی قەندەهار کە هەردوو دەوڵەتەکەی لێکجیا دەکردەوە و هەر لەسەردەمی شا عەباسی یەکەمەوە لەژێر دەسەلاّتی سەفەوییەکاندابوو. لەساڵی یەکەمی دەسەلاّتداریێتی شاعەباس دووەم پاشای هیندستان

(١٦٢٨-١٦٥٨ز) جیهانشـــا بڕیاریـــدا بیخاتـــە پـــاڵ موڵکـــەکانی خۆیـــەوە، ئـــەویش لەچوارچێوەی ئەو سیاسەتە فراوانکارییە کەلەناوەراستی ئاسیا پەیڕەوی دەکرد و لەهەوڵی گێڕانەوەی وڵاتی پشت رووبـاریش بـوو، بـۆ ئـەم مەبەسـتە سـەرەڕای گرنگیـی لـەرووی بازرگانییەوە کەچی سەرقاڵی و ماندوویی سەفەوییەکانیشی لـەتێوەگلانی شـەڕی بـەرەی خۆراوای دژ بەعوسمانییەکان قۆزتەوە. لەسەرەتادا ویستی بەشێوەیەکی ئاشتیانە لـەژێر دەستی عەلی مەردانی بریکاری شا بیگێڕێتەوە بۆ خۆی، بەڵام والی ئەمەی رەتکـردەوە و هەوڵەکەی سەری نەگرت، ئینجا لەساڵی ١٦٣٨ز بـەهێزی سـەربازی هێرشـی بـۆ کـرد و لەبەرانبەریشدا عەلی مەردان داوای یارمەتی لە شاسەفی کرد بۆ ئەوەی لەرووی پەلاماری مەگۆلەکاندا بوەستێتەوە بەڵام وادیار بوو شا گومانی لەدڵسۆزییەکەی هـەبوو بۆیـە ئـەم داواکارییەی بەدرۆخستەوە و گومانی وابوو کەدەیەوێ دەسەڵاتەکەی خۆی بـەهێزبکات و لەگەڵ مەغۆلەکاندا گفتوگۆ بکات و پاشان سـەربەخۆیی خۆی رابگەیەنێ، بۆیە هێزێکـی گەورەی ناردە سەر شارەکە تاکو دەسگیریی بکەن. کاتێك عەلی مـەردان بـۆی دەرکـەوت کە چ پیلانێکی بۆ دارێژراوە یەکسەر نامەیەکی نهێنی بۆ سـەعیدی حـاکمی کـابۆل نـارد کەمـەگۆلی بـوو و داوای یارمـەتی لێکـرد بـۆ ئـەوەی هێـزی سـەفەوییەکان لەشـارەکە وەدەرنێنێ ئەویش شارەکەیان بخاتە ژێردەست، ئەویش داواکەی جێبەجێکرد و پاشان هێزی سەفەوییەکانیان لەشارەکە دەرکرد.

لەدوای ئەوە جیهانشا بەرەو ناوەراستی ئاسـیا کەوتەرێ لەوێش بەلەخی داگیرکرد و پاشـان هێرشی کردە سـەر بوخـارا و، ئەمانەشـی بەیارمـەتی نـەدر محەمـەدخان لـەدژی کـوڕو شازادەکانی ئەنجامدا، ئۆزبەکەکانیش هەمیشە لەدژی نەدر پیلانیان دادەڕشـت و ئـەویش ناچاربوو کەوا شارەکە بەجێبهێڵێت و بەرەو خۆراسان هەڵات و خۆی گەیانـدە شاعەباسـی دووەم و داوای لێکرد یارمەتی بدات بۆ دەرکردنی مەگۆلەکان و شاعەباسیش رەزامەندیی بۆ نواند. لەساڵی ١٦٤٥ز هێرشیان برد بۆ بەلەخ و کاتێکیش شاجیهان بەم هەواڵەی زانی لە٢٣ئەیلوویل١٦٤٧ز لەگەڵ نەدر محەمەد کەوتە دانوستان و لەسەر ئەوە رێکـەوتن کـەوا مەگۆلەکانی بوخارا و قەلای بەلخ بدەنەوە دەست محەمەد نەدرخان و بگەڕێنەوە بـۆ وڵاتـی خۆیان و ئینجا سەفەوییەکانی گەڕاندەوە.

شاعەباسی دووەم لەبەرانبەر لەدەسدانی قەنـدەهار بێـدەنگ نـەبوو، بۆیـە دەسـتی کـرد بەکۆکردنەوەی هێز و پەلاماردانی و بۆ ئەم مەبەسـتەش مورتەزا قوولی خان قاجاری کردە سەرکردەی سوپای ئێران و فەرمانی پێکرد کەوا قەندەهار بگێڕێتەوە، ئـەوبوو لەزسـتانی ١٦٤٩ز بەرەو قەندەهار وەڕێکەوت و زانیاری ئەوەشی هەوبوو کەلەبەر بەفری هیندوکوش یارمەتی و ئازووقە لەهیندستانەوە ناگاتە شارەکە. لەراستیشدا ئـەم بۆچـوونە لـەجێگای خۆیدابوو چونکە دەولەتخان کە بریکاری شاجیهان بوو لەناوچەکەدا کاتێك هەسـتی کرد شا دوودڵە لەناردنی یارمەتی لەم وەرزی زستانەدا، نەیتوانی ماوەیەکی زۆر خۆڕاگری بکـات و ناچار بوو لەدوای پەنجاو حەوت ڕۆژ خۆی و شارەکەی بەدەستەوەدا و ئاگای لەوەش نەبوو کەئەوانیش بـەهۆی سـەختی وەرزی زسـتانەکە و کـەمی ئازووقـە ئـەوێ بەجێـدەهێڵن و دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان.

کاتێکیش شاجیهان هەواڵی رووخانی قەندەهاری بیست سوپایەکی لە شەست هەزار سوار و دە هەزار پیادە سـازکرد و بەسـەرکردایەتی ئـۆرنجزەیتی کـوڕی نـارد بـۆ گێڕانـەوەی و بۆخۆشی بۆ نزیك بوونەوە لەرووداوەکان چووە کابۆل بـۆ ئـەوەی لـەکاتی پێویسـت خـۆی تێهەڵقورتێنێ. شازادەی مەگۆلی هێرشی کردە سەر شارەکەو ماوەی سێ مانگ و بیسـت ڕۆژ گەمارۆیداو لەگەڵ هێزە وڵاتپارێزکانیشدا چەندین شەڕی لابەلای کرد بـەلام لەلایـەن باوکییەوە فەرمانێکی بـۆ هـات کـە لەبـەر نزیـك بوونـەوەی وەرزی زسـتان گەمارۆکـە هەڵوەشێنێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ ئۆکرا.

گەمارۆ سەنەکەوتووانەکەی مەگۆلی بۆ سەر قەندەهار ناوبانگی کەوەك گەورەترین هێـزی هێندستانبوو لەکەدارکرد، بۆیە شاجیهان لەوە ترسـا ئـەم کـارە کاریگـەری بکاتـە سـەر حاکمەکانی دەوروبەر و لەدژی بوەستن و راپەڕین بکەن و، بەپەلە سوپایەکی دیکەی ناردە سەر قەندەهار کەلەپەنجا هەزار سوار و دە هەزار پیادە پێکهاتبوو و چەندین تۆپ و فیـل و وشترییشیان لەگەڵ خۆیاندا بردو سەرەڕای ئەوانە چەند سەرکردەیەکی گەورەی سـەربازیی وەك سـەعدوڵلاخان و ڕۆسـتەم خـانیش یـاوەری ئۆرنجزەیـب بـوون و لـە٢ئایـار١٦٥٢ز شارەکەیان گەمارۆداو ماوەی دوو مانگ و هەشت ڕۆژ بـەردەوام بـوون بـەلام نـەیانتوانی بچنە ناو شارەکە.

بەدڵنیاییـــەوە تۆپـــەکانی ســـەفەویی لـــەهی مەگۆلییـــەکان بـــەهێزتربوون، بۆیـــە هێـــزی مەگۆلەکان زیانی زۆری پێگەیشـت و بەمـەش سـوڵتانی مـەگۆلی بڕیاریـدا گەمارۆکـە بشکێنن و بگەڕێنەوە بەڵام وادیار بـوو هەڵوێسـتەکە هێنـدە نالـەبار نـەبوو وەك ئـەوەی سولتان پێیگەیشتبوو و داوای لەباوکیشی کردبوو کەوا یارمەتی دیکەی بۆ نێریّ ئـەویش داواکەی جێبەجێنەکرد و لەبەرانبـەردا ئۆرنجزیـب سەرکێشـیکرد و فەرمانەکـەی بـاوکی بەجێنەگەیاند، بـەڵام لەکۆتاییـدا هاتـە ژێـر بـاری فەرمانەکـەی بـاوکی و گەمارۆکـەی هەڵوەشاندەوە و گەڕایەوە بۆ ئۆکرا. لەراستیشدا ئەمە هەڵەیەکی سەربازیی بـوو چـونکە ئۆرەنجزیب لـەو دوو هێـرش و گەمارۆیـەدا زانیـاری پێویسـتی شـەڕی هـەبوو و ئاگـای لەلاوازی هێزەکانی ناو شار و باری ناوخۆشییان هەبوو و دەیزانی کەوا ناتوانن ماوەیـەکی درێژتر خۆراگری بکەن.

لەسالّی ١٦٥٣ز سـولّتانی مەگۆلی پەلاماری سێیەمی بۆ سەر قەنـدەهار دەسـپێکردەوە، ئەمجارەیان زیادەڕەوییەکی زۆری کرد لەسازکردنی سوپا، چـونکە نزیکـەی حـەفتا هـەزار سوار و پێنج هەزار پیادەو دە هەزار سەربازی دیکەی تۆپهاوێژەکان و شـەش هەزار کەسـی دیکە بۆ سەنگەر هەڵکەندن و هەروەها پێـنج سـەد سـەربازی دیکـە بـۆ بەردشـکاندن و زۆرێك لەچـەك و تەقەمەنیشـیی لەگەڵـدا نـارد و هـەمووی خسـتە ژێـر سـەرکردایەتی داراشکۆی کوڕی.

ئەم هێزە زەبەلاحە شارەکەی گەمارۆدا و هیوای داراشکۆ وابوو کەوا لەماوەیەکی کورتـدا بیرووخێنیّ، بەڵام لەگەڵ هێزەکـانی دەوورویـەری بـووە شـەڕیان و سـەرەڕای گـەورەیی و زەبەلاحیی سـوپاکە نەیانتوانیی بچنە ناو شـارەکە، لەکۆتاییـدا بۆیـان روونبـووەوە کـەوا هێزی سەفەوییەکان لـەهی ئـەوان گـەورەترە، بۆیـە لـەدوای حـەوت مـانگ گـەمارۆدان داراشکۆ لەکویّ هاتبوو بۆی گەڕایەوە. شایانی باسە کەوا ئەم سێ هێرشە سـەرنەکەوتووە بۆ هۆی ئەوەی سولّتان بەیەکجاری دەسبەردا لەداگیرکردنی قەندەهار.

## شاعەباسی دووەم و عوسمانییەکان:

لەسەردەمی شا عەباسی دووەم پەیوەندی سەفەویی و عوسمانییەکان ئاسایی بوو، کاتێکش ئەم شایە بوو بەفەرمانڕەوای دەوڵەتی عوسمانی سوڵتان ئیبراهیمی یەکەم نێردراوێکی ناردە لای بۆ ئەوەی پیرۆزبایی لێبکات و پێی رابگەیەنێ کەبەردەوامن لەسەر پەیوەندییە دۆستانەکەی نێوانیان. لەهەمان کاتدا نامە گۆڕینەوە لەنێوانیاندا بەردەوامبوو و لەهەموو بۆنەیەکدا یەکتریان بەسەر دەکردەوە و، تائەوکاتەی سوڵتان ئیبراهیمی یەکەم کۆچی دوایی کرد لەساڵی ١٦٤٨ز ئەم پەیوەندییانە بەم شێوەیە بەردەوامبوون. لەدوای ئەویش محەمەدی چوارەم بوو بەسوڵتانی عوسمانی و بەلاّم بەهۆی کێشەی نێوان سەڵتەنەتی عوسمانی و حاکمی بەسرە حوسێنی کوڕی ئەفراسیاب خەریک بوو نێوانیان بشڵەژێ. لەراستیشدا ماوەی نیو سەدەبوو بەسرە ببووە خاڵی سەرەکی ناکۆکی سەفەویی و عوسمانییەکان، هەر لەساڵی ١٥٧٨ز تا ١٦٣٨ز چونکە شوێنە جوگرافیەکەی زۆر ستراتیژیی بوو و دەروازەی دەوڵەتی عوسمانیش بوو بۆ کەنداوی عەرەبی، جگە لەوەش سەرچاوەیەکی سەرەکی بوو بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی ئابووری هەردوو دەوڵەت. لەپەیماننامەی زەهابیشدا هەردوولا رێکەوتن لەسەر ئەوەی ناوچە کێشەلەسەرەکان لەنێوان خۆیاندا دابەش بکەن. بەمەش ئاشتەوایی ماوەی هەشتا ساڵ لەنێوانیاندا سەقامگیربوو و هیچ شتێك نەدبووە هۆی شڵەژانی تەنها چەند رووداوێکی بچووکی دەوروبەری ناوچەکە نەبێت بەتایبەتیش بەسرە، بەلاّم ئەمانەش نەدەبوونە هۆی ئەوەی کەوا شەڕ لەنێوانیاندا بەرپابێتەوە و وەکو پەیاننامەکانی پێشوو هەڵبوەشێتەوە.

لەدوای مردنی شا عەباسی یەکەم و لەسەردەمی عەلی کوڕی ئەفراسیاب چووە قۆناغێکی نوێوە، چونکە شاسەفیی ئارەزووی ئەوەی دەکرد کەوا خۆی لەئیمارەتی ئەفراسیاب نزیك بخاتەوە و لەکێشەی نێوان ئەو و عوسمانییەکان بێلایەن بێ و لەوکاتەشدا سوڵتانی عوسمانیی موڕادی چوارەم لەهەوڵی گێڕانەوەی بەغدا بوو بۆ ژێر دەسەلاّتی خۆی. ئەم لێك نزیك بوونەوەیەی شاسەفی و ئەفراسیاب عوسمانییەکانی نیگەران کرد بۆیە لەدوای تەواوکردنی گێڕانەوەی بەغدا بۆ دەوڵەتی عوسمانیی بەرەو بەسرە پێشڕەوییان کرد

بۆ ئەوەی خانەوادەی ئەفراسیابی لەناوبەرن، بەڵام ئەو بارانە زۆرەی ئەو ساڵە باری هێرشەکەی راگرت و ناچاربوون کەوا پرۆژەکە بۆ کاتێکی دیکە دوابخەن.

لەدوای مردنی عەلی کوڕی ئەفراسیاب، سەرەڕای بەرهەڵسکاری دوو مامەکەی ئەحمەد بەگ و فەتحی بەگ حوسێنی کوڕی جێی گرتەوە، ئەم بەرهەڵسکاییەش هەلی بۆ عوسمانییەکان رەخساند کە هێرشبەرن و خانەوادەکە لەناوبەرن. لەناو ئەو هەموو کێشەو ململانێیەدا هەردوو مامەکەی داوایان لەدەوڵەتی عوسمانیی کرد کەوا یارمەتییان بدات، ئینجا سوڵتان موورادی چوارەم فەرمانی بەمورتەزاپاشا کرد هێرش بکاتە سەر بەسرە، بەڵام حوسێن لەساڵی ١٦٥٣ز شۆڕشی لەدژی دەوڵەتی عوسمانیی راگەیاند. هێزەکانی عوسمانیی شارەکەیان گەمارۆداو پاشان چوونە ناویەوە و حوسێنیش بەرەو ئەسفەهان رایکرد و داوای دالدەدانی لەشا عەباسی دووەم کرد. لەساڵی ١٦٥٧ز سوڵتان نێردراوێکی نارده لای شا عەباس و داوای لێکرد کەوا یارمەتی حوسێن نەدات بۆ گەڕانەوەی بۆ بەسرە، شاعەباسیش رێزی لەنێردراوەکەی سوڵتان گرت و داواکارییەکەشی بۆ جێبەجێکرد.

ئەحمەد بەگ بوو بەفەرمانڕەوای ئیمارەتی ئەفراسیابی لەبەسرە، بەڵام سەردەمی ئەو سەرتاپای زۆرداریی و بەفیڕۆدانی سامانی وڵاتبوو و، دانیشوانەکەی لەدژی هەڵگەڕانەوەو ئەمەش هەلی بۆ حوسێن رەخساند کەوا جارێکیدیکە بگەڕێتەوە بۆ فەرمانڕەوایەتی.

حوسێن هەوڵیدا تۆڵە لەمحەمەدپاشای والی ئەحسا بکاتەوە چونکە رۆڵێکی کاریگەری هەبوو لەهاندانی مامەکانی و بۆ ئەوەش هەڵوێستی خۆی بەهێزبکات بەراکی خستە پاڵخۆی کەسەرۆکی خێڵی بەنی خالیدبوو، ئەمیش توانی محەمەدپاشا لەئەحسا وەدەرنێ و دەسەڵاتیش بگرێتەدەست.

حکومەتی عوسمانیی لەبەرانبەر لەدەسدانی ئەحسا بێدەنگ نەبوو بەڵکو لەساڵی ١٦٦٥ز هێرشێکی بۆ برد و گەمارۆی خستەسەری، بەڵام لەبەر ئەوەی حوسێن هانای بۆ زۆرێك لەهۆزە عەرەبەکان برد نەیتوانی دەستی بەسەردابگرێت؛ لەسەرووی هەمووشیانەوە شازادە ئەهوازی موشەعشەعی.

## پەیوەندی لەگەڵ کەرەج:

بەهۆی رکابەری و ململانێی شازادەکان، ولاتـی کـەرەج لەسـەردەمی شاعەباسـی دووەم شڵەژانی تێکەوت، ئینجا خەسـرۆمیرزای حـاکم یـاخود رۆسـتەم خـان لـەبارەگای خـۆی لەتفلیسـەوە بـەرەنگارییان دەبوونـەوە، بـەڵام بـەهۆی بێتوانـایی حکومـەتی ناوەنـدی ئەسفەهان شازادە رکابەرەکان توانییان دەوورەبەرەکە دابڕان، لەوێوە رۆستەم خان لەسـاڵی ١٦٤٨ز لەلایەن تەهمورس خان دووچاری پیلانێك هات و ویستی جێگای ئەو بگرێتـەوە، کەچی دووچاری شکستێکی گەورەهات و بەرەو رووسـیا هەڵات و، دەستی کرد بەهانـدانی رووسەکان بۆ داگیرکردنی کەرەج. ئەوەبوو کۆمەڵێك لەقـەوقازەکانی سەربەرووسـیا تـاکو رووباری تورك هاتن و چەند قەڵایێکیان لەداغستان دروستکرد لـەو شـوێنەی دەیڕوانییـە سەر رێگای خۆرەلاتی ولاتی کەرەج و کردیان بەبنکەیەك بۆ هەڵمەت بردنە نـاو قـوولایی ولاتەکە، بەلام هێزەکانی کەرەج و داغستان و شـەروانی سـەر بەسـەفەویی توانیـان ئـەم قەڵایانە بڕووخێنن و هێزە قەوزاقەکانیش ناچار بکەن بگەڕێنەوە رووسیا.

تەهمورس تا ساڵی ١٦٥٩ز لەرووسیا مایەوە و پاشان گەڕایەوە بۆ ئێـران و شـا عەباسـی دووەم لێخۆشبوونی بۆ راگەیاند.

## کۆچی دوایی شاعەباسی دووەم:

کاتێـك شاعەباسـی دووەم تەمـەنی گەیشـتە سـی و چـوار سـاڵی نـەخۆش کـەوت و پزیشکەکانیش ئامۆژگارییان کرد کەلەمازەندەران بمێنێتەوە چونکە ئاوهـەوای ئـەوێ زۆر پاك و تەندروستە. بۆیە چووە ئەشرەف و ماوەی یەك ساڵ لەوێ مایەوە و لەدواییدا چـووە مەشهەد و لەشەوی ٢٣ئەیلوول١٦٦٦ز لەخەسرۆئاباد لەنزیك دامغان کۆچی دواییکـرد و تەرمەکەی گوازرایەوە بۆ تەنیش بـاوکی، شـایانی باسـە مـاوەی بیسـت و پێـنج سـاڵ و پانزەرۆژ فەرمانڕەوایەتی کرد.



## شاسەفی دووەم (سولەیمان)
## ١٦٦٦-١٦٩٤زایینی

مردنی شاعەباسی دووەم کێشـەی جێنشـینیی لـەدوای خـۆی بەجێهێشت چـونکە ئـەو لەژیانی خۆیدا کەسی بەجێنشین دانەنابوو، زانراویشـە کە دوو کوڕی هەبوو یـەکیان سـەفی میرزا تەمەنی بیست سـاڵ دەبـوو و لـەدایکێکی شەرکەسیی بـوو، ئەویدیکـەش نـاوی حەمزەمیرزا بوو تەمەنی تەنها هەشت ساڵبوو لەدایکێکی کەردجی بوو و ناوی نـەکیهات خانم وبوو.

شاعەباسی دوودم زۆر حەزی لەکوڕە گەورەکەی نـەدەکرد، لەوانـەبوو بـەهۆی هەڵویسـتی دایکی کوڕە بچووکەکەی بووبێ کەوا سەرەڕای کەم تەمەنی دەیویست فەرمانڕەوایەتیەکە بۆ ئەو بێ، بۆیە لەیەکێك لەکۆشکەکانی پاشایەتی بەندیکرد و هەموو تەمەنی گـەنجێتی لەناو ئافرەت و خەساوەکاندا بردەسەر.

بەگوێرەی دابونەریتەکانی سەفەویی دەبوایە بـرا گەورەکـە ببێتـە جێنیشـێن (هەرچـەندە ئەگـەر باوکیشـی داینەنابایـە)، بـەڵام شـازادەو پیـاوەمـاقوولانی سـەفەوی لـەدامغان و بەسـەرکردایەتی سـەدری ئـەعزەم میرزامحەمـەدی مەهـدی کۆبوونـەوە و بەپێچـەوانەی دابونەریتە پەیڕەوکراوەکان بڕیارياندا میرزاهەمزە ببێتـە جێنشـینی بـاوکی، گومانیشـی تێدا نییە دایکی ڕۆڵێکی یەکجار گەورەی هەبوو. بۆ ئـەوەش رای بەرهەڵسـتکارانی ئـەم فەرمانەش بۆ لای خۆیان رابکشێن ئەوەیان بلاوکردەوە کەوا باوکی کـاتی خـۆی هـەردوو چـاوی میرزاسـەفی دەرهێنـاوە و بۆیـە بـەهۆی کـوێریی و نابینایيەکەیـەوە نـاتوانێ کاروبارەکانی دەوڵەت بەڕێوەببات.

لەلایەکی دیکە ئاغا موبارەکی سەرۆکی بەرەی خەساوەکان ئەوەی راگەیاند کـەوا مـیرزا تەندروستییەکی باشی هەیە و هیچ ناکامییەکیشـی نییـە و هەڕەشـەی لەمیرزاهـەمزەش کرد کەئەگەر لایـەنگرانی واز لەپاڵپشـتیی نـەهێنن ئـەوا دەیکـوژێ، بۆیـە شـازادەکان ناچاربوون شاسەفی دووەم بکەنە شای سەفەوییەکان لەدواییشدا ناویان نـا شـا سـولەیمان و

بەم ناوەش لەمێژوودا ناوبانگی دەرکرد و لـە١تشـرینی دووەم١٦٦٦ز تـاجی شـاهانەیان خستەسەر.

شا سولەیمان لەئاستی لێپرساوێتیدا نەبوو، چونکە لەبەر ئەوەی هەموو ژیانی لەناو ئافرەت و خەساواندا بەسەربردبوو هیچ زانیاریەکی دەربارەی بەڕێوەبردنی دەوڵەت و کێشەی نێوان شازادەکان و رکابەرییان لەسەر دەسەلآتدارێتی نەبوو. سێ وەزیریشی بۆ داندرا، یەکەم میرزامحەمەد مەهدی کەپێشتریش وەزیری باوکی بوو و لەساڵی ١٦٦٨ز شا بەدەستی شێخ عەلی خانی زەنگەنە بەبیانویی ئەوەی چاودێریی باوکی نەکردووە و گرنگی پێنەداوە کوشتی لەناویبرد و بکوژەکەشی کردە سەدری ئەعزەم و تا مردنیشی لەساڵی ١٦٩٠ز هەر لەو پلەیە مایەوە لەدوای ئەویش میرزا محەمەد تاهیری قەزوینیی بوو بە(وەزیری دەستەراست) سەدری ئەعزەم.

شا سولەیمان لەبری دیوان کۆشکی ئافرەتان و کەنیزە و خەساوەکانی هەڵبژارد بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دەوڵەت و هەر لەوێشەوە فەرمانەکانی دەوڵەت دەردەچوون و بەرەو جێبەجێکردن دەچوون.

بەلآم لەبواری سیاسەتی دەرەوە، دەوڵەتی سەفەویی لەسەردەمی شاسولەیمان کەبیست و هەشت ساڵی خایاند دووچاری هیچ هێرش و پەلامارێکی دەرەکی گرنگ نەبۆوە. چونکە ئۆزبەکەکان سەرگەرمی کێشە ناوخۆییەکانی خۆیان بوون و عوسمانییەکانیش بەشەڕی نەمسا و پۆڵەندا و ڤینیسیاوە سەرقاڵبوون. کەچی باکووری ئێران کەپێکهاتبوو لەئستەرئاباد و دامغان و سەمنان دووچاری هێرش و پەلاماری تورکمانەکان بوون (١٦٧٥ز و ١٦٧٦ز بەسەرکردایەتی ئادینە سوڵتان ئەم ناوچانەیان وێران کرد و خەڵکەکەشیان کوشت، بەلآم کەلب عەلی خانی شاملوو وەدەریان و ئەدینە سوڵتانیشی کوشت.

شاسولەیمان لە٢٩تەمووز١٦٩٤ز لەئەسفەهان و بەهۆی زیادەرۆیی لەمەیخواردنەوە و داوێنپیسیی کۆچی دوایی کرد، یاخود بەهۆی ئەو نەخۆشییە درێژخایەنەی کەوا خستییە ناو جێگاو ماوەی دوو ساڵان نەیتوانی هەڵستێتەوە و ئەوکاتە تەمەنی چل و شەش ساڵ بوو کەکۆچی دوایی کرد.

## شاحوسێن
## ١٦٩٤-١٧٢٢زایینی

### تاج لەسەرنانی شاحوسێن:

شاسولەیمان لەدوای خۆی حەوت کوڕی بەجێهێشت و گەورەکەیان کەناوی سولتان حوسێن بوو تەمەنی بیست و شەش ساڵبوو، بەڵام بەر لەوەی شا بمرێ بڕیاریدابوو کەوا کوڕی دووەمی کەناوی میرزاعەباس بوو جێی بگرێتەوە، چونکە ناوبانگی بەزیرەکی و لێزانیی دەرکردبوو، بەپێچەوانەی براگەورەکەی کەبە نەفسنزمی و دوورە پەرێزی و دوور کەوتنەوە لەکۆمەڵگا دەرکردبوو.

فەرمانی کۆتایی بۆ دەسنیشانکردنی جێنشین بەدەست شازادەکان و سەرکردەکان بوو، ئەوەبوو سولتان حوسێنیان هەڵگرت و خستیانە سەر تەختی پاشایەتی بۆ ئەوە وڵات بەڕێوە ببات و لە٦ئاب١٦٩٤ز بەم بۆنەیەوە ئاهەنگ سازکرا.

شاحوسێن سەرەتای ژیانی سیاسی خۆی بەیارمەتی و هاوکاری شێخولئیسلام محەمەد بەگێری مەجلیسی کەموفتییەکی بەناوبانگبوو دەسپێکرد، ئەو پیاوە حوسێنی بەرەو کاری چاکە و دوورکەوتنەوە لەهەوەسبازیی ڕێنامیی دەکرد و پشتی لەسۆفییەکانی پایتەختیش کرد چونکە لەگەڵیاندا نەدەگونجا، جگە لەمەش دەوڵەتی سەفەویی لەدوایین ساڵەکانیدا بوو بەهۆی ئەو بێهێزییەی کە وڵاتەکەی داگرتەوە و زۆر بەخێراییش داگیرکاریی ئەفغانییەکان بۆ ئێران دەسپێکرد و دەوڵەتی سەفەویی بەرەو کۆتاییەکی مەسۆگەری برد.

### داگیرکردنی ئێران لەلایەن ئەفغانیەکانەوە:

لەسەرەتاکانی سەدەی هەژدەهەمدا ئێران دووچاری پەلامارێکی وێرانکارانەی ئەفغانییەکان هات. لەراستیشدا ئەم دەوڵەتە لەسەردەمی شاحوسێن و بەهۆی ئەو هەموو کێشە ناوخۆییەی لەسەر دەسەلات بەرپابوون لەناوچوو، لەلایەکی دیکەشەوە ئەم پاشایە

سیاسەتی مەزهەبی توندڕەویی پێڕەودەکرد کەبووە هۆی دوژمنایـەتی ئەفغانـە سـوننەکان کەبەناوی شای ئێرانەوە پارێزگارییان لەقەندەهار دەکرد.

لەراستیشدا هەرێمی ئەفغانستان لەسەدەکانی شانزەهەم و حەڤدەهەمدا یەکگرتوو نەبوو، بەڵکو ببوو بەسێ بەشەوە:
بەشی خۆراوا، سەر بەدەوڵەتی مەگۆل بوو لەهیندستان.
بەشی خۆرەلات، پێکهاتبوو لەهەرات و سیستان و سەر بەدەوڵەتی سەفەویی بوو.

هەرێمی قەندەهار، ئەو شارەبوو کە مەگۆل و سەفەوییەکان شەڕیان لەسەر دەکرد، جارێك سەربەدەوڵەتی سەفەویی دەبوو و جارێکی دیکە دەکەوتـە ژێـر دەسـەلاتی مەگۆلـەکانی هیندستان، ئینجا لەساڵی ١٦٢٢ز شا عەباسی یەکەم بەیەکجاریی خستیە سەر دەوڵـەتی سەفەویی و والییە سەفەوییەکانیش تاکو سـەرەتایی سـەدەی هەژدەهـەمی زایـینی یـەك لەدوای یەك حوکمڕانیان دەکرد.

لەسـەردەمی سـەفەوییەکاندا چـەندین هـۆزی جۆراوجـۆر لەئەفغنسـتاندا دەژیـان و لەهەمووشیان گرنگتر دوو هۆزی سەرەکی بوون:

- گیلزایی لەکەرتی خواروو، پێکهاتبوو لەچەندین خێڵی جۆراوجۆر.
- دەورانیی لەکەرتی خۆرەلات، لەدوایدا ناویان لێنا عەبدەلی.

لەناوچەکانی باکوری هیندستاندا چەند هۆزێکی ئۆزبەك و لەناوەڕاسـتی ولاتیشـدا چـەند هۆزێکی مەگۆلیی دەژیان وەك هۆزی تایمانی و هازا و شەهر ئەیاك. لەناوچەی هەراتیشدا هۆزێکی ئاری بەناوی تاجیکی لێبـوو، هـەروەها تێکەڵەیـەك لـەهۆزەکانی ئـاری کـۆنی خۆرەلاتی کابۆل لەواخان و رۆشان و کافرستان دەژیان و جگە لەوانەش پاشماوەی هۆزەکانی خێڵەکی ئارییەکان لەچیاکانی ئەفغانستان و دۆڵەکاندا بلاوببوونەوە.

زۆربەی ئەو هۆزانە بەتایبەتیش ئـاری و ئۆزبەکـەکان لەمـەزەبی سـوننی بـوون و خێڵـی هازەریش لەشـیعەمەزەبەکانبوون. گیلزایـی پەیوەندییـەکی دۆسـتانەی لەگـەڵ مەگۆلـە هیندیەکان کەهەردوولا سوننەبوون سـازکرد، هـەروەها سـەفەوییەکان و لایەنـە شـیعیە کەمایەتیەکانی ئەفغانستانیش پەیوەندییان دۆستانەبوو.

هێـزە خێڵەکییـەکانی ئەفغانسـتانیش کەوتنـە نێـوان دوو هێـزی گـەورەوە: یـەکیان سەفەوییەکان بوون لەلای خۆرەڵات و ئەویدیکەش لەلای خۆراوا دەوڵەتی مـەغۆلی بـوو، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوانە نەیاندەتوانی رووبەرویی هـیچ کـام لـەم هێزانـە ببنـەوە، بۆیـە جارێك دەکەوتنە ژێر دەسـەڵاتی سەفەوییەکان و جارێکیدیکەش مەگۆل.

لەسەردەمی شاحوسێن هەرێمی قەندەهار سەر بەدەوڵەتی سەفەویی بوو، بەڵام لـەناوخۆدا هەنـدێك رووداو هاتنـە پێشـەوە کەبەهۆیـەوە دانیشـتوانەکەی داوای سـەربەخۆییان لەسـەفەوییەکان کرد. لەساڵی ١٧٠٣ز قەندەهار بوو بـەخاوەنی هێزێکـی دیـار و بەرچـاو لەناوچەکەدا لەسەر شانۆی سیاسی نێودەوڵەتیشی جێی خۆی کـردەوە، ئەمـەش لـەدوای ئەوە هات کەکورکینخانی کەرەجی بووە فەرمانڕەوا و بەزێبیی ناوبانگی دەرکردبوو، ئەم والییە سەفەوییە کەئایینە راستەقینەکەی مەسیحی بوو و سەر بە دەوڵەتی شـیعەمەزەب بوو هەمیشە تەنگی بەئەفغانە گیلزائییـە سـوننەکان هەڵچـنیبوو، ئەمـەش بـووە هـۆی توڕەبوونی میرئەویس کەبەناوبانگترین سـەرکردەی هۆزەکـانی گیلزایـی بـوو و بەرپرسـی کارگێڕیی قەندەهاربوو هەوڵیدەدا کەوا لەنێو پیاوەکانی هۆزەکـەی لـەدژی کۆرکینـەکان هانبدات و دووبەرەکیان بخاتە نێوانەوە، لەبەرانبەردا بەدیل گرتیان و بەندیان کرد و بـەرەو ئەسفەهان بردیان.

وادیار بوو میرئەویس زۆر زیرەك بوو، چونکە تـوانی خـۆی لەشاحوسـێن نزیکبکاتـەوە و ئەویش لێیخۆش بـوو و پاشـان کـردی بەیـەکێك لـەپیاوە نزیکـەکانی خـۆی، هـەروەها روخسـەتی لێخواست بۆ سەفەری حەج و ئەویش رێی پێدا، بەڵام بـوونی خـۆی لەمەککـە بەهەلزانی توانی موفتیی و شەریعەتوانەکان بهێنێتە سەر ئـەو رایـەی کـەوا فتوابـدەن و رایبگەیەنن لەرووی ئایینیەوە پێویستە شەڕ لەگـەڵ سـەفەوییەکان بکـرێ چـونکە ئـەوان بوونەتە مەترسی لەسەر ناوچەکە.

کاتێك میرئەویس گەڕایەوە بۆ ئەسفەهان چـاوی بەقەیسـەری رووسـی پەترۆسـی گـەورە (١٦٨٩-١٧٢٥ز) کەوت کەناوی ئەرشیل بوو و برای کۆرکین بـوو و خـەریکی دانوسـتان بوو لەگەڵ شاحوسێن دەربارەی ئەوەی کەوا شا هەندێك لەو زەوییـانە بەرووسـیا ببەخشـێ کەبەهۆیەوە دەیگەیاندە هیندستان و کەنداوی عـەرەبی. ئاشـکرایە سیاسـەتی پەترۆسی

گەورە ئەوبوو خۆی لەئەستانبوڵ و مەمالیك نزیك بكاتەوەو ئێرانیش داگیربكات و رێگای كۆنی بازرگانی نێوان شام و هیندستانیش دووبارە والآبكاتەوە، بەلآم ئەرشیل جگە لەرەزامەندی شا لەسەر هەندێك ئاسانكاری بۆ بازرگانەكانیان هیچی دیكەی لێوەدەستنەكەوت.

میرئەویس ئەم بابەتەی قۆزتەوەو شاحوسێنی لەكۆركین هاندەدا و پێی رادەگەیاند كەوا كۆركین مەیلی بەلای رووسەكاندایە، بۆیە لەساڵی ۱۷۰۸ز شاحوسێن فەرمانێكی دەركرد كەمیرئەویش ببێتە سەركردەی پۆلیسەكانی قەندەهار و چاودێری كاروبارەكانی كۆركینیش بكات، بەلآم ئەم كارەش نەبووە هۆی ئەوی بارەكە لەدژی ویستەكانی ئەو هەڵنەگەڕێتەوە، بۆیە بڕیاریدا سزای میرئەویس بدات، و ئەویش دەسپێشخەریكرد بۆ ئاشتبوونەوە و پێشنیاری كرد كەوا كێشەكانیان بەگفتوگۆ چارەسەربكەن، ئینجا كۆركین داوای لێكرد یەكێك لەكچەكانی میرئەویس مارەبكات، بەلآم میر كچێكی دیكەی بۆ نارد و وای تێگەیاند كەئەمە كچی خۆیەتی و بۆ ماوەیەكی كاتی دڵی راگرت، لەكۆتاییدا كۆركین مكوڕبوو لەسەر تەوەی كێشەكانی نێوانیان بەشمشێر یەكلایی بكاتەوە، ئینجا میرئەویس دەبوایە لەناوی ببات، بۆ ئەم مەبەستەش توانی هەندێك فێڵ بەكاربهێنێت و بەغەدر لەو داوەتەدا كەبۆی سازكردبوو لەساڵی ۱۷۰۹ز بیكوژێ و لەدوای ئەویش بۆخۆی ببێتە فەرمانڕەوای قەندەهار.

سەركەوتنی هۆزی گیلزایی ئەفغانی هاندەرێك بوو بۆ هۆزی عەبدالییە ئەفغانییەكان تا لەهەرات و لەدژی دەسەلآتی سەفەویی شۆڕش بەرپابكەن، ئەوەبوو سەركردەی هۆز كەناوی ئەسەدوڵلا خان بوو لەگەڵ تۆزبەكەكان هاریكارییان كرد و توانیان سوپایەك پێكبهێنن كەلەحەڤدە هەزار سەرباز پێكهاتبوو و لەوانە پێنج هەزاریان لەجەنگاوەرانی تۆزبەكی بوون، لەنزیك هەرات رووبەرووی هێزەكانی سەفەویی بوونەوە توانیان بەسەریاندا زاڵبن و سەربەخۆییان بۆ شارەكە دابین كرد. بەمەش ئیمارەتێك لەسنوری خۆرەلآتی ئێران لەهەرات دروستبوو، بەلآم لەگەڵ قەندەهاردا هیچ پەیوەندییەكی دۆستانەیان نەبوو. ئەم سەركەوتنەش رێگای بۆ عەبدالییەكان خۆشكرد كەبەرەو خۆراسان هێرش ببەن.

بەهۆی ئەم ناکۆکیەی نێوان گیلزائییەکان و عەبدالییەکان و بۆ ئەوەی لایەنی سەفەویی قایل بکەن میرمەحمودی کوڕی میرئەویش خۆی ئامادەکرد بۆ شەڕی ئەوانەو توانی بەسەریاندا زاڵبێ و لەکۆتاییشدا ئەسەدوڵلاخانی سەرکردەیانی کوشت، بەبۆنەی ئەم سەرکەوتنەشی شاحوسێن شمشێرێکی نەخشێنراوی بۆ نارد بەدیاری کەنیشانەی بەخشینی پلەی خان بوو و ناوی لێنرا حوسێن قوولی خان واتە بەندەی شا، لەدوای ئەوە میرئەویس دەستی کرد بەدوورخستنەوەی سەربازە سەفەوییەکان لەویلاتەکەی و تا لەکۆتاییدا بەیەکجارەکی سەربەخۆیی خۆی بەدەسهێنا.

ئەم هەڵسوکەوتانە دەوڵەتی سەفەویی نیگەران و بێزارکرد بەلاّم شاحوسێن ئەو کاتە ئامادەیی ئەوەی تێدا نەبوو کەوا سوپایەك بنێرێ بۆ رووبەروو بوونەوەی سوپای میرئەویس، چونکە لەزۆربەی زۆری ویلایەتەکانی ئێراندا شۆڕش بەرپابوو، بۆ ئەم مەبەستە هەوڵیدا بەگفتوگۆ کێشەکە چارەسەر بکات، و نێردراوێکی نارده لای بۆ ئەوەی پێی رابگەیەنێ کەوا حوکمڕانی قەندەهاری دەدا بەدەست خۆی بەمەرجێك لەچوارچێوەی دەوڵەتی سەفەوییدا بمێنێتەوە، بەلاّم میرئەویی بیرۆکەی دانوستانی ڕەتکردەوە و بەنێردراوە ئێرانیەکەشدا هەڕەشەیەکی توندی بۆ شا نارد: (دڵنیابە کاتی تۆڵەسەندنەوە نزیکبۆتەوە، هەروەها ئەفغانییە قارەمانەکانیش خوداوەند هەڵیبژاردوون بۆ ئەوەی سزای فارسە خوێنڕێژەکان بدەن).

ئاشکرایە شازادە ئەفغانییەکە هەستی بەوە کردبوو کەوا سەفەوییەکان ناتوانن مەترسی بۆ دروسبکەن و هەموو ئامادەکارییەکی سەربازیشی ئامادەکردبوو، بۆیە هەڕەشە و تۆمەتی تاوانکاری بۆ شا ناردو بەڵێنی پێدا کەوا دەوڵەتی سەفەویی دەبێ لەناوبەرێ.

بەلاّم سەرەڕای ئەم هەڕەشەیە شاحوسێن تەنها چەند هەنگاوێکی لاوەکی هەڵهێنا بۆ رووبەروو بوونەوەی میرئەویی و گێڕانەوە قەندەهار، لەدواییدا خەسرۆخانی حاکمی ولاّتی کەرەجی راسپارد تا بۆ لێدان و لەناوبردنی و گێڕانەوەی قەندەهار بۆ ژێر دەسەلاّتی سەفەویی.

خەسرۆخان هەمیشە ئامادەبوو بۆ لێدانی میرئەویس و تۆڵەکردنەوەی خوێنی کوڕکینی برای و بۆیە سوپایەکی لەبیست و پێنج هەزار سەربازی شەڕکەر پێکهێناو لەسالّی

١٧١٢ز بەرەو قەنـدەهار وەرێکـەوت و یەکسـەر گـەمارۆی خسـتە سـەر و لەسـەرەتادا ئەوەشی رەتکردەوە کـەوا دانیشـتوانەکەی خۆیـان بەدەسـتەوە بـدەن بەمـەرجی ئـەوەی دڵنیاییان پێببەخشێ، ئینجـا ئـەوان کەوتنـەخۆ و دەسـتیان کـرد بەبـەرگری کردنێکـی ئازایانە و توانیان رووبـەرووی هێزەکـانی سـەفەویی ببنـەوە و پاشـان راوەدوویـان نـان و لەئەنجامدا بیست و چوار هەزار کەسیان لێکوشتن کەلەناویاندا خەسرۆخانیشی تێدابوو.

جـارێکی دیکـە شاحوسـێن هـەوڵی گێرانـەوەی قەندەهاریـدا، سـوپایەکی دیکـەی بەسەرکردایەتی رۆستەمخان نارد و ئەویش لەسـەر دەسـتی هێـزە ئەفغانییـەکان لەناوچـوو. ئەم سەرکەوتنانە هێندەی دیکە هەلیان بۆ میرئەویس سازکرد کەوا دەسـەڵاتدارێتییەکەی خۆی بەسەر قەندەهارەوە جێگیربکات، ئـەم بارەشـی تـاکو کۆچـی دواییـەکـەی لەسـاڵی ١٧١٥ز بەردەوامبوو.

میرئەویس هێزێکی گەورەو بەتواناى لەقەندەهار پێکهێنا و ئەمەش بـووە هانـدانێك بـۆ جێنشینەکانی کەوا بیر لەناوچەکانی دەرەوەی سنووری خۆیان بکەنەوە.

عەبدوڵڵای برا میرئەویس بەبێ ئەوەی بـوار بداتـە جێنشـینە شـەرعیەکەی کەمـەحمودی کوڕی ئەویس بوو تەمەنیشـی تـەنها دوانـزە سـاڵبوو و خـۆی دەسـەڵاتی گرتـە دەسـت. وادیاربوو کەئەفغنییەکانی بەری سەرکەوتنەکانیان دەخـۆن و دەسـدەکەن بـەفراوانکردنی سنوورەکەیان و بەتایبەتیش بەرەو خۆراسان و لەوێشەوە بۆ ئێران پێشڕەویی بکـەن، بـەڵام عەبدوڵڵا زیاتر ئارەزووی گفتوگۆ و دانسوتانی هەبوو لەگەڵ سـەفەوییەکان و مەبەسـتی دابین کردنی ئاشتی بوو لەناوچەکەدا. ئەو دەرکی بەوەکردبوو کەوا قەنـدەهار تاماوەیـەك دەتوانێ لەبەردەمی سەفەوییەکاندا خۆراگریی بکـات، لەلایـەکی دیکەشـەوە دەیویسـت بۆخۆی بەتەنها دەسەڵاتدارێتییەکە بەرێوەببات، ئەم کارەش پێویسـتی بـەوە هەیـە کـەوا لەگـەڵ سـەفەوییەکاندا ئاشـتیی بکـات، بۆیـە نێردراوێکـی نـاردە لای شـا کـە چـەند پێشنیارێکیان پێبوو:

- لابردنی ئەو سەرانەی قەندەهار دەیداتە ئێران.
- نەناردنی هێزی ئێرانی بۆ قەندەهار.
- فەرمانرەوایەتی لەوڵاتەکەیەدا بەشێوازێکی ویراسی بێ.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەوا قەندەهار بگەڕێتەوە نێو چوارچێوەی دەوڵەتی سەفەویی.

ئەم پێشنیارەش بەهیچ شێوەیەك ئاشتی بەدواوە نەبوو چونکە ئەفغانییەکان دەسپێشخەریان لەشەڕەکاندا کردبوو ئەمەش بوو بەهۆی بێزاریی پیاوەکانی دەووروبەری، زۆریشی نەبرد کەوا مەحمودی کوڕی ئەویس مامی خۆی کوشت و دەستی بەسەر تەختی پاشایەتیدا گرت و بوو بەحاکمی قەندەهار و لەدواییشدا دەرگای رکابەری بەرووی سەفەوییەکاندا کردەوە.

لەساڵی ١٧١٧ز شاحوسێن سوپایەکی دیکەی بۆ لەناوبردنی میرمەحمود سازکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی هەواڵی دەسبەسەرداگرتنی دورگەی بەحرەین لەلایەن عوسمانییەکانەوە گەیشتە ئەسفەهان شا ناچار بوو رووی بەرەو دوورگە وەرگێڕێ بۆ ئەوەی ئازادی بکاتەوە، لەبەر ئەوەی سەفەوییەکانی خاوەنی کەشتی گەلی دەریایی نەبوون دەبوایە سەرکردەی سوپا هانا بباتە بەر کەشتییەکانی پورتوگالی تا سەربازەکانی بگەیەنێتە دوورگەکە، بەڵام بەبیانووی ئەوەی کەوا دەوڵەتی سەفەویی باجە کەڵەکەبووەکانی خۆیان نەداوەتە پورتوگال داواکارییەکەیان بۆ بەجێنەهێنان، ئەم هەڵوێستەش بوو بەهۆی ئەوەی سوپاکە بگەڕێتەوە بنکەی خۆی و بەهیچ شێوەیەکیش نەیتوانی مەبەستەکەی خۆی بهێنێتەدی.

سەرەڕای ئەو زیانە گەورەیەی بەر دەوڵەتی سەفەویی کەوت و بەردەوامیش مەترسیەکانی سەری گەورەتر دەبوون، شاحوسێن و پیاوەکانی دەسەوەستان بوون و نەیانتوانی ئەو لێپرسراوێتییەی لەسەر شانیانە بەچاکی بەڕێوەی ببەن، لەهەمان کاتیشدا نەتەوەی ئێرانیش وردەوردە بەهۆی داتەپینی بواری ئابووری و سیاسی دەوڵەت وریان دەرووخاو، جگە لەکارەساتە سروشتیەکانی وەك بومەلەرزە، ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی میرمەحمود هێرش بکاتە سەر هەرێمەکانی خۆرەلاتی ئێران و پاشان لەشکرکێشی بکات بۆ قووڵایی ئێران بەمەبەستی فراوانکردنی سنوری دەسەلاتەکەی و لەناوبردنی دەوڵەتی سەفەویی.
سەرەتای هەڵمەتەکانی بە هێرشکردنە سەر عەبدالییەکان لەساڵی ١٧١٩ز دەسپێکرد و دەستیان بەسەر سیستانی پایتەختیاندا گرت و پاشان لەساڵی ١٧٢٠ز بەرەو کرمان رۆیشتن و ئەوێشیان داگیرکرد و لەدوای ئەویش هێرشی کردە سەر یەزد کەلەسەر رێگای ئەسفەهان بوو و دەستیان بەسەر ئەویشدا گرت بەمەش رێگای خۆراوای پایتەختی

لەبەردەمدا کرایەوە، بەڵام بۆ ڕێکخستنەوەی ڕیزەکانی سوپاکەی لەکرمان ماوەیەك وەستا و ئینجا بەر لەوەی دەست بکەنەوە بەهێرشبردن دەستیان بەسەر هەندێك بەربەستی سەرەکیدا گرت و لەدوای ئەوەی هێزەکانی فەرەح ئاباد هەڵاتن توانیان زۆر ئاسانی داگیریبکەن، لەولاشەوە جولفا کەکەوتبووە لای خۆراوای ڕووباری زایەنەدەروود خۆی بەدەستەوەدا ئەویش لەدوای ئەوەهات دانیشتوانەکەی کەلەئەرمەن و فارس و عەرەب پێکهاتبوون دابەشبوون و لێکدوور کەوتنەوە.

لەبەرانبەر ئەم بەرەوپێشچونەی ئەفغانییەکان، شاحوسێن نێردراوێکی ناردە لای میرمەحمود و پێشنیاری گوژمەیەکی زۆر گەورەی پارەی بۆ کرد لەبەرانبەر گەڕانەوەی بۆ ئەفغانستان، سەرکردەی ئەفغانیەکان وای هەستکرد کەسەفەوییەکان بۆ ئەم پارە زۆرە دەدانە ئەوان چونکە هەڵوێستیان زۆر شلۆق و لاوازە و ناتوانن ڕووبەڕوویان ببنەوە، بۆیە ئەم ڕایەی هانیدا کەبەرەو ئەسفەهان هەڵمەت ببات.

شاحوسێن هێزەکانی خۆی بۆ گولەنئاباد نارد کەتاکە ڕێگا بوو بۆ پەڕینەوە بۆ ناو ئەسفەهان و هەر لەوێشدا شەڕی یەکلاکەرەوەی نێوانیان دەستی پێکرد و بەئاشکراش سەرکەوتنی ئەفغانەکان بەدیدەکرا، بەڵام سەربازە سەفەوییەکانی بەردو ناوەوەی ئەسفەهان هەڵاتن و لەوێ خۆیان قاییم کرد.

هێزی ئەفغانی بەرەو شار چوون و گەمارۆیاندا و لەدوای چەندین مانگ و بەهۆی بڵاوبونەوەی برسێتی و نەمانی ئازووقە شاحوسێن هیچی بەدەستەوە نەما تەنها ئەوە نەبێ خۆی بەدەستەوە بدات و دەسبەرداری فەرمانڕەوایەتیەکەی بێ بەمەرجی ئەوەی کچی میرمەحمود مارەبکات.

لەدوای ڕووخان و بەهۆی ئەو خۆبەدەستەوەدان و دەسهەڵگرتنەی شاحوسێن لەتەختی پاشایەتی سەفەویی و دانانی بەمیرمەحمود، دەتوانین بڵێین کەدەوڵەتی عوسمانی بەتەواوی لەو کاتەدا کۆتایی پێهاتبوو، کەچی ئەم بارە نالەبار و ڕووکەشییەی دەوڵەتی سەفەویی ماوەی چواردەساڵی دیکەی خایاند تا بەیەکجاری و لەناوبچێ، هەروەك چۆن لەساڵی ١٧٣٦ز لەسەر دەستی نادرشای ئەفشاری تەواوبوو.

## شا تەهماسبی دووەم

## ١٧٢٢-١٧٣٢زایینی

### شاتەهماسبی دووەم و دەسەڵاتدارێتی:

لەوکاتەی میرمەحمود هێرشی کردە سەر ئەفغانستان جێنشینی شەرعی دەوڵەتی سەفەویی میرزاتەهماسبی کوڕی شاحوسێن نێردراوی ناردە قاشان و قەزوین بۆ ئەوەی سوپایەك پێکبهێنن و بچن یارمەتی باوکی بدەن لەئەسفەهان و لەچنگ پەلامار و داگیرکاریی ئەفغانەکان رزگاری بکەن، بەلاّم لەبەر ئەوەی باوکی بۆ میرمەحمود دەستی لەتەختی پاشایەتی هەلگرتبوو هانی تەهماسبیدا کەوا بۆخۆی لەقەزوین لەسەر خۆی بکاتە شای سەفەوییەکان. هەرکە میرمەحمود ئەم هەواڵەی پێگەیشت یەکسەر سوپایەکی بەسەرکردایەتی ئەمانوڵلاّخان بەرەو قەزوین نارد بۆ ئەوەی دەستی بەسەردابگرێ و تەهماسبیش دەسگیربکات، بەلاّم تەهماسب بەرەو تەورێز رایکرد بەمەبەستی ئەوەی لەخزمەکانییەوە یارمەتی پێبگات.

### سیاسەتی میرمەحمود:

میرمەحمود لەسیاسەدا زۆر دووربین بوو، لەدوای ئەوەی پایتەختی سەفەوییەکانی داگیرکرد و بوو بەخاوەنی شەرعی فەرمانڕەوایەتی ولاّت و پاڵپشت بەهێزێکی زۆر و زەبەللاح، سیاسەتێکی مامناوەندی گرتەبەر:

- بەردەوامیدان بەکاروبارە گشتییەکانی ژیان، بۆ ئەم مەبەستەش فەرمانبەرە ئێرانییەکانی لەپلەکانی خۆیاندا هێشتەوە، بەلاّم لەگەلّ ئەوانیش چەند فەرمانبەرێکی ئەفغانی دامەزراند تاکو چاودێری کارو کردەوەکانیان بکەن و دلّنیابن لەوەی ئەوان لەدژایەتی حوکمی نوێی دەوڵەتدا ئیش ناکەن.

- بەمەبەستی سەرنجراکێشان و دەستەمۆکردنیان هەوڵیدا بەشێوازێکی جوان و شایەستە هەڵسوکەوت لەگەڵ دانیشتوانی ئەسفەهاندا بکات.

- هاریکاری لەگەڵ ئەورووپییەکان لەرووی دابین کردن و برەودان بەبواری بازرگانی و بواری ئەوەشیان پێبدرێ کەوا کاروبارەکانی خۆیان بەئازادی بەرێوەببەن و ئەو دەسکەوتانەی لەسەردەمی سەفەوییەکاندا پێیان درابوو وەکو خۆیان بمێننەوە.

- خەلاتکردنی ئەو سەرکردانەی کەئەمەکداربوون بەرانبەر بە شاحوسێن و سزادانی ئەوانەی ناپاکییان لەگەڵدا کرد.

ئەمانە رێنماییەکانی میر مەحمود بوون، کەچی دووچاری چەندین ئاستەنگ هات کەبەهۆیانەوە هیواکانی کەوتنە مەترسییەوە، هەندێك لەو ئاستەنگانە:

- ئێرانییەکان گومانیان لەنیازپاکیی ئەوبوو، کەبینیان دەستی بەسەر خۆرەلات و ناوەراستی ئێراندا گرتووە و لەئەسفەهانیش لەسەر تەختی حوکومڕانیش دانیشتووە و داوا لەخەڵك دەکات کەوەك جێنشینێکی شەرعیی هاریکاریی بکەن، ئەمانە هەرگیز لەفێڵ و تەڵەکەبازی ئەو خاڵیی نەبوون.

- بوو بەهۆکاری ئەوەی کە هێزە تەماعکارەکان دەووروخولی وڵاتە بێهێز و ماندووەکە بگرن و دەست لەکاروبارە ناوخۆییەکانیشی وەربدەن و هەرچەندیشی لەدەستیان بێ ئەوا لەخاکەکەیدابڕن بۆخۆیان، مەبەست لەم هێزانەش دەوڵەتی عوسمانیی لەخۆراوا و روسیا بوو لەخۆرەلات.

- بوونی شاتەهماسبی دووەم لەباکوری ئێران و خەریك بوونی بە پێکەوەنانی سوپایەکی گەورە بۆ بەرگریکردن لەوڵاتەکەی و دەرهێنانی تەختی حوکومڕانی سەفەویی لەژێر دەستی ئەفغانەکان و پێویستیش بوو کەوا بەشمشێر ئەم مافە بگێرێتەوە، بۆیە هێرشێکی سەربازیی کردە سەر و لەدەسبەسەرداگرتنی قەزوین و قوم و قاشان سەرکەوتنی بەدەسهێنا بەبێ ئەوەی بتوانێ شا لەناوبەرێ.

- چـەند ســەرکردەیەکی توونـدڕەوی خێڵـەکانی فـارس و کـورد سـەریان هەڵـدا و لەهـــەوڵی ئـــەوەدابوون ســـەربەخۆیی بـــۆ ناوچـــەکانیان وەدەســـبهێنن و خۆیـــان لەپابەنـدیی ســەردەمە تازەکـە رزگارکـەن و هـەروەها ئـەو پەیوەندییـە نـەخوازراوەی بەسەفەوییەکانیانەوە هەبوو ئەویش نەهێڵێن.

- کـەموکورتی لـەتواناکانی میرمـەحمود بـەخێرایی بـەدیار کـەوتن چـونکە ئـەو هـــەموو هێـــز و توانـــای خـــۆی لـــەداگیرکردن و دەسبەســـەرداگرتنی ولاتەکـــەدا خـــەرجکرد، لەلایـــەکی دیکەشـــەوە ئێرانییـــەکان ئامـــادە نـــەبوون بچـــنە ریـــزی سـوپاکەیەوە، و بێگومـان دروسـکردنی سـوپایەکی تـازە لەئەفغانسـتان و نـاردنی بـۆ ئێران کـارێکی زۆر سـەخت بـوو، بـەلام تـوانی بەلـەخۆگرتنی هـۆزە کـوردە سوننەکان ئـەم کێشـەیە چارەسـەربکات، ئـەوەبوو سـوپایەکی بـەهێزی لێپێکهێنـان نـاردنی بـۆ لـەناوبردنی ئـەو شـارە راپەڕیوانـەی کەلەخونسـان و قاشـان و شـیراز و بەندەرعـەباس و بەهەبان شۆڕشیان دەکرد و، توانیان لەم هەڵمەتەیاندا سەرکەوتن بەدەسبهێنن.

- دەســـەلاتدارێتی میرمـــەحمود دووچـــاری کۆمـــەڵێك شۆڕشـــی نەپســـاوەی شـــارە جیاجیاکـــانی ئێـــران بـــۆوە بەتایبـــەتیش قـــەزوین و، ئاشکراشـــە ئـــەو هێـــزە ئەفغانییانـــەی کەلەشـــارەکە دەرکرابـــوون ئامـــادە نـــەبوون بچـــنە ریـــزی هێـــزە ســـەرەکییەکەوە و ئێرانیـــان بەجێهێشـــت و بـــەرەو قەنـــدەهار رۆیشـــتن، ئـــەم کـــارەش هێندەی دیکە هەڵوێستەی لاوازترکرد.

## سەفەوییەکان لەنێوان عوسمانیی و روسەکاندا:

کێشـە ناوخۆییـەکانی ئێـران سـەرنجی عوسمانییـەکانی راکێشـا و ئەوکاتـەش لـەدوای رێکەوتنامەکـەی ٥حـوزەیران١٧١٨ز کەلەگـەڵ خانـەوادەی هابسـبۆرگی نەمسـایی لـە بـــاروڤیتز ســـازیانکرد ببوونـــەوە خـــاوەن هێزێکـــی بـــاش و گونجـــاو، لەلایـــەکی دیکـەوە ئێـران بـەگوێرەی چـەند بەنـدێکی ئـەم رێکەوتنامەیـە هەنـدێك دەسـکەوتیان پێبڕا کەبریتی بـوو لـەو ئاسـانکارییانەی بـۆ بازرگانـە ئێرانیـەکان دەکـرا لـەرێگاکانی خـــاکی عوسمانییـــەکان کەلـــەوێوە بـــەرەو رووبـــاری دانـــوب دەچـــوون، چـــونکە عوسمانییـــەکان لـــەکاتی شـــەڕی ئەورووپییـــەکان ئـــەو رێگایانـــەی بڕیبـــوو و

نەیاندەهێشـت بازرگـانیی حـەریری تێـدا ئـەنجام بـدرێ و ئـەوانیش لەبەرانبـەردا رێگای گواستنەوەی زیویی عوسمانییەکانیان بۆ ئێران قەدەغەکردبوو.

عوسمانییـەکان دەرکیـان بـەوەکرد کەئـەو ئاشـتەواییەی لەگـەڵ ئەمسـاییەکان هەیانـە رێگایان بـۆ خۆشـدەکات کـەوا جـارێکی دیکـە دەسـەلاتی خۆیـان بەسـەر ناوچـەکانی دەووروبەردا بسـەپێننەوە.

لەبەرانبـەر نیگـەرانی بـەردەوامی سـەفەوییەکان و هـەوڵی سـەڵتەنەتی عوسمـانیی بـۆ دانوسـتان، سـولتان ئەحمـەدی سـێیەم (۱۷۰۳-۱۷۳۰ز) ئەحمـەد ئەفەنـدی بـەنێردراویی خۆیـان نـاردە ئەسـفەهان بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ شاحوسـێندا بـۆ مەبەسـتی گفتووگـۆکردن دەربـارەی بازرگـانی سـەفەوی و ئەمسـاییەکان و پەیوەنـدیی نێوانیـان دانوسـتان بکـەن، هـەروەها لەکۆتاییشـدا راپۆرتێـك دەربـارەی بـاری نـاوخۆیی ئێرانـی بـۆ بهێنێتـەوە. کاتێـك گەڕایـەوە ئەسـتانبوڵ راپـۆرتێکی پێشکەشـی سـولتان کـرد کەتێیـدا باسـی هەڕەشـەکانی ئـەفغانی بـۆ سـەر سـەفەوییەکان کـرد کـە مەترسـیی خستبووە سەر دەسەلاتە لاوازەکەی شاحوسێن.

کاتێـك میرمـەحمود لەسـەر تـەختی فەرمانڕەوایـەتی خـۆی جێگیرکـرد، حەسـەن پاشـای والـی بەغـدا نێردراوێکـی نـاردە ئەسـفەهان و داوای لێکـرد کـەوا واز لەمەرامـە خراپـەکانی خـۆی بهـێنێ بەرانبـەر دەوڵـەتی عوسمـانیی، ئـەویش لایـەنگیریی خـۆی بـۆ راگەیانـد و بـۆ جەختکردنـەوە لەسـەر ئـەم هەڵوێستەشـی محەمەدسـادق خـانی وەك نێـردراوی خـۆی نـاردە بەغـدا و داوای لەحەسـەن پاشـا کـرد کەپاڵپشـتی عوسمانییـەکان بـۆ ئەفغانسـتان دابـین بکـات، تـاکو بتـوانن دەسبەسـەر هـەموو خـاکی سـەفەویدا بگـرن، حەسـەن پاشـا راپـۆرتێکی دوورودرێـژی لەمبارەیەوە ناردە ئەستانبوڵ.

پشتبەسـتن بەراپۆرتەکـەی والـی بەغـدا سـولتان بڕیاریـدا ناوچـەکانی دەووروبـەر داگیربکـەن: ئـەیرەوان و تـەورێز و گەنجـەو تفلـیس بـۆ ئـەوەی بـەرەی خۆرەلاتیـان بەهێزبکـەن، جگـە لەمانـەش فـەرمانیکردە ویلایەتـەکانی ئـەرزەرووم و قـارس و وان و چـلدەر و موسـڵ و شـارەزوور و بەغـدا و بەسـرە و دەسـبکەن بـەداگیرکردنی تـەنها

ئەو زەوییە ئێرانییانەی کەبەدەست سەفەوییەکانەوەن، ئەوەبوو حەسەن پاشا هێرشیکردە سەر کرمانشا و دەستی بەسەرداگرت.

لەلایەکی دیکەشەوە ئەم سیاسەتە فراوانخوازییەی عوسمانییەکان و لاوازی سەفەوییەکان سەرنجی پەترۆسی گەورە قەیسەری رووسی راکێشا و ئەویش چاوی لەوەبوو کەوا دەسبەسەر ویلایەتی کەرەج و ئێرانی قەوقازیدا بگرێت و دەریای قەزوینیش بکاتە دەریای روسی، جگە لەمانەش لەهەوڵی ئەوەدابوو لەرووی ئابوورەیەوە دەسبخاتە سەر بازرگانی حەریر و هەمووی بۆ خۆی قۆرخبکات کە ئەوکاتە بەرێگای خووی و بوخاراوە دەچووە هیندستان، بۆیە هێرشی کردە سەر دەربەند و دەستی بەسەرداگرت و پاشان رووی کردە شەماخی و کاتێکیش گەیشتە ئەوێ بینیان کەوا ئیبراهیم پاشای سەدری ئەعزەمی عوسمانیی بەخۆی و سوپاکەوە بەر لەئەو گەشتۆتە ئەوێ و بەر لەویش ئەرمینیا و کەرەجی داگیرکردبوو، لەبەر ئەوەش توانای بەرەگاربوونەوەی سوپای عوسمانیی نەبوو بۆیە گەڕایەوە رووسیا.

لەساڵی ١٧٢٣ز لەلایەن ئەفغنیەکانەوە میرمەحمود دەستی بەسەر رشت و شارۆچکەی گەیلاندا گرت و بەهۆی ئەمانەوە حاکمی فارس لەوە ترسا کەوا ولاتەکەی ئەویش داگیربکات و داوای یارمەتی لەقەیسەری رووسی کرد و ئەویش هێزەکانی خۆی ناردە گەیلان بۆ ئەوەی داگیریی بکات و لەهەمان کاتیشدا عوسمانییەکان دەستیان بەسەر شەماخی و تفلیس و شەرواندا گرتبوو.

وادیاربوو ئەو لەشکرکێشیەی رووسیا بۆ ناو قوڵایی خاکی ئێران بووە هەڕەشە بۆ دەسەلاتی عوسمانیی لەو ناوچانەی دەستیان بەسەرداگرتبوو، ئەمەو سوڵتان ئەحمەدی سێیەم نامەیەکی بۆ پەترۆسی گەورە ناردو تیایدا هۆشداری دایێ لەوەی هێزەکانیان بەرەو شاری دەربەند هاتوون و ئەمەش مانای هەڵگیرسانی شەڕە لەدژی عوسمانییەکان.

لەراستیدا پەترۆسی گەورە لەو قۆناغەدا نارەزووی ئەوەی نەدەکرد بۆ داگیرکردنی خاکی ئێران لەگەڵ عوسمانییەکاندا بکەوێتە کێشەی چەکدارییەوە،

بۆیــە لــەپێناوی ئــەوەی دەســـبگریّ بــەباكۆ و دەربەنــد كەلەئــەنجامی تەنگژەكانــدا دەستی بەسەردا گرتبوون.

لــەدوای ئــەوەی ســولّتانی عوسمــانیی شــەڕی لــەدژی دەولّــەتی ســەفەویی ڕاگەیانــد و لەشكركێشــی كــردە نــاو خــاكی ئێــران شاتەهماســـبی دووەم نامەیــەكی بــۆ ســولّتان ئەحمــەدی سێیەم نــاردو تیایــدا داوای ڕوونكردنــەوەی هاتنــە نــاو وڵاتەكــەی لێكــرد، ئــەویش وەلاّمــی دایــەوە كــە لەبەرئەوەیــە ڕووســیا لــەلای خۆیــەوە بــاكۆ و دەربەنــدی داگیركــردووە و ئەفغانیــەكانیش ئەســفەهان، ئــەویش دەیــەویّ بــەر لــەوەی دوژمــن دەســتیان بەســەردابگریّ ئــەیرەوان و تــەوریز بگێڕێتــەوە بــۆ ژێــر دەســەلاّتی خــۆی، ئەوكاتــە شاتەهماســـبی دووەم دەركــی بــەوەكرد كــەوا ئــەم نامەگۆڕینەوەیــە هــیچ ســودێكی نییــەو ناچــاربوو داوای یارمــەتی لەڕووســیاكرد و بــۆ ئــەم مەبەســتەش ئیســماعیل بــەگی نــاردە لای و نامەیــەكی پێبــوو تێیــدا داوای یارمــەتی لەپەترۆســی گــەورە دەكــرد. قەیســەری ڕووســی لەســەر داواكــەیان ڕەزامەنــدیی نوانــد بەمــەرجی ئــەوەی ئەســتەرئاباد و مازەنــدەران و گــەیلان بخاتــە نــاو ســنووری خۆیــەوە، كاتێــك نێردراوەكــەی گەڕایــەوە و نێردراوێكــی ڕووسیشــی لەگەڵــدابوو، زۆر بەتوونــدی هەڵســوكەوتی لەگەڵــدا كــرد و ناردییــەوە بــۆ وڵاتەكــەی خــۆی، بەمــەش پــەترۆس توڕەبوو و دەستی كردەوە بەسیاسەتی فراوانخوازیی.

بــەهۆی نــاكۆكی لەســەر داگیركردنــی خــاكی ئێــران خــەریك بــوو روســەكان و عوسمانییــەكان لــەنێوان خۆیانــدا دووچــاری شــەڕدەبوون، چــونكە شــوێنە كێشــە لەســەرەكان جێگــای تــەماعی هــەردوو لایــان بــوو. دەولّــەتی عوسمــانیی دەیویســت شــوێنە پــڕ لەچــالاكییە ئابووریــەكان بخاتــە ژێــر دەســەلاّتی خــۆی و ڕووســەكانی لێبێبــەش بكــات و لەهــەمان كاتیشــدا ڕووســەكان دەیانویســت ڕێگــا لەعوسمانییەكان بگرن و نەهێڵن بگەنە دەریای قەزوین.

واپێدەچــوو كــەوا ئــەم كێشــەیە زیــانی بــۆ ســەر بەرژەوەندییــە ئابووریــەكانی فەرەنسا هــەبوویّ لەخۆرهەلاّتــدا، بۆیــە هەوڵیــدا ناوبــژیوانیــان بكــات و كێشــەكە ئاشــتییانە چارەســەربكات، لــەم هەوڵەشــیدا ســەركەوتنی هێنــا چــونكە لــە٢٤حــوزەیران١٧٢٤ز

ڕێکـەوتنێکیان مـۆر کـرد کەبەهۆیـەوە هـەر یەکـەیان بۆیـان هـەبوو پارێزگـاری لـەو بـەش و ناوچـانە بکـەن کەلـەئێرانیان دابڕیبـوو و هەردوولاشـیان هاریکـاریی یەکتربکـەن لەهـەر هـەوڵێکی تەهماسـبی دووەم بـۆ گێڕانـەوەی ئـەو شـوێنانەی داگیریان کردووە، ئەو ڕێکەوتنامەیەش بریتی بوو لەم بەندانە:

- ئـەو هێڵـەی کەلەتورکسـتان لەخۆرەلاتـەوە هەڵدەکشـێ و دەگاتـە خـاڵی بەیـەك گەیشـتنی هـەردوو ڕووبـاری کـەڕ و ڕەس لەدەربەنـد ببێتـە هێڵـی جیاکـەرەوەی سنوری دەوڵەتەکانیان.

- دەوڵەتی عوسـمانیی ئـەم شـارە خۆراواییانـەی ئێرانـی بکەوێتـە دەسـت: قـەرەباغ، گەنجـە، نەخجـەوان، ئـەیرەوان، تـەورێز، خـووی، کـورس، ئەروومیـە، مەراغـە، سەلماس، سنەندەج، هەمەدان و کرمانشا.

- ناوچـەکانی سـەر دەریـای قـەزوین و بـاکووری ڕێـڕەوی خـوارووی ڕووبـاری ڕەس بـۆ ڕووسـیابێ، واتـە ئـەو شـوێنانەی کەپێشـتر تەهماسـب شـا بـۆ ڕووسـیا دەسـتی لێهەڵگرتبوو: ئەستەرئاباد، مازەندەران، گەیلان و بەشێکی شەروان.

- شـا تەهماسـب دەسـبگرێ بـەو ناوچـانەی لەبەردەسـتییەتی بەمـەرجێك دان بەبەندەکانی ئەم ڕێکەوتنامەیەدا بهێنێ.

لەراسـتیدا ڕووسـەکان بـەهۆی ئـەم پەیماننامـەوە ئامـانجێکی زۆر سـتراتیژی خۆیـان پێکـا، ئـەویش دوورخسـتنەوەی عوسمانییـەکان بـوو لـەدەریای قـەزوین، بـەلاَم سـوڵتان ئەحمـەدی سـێیەم لەلایـەن زانـا ئایینیەکانـەوە دووچـاری ڕەخنـە بـووەوە بـەهۆی ئـەو هاوپەیمانێتییـەی لەگـەڵ مەسـیحییەکاندا لـەدژی دەوڵـەتێکی ئیسـلامی سـازیکرد و ولأتەکەشـیانی دابەشـکرد، لەلایـەکی دیکەشـەوە پەیماننامەکـە بـەهیچ شێوەیەك باسی ئەفغنیەکانی ناو ئێرانی نەکرد.

## کاریگەری پەیماننامەکە لەسەر ئەفغانەکانی ئێران:

پەیماننامەکـەی نێـوان ڕووس و عوسمانییـەکان کاریگـەری خراپـی هـەبوو لەسـەر بـوونی ئەفغانییـەکان لـەئێران، چـونکە بەهۆیـەوە میرمـەحمود بەهەنـدێك کێشـە و

ململانێی ئەوتۆوە گلا کەبەهیچ شێوەیەک نەیدەتوانی خۆیانی لێ دەربازبکات و لەکۆتاییشدا لەناوچوو. لەبەرئەوەی چالاکییەکانی لەناو چوارچێوەی ئێران مابۆوە و نەیدەتوانی بۆ هیچ جێگایەکی دیکە پەل بهاوێ لەهەر چوار لاوە کێشە و گرفت دەوریانگرت، لەوانە:

- پاڵەپەستۆی نێودەوڵەتی کەپێکهاتبوو لەدەوڵەتی عوسمانیی و رووسیا و ئەوانیش هەریەکە بەئارەزووی خۆیان خاکی ئێرانیان دادەبڕی.
- سوپاکەی چەندین جار و لەسەر یەك لەناوخۆی ئێراندا شکستی خوارد.
- هێرشی کوردە ئێزیدییەکان بۆ سەر سەربازگەکەی.

ئەم گۆڕنکارییە ناوخۆیی و دەرەکییانە میرمەحمودیان لەرووی ئابووری و سەربازی و دەروونییەوە زۆر ماندوو و شەکەت کرد، هەرگیز مێشك و بیری ئەو توانای بەرگریکردنیان نەبوو بۆ ئەم هەموو کێشە کەڵەکە بووانە، وردەوردە زیاتر ورەی لەدەستدەدا و ئەمەش کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر هەڵسوکەوتەکانی و هەمیشە بەلای تووڕەیی دڵڕەقی و بێبەزیی بوونی دەبرد، لەلایەکی دیکەشەوە دەستیکرد بەکوشتنی پیاوماقوولە ئێرانییەکان و پاشان سێ هەزار کەسی لەلایەنگرانی شاحوسێن کوشت، ئەم قەسابخانەیەش تەنانەت سەرکردە گەورەکانی ئەفغانییەکانیشی گرتەوە، هەروەها باجی دیکەی خستە سەر زەوی و زارەکان و بەمەش خەڵکەکە زۆر بێزاربوون، سەربازەکانیشی تالآنی دوکەکانی ئینگلیز و هۆڵەندیەکانیان دەسپێکرد، سەرەڕای هەموو ئەمانەش مکوڕبوو لەپارێزگاریکردنی فەرمانڕەوایەتی ئەسفەهان.

پیاوە گەورەکانی ئەفغانی دەرکیان بەوەکرد کە ئەگەر میرمەحمود بەردەوامبێ لەسەر ئەم سیاسەتەی ئەوا ئەفغانییەکان بوونیان لەئێراندا نامێنێ، بۆیە لەدوای ئەوەی کەمیرمەحمود بەیەکجاری هۆشی لەدەستدا و شێتبوو، میرئەشرەفی ئامۆزایان لەئەفغانستانەوە بانگهێشتکرد و متمانەی جێنشینیان پێبەخشی و

پاشـــان لەنیســـانی ١٧٢٥ز بـــەرە و تـــەختی پاشـــایەتی بـــەرزیان کـــردەوە و، یەکـــەم کارێکی کەئەنجامیدا ئەوەبوو میرمەحمودی کوشت.

## ئەفغانییەکان لەسەردەمی میرئەشرەف:

لێکتێگەیشـــتنی عوسمـــانیی و ئەفغانییـــەکان: میرئەشـــرەف دەبوایـــە رووبـــەرووی ئـــەو هـــەموو تەنگـــژە گەورانـــە ببێتـــەوە کەدووچـــاری ئەفغانییـــەکانی ئێـــران دەبوونـــەوە و هەمووشی لەململانێیە هەرێمایەتیەکانەوە سەرچاوەیان دەگرت:

- ئەفغانـــەکان بەســـەرکردایەتی میرئەشـــرەف خـــۆی کەدەستیانبەســـەر ئەســـفەهان و شـــیراز و خـــواروی خـــۆرەلاتی ئێرانـــدا گـــرت، بـــەلام لەبـــەر ئـــەوەی هێـــزە دەرەکییـــەکان زۆر بـــوون و هەمووشـــیان چـــاویان بڕیبـــووە خـــاکی ئێـــران و لەلایـــەکی دیکەشـــەوە شۆڕشـــە ناوخۆییـــەکان و نـــەبوونی ســـوپایەکی بـــەهێز ناچـــاریان کـــرد تـــەنها بـــیر لەبەرگریکردن بکاتەوە.

- ســـەفەوییەکان بەســـەرکردایەتی تەهماســـبی دووەم خۆیـــان بـــەخاوەنی شـــەرعیی فـــەرمانڕەوایی ئێـــران دەزانـــی و مەڵبەندەکەشـــی لەمازەنـــدەران بـــوو، لەبـــەر ئـــەوەی خاوەنی هێزێکی کـــەمبوو بۆیـــە هـــەر خـــەریکی چـــاودێری کردنـــی رووداوەکـــانی دەکـــرد و هـــەوڵی دەدا کـــەوا ســـوودیان لێـــوەربگرێ، ئینجـــا فـــەتح عـــەلی خـــانی ســـەرکردەی قاجارەکـــــان هاتـــــەپاڵی و پەیوەنـــــدی پێـــــوەکردو بەمـــــەش تـــــوانی بەشـــــداری لەرووداوەکاندا بکات.

- رووســـیا کەبـــەردەوامی بەسیاســـەتە فراوانخوازییـــەکی (لـــەدوای مردنـــی) پـــەترۆس گـــەورە دەدا و هـــەوڵی دەدا لەســـەر حیســـابی ئێـــران دەوڵەتەکـــەی خـــۆی فراوانبکـــات، و لەســـەردەمی خانمەقەیســـەر کـــاترینی دووەم (١٧٦٢-١٧٦٩ز) دەبێتـــە هێزێکـــی گەورەو لەسەر سنووری ئێرانی و عوسمانییەکان دەوڵەتەکەی خۆی فراواندەکات.

- عوسمانییـــەکان کـــەخۆیان بـــەخاوەنێکی شـــەرعی حوکـــومڕانێتی ئێـــران و پارێزگـــاری لێکردنـــی لەبەرانبـــەر ئـــەفغانیی و رووســـەکاندا دەزانـــی، بـــۆ قولایـــەکی

زۆری نێـو خـاکی ئێـران بەسـەرکردایەتی ئەحمەدپاشـای والـی بەغـدا (جێنشـینی باوکی بوو لەم پۆستەدا) لەشکرکێشییان کردبوو.

میرئەشـرەف لەسـەرەتای دەسـەڵاتداریتییەکەی خۆیـدا ویسـتی بـەفێڵێکی سیاسـی کەشاحوسـێن لەبەندیخانـە بێنێتـە دەرەوەو یـەکێك لەکچەکانیشـی مارەبکـات تـاکو بەمـە فەرمانڕەوایەتیەکـەی ببێتـە شـەرعی، پاشـان هـەوڵی دەدا لەگـەڵ شاتەهماسـبی دووەم کۆبوونەوەیـەك سـازبکات، کەچـی شـا پیلانـی بـۆ ئـەوە دەگێـڕا کـەبیکوژێ، ئینجـا میرئەشـرەف پێیزانـی، بۆیـە شـا بـەرەو سـیمنان و لەوێشـەوە بـەرەو تـاران رایکـرد، لەوێـدا بانگهێشـتی فـەتح عـەلی خـانی سـەرۆکی هـۆزی قاجارەکـانی کـردو کردیـە بریکـاری خـۆی و پلـەی مـیری میرانـی پێبەخشـی و لەگەڵیدا رێکەوت بۆ ئەوەی شەڕی ئەفغانییەکان بکەن و لەئێران وەدەریاننێن.

کاتێـك میرئەشـرەف هێرشـی کـردە سـەر تـاران شاتەهماسـبی دووەم ئەوێشـی بەجێهێشـت و بـەرەو مازەنـدەران هـەڵات و لەوێشـەوە بـەرەو مەشـهەد و بـۆ ئـەوەی دەسبەسـەر خۆراسـاندا بگـرێ و رێگـای یارمەتییـەکانی ئەفغانسـتان لەمیرئەشـرەف بگـرێ، بـەڵام کاتێـك ئـەوان خـەریکی خۆسـازدانبوون میرئەشـرەف لـەدامغان پێیـان گەیشت.

لەلایەکیدیکەشـەوە میرئەشـرەف هـەوڵی دەدا کـەوا عوسمانییـەکان بـەرەو دەرەوەی سـنورەکانی ئێـران-عـێراق ببـات، ئـەوەبوو وەفـدێکی بەسـەرکردایەتی عەبدولعـەزیزخان و مـەلارەحیم نـاردە ئەسـتانبوڵ و لەوێـدا نـارەزایی خۆیـان لـەدژی پەیماننامـەی سـاڵی ١٧٢٤ز بـۆ سـوڵتان ئەحمـەدی سـێیەم دەربـڕی. لەبـەر ئـەوەی سیاسـەتی ئـەوکاتی عوسمانییـەکان لەگـەڵ ئـەم ئاراسـتەیە نـەدەگونجا، سـوڵتان فەرمانیـدا نێردراوەکـەی ئـەفغانی لەئەسـتانبوڵ دەرکـەن و لەدواییـدا لـەداگیرکردنی ئێران توندی زیاتری نواند.

ئـەم سیاسـەتەی عوسمانییـەکان لەبەرانبـەر ئەفغانییـەکان کاردانەوەیـەکی خراپـی لەلایـەن رای گشـتی عوسمانییـەکان لێکەوتـەوە و زۆربـەی چـین و توێـژەکانی وڵات

لێی نارازیی بوون، ئەمە پاڵی بەسوڵتانەوە نا کە داوا لەشێخولئیسلام بکات شەڕی ئەفغانییەکان جائیزبکات.

لەراستیشدا بەرژەوەندییە باڵاکانی عوسمانییەکان لەسەرووی رای گشتییەوەبوو لەرێگەگرتنی تەماعی رووسەکان کەچاویان بڕیبووە خاکی ئێران. بۆیە سوڵتان بڕیاریدا درێژە بە چالاکییە سەربازییەکان بدرێتەوە و ئینجا لەساڵی ١٧٢٦ز فەرمانی بەئەحمەد پاشادا کەوا هێرش بکاتە سەر ئەسفەهان، لەوێش لەنزیک هێڵی هەمەدان-ئەسفەهان لەگەڵ هێزەکانی میرئەشرەف بەیەك گەیشتن. شەڕ لەنێوانیان دەستی پێکرد و سەرکەوتنێکی ئاشکراش بۆ هێزەکانی ئەفغانی مسۆگەربوو کەتوانیان لەسەرەتاوە زەبرێکی کاریگەر لەپێشەوەی سوپاکە بوەشێنن و پێشڕەوی عوسمانییەکان راگرن. وادیاربوو جەنگاوەرە کوردەکان ئەوەیان رەتکردەوە کەدژی ئەفغانییە سوننەکان بجەنگن و بەر لەدەسپێکردنی شەڕەکە ئەوان پاشەکشەیان کرد و بەمەش سوپای عوسمانیی توانای شەڕی کەمبۆوە و، ئەوانیش لەدواییدا زۆربەی تەقەمەنییەکانی خۆیان لەمەیدانی شەڕەکە بەجێهێشت و هەمووی کەوتە دەس ئەفغانەکان و ئەوانیش بەرەو کرمانشا هەڵاتن.

ئەحمەد پاشا راپۆرتێکی دووردرێژی بۆ ئەستانبووڵ نارد و تیایدا باسی بارودۆخەکەی بۆ کرد، سوڵتانیش لەوەڵامدا فەرمانی پێکرد لەشەڕکردن نەوەستێ و دیسانەوە بەرەو ئەسفەهان هەڵکشا. لەوکاتەشدا میرئەشرەف دووچاریی مەترسی و هەڕەشە ناوخۆییەکان بووە و شاتەهماسبیش دووبارە هێزەکانی خۆی رێکخستەوە، بۆیە لەپێناو پاراستنی هێزەکانی خۆی و رووبەرووبونەوەی تەهماسب هەوڵیدا لەگەڵ عوسمانییەکان ئاگربەست بکات و لەگەڵیان رێکبکەوێ، و نامەیەکی بۆ ئەحمەدپاشا ناردو تیایدا پێشنیاری مۆرکردنی رێکەوتنێکی ئاشتیانەی بۆ کرد و لەگەڵ نامەکەشدا وەك دەربڕینی نیازپاکی هەموو دیلەکان و تەقەمەنییەکانی بۆ ناردەوە، ئەحمەدپاشا ئەم پێشنیارەی میرئەشرەفی بۆ لای سوڵان نارد و ئەویش رەزامەندی لەسەر نواند،

چـونکە ئەوکاتـە رووسـەکان لەسـاڵی ١٧٢٥ز بـەهۆی مردنـی پەترۆسـی گـەورە فشاری رووسەکان لەسەریان کەمبێوە و رێکەوتنەکەش بریتی بوو لە:

- میرئەشرەف دان بەژێردەستەیی دەوڵەتی عوسمانیدابنێ.

- دەوڵـەتی عوسمـانی دان بەمیرئەشـرەفدا بـنێ وەك حـاکمی ئێـران و وتارەکـانی وڵات دراویش بەناوی سوڵتان یەکەمجار و پاشان بەناوی میرئەشرەفەوە لێبدرێ.

- ناوچـە نزیکـەکانی ئێـران: کرمانشـا و لورسـتان و هەمـەدان و نەهاوەنـد و مەراغـە و تـەوریز و خـوی و زنجـان و گەنجـەو قـەرعباغ و تفلـیس و نـەخجوان و شەروان راستەوخۆ لەژێر حوکومرانی دەوڵەتی عوسمانییدا بن.

- ئەهواز راستەوخۆ بکەوێتە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیی.

- هەردوولا بەڵێن دەدەن کەوا داڵدەی هەڵاتوەکانی یەکتری نەدەن.

- هـەردوولا سـەفیرەکانیان بـۆ یـەکتر بنێـران تـا ئەوکاتـەی دۆسـتایەتیەکە جـێگیر دەبێ.

- دەوڵەتی عوسمانیی رێگای حاجییە ئێرانیەکان بەناو خاکی خۆیدا دەکاتەوە.

- هەردوولا بەڵێن دەدەن کەوا دەست لەکاروباری یەکتری وەرنەدەن.

- ئـەم رێکەوتنـە ببێتـە بناغەیـەك بـۆ ئاشـتەوایی نێوانیـان و لەیەکـەم سـاتی مۆرکردنیـەوە کـاری پێبکـرێ. شـایانی باسـە کەئـەم رێکەوتنامەیـە لـە٤تشـرینی یەکەم١٧٢٧ز لەهەمەدان مۆرکراو بەرێکەتنامەی هەمەدانیش ناونرا.

## بەدواداچوونێک بۆ رێکەوتنامەی هەمەدان:

- میرئەشـرەف توانـا و لێهـاتووی سیاسـیانەی خـۆی لەگـەڵ عوسمانییـەکان و لـەژێر ئـەو بـارە سـەختەیدا سـەلماند و دەستیشـی پێهـەڵگرتن لەشەڕوکوشـتار و لەهەمانکاتیشدا رازامەنـدی ئـەوانی بۆخـۆی دابـین کـرد و دیسـانەوە جـەختی لەسـەر

پەیوەندی دۆستانەی هەردوولا کردەوە و بەمەش توانی ئەو پرۆژە فراوانخوازییەی کەهەیانبوو لەخاکی ئێران و بەرێگای ناوچەسنوورییەکان رایانگرت.

- هێرشی ئەفغانەکان و دەستبەسەرداگرتنی ئێران هەلی بۆ عوسمانییەکان خۆشکرد کەوا ئەو ناوچانەی بەهی خۆیانیان دەزانی و لەرووی ئابوورییەوە ناوەندیی چالاکی بازرگانیی بوون و لەرۆژئاوایشیدا هۆکاری سەرەکی ململانێیەکی دووروودرێژیان بوون لەگەڵ سەفەوییەکاندا گێڕایانەوە بۆ ژێر دەسەلاتی خۆیان.

- دەستبەسەرداگرتنی ئێران لەلایەن ئەفغانییەکانەوە رووسەکانی وشیارکردەوە چونکە ئەوان هەمیشە لەهەوڵی ئەوەدا بوون دەستبەسەر ناوەگەرمەکاندا بگرن و ئابووری خۆیان دابین و دڵنیا بکەن، ئەمەش بووە هۆی تێکچڕانی بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ هی عوسمانییەکاندا. ئەم هەڵوێستەش بوو بەهۆی ئەوەی فەرەنسا بێتە ناو کێشەکەو رۆڵی ناوبژیوانی بگێڕێت و نەیەڵێ کەوا کاریگەری خراپ بکاتە سەر بەرژەوەندییەکان ئەوان لەرێگای نێوان شارەکانی ئێران و سەڵتەنەتی عوسمانیی.

- رێکەوتنامەی ساڵی ١٧٢٧ز ئێرانی خستە ژێر چاودێری عوسمانییەکان، ئەمەش ئامانجی میرئەشرەف بوو چونکە هەموو کاتێك عوسمانییەکان بارێکی قورسبوون لەسەر شانی و لەلایەکی دیکەش دەبوایە خەریکی کێشە ناوخۆییەکانیێ.

- بەم رێکەوتنامەیە میرئەشرەف توانی ناوچە ستراتیژییەکان لەداگیرکاری رووسەکان بپارێزێ ئەویش بەهۆی ئەوەی کەوا کەوتنە ژێر دەسەلاتی عوسمانییەکان و بەدیوارێك لەنێوان ئەوان و ئەو رووسانەی چاویان بریبووە خاکی ئێران، ئەمەش لەبەرژەوەندی ئەودا بوو چونکە نەیدەتوانی تەنها بەهێزی خۆی پارێزگاری لەم ناوچانە بکات.

- ناوچـەی ئـەهواز بـۆ یەکـەمجار کەوتـە ژێـر فـەرمانڕەوایی عوسمـانیی و ئەمـەش بـەهۆی بێتوانـایی دەسـەڵاتی ئەفغانییـەکانی ئێرانبـوو، کەچـی سـەرەڕای ئـەوەی ئەمـە دەسـکەوتێکی گـەورەبوو بـۆ عوسمانییـەکان بـەڵام لەدواییـدا بـوو بـەهۆی ئەوەی دووچاری زۆرێك لەکێشەو گرفتییان بکات.

بەمشـێوەیە ئێـران سـەرەڕای هـەوڵی میرئەشـرەف بـۆ یەکپارچـەیی کەچـی بەسـەر چـوار لایەنـدا دابەشـبوو: سـەفەوییەکان و ئەفغانییـەکان و عوسمانییـەکان و رووسـەکان. هەرچـەندە میرئەشـرەف تـوانی بـەهۆی رێکـەوتنی لەگـەڵ عوسمانییـەکان بـەری لای ئـەوان ئارامبکاتـەوە، بـەڵام پێویسـت بـوو لەسـەری کـەوا خـۆی بـۆ چـەند هێزێکـی دیکـەی دوژمـن ئامادەبکـات بەتایبـەتیش شاتەهماسـبی دووەم کەلـە دوای ئـەوەی نادرشـای ئەفشـاری هاتـە پـاڵی بـاروگوزەرانی رووی لەباشـی کردبـوو، ئـەو پیـاوەش ئـەو کەسـەبوو کـەوا لەمێـژوودا بـە تەهماسـبی قـوولی خـان ناوبـانگی دەرکـردو، ئینجـا لـەدوای ئـەوەی دەسـەڵاتی گرتەدەسـت و میرئەشرەف و تەهماسـبی دووەمی لەناوبرد بەناوی نادرشا ناوبانگی پەیداکرد.

## پەیدابوونی نادرخانی ئەفشاری و کۆتایی ئەفغانییەکانی ئێران:

نادرشـا لەبنچـینەدا سـەربە هـۆزی ئەفشـاری تورکمانیـەو لەتورکسـتانەوە بـەهۆی داگیرکـاری مەغۆلەکانـەوە لـەئازەربێجان نیشـتەجێببوو و تـا ئەوکاتـەی شـا ئیسـماعیلی یەکـەم دووری خسـتەوە بـۆ خۆراسـان هـەر لـەوێ مایـەوە و پاشـان لەئـەبیورد نیشـتەجێبوو. هۆزەکەشـیان لـەنێوان ئـەبیورد و دەسـتجەرد گـەرمێن و کوێسـتانیان دەکـرد و لەتشـرینی دووەمـی ١٦٨٨ز نادرشـا لـەخێزانی هـەژار لەدایکبوو.

بـاوکی شـوانکارو دارکـەربوو و زۆر بەهـەژاری دەژیـا. ئینجـا نـادر پیشـەکەی بـاوکی وەرگـرت و لـەکاتی گەنجیـدا خـۆی و دایکـی لەپـەلامارێکی ئۆزبەکـەکان بـۆ سـەر خۆراسـان بـەدیل گـیران و بـردران بـۆ خیـوە و دایکـی لـەدوای چـوار سـاڵی دیلیـی کۆچـی دوایـی کـرد، ئـەویش تـوانی راکـات و خـۆی رزگاربکـات و بگەڕێتـەوە نیشـتیمان و نێـو هـۆزی ئەفشـار، پاشـان بـوو لایـەنگریی بابەعـەلی بـەگی حـاکمی

ئەبیورد و خزمەتێکی زۆری پێشکەشکرد و ئەویش زۆری خۆشدەویست و دوایی کچێکی خۆی لێ مارەکرد.

نادرخان خاوەن هیوا و ئاواتی سیاسی زۆربوو، لەسەرەتاوە چاوی لەدەسەلاتداریتی ئەبیوردبوو، زۆریشی پەلە بۆ کرد و هەر زوو مامەکەی بەژەهر کوشت و پاشان چاوی تەماعی خستە سەر تەواوی خۆراسان، بۆیە لەگەڵ فەرمانڕەواکەیدا رووبەرووی یەکبوونەوە و بەلام نەیتوانی شکستی پێبهێنێ بۆیە شارەکەی چۆلکرد و هەلات و لەکۆتاییشدا بوو بەرێگر و توانی چەند چەکدارێك لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە، ئینجا دەستی کرد بەبەشداری کردن لەرووداوەکانی ناوچەکە و توانی لەقەلای خۆراسان جێگیربێ و کەلەدواییدا بەناوی ئەوەوە ناونرا (قەلای نادری) و پاشان کردیە بنکەیەك بۆ چالاکیەکانی خۆی و فراوانکردنی بازنەی دەسەلات و سەرەتاش دوو ئامانجی خستە بەر چاوی خۆی:

یەکەم: لەسەر بەرژەوەندی و حسابی هێزەکانی خۆرەلات و خۆراوا و کەنداوی عەرەبی دەسەلاتەکەی فراوان بکات.

دووەم: ئازادکردنی ئێران لەدەستی ئەفغانەکان و لەناوبردنی سەفەوییەکان و پاشان بەتەنها فەرمانڕەوایەتی ولات بکات.

بۆ ئەوەی بتوانێ ئامانجەکانی بپێکێ خۆی خستە پال سەفەوییەکان بۆ ئەوەی لەناوەوە زەبری خۆیانی لێ بوەشێنێ. ئەوکاتەش ئێران لەدوای کشانەوەی روسیا لەمازەندەران و ئەستەرئاباد پێی نابووە قۆناغێکی تازەوەو شاتەهماسبیش گەڕابۆوە بۆ مازەندەران و لەوێش چاوی بەفەتح عەلی خان قاجار کەوت و هێنایە پال ریزەکانی خۆی، ئینجا نامەیەکی بۆ نادرشا نارد و تیایدا داوای لێکرد کەوا بۆ دەرکردنی ئەفغانەکان لەمەشهەد یارمەتی بدات، بەلام سەرەڕای ئەوەی داواکەی شاتەهماسبی جێبەجێکرد کەچی لەگەڵ فەتح عەلی ناکۆکبوو، چونکە هەر یەکێك لەوانە لەهەولی ئەوەدابوو سەرکەوتنەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاربهێنن، بەمەش لەبەردەم هێزەکانی ئەفغانی لەسالی ١٧٢٧ز بەسەرکردایەتی مەحمودی سیستانی شکستێکی گەورەیان خوارد و لەکۆتاییدا

نادرشا توانی قاجاری لەناوببات و لەساڵی دواییدا دووبارە هێرشی کردەوە سەر مەشهەد و توانی ئازادی بکات و ئەمەش بوو بەیەکەمین سەرکەوتنی ناوخۆیی، هەروەها لەدوای ئەوەی شکستی بە ئەڵلایارخانی حاکمە ئەفغانییەکی هەرات هێنا ئەویشی داگیرکرد، بۆیە شا لەبەرانبەر ئەم سەرکەوتنانەی ناوی خۆی وەك رێزلێنانێك پێبەخشی و ناوی نا تەهماسب قوولی خان، جگە لەمەش چەندین دیاری دیکەی پێشکەشکرد چونکە توانی متمانە بۆ دەوڵەتی سەفەویی بگێڕێتەوە، بەمەش نادرشا پلەو پایەی خۆی و شای سەفەویی بەرزبووکردەوەو توانیان رووبەروو و رکابەریی میرئەشرەف بکەن، ئەمیش لەبەرانبەردا بەپەلە هێرشی کردە سەر خۆراسان بۆ ئەوەی بواری قیتبوونەوەیان نەدا، بەلاّم لەبەر ئەوەی پشێوی و ئالۆزیی لەناوخۆدا سەریهەڵدابوو بەتایبەتیش لەقەندەهار بەهۆی بلاّوکردنەوەی تیپە سەربازییەکانی لەنێو شارەکان بۆ بەرگری و پارێزگاریی نەیتوانی سوپایەکی گەورە و زەبەلاح لەگەڵ خۆیدا ببات و ئەوەی لەگەڵی بوون تەنها سی هەزار سەربازبوون و هەمووشیان ئەفغانیی نەبوون، بۆیە لەساڵی ١٧٢٩ز لەشەڕی میهماندۆست لەدامغان شکستی هێناو گەڕایەوە بۆ ئەسفەهان و لەوێشدا نادرشا وازی لێنەهێنا و هێرشی کردە سەرو شارەکەی لەژێر دەستی دەرهێنا.

لەدواییدا میرئەشرەف شا حوسێنی کوشت و بەرەو شیراز هەلاّت، کاتێکیش شاتەهماسبی دووەم چووە ناو شارەکەوە زۆر دڵتەنگ بوو بەو وێرانکارییەی کەوا ئەفغانییەکان بەسەریان هێنا بوو بەتایبەتیش کۆشك و تەلارەکانی خانەوادەی سەفەویی.

شاتەهماسبی دووەم ئامانجی ئەوەبوو کەوا ئەفغانییەکان یەکجارەکی لەخاکی سەفەوییەکان وەدەرنێ، نادرخانیش لەلای خۆیەوە دەرکی بەوە کردبوو کەوا شا تا چ ئەندازەیەك پێویستی پێی هەیە، کاتێکیش فەرمانی پێکرد هێرش بکاتە سەر پاشماوەی ئەفغانییەکان و لەناویان ببات وەك سەرکردەیەکی سەرکەوتوو

داوای خەڵاتیکرد، ئەوکاتەش شا هیچی بەدەستەوە نەبوو بۆیە ناچاربوو داواکارییەکەی جێبەجێ بکات، چونکە هەموو هێزەکان لەژێر فەرمانی ئەودابوون و شا تەهماسبی دووەم هێزێکی ئەوتۆی لەژێر دەستنەبوو تابتوانێ ویستەکانی خۆی بەسەردا بسەپێنێ. بەمجۆرە نادرخان توانی بەهۆی رۆڵی کاریگەریی خۆی بەسەر دەوڵەتی سەفەوییدا بسەپێنێ، و هەموو داهات و باجەکانی دەوڵەتی لە شا وەرگرت و لەکۆتاییشدا بوو بەخاوەنی دەسەڵات بەسەر سەرجەم هێزەکان و توانا داراییەکانی وڵات.

میرئەشرەف دەرکی بەوەکرد کەوا تەرازووی هێز لەئێراندا لەبەرژەوەندی ئەودانییە، بۆیە داوای یارمەتی دەرەکی کردو جگە لەعوسمانییەکانیش کەسی دیکەی بەدەستەوە نەبوو، لەهەمانکاتیشدا ئەوان لەدوو لایەندا هاوبەشبوون یەکەم هەردوولایان لەسەر مەزەبی سوننی بوون و دوژمنی سەفەوییەکانیش بوون، نێردراوێکی نارده ئەستانبوڵ و داوای یارمەتی لێکردن و لەبەرانبەردا ئەحمەد پاشای والی بەغدا تیپێکی تۆپهاوێژی بۆ نارد، بەڵام بەر لەوەی ئەو تیپە بەشداری شەڕەکان بکات نادرخان هێرشی کردە سەریان و توانی لەناویان ببات و دەستیش بەسەر هەموو چەك و تەقەمەنییەکانیاندا بگرێ، بەمەش ئەشرەف دووچاری شکستێکی هێندە بەهێزهات وای لێکرد کەوا کەسوکارو خانەوادەی خۆی و پارەو سامانەکەی کۆبکاتەوە و بەرەو شیراز رابکات، نادرخان وازی لێنەهێناو هەر بەدوایەوە بوو لەنزیك زارغان کەبیست میل لەشیرزا دووربوو، دووبارە شکستی پێهێنایەوە.

میرئەشرەف لەناو ئەو هەموو شکست و زیانانەی پێی گەیشت کەچی هەوڵی دەدا لەگەڵ شاتەهماسبی دووەم رێکەوتن بکات، بەڵام ئەو تەنانەت

کۆبوونەوەشی رەتکردەوە، کاتێکیش شا هەرەشەی لەهەموو ئەفغانەکان کرد کەئەگەر نەیدەن بەدەستەوە ئەوا هەموویان دەکوژێ، بۆیە ئەویش لەترسان بەخۆی و ژمارەیەکی زۆر کەمی سەربازەکانی کەتەنها دووسەد کەس دەبوون لەشیراز وەرێکەوتن و بەرەو قەندەهار رۆیشتن، ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئەوە دەگەیەنێ کەوا سەربازەکانی لێی دوورکەوتوونەتەوە، سوارچاکەکانی سەفەویی راوەدوویان ناو ئەویش لەدوای ئەوەی لەناوچەکەدا کشایەوە هەوڵیدا دەسبەسەر لار و کرماندا بگرێ بەلام خەلکەکەی لێی هاتنە دەست و رووبەرووی بوونەوە، ئینجا دەرکی بەوەکرد کەمانەوەی لەئێران مانای کۆتایی خۆییەکەیەتی، لەوێوە بەخۆی و سەربازە بێهێز و ماندووەکانیەوە بەرەو قەندەهار رۆیشت، لەپاشان برایەکی ناردە بەسرە و پارەو زێرێکی زۆریشی بۆ عوسمانییەکان پێدانارد، کاتێکیش گەیشتە ناوچەی زەردەکۆه لەبلوجستان خانی بلوجەکان هێرشی بۆ برد و کوشتی و لەساڵی ۱۷۳۰ز سەری براویشی ناردە ئەسفەهان بۆ ئەوەی ببێتە هۆکاری نزیک بوونەوەی لەگەڵ سەفەوییەکان. بەکۆتایی هاتنی میرئەشرەف ئەفغانییەکان بوونیان لەئێراندا کۆتایی پێهات کەتەنها ماوەی حەوت ساڵ لەوێ بوون.

## پەیوەندی سەفەوییەکان و عوسمانییەکان لەسەردەمی نادرخان:

لەدوای ئەمانە نادرخان دەبوایە رووبەرووی ئەو هێزانەی دیکە ببێتەوە کەوا هێشتا بەشێکی خاکی ئێرانیان لەژێردەست ماوەتەوە، ئەوانیش دەوڵەتی عوسمانیی و روسیابوون و، سەرەتا لەعوسمانییەکانەوە دەستی پێکرد.

لەوکاتەی شاتەهماسبی دووەم چاوەڕێی ئەوەی دەکرد کەوا بەهەوڵەکانی نادرخان ئەسفەهان لەژێر دەستی ئەفغانەکان دەربێنێ لەساڵی ۱۷۲۹ز نێردراوێکی ناردە

ئەسـتانبووڵ و نامەیـەکی بـۆ سـوڵتان نـارد و تیایـدا هـەموو ڕووداوەکـانی ئـەم دواییـەی تایبـەت بەدەوڵەتەکـەی بـۆ باسـکرد و داواشـی لێکـرد دەسـت لـەو ناوچـانە هـەڵگرێ کـەوا لەسـەردەمی ئەفغانییەکانـدا عوسمانییـەکان داگیریـان کردبـوو، لەبەرانبـەردا شـتێکی ئاسـایی بـوو کـەوا سـوڵتان داواکـەیان جێبـەجێ نـەکات و نێردراوەکەش بەدەستی بەتاڵەوە بگەڕێتەوە.

ئـەم ڕەتکردنەوەیـەی عوسمانییـەکان نادرخـانی تـووڕەکرد، بۆیـە هەوڵیـدا بـەزەبری هێـز ناوچـەکانی ژێردەسـەڵاتی عوسمانییـەکان بگێڕێتـەوە بـۆ سـەفەوییەکان و سـەرەتا دەستی بەسـەر ئـەهواز و هەمـەدان و نەهاوەنـد و تـەورێزداگرت. کـاتێکیش لەتـەورێزبوو هـەواڵی ئـەوەی بـەر گـوێ کـەوت کـەوا ئەفغانییـە عەبدالییـەکان هێرشـیان کردۆتـە سـەر هـەرات، بۆیـە نادرخـان شـارەکەی بەجێهێشـت و هێزەکـانی بەرە و بەرەنگاربوونەوەیان وەرێخست.

لەهـەمان کاتیشـدا سـەرکردە ئەفشـارییەکە لەخۆراسـان و ئازەربێجـان سـەرکەوتنی گـەورەی بەدەسـهێنا، هـەروەها دەوڵـەتی عوسمـانیی بـەهۆی ئـەو شۆڕشـە جەماوەرییـەی کـەوا پـەترۆنا خـەلیل بـەرێوەی دەبـرد هەڵوێسـتی زۆر ناخۆشـبوون، شۆڕشەکەش لەبەر ئەم هۆیانەبوو:

- دابـەزینی بـەهای دراوی عوسمـانی کـەبووە هـۆی ئاوسـان و متبـوونی ئـابووری وڵات.
- بەرزبوونەوەی ئاستی باجەکان بەهۆی شەڕی بەرەی خۆرەڵات.
- زۆربوونی دانیشتوانی ئەستانبووڵ بەهۆی کۆچی خەڵکی دووروبەرییەوە.
- تێکەڵبوونی بەشێکی سوپا بە بواری پیشەوەرەییەوە.

لەدەسـتکەوتە هـەرە بەرچـاوەکانیش لادانـی سـوڵتان ئەحمـەدی سـێیەم و دانـانی برازاکـەی بـوو لـەجێی کـەناوی مەحمـودی یەکـەم بـوو (١٧٣٠-١٧٥٤ز)، فـەرمانی بـۆ ئەحمـەد پاشـای والـی بەغـدا و عـەلی پاشـای سـەرکردەی سـوپای خـۆرەڵات نـاردا شـەڕی سـەفەوییەکان بکـەن، ئـەوەبوو ئەحمـەد پاشـا لـەبیابانی تۆریجـان لەگـەڵ شاتەهماسـبی دووەم لەسـاڵی ١٧٣٢ز لـەنزیك هەمـەدان ڕووبـەڕووی یەکبوونـەوە و

شکسـتی بەشـا هێنـا، عـەلی پاشـا لـەلای خۆیـەوە لەوکاتـەی نادرخـان لەشـارنەبوو هێرشـیکردە سـەر تـەورێز و داگیرکـرد و هێزەوڵاتپارێزەکـانی سەفەوییشـی تێـدا دەکرد.

سـوڵتانی عوسمـانیی پاسـاوی شـەڕەکەی بـەوە هێنایـەوە کـەوا شـای سـەفەویی رێـزی ئـەو رێکەوتنامەیـەی نـەگرتووە بـەهۆی نێردراوەکـانی وەلـی محەمـەدخان و رەزاقـوولی خـان لەسـاڵی ١٧٣١ز لەگـەڵ عوسمانییـەکان مۆریـان کردبـوو و ئـەم بەندانەی لەخۆگرتبوو:

- تەورێز و کرمانشا و ئەردەلان و لورستان و حەویزە بۆ سەفەوییەکانبێ.

- عوسمانییـەکان پشـکی ئـەیرەوان و تفلـیس و گەنجـە و شـەروان و شـەماخی و داغستانیان بەربکەوێ.

- سـەفەوییەکان سـەدهەزار پارچـە زێـر وەك قەرەبووکردنـەوەی زیانـەکانی شـەڕ بدەنە عوسمانییەکان.

شاتەهماسـبی یەکـەم بـەهۆی دۆڕاندنـەکانی ناچـاربوو ئاشـتەوایی لەگـەڵ عوسمانییەکاندا بکـات و سـەفیی قـوولی خـانی وەك نێـردراو نـاردە بەغـدا بـۆ ئـەوەی دانسـوتانیان لەگەڵـدا بکـات و لەسـاڵی ١٧٣٢ز لـەنێوان خۆیانـدا رێکـەواتن و پەیماننامەیـەکیان مـۆرکرد کەبـە پەیماننامـەی ئەحمـەد پاشـا نـاونرا و بەهۆیـەوە شاتەهماسبی دووەم دەستی لەزۆربەی پارچەکانی خاکی ئێرانا هەڵگرت:

- رووبـاری رەس و دەرنـە و دەرتـەنگ و چـەندی دیکـەش کەسـنوری کـۆنی نێوانیان بوو ببێتە هێڵی جیاکەرەوەی موڵکەکانی عوسمانیی و سەفەویی.

- شاتەهماسـبی دووەم شـاری گەنجـەو تفلـیس و نـەخجوان و شـەماخی و داغسـتان بداتـە دەسـت عوسمانییـەکان، بەواتایـەکی دیکـە زۆربـەی ویلایەتـە خۆراواییـەکانی ئێـران کەعوسمانییـەکان چـاویان تێـوەی بـوو بخرێتـە نـاو سـنووری دەوڵـەتی عوسمانییەوە.

- تەورێز و ئەردەلان وکرمانشا و هەمەدان و ئەهواز بۆ دەوڵەتی سەفەویی بن.

- دەوڵـــەتی عوسمـــانیی بـــەڵێن بەســـەفەوییەکان دەدات کـــەوا لـــەدەرکردنی هێزەکانی رووسیا لەدەربەند و گەیلان یارمەتییان بدات.

- دەوڵـەتی عوسمـانیی بـەڵێن دەدات کـەوا رێگـا بەئێرانییـەکان بـدات سـەردانی شوێنە پیرۆزەکانی عیراق بکەن.

- هـەردوولا پـەیمان دەدەن کـەوا ئاسـانکاری بـۆ بازرگـانی یـەکتری بکـەن و سـەفیر بۆ ئەستانبووڵ و ئەسفەهان بنێرن.

خستنی شاتەهماسبی دووەم:

پەیماننامـەی ئەحمەدپاشـا لەهـەردوولاوە دووچـاری زۆرێـك لەبەرهەڵسـکاری بـوودەوە، کاتێـك سـوڵتان مـەحمودی یەکـەم رەزامەنـدی لەسـەر نوانـد تـەورێزی لەبەشـی سـەفەوییەکان هێنایـە دەرەوە. رای عوسمانییـەکانیش بـوو بـەدوو بەشـەوە یەکـەمیان ئـەو بابەتـەی رەتـدەکردەوە و دووەمیشـیان لەبـەر گرنگـی لـەرووی سەربازیی و بازرگانیی عوسمانییەکانەوە رەزامەندی لەسەربوو.

بـەڵام لایـەنی سـەفەویی، کاتێـك نادرخـان نـاوەرۆکی پەیماننامەکـەی بیسـت زۆر تـورەو بێـزار بـوو و لەبەرانبـەردا فـەرمانی بـۆ حاکمـەکانی دەووروبـەر نـارد کـەوا ئـەم پەیماننامەیـە جێبـەجێ نەکـەن، هـەروەها سـەفی قـوولی خـانی گەڕانـدەوە بـۆ ئەسـتانبووڵ و داوای لێکـرد کـەوا بەعوسمانییـەکان رابگەیـەنێ لـەم دوو شـتە یەکیان هەڵبژێرن، یـا خۆیـان ئامادەبکـەن بـۆ شـەڕ یـاخود هـەر شـوێنێکی خـاکی ئێرانیـان داگیرکـردووە بیگێڕنـەوە، پاشـان لەگـەڵ گـەورە پیـاوانی دەوڵـەت و ئەرکانەکانـدا کۆبـووەوە و بڕیاریانـدا شاتەهماسـبی دووەم لابـدەن و مـیرزا عەباسـی کـوڕی کـەجارێ شـیرەخۆرەبوو لـەجێی دابنـێن و نـاوی بنـێن شاعەباسـی سـێیەم و ئـەویش بـوو بـەبریکاری دەسـەڵاتدارێتییەکە و هـەموو کاروبارەکـانی دەوڵـەتی لـە٢٦ئـاب١٧٣٢ز کەوتـە ژێردەسـت و شـای لـەکار لادراویـش بـەرە مەشهەد بەرێخراو لەوێ بەندکرا.

لەراستیدا نادرخان هەمیشە چاودێری هەڵسوکەوتەکانی شاتەهماسبی دووەمی دەکرد و بەردەوام چاودێری ئەوەی لێدەکرد کەبچووکترین هەڵە ئەنجامبدات بۆ ئەوەی بیکاتە بیناگە و دەسبەسەر ئێراندا بگرێ، بۆیە کەئەیاننامەکەی لەگەڵ عوسمانییەکاندا مۆرکرد و بەهیچ شێوەیەکیش پرسی پێنەکرد رقی لێهەڵگرت و واشی دەبینی کە ئەم پەیماننامەیە هەڵگری بەرژەوەندییە باڵاکانی ئێران نییەك چونکە:

- ئەو سەد هەزار دینارە زێرەی کەپەیماننامەی پێشوو باسی لێوەکردبوو پشتگوێخرا.

- ئەم پەیماننامەیە باسی دیلە ئێرانییەکانی تێدا نەبوو.

- ئەم پەیماننامەیە باسی دژایەتی دوژمنی هاوبەشیان دەکات کەئەویش لەبەرژەوەندی سەفەوییەکاندا نییە.

- دانانی سەفیری هەرلایەك لەدەوڵەتی بەرانبەر، ئەمەشیان لەبەرژەوەنی سەفەوییەکاندا نەبوو.



# شاعەباسی سێیەم
# ١٧٣٢-١٧٣٦زایینی

## دژایەتیی لەگەڵ عوسمانییەکان لەپێناو بەغدا:

لەئـــەنجامی ئـــاڵۆزی پەیوەندییـــەکانی نادرخـــان و عوسمانییـــەکان، نـــادر رایگەیانـــد کـــەوا بەســـەرکردایەتی ســـوپاکەیەوە لـــەپێناو گێڕانـــەوەی ئـــەو زەوییانـــەی لەعیراقـــدا هـــەیانبوو دەجـــەنگێ. ئـــەم ویلایەتـــەش لەســـەردەمی عوسمانییەکانـــدا زۆر لاوازبـــوو، بەتایبـــەتیش لـــەدوای ئـــەوەی چـــەندین هـــۆزی عـــەرەب لـــەدژی دەســـەلاتداریتی ئەحمـــەد پاشا شۆڕشیان هەڵگیرساند.

جا بۆ ئـەوەی نادرخـان بەتـەواوی ئامادەباشـی بـۆ ئـەم شـەڕەبکات رێکەوتنامەیـەکی ئاشـتی لەگـەڵ رووسـیا سـازکرد کـەتاوی رێکەوتنامـەی رەشـت بـوو و بەهۆیـەوە تـوانی هـەموو ئـەو ناوچـانەی کەوتوونەتـە خـوارووی رووبـاری کـەر بگێڕێتـەوە بۆخـۆی، هـەروەها ناوچـەکانی بـاکوری رووبارەکەشـی گرتـەوە، وەك: بـاکۆ و دەربەنـد و، لەئـەنجامی کشـانەوەی هێزەکـانی عوسمـانیی لەئـەرمینیا و ولاّتـی کـەردج سـنوری ولاّتەکـەی لـەلای خۆرەلاّتـەوە جێگیرکـرد و بەمـەش لـەکاتی ئەنجامـدانی هێـرش و پەلامارەکەی بۆ عیراق خـۆی دڵنیـاکرد کـەوا هـیچ مەترسـیەك بـۆ سـەر ئـەم ناوچـانە نییـە، ئینجـا لەسـێ لایەنـەوە هێرشـی بـۆ بەغـدا بـرد: دەرنـە-شـارەزوو، موسـڵ، بەغـدا، بـەو مەرجـەی کـە هـەر سـێ سـوپاکە لەبەغـدا یـەك بگرنـەوە و گەمارۆشـی بخەنەسـەر، شـایانی باسـە خـودی خـۆی سـەرکردایەتی بەشـی سـێیەمی سـوپاکەی دەکـرد، و تـوانی لـەکاتی پێشـڕەوییەکەی بـۆ بەغـدا سـوپایەکی دوانزەهـەزار کەسـی بشـکێنێ و بـەرەو بەغـدا لـە١٩ئـازار١٧٣٣ز رۆیشـت و گـەمارۆی خستەسـەری، لەولاشـەوە هێزێکـی نـاردە سـەر رێگـای کازمییـە بـۆ ئـەوەی رێ لـەو یارمەتییانـە بگرێ کە لەبەسرەوە بۆی دێن.

هێـــزە وڵاتپارێزەکـــانی بەغـــدا زۆر قارەمانانـــە بـــەرگرییان لەشـــارەکە کـــردو دانیشـــتوانەکەی بـــارگرانی گەمارۆکـەیان بەتایبـەتی لـەکاتی کەمبوونـەوەی ئازووقـە کەوتـە سەرشـان، بۆیـە والـی بەغـدا داوای یارمـەتی بەپەلـەی لەئەسـتانبوڵ کـرد، لەوێشـــەوە ســـوپایەك بەســـەرکردایەتی تۆپپـــاڵ عوسمـــان پاشـــا بـــۆ بـــەهاناهاتنی وەرێکـەوت، کاتێـك نادرخـان ئـەم هەواڵـەی بیســت بەشـێکی سـوپاکەی بـۆ شـەڕی بەغـدا بەجێهێشـت و بـۆ خۆشـی بەسـەرکردایەتی بەشـێکی دیکەیـەوە بەرەو رووی کـەرکووك رۆیشـت و لـەوێ لەگـەڵ تۆپپـاڵ عوسمـان پاشـا بەیـەك گەیشـتن. ئـەوەبوو شـــەڕێکی زۆر خوێنـــاوی لەنێوانیانـــدا بـــەرپابوو و عوسمانییـــەکان ســـەرکەوتن ونادرخـــان و هێزەکـــەی بـــەرەو هەمـــەدان هـــەڵاتن و لـــەوێش دەســـتی کـــردەوە بەرێکخســـتنی ســـوپاکەی و دیســـانەوە هێرشـــی بـــردەوە ســـەر کـــەرکووك و ئـــەمجارەیان ســـەرکەوتنی بەدەســـهێنا و تۆپپـاڵ عوسمـان پاشـای سـەرکردەی عوسمانیشـی کوشـت و گەڕایەوە بۆ بەغدا و درێژەی بەگەمارۆکەی سەری دایەوە.

سـەرکردە ئەفشـاریەکە لـەدوای ئـەم سـەرکەوتنە مەزنـە ئامـادەبوو بـەردەوام بـێ لەشـەڕەکانی نێـو خـاکی عـێراق، بـەڵام ئـەوەی بـۆ نەرەخسـا چـونکە هـەواڵی ئـەوەی پێگەیشـت کـە لەهـەرێمی فـارس بـۆ لایـەنگیریی سـەفەوییەکان شـۆڕش بـەرپابووە، بۆیـە ناچـار بـوو لەسـاڵی ١٧٣٥ز پەیماننامـەی تفلـیس لەگـەڵ ئەحمـەد پاشـا مۆربکات و تیایـدا لەسـەر ئـەوە رێکـەوتن کـەوا هـەموو کاروبارەکـان بگەڕێتـەوە بـۆ سـەردەمی پـێش فراوانکارییـەکانی عوسمانییـەکان لـەنێو خـاکی ئێرانـدا. دەوڵـەتی عوسمـانیش دەسـبەرداری هـەموو دەسـکەوتەکانی بـوو تەنانـەت دەسـتی لەبەغـداش هـەڵگرت، بەمـەش هـەموو ئـەو هەرێمانـەی عوسمانییـەکان دەسـتیان بەسـەرداگرتبوو جارێکی دیکە گەڕایەوە بۆ ئێرانییەکان:

- سـنوری نێـوان دەوڵـەتی سـەفەویی و عوسمـانی بـەگوێرەی بڕیـاری پەیماننامـەی ساڵی ١٦٣٢ز لێبێتەوە.
- هەردوولا بەڵێن دەدەن کەوا دیل و چەکەکان بۆ یەکتری بنێرنەوە.
- عوسمانییەکان بـەڵێن بـدەن رێ لـەو ئێرانییانـە نـەگرن کـەوا بـۆ سـەردانی شـوێنە پیرۆزەکان دەچنە عیراق.

- عوسمانییـەکان بـەڵێن دەدەن گەنجـەو شـەروان و ئـەیرەوان و تفلـیس بگێڕینـەوە بۆ ئێرانییەکان و بەزووترین کاتیش هێزەکانی خۆیان لەم ناوچانە بکشێننەوە.

لەراسـتیدا ئـەم پەیماننامەیـە زیـاتر لەبەرژەوەنـدی نادرخـان بـوو بـۆ ئـەوەی بتـوانێ بەرەی عیراق ئـارام بکاتـەوە، تـاکو خـۆی بەتـەواوی سـازبکات بـۆ شـەڕی لـەناوبردنی شۆڕشی فارس و جارێکی دیکە بگەڕێتەوە بۆ عیراق و درێژە بەشەڕەکان بداتەوە.

هەرچـیـیەك بـێ ئـەم پەیماننامەیـە بەرهەڵسـتکاری زۆریـی هـەبوو لەلایـەن عوسمانییەکانـەوە چـونکە سـەرتاپای لەبەرژەوەنـدی ئێرانییـەکان بـوو، بۆیـە سـوڵتان محەمـەدی یەکـەم رەتیکـردەوەو بڕیاریـدا هـەموو شـوێنەکان بەشـەڕ بگێڕێتـەوە، بـۆ ئەم مەبەستەش سوپایەکی بەسەرکردایەتی عەبدوڵلاپاشا نارده سەر قارش.

نادرخـان ئـەم رەتکردنەوەیـەی عوسمانییـەکانی بـۆ پەیماننامەکـە بەهـەلزانی و دەسـتی کـرد بەتـەواوکردنی داگیرکـاری بـۆ ناوچـەکانی ئـەرمینیا و وڵاتـی کـەرەج و لەوێشەوە توانی داغسـتان داگیربکـات. ئـەو کاتـەش روسـیا خـەریکی پێکـدادان بـوو لەگـەڵ عوسمانییـەکان و دیسـانەوە نادرخـان ئەمـەی قۆزتـەوە بـۆ بەرژەوەنـدی خـۆی و هەڕەشـەی لەروسـیا کـرد کـەوا نـابێ لەگـەڵ عوسمایەکانـدا هاوپـەیمانێتی بکـات، بۆیـە رووسـەکان ناچـاربوون رێکـەوتن لەگـەڵ نادرخانـدا بکـەن و بـەگوێرەی پەیماننامەیەك لێك نزیك بوونەوە، ئەم بەندانەی لەخۆگرتبوو:

- رێگە نەدرێ حەریری ئێرانی بەنێو خاکی عوسمانییەکاندا هەناردەبکرێ.
- روسەکان بـەڵێن بـدەن کـەوا لەدەربەنـد و بـاکۆ لـەماوەی دوو مـانگـدا بکشـێنەوە و بیاندەنەوە دەست ئێرانییەکان.
- یارمەتی سەربازی پێشکەش بەئێران بکەن.

لەراسـتیدا دەسـەبەرداری روسـیا لەدەربەنـد و بـاکۆ بـۆ بەرژەوەنـدی ئێـران بـەو ئاسـانییە بـۆ ئـەوەبوو کـەوا مەترسـی عوسمانییـەکان بـۆ سـەر ئـەو ناوچـانە بڕەوێنێتەوە چونکە مەترسی ئێرانییەکان بەئەندازەی ئەوان نەبوو.

بـۆ بەئـەنجام گەیانـدنی ئـەم پەیماننامەیـە روسـیا هێزێکـی تۆپهاوێـژی بـۆ نادرخـان نـارد تـاکو لـەداگیرکردنی شـاری گەنجـە یارمەتیـدەری بـێ، لەوێشـەوە بـەرەو قـارس کەوتـەرێ تـاکو عەبـدوڵلا پاشـا لـەناوببات و لـە١٨حـوزەیران١٧٣٥ز و لەناوچـەی

باغـــەوان بەیـــەکیان دادا. شـــایانی باســـە ســـەرەڕای گـــەورەیی ســـوپا و هێزەکـــانی عوسمـــانیی کەچـــی نادرخـــان تـــوانی ســـەرکەوتنێکی زۆر گـــەورە بەدەســـبهێنێ و لەئەنجامـــدا دەســـتی بەســـەر تفلیســـدا گـــرت، ئـەیرەوان و قارسـیش بـەرگریان دەکـرد و تەرمی عەبدوڵلاپاشا کەوتە مەیدانی شەڕەکە.

ئـــەم ژێرکەوتنـــەی عەبدوڵلاپاشـــا کاردانەوەیـــەکی زۆر توونـــدی هـــەبوو لەلایـــەن ئەســـتانبوڵەوە، بۆیـــە ســـوڵتان ســـوپایەکی دیکـــەی ســـازکرد و بەســـەرکردایەتی ئەحمـــەد پاشـــا کەپێشـــتر والـــی بەغـــدا بـــوو و ســـوڵتان لایـــدابوو بـــۆ تۆڵەســـەندنەوە بنێـــرێ و لەهـــەمان کاتیشـــدا نادرخـــان خـــۆی ئامـــادە دەکـــرد پـــەلاماری ئـــەرزەرووم بـــدات کـــەدەروازەی ئـــەنادۆڵبوو بەمەبەســـتی ئـــەوەی ڕێگـــای هـــەناردەی حـــەریری ئێرانـــی بـــۆ دەوڵـــەتی ســـوڵتانی بگـــرێ. ئەحمـــەد پاشـــا گەیشـــتە ناوچـــەکە لەشـــەڕێکی دەســـتەویەخەدا ڕووبـــەرووی یەکتربوونـــەوەو لەئەنجامـــدا عوسمانییـــەکان شکســـتێکی گـــەورەیان بـــەنادرخان هێنـــا و ئـــەویش بەناچـــاری بـــەرەو دۆڵـــی مۆقـــان هـــەڵات و لەوێشـــەوە لـــەپێناو ڕاگـــرتنی شـــەڕ داوای لەعوسمانییـــەکان کـــرد کـــەوا ڕێکـــەوتنی ئاشتی مۆربکەن.

## تاج لەسەرنانی نادرخان:

نادرخـــان لـــەمۆقان بـــەئامادەبوونی ئەرکانـــەکانی دەوڵـــەت و ســـەرکردە ســـەربازییەکان و فـــەرمانڕەوای ویلایەتـــەکان و زانـــا ئایینیـــەکان و نێـــردراوی دەوڵـــەتی عوسمـــانیی کـــەجانجی عـــەلی پاشـــا بـــوو کۆبوونەوەیـــەکی ســـازکرد و تێیـــدا خۆتـــەرخانکردنی بـــۆ ئامـــادەبووان لـــەپێناو بـــەرگریکردن لـــەئێران و پارێزگـــاری لێکردنـــی لـــەدژی دوژمنـــەکان نیشـــاندا و دەیـــەوێ چـــیدیکە شـــەڕ نـــەکات و پشـــوویدات و لەمەشـــهەد نیشـــتەجێببێ و داوای لێکـــردن کـــەوا لـــەنێو کوڕەکـــانی خانـــەوادەی ســـەفەویی کەســـێك هەڵبژێرن کەبارگرانی دەسەڵاتدارێتی بخاتە سەرشانی خۆی.

لەڕاستیشـــدا ئـــەم هەڵوێســـتە بـــۆ ئـــەوەبوو خـــۆی بگەیەنێتـــە فەرمانڕەوایـــەتی چـــونکە لەخانـــەوادەی ســـەفەوییدا کەســـێکی وا نـــەبوو توانـــای ئـــەم کـــارەی هـــەبێ و بـــەلێزانی شـــوێنی ئـــەو بگرێتـــەوە، بەڵگـــەش ئـــەوەبوو کـــەوا لەســـاڵی ١٧٣٥ز بەڵگەنامەیـــەکیان مـــۆرکرد و بەهۆیـــەوە شاعەباســـی ســـێیەمیان لاداو کۆتاییـــان بەدەســـەڵاتدارێتی

سەفەویی هێناو لەلایەکی دیکەش نادرخانیان وەك شای ئێران بۆ سەر تەختی پاشایەتی بەرزکردەوە، ئەوەشی لەدوای دوودڵییەکی بەئەنقەست تاکو وای لێکنەدەنەوە چاوی بڕیوەتە ئەم پلەیە رەزامەندی لەسەر نواند و لە٩ئازار١٧٣٦ز تاجی شاهانەی لەسەرنراو بەمەش بەیەکجاری کۆتایی بەخانەوادەی سەفەویی هات و لەجێی ئەواندا خانەوادەی ئەفشاریی دەسەلاتیان گرتەدەست.

نادرخان لەدوای ئەوەی لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت نازناوی شای وەرگرت و دەستی کرد بەرێکخستنی کاروبارەکانی دەوڵەتە تازەدامەزراوەکەی و رەزاقوولی کوڕی کردە حاکمی خۆراسان و لەهەمان کاتیشدا تەهماسب قوولی خانی جەلائیری هاوکاری دەکرد و ئینجا ئیبراهیم خانی برای کردە حاکمی ئازەربێجان و حاکمی بۆ هەموو هەرێمەکان دەسنیشان کردو نێردراویشی بۆ لای قەیسەری رووسی و سوڵتانی عوسمانی نارد و پێی راگەیاندن کەوا بوەتە خاوەنی عەرشی ئێران.

شاتەهماسبی سێیەم خرایە زیندان و لەساڵی ١٧٤٠ز خۆی و شاتەهماسبی دووەمی باوکی و میرزا سولەیمانی برای کوژران و لەدوای ئەوەش لەسەردەمی هەردوو خانەوادەی ئەفشاری و زەندی ئێران دووچاری پشێوی و ئاڵۆزییەکی زۆر سەخت هاتەوە و هەردوولا رکابەرییان لەسەر فەرمانڕەوایەتی ئێران دەسپێکرد. ئەوەبوو رکابەرەکانی نادرشا مکوڕبوون لەسەر ئەوەی یەکێك لەخانەوادەی سەفەویی خاوەنی شەرعی دەسەلاتدرێتییەکە پەیدابکەن و بەرزی بکەنەوە بۆ سەر تەختی پاشایەتی چونکە ئەو کاتە لەوبەڕی پێویستیی ئەو کەسایەتیەدابوون. بەمەش هەریەك لەئیسماعیلی سێیەم و سولەیمانی دووەم و ئەبولفەتح سوڵتان محەمەد بوونە فەرمانڕەوای دەوڵەت، بەلام ئەوانە وەك و قەرەقۆز بوون بەدەست شازادە خاوەن هێزەکان و دوایین کەسیان تا ساڵی ١٧٨٦ز لەفەرمانڕەوایەتییەکە مایەوە.



# دوا وتـــه

ئێرانـــی ســـەفەویی لەســـەرەتایی ســـەدەی هەژدەهـــەمی زایینیـــدا دواکـــەوتنی پێـــوە وەدیارکـــەوت، کەچـــی لەســـەدەی حەڤدەهەمـــدا پێشـــکەوتن و گەشەســـەندنێکی زۆر بەرچـــاوی بەخۆیـــەوە بـــینی و لەوکاتانـــەدا خانـــەوادەی ســـەفەوییەکان توانیـــان یـــەکریزی سیاســـی و ئـــایینی و مـــەزهەبی تێـــدا بەرقەراربکـــەن، هـــەروەها هۆکارەکـــانی پێشـــکەوتنی لەئـــەوروپای خۆراواییـــەوە دەهێنـــا، بـــەڵام دەوڵـــەتی ســـەفەویی لـــەدوای ماوەیـــەکی کـــەم بـــەهۆی نغرۆبـــوونی فەرمانڕەوانکانییـــەوە لـــەنێو گەندەڵیـــدا دەســـتی کـــرد بەلەدەســـدانی هێزەکـــانی خـــۆی و ئەمـــەش بـــووە هـــۆی زیـــادبوونی هۆکارەکـــانی لێکهەڵوەشـــانەوە و چـــاوتێبڕینی دراوســـێیەکان. ئەفغانییـــەکان یەکـــەم کەســـبوون کـــەوا بێفـــەرمانی دەوڵـــەتی عوسمانیـــان کـــرد کەپێشـــتر و لەســـەردەمی دامەزرێنـــەری دەوڵـــەتی ســـەفەویی لـــەژێر دەســـەڵاتیاندابوون، ئەمـــەش هـــانی هێزەکـــانی دەووروبـــەری ئێرانیـــدا وردەوردە لێیبببنـــەوە. ئۆزبەکـــەکان بەســـەرکردایەتی ئـــەمیری بوخـــاری دەســـتیان بەســـەر خۆراســـاندا گـــرت و روســـەکانیش چـــاوییان بڕیـــە رێگـــا بازرگانییەکـــەی نێـــوان هیندســـتان و ئـــەوروپا کەبـــە کـــابوڵ و هـــەرات و مەشـــهەد و تـــەورێزدا تێدەپـــەڕی و بـــەرەو بـــاکوری ئـــەرەزەرووم و تـــەرابزۆن دەرۆیشـــت، لـــەلای باشووریشـــەوە بـــۆ دیاربـــەکر و حەلـــەب و ئەســـکەندەرییە، زۆریشـــی نـــەبرد کـــەوا لەســـاڵی ١٧٢٢ز دەربەنـــد هاتـــە ژێـــر دەســـەڵاتیان و لەســـاڵی دواتریشـــدا بـــاکۆ، لەپاشـــان زاڵبـــوون بەســـەر کـــەنارەکانی خۆرئـــاوای دەریـــای قـــەزوین و داغســـتان و گـــەیالن و مازەنـــەران و ئەســـتەرئاباد و ئەمانـــەش هـــەموو لەئـــەنجامی پەیماننامـــەی پترســـبۆرگ بەئـــەنجام گەیشـــتن. عوسمانییـــەکانیش لـــەلای خۆیانـــە هەلەکـــەیان قۆزتـــەوە بـــۆ ئـــەوەی تۆڵـــەی خۆیـــان بکەنـــەوە و دەســـتیان بەســـەر ئـــەرمینیا و عـــێراق و ئازەربێجانـــداگرت. میرئەشـــرەف کەلـــەجێی مـــیر مـــەحمودی گرتـــەوە لـــەئێران و

بەسـایەی مەزهەبەکەیـەوە لەعوسمانییـەکان نزیـك بـوو، خـۆی لـێ نزیـك کردنـەوەو دانیشـی بەهـەموو فتوحاتەکانیانـدا نـاو لایـەنگری و بەندەفـەرمانی خۆیشـی بـۆ سـولتانی عوسمانی راگەیانـد و بـەڵێنی دایـێ کـەوا سـەفەوییەکان لـەرەگ و ریشـەوە هەڵکـەنێ، ئەمـەش ئـەوەی دەگەیانـد کـەوا دەوڵـەتی سـەفەویی هەرچـەندە ئێرانـی گەیانـدە پلـەی بێوێنـەیی لەجیهانـدا بـەرەو نـەمان بچـێ، بـەڵام بەشـێوەیەکی کـاتی لەسـەر دەسـتی سـەرکردەیەکی رەوەنـدی تـورکی عـێراق کەلەخۆراسـان دەژیـا تـوان پارێزگـاری لـەخۆی بکـات کەئـەویش نادرخـانبوو و تـوانی بەسـەر ئەفغانەکانـدا زاڵـبێ و لەسـاڵی ١٧٣٠ز یـەکریزی وڵاتەکـەی سـازکردەوە و دانـی بەدەسـەڵاتی شاتەهماسـبی دوووەم دانـا. شـا تەهماسـب بەتایبـەتی ئێرانییـەکانی بەگشـتی ئومێدی ئـەوەیان بـەنادر هـەبوو کـەوا ئێـران بگێڕێتـەوە بـۆ سـەردەمی جـاران، بۆیـە دەسـتی کـرد بەهێرشـبردنە سـەر خۆراسـان و هـەرات و لـەژێر دەسـتی ئەفغانـەکانی هێنایـە دەرەوە و عوسمانییەکانیشـی ناچـارکرد کـەوا لـەعیراق و ئازەربێجـان و ئـەیرەوان و قـارس بچـنە دەرەوە، جگـە لەوانـەش چـەندین قـەڵاتیان لەقـەوقاز داگیرکـرد. بـەگوێری ئـەو پەیماننامەیـەی لەسـاڵی ١٧٣٧ز لەئەسـتانبوڵ سـازکرا ئـەو ویلایەتانـەی پێشـتر هـی سـەفەوییەکان بـوون گەڕاندرانـەوە بـۆی، لەلایـەکی دیکەشـەوە ئێـران بـوو بـەخاوەنی سەرپەرشـتیاریی ئـەرمینیای خـۆرەڵات و دەسـتی بەسـەر وڵاتـی کەرەجیشـدا گـرت. روسـیەکانیش ناچـاربوون زەوییـە پـان و بەرینـەکانی بـاکوری ئێـران چـۆڵبکەن، بـەڵام نادرشـا تـوانی لەسـاڵی ١٧٣٦ز دوایـین پاشـاکانی سـەفەویی لـەناوببات و لەناهـەنگێکی زۆر شـکۆدار لەپێدەشـتەکانی مۆقانـدا نازنـاوی شـای وەرگـرت و دەربارەکەشـی گواسـتەوە بـۆ مەشـهەد بـۆ ئـەوەی بتـوانێ چـاودێری سـنوورەکانی بکـات و بیانپـارێزێ لەدەسـدرێژی دراوسـێکانی. لەسـاڵی ١٧٣٧ز بەسـەرکردایەتی سـوپایەکی بـەهێزەوە بـەرەو ئەفغانسـتان رۆیشـت و تـوانی قەنـدەهار و غەزنـە و کـابۆل داگیربکـات و هـەموو هۆزەکانیشـی ملکـەچ کـرد، ئینجـا دەوازەکـانی هیندسـتانی لەبەردەمـدا کرایـەوە، لەپاشـان لـەرووباری هینـدوس پەڕیـەوەو چـووە نـاو شـاری لاهـور، ئینجـا شکسـتی بـەهێزەکانی

سـەرکردەی مەغۆلـەکانی هیندسـتان سـوڵتان مـەحمود هێنـا و دەسـتی بەسـەر دەڵهیـدا گـرت، دوایـی فەرمانڕەوایەتییەکـەی بـۆ گێڕایـەوەو بـەرەو تورکسـتان وەڕێکەوت، لـەوێش حـاکمی بوخـارای ناچـارکرد کـەوا سـەرانەیەکی زۆر گـەورە بـدات و خانەکـەی بەیـەکێکی دیکـە گۆڕیـەوە کـە لایـەنگری خۆیبـوو، پاشـان و لـەدوای ئـەوەی ئاسـاییش لەوڵاتەکـەدا سـەقامگیربوو بـیری لـەوەکردەوە کـەوا شارسـتانیەتی ئەوروپییـەکان بگوازێتـەوە بـۆ ئێـران، بـەڵام لەسـاڵی ١٧٤٧ز بەدەسـتی یـەکێك لەئەنـدامانی هۆزەکـەی کـوژرا. شـایانی باسـە نادرشـا بەیـەکێك لەپاشـا گـەورەکانی ئێران دەژمێردرێ.

لـەدوای ئـەو جێنشـینەکان رکابـەریی یـەکتریان دەکـرد و بەمـەش گەنـدەڵی و بێسـەروبەرەییەکی زۆر بـاڵی بەسـەر وڵاتـدا کێشـا، هەرچـەندە لـەنێو جێنشـینەکانیدا کەسێك نـەوتۆ نـەبوو بتـوانێ بـەکارەکانی ئـەو هەڵسـێ بـەڵام ئـەو هـەموو جیـاوازی بیروراییانـەی نێـوان دانیشـتوان و لایەنـەکانی دەوڵـەت نەیانـدەتوانی کاربانـانی بـۆ بەڕێوەبەرایـەتیی پاشـاکانی دوای ئـەو بکـەن، ئاشـکرایە کەلەئێرانـدا چـەندین جـۆر نەتـەوە هـەبوون وەك عەرەبـەکانی لورسـتان هەنـدێکی دیکـەی عیراقـی زەرد و مـەگۆل و تاتـار و تـورك. بەمەشـێوەیە ئێرانێکـی تێکـەڵ لـەم هـۆز و تایەفانـە سـازیبوو، میراتگرانـی نادرشـا تـەنها خۆراسـانیان بەرکـەوت و مەشهەدیشـیان کـردە پایتـەختی خۆیـان، ئەفغانـەکانیش توانیـان سـەربەخۆیی خۆیـان دابـین بکـەن و تورکمانـەکانیش کەزۆربـەی سـەرکردە سـەفەوییەکان لەوانـەوە دروسـتبوون چـەندین تیپـی سـەربازییان پێکـەوەناو دەسـتیان بەسـەر ویلایەتـەکانی لای بـاکوردا گـرت کەلەئـەرمینیاوە بـەرەو ئەفغانسـتان هەڵدەکشـان، ئەسـفەهان و ئەسـتەرئاباد و قەندەهار لەشارە گەورەکانیان بوون.

سەرکردەکانی هـۆزی بـەختیار و زەنـد هەوڵیانـدا کـەوا دەسـەڵاتی ئێرانیـی لـەخوارو و خـۆراوا دروسـبکەنەوە، بۆیـە لەوڵاتەکـەدا دەوڵـەتێکی نەتـەوەیی دروسـتبوو بـەناوی دەوڵـەتی زەنـد بەسـەرۆکایەتی کـەریم خـانی زەنـد و توانیـان ئەسـفەهان و

ئازەربێجان و مازەنـدەران لـەژێر دەسـتی قـەوقازە تورکـەکانی سـەر بەرووسیا بهێننـە دەرەوە، بەمـەش یـەکریزیی خـۆراوای ئێرانـی سـازکردەوە کەلەکـەنارەکانی دەریـای قەزوینـەوە بـەرەو ناوچـەکانی کەنـداوی عـەرەبی هەڵدەکشـاو شیرازیشـی کـردە پایتەختی خۆی.

لـەدوای مردنـی کـەریم خـانی زەنـد لەسـاڵی ١٧٧٩ز کێشـەی بەدەسـتەوە گـرتنی دەسـەلآت کەوتـە نێـوان ئەنـدامانی خانـەوادەی زەنـدو، سـەرەڕای ئـەوانیش خانـەوادەی قاجـاری تورکمـانی کـەدژێکی کەللـەرەقی زەندییـەکان بـوون هاتنـە نـاو ململانێیەکـە و لەپاشـاندا ئاغـا محەمـەدی قاجـاری تـوانی دەسـەلآتەکە لەخانـەوادەی زەندییەکان وەرگرێـت و هـەموو رکابەرەکانیشـی کوشـت و بـوو بـە بـەهێزترین پیـاوی ئێران و پاشان تاجی شاهانەی خستەسەر و لەساڵی ١٧٩٧زدا کوژرا.

دەسـەلآتدارێتی خانـەوادەی قاجـاری تـاکو جـەنگی جیهـانی یەکـەم ئـەو کودەتایـەی رەزاپەهلـەوی لەسـەریکردن هـەر بـەردەوامبوو، ئـەم کودەتایـەش بەتـەواوی لەنیسان١٩٢٦ز لەسەردەمی دواپین پاشا کەئەحمەدی قاجاری بوو روویدا.

کۆتایی

ئەم کتێبە باس لە مێژووی دەوڵەتی سەفەوییەکان دەکات لەئێران. لەراستیشدا بەرچاوخستن و وێناکردنی رابردوو کارێکی زۆر سەختە ئەویش نەک لەبەر وێکچوونی زانیارییە مێژووییەکان یاخود کەمی بابەتەکان، بەڵکو بەپلەی یەکەم گێرانەوەی مێژوو کارێکی سیاسییە، گۆتەگۆتیش دەربارەی نووسینی مێژووی سەفەوییەکان کە ئەویش لەسەر بنچینەیەکی سیاسی و تاک مەزەبی دامەزراوە وا لەلیکۆڵەر دەکات تووشی چەندین کاری سەخت و دژوار بێتەوە.



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی
ڕۆژهەڵات